حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرە (٤٢٥)

# کەشکۆڵ

محەمەد عەبدولکەریم سۆڵەیی

سلێمانی ٢٠٠٦

# کەشکۆڵ


نووسەر: محەمەد عەبدولکەریم سۆلەیی

بابەت: کەشکۆڵ

تایپ: تەرزە خالید

نەخشەسازی کۆمپیوتەر: مەهدی ئەحمەد

هەڵەبڕی: سەناریا کەریم

سەرپەرشتیاری چاپ: سەلام فاتح

نەخشەسازی بەرگ: دیاری جەمال

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: (٢٤٥)ی ساڵی ٢٠٠٦ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

# پێرست

## کەشکۆڵ پێشکەشە بە:

زێنەبی هاوسەرم

کوڕەکانم( بەخشی، ئازاد، ژیر، بلێسە )

کچەکانم( بەهار، شێنێ، شەنگە )

ئەوانەی فێری خوێندنیانکردم

سوپاسی ئەم بەڕێزانە دەکەم کە لە ئامادەکردنی ئەم کەشکۆڵەدا ئەرکیان کێشاو لەگەڵمدا ماندوو بوون:

تەرزە خالید

سەناریا کەریم

سنەوبەر کەریم

مەهدی ئەحمەد

# کەشکۆڵ بۆ؟

مـرۆڤ رۆژانـە ئەندێشـەی خـۆی هەیـە. دیـارە هـەموو مرۆڤێـك ناتوانێـت ئەندێشـەکانی تۆماربکـات. بـەلاَم مـرۆڤیش هەیـە ئەندێشـەکانی لەدەفتـەری بیرەوەری بەنووسـین تۆمـار دەکـات.نووسـین زادەی بیرکردنـەوەی مرۆڤـە. زادەی مـرۆڤیش بـەپێی سـەردەموبارودۆخی خـۆی سـوود بـەرەوتی ژیـانی مرۆڤایـەتی دەگەیەنێت... بۆیە باشتر وایە زادەی بیرکردنەوەی مـرۆڤ بگاتـە دەستی مـرۆڤ.. لەوکاتـەوەی بوومەتـە هـاورێی قەڵـەمو قەڵـەم دەسـتمی ناسـیوە.. نووسـینم نووسـیوە. نوسـینەکانم هەمـە جـۆرن لەسـاڵی(٢٠٠٤) دا کۆمەڵـە شـیعرێکم بەناونیشانی(دابڕان) بلاَوکردەوە.. کە ئەوشیعرانە زادەی رۆژگارەکان بوون.

دوای ئـەوەی بەدەفتـەرە کۆنەکانمـدا چـوومەوە(چـەند نووسـینێکی تـرم). دۆزینـەوە. لـە سـالاَنی رابـردودا نـاوە نـاوە وتـاری هەمـە جـۆرم نووسـیوەو، لەرۆژنامـەو گۆڤارەکانـدا بلاَوم کردونـەتـەوە، بەمەبەسـتی ئـەوەی ئەو نووسینانە لەناو نەچن هەر هەموویانم کۆکردەوە لەم کتێبەدا پێشەکەشی خوێنـەری کوردو کتێبخانەی کوردی دەکەم، ناویشم ناوە(کەشکۆڵ) بۆیە ئەم ناوەشم لێنـاوە لەبەر ئەوەی نووسینەکان تێکەلاَون و نوسینی هەمەچەشنەنو زۆربەشیان لەرۆژنامـەو گۆڤارەکاندا بلاَوکراونەتەوە. تیایاندایە لەپەراوێزدا ناوی رۆژنامە یان گۆڤارەکەو سـاڵی بلاَوکردنـەوەی نووسـراوە، هەشـیانە ئـەوەی بـۆ نـەکراوەو لەکاتێکـدا بلاَوکراوەتـەوە، ئەمـەیان لەراستیدا هـەر چـەند خـۆم ماندوو کـرد نـەمتوانی ئـەو بلاَوکراوانـە بدۆزمـەوە کـە تیایانـدا بلاَوکراوەتـەوە هەشیانە......لـەکاتی خـۆیـدا نووسیومەو بلاَوم نەکردۆتـەوە وا لـەم کتێبـەدا دەیخوێنیتـەوە بەئومێدی ئـەوەی تـوانیبێتم خزمـەتێ بـەبواری روونـاکبیریو ئـەدەبی گەلەکـەم بگەیـەنم(کەشـکۆڵ) کراوەتە (دوو) بەش، بەشی یەکەم وتارەکانو بەشی دووەم بابەتە ئەدەبیەکانە.

**نووسەر**

# نامەیەكی مەلیك مەحمود بەزمانی عەرەبی بۆ عەبدولڕەحمان بەگ

## لە ( ١٩٤٨/١٢/٢٦ )دا

سليمانية
١٩٤٨/١٢/٢٦

حضرة الوجيه الفاضل المحترم عبدالرحمن بك المحترم

بعد التحية والتكريم

بعد السؤال عن عزيز خاطركم نسأل من الباري عز وجل ان تكونون موفوري الكرامة والسعادة ونبدي
عندما تشرفتم الى قرية داريكلي فقد نسيت ان ابين لحضرتكم عن قريبه المعظم الشيخ عبدالكريم ابن الشيخ
محمد الذي هو رجل عالم وفاضل وانه يقيم منذ خمسة عشر سنة في وظيفة الامامة [illegible]
[illegible]
[illegible]
[illegible]
[illegible]
[illegible]
[illegible]

الشيخ محمود الحفيد

مـــەلیك مـــەحمود لەســـەرەدەمێكدا لەگونـــدی داریكـــەلی ناوچـــەی بازیـــان دادەنیشت...لەوسالأنەدا رۆژانە خەڵكی كوردستان لەهەموو لایەكەوە سەردانیان دەكردو شەوانە لای دەمانەوە.. بەتایبەتی دانیشتووانی گونـدەكانی ناوچـەكانی گـەرمیانو قـەرەداغ، بازیـانو سـوورداشو شـارەزوورو پێنجوێن، بەبـەردەوامی دیوەخانەكـەیان گـەرم دەكـردو لای شـێخیان چـۆڵ نـەدەكرد. شـێخ ناوەنـاوە بەمەبەسـتی بەسـەركردنەوە، سـەردانی گونـدەكانی دەوروبـەری داریكـەلی دەكـرد..یـەكێك لـەو گوندانـە، كـە نـزیكترین گونـدی ناوچـەی قـەرەداغبوو لەداریكەلییەوە گوندی(سۆڵەی دەربەند)بوو، پەیوەندییەكی بـەردەوام لـەنێوانی دانیشتووانی ئـەم گونـدەو جـەنابی شـێخدا هـەبوو، یـەكێك لـەناودارەكانی ئـەو

گونده كه پەيوەندييەكى زۆرپتەوى لەگەڵ شێخدا هەبوو، شێخ عەبدولكەريمى شێخ كاكە حەمەى سۆڵەبوو، شێخ عەبدولكەريم خاوەنى تەكيەو خەليفەو دەروێش و شێخى ئيرشاد بوو.

لەبەر ئەوەى مەليك مەحمود لەنزيكەوە ئاگادارى تەكييەو ميوان و بارى ژيانى شێخ عەبدولكەريم بووە، لەو سەردەمەشدا ميرى موچەى بۆ مەلاكان بڕيوەتەوە، بۆيە مەليك مەحمود.. بەنامەيەك داواى لەعەبدولرەحمان بەگ كردووە، كە وەكو ئەو مەلايانە مووچەيەكى مانگانەش بۆ شێخ عەبدولكەريم ببڕنەوە من نازانم ئەو هەبدولرەحمان بەگە كێبووەو پلەوپايەو كارى لەوكاتەدا لە حكومەتدا چيبووە. دڵنيام كاربەدەستێكى بەدەسەڵات بووەو دۆستێكى نزيكى شێخبووە بۆيە نامەى بۆ نووسيوە.. نامەكە لە(١٩٤٨/١٢/٢٦) لەسليمانى و بەزمانى عەرەبى نووسراوە. ديارە جەنابى شێخ ئەوكاتە لەسلێمانى بووە. لەبەرئەوەى نامەكە نامەى مەليك مەحمودەو دڵسۆزى شێخ بۆ خۆشەويستى و دۆستەكانى دەردەخات، بۆيە بەجێى خۆيمان زانى كە لە گۆڤارى سليمانيدا بڵاوى بكەينەوە، نامەكە لاى حاجى شێخ عوسمانى كوڕى شێخ عەبدولكەريم پارێزرا بوو..

# چەند زانیارییەك لەبارەی ئەم نامەیەی خوالێخۆشبوو شێخ مەحمودەوە*

ئەم نامە جوان و رێکوپێکەی شێخ مەحمود بۆ(الوجیه الفاضل المحترم عبدالرحمن بگ) کە بەزمانێکی عەرەبی پاراوو بێ هەڵەی زمانەوانی بۆ دامەزراندنی خوالێخۆشبوو شێخ عەبدولکەریم شێخ کاکە حەمەی سۆڵە نووسراوە تیایدا داوای مووچەی مانگانەی بۆ ئەکات وەك ئیمامی مزگەوتی سۆڵەی قەرەداخ، کەباوکی هاورێی خۆشەویستمان شێخ محەمەد سۆڵەیی بەڕێوەبەری گشتی چاپ وبڵاوکردنەوەیە لە سلێمانی وباوکی حاجی شێخ عوسمانە کە پیاوێکی ئایینی و ناسراوە لەشاردا ئێمە بۆ بەدوادا چوونی ئەو عەبدولرەحمان بەگە چووینە لای پیاوی شارەزا لەکلروباری ئیداری ئەم شارە لەکۆندا برامان(کاك جەمیل شەکیب)و ئەو گوتی: ئەو عەبدولرەحمانەی شێخ ئەو نامەیەی بۆ نووسیوە:

عەبدلرەحمان خضر بوو کە محامیەکی بەغدادیی و زۆر دۆستی شێخ مەحمود بووە، ئەم پیاوە بەئیرادەی مەلەکی بەبەڕێوەبەری گشتی ئەوقاف لەعیراقدا دانرا، کەیەکسەر ئەو بەڕێوەبەرایتییە بەسترابوو بە(بلاطی ملکی) یەوە لەو زەمانەدا ئیمام و خەتیبەکانی عیراق هەندێکیان مووچەیەکی کەمیان هەبوو، کە لەنێوان ٢تا ٦دینار بوو، مجیور مووچەکانیان لەنێوان ٢٥٠فلس تا٥٠٠فلس بوو. کە عەبدلرەحمان خضر پۆستی بەڕێوەبەری ئەوقافی لەعیراقدا وەرگرت، بڕیاریدا کە مووچەی ئیمام و خەتیب بەرزبکرێتەوە بەپێی بڕوانامەو ساڵی خزمەت و پلەی مزگەوتەکان کەتێکڕا مووچەی مەلاکان زیادی کرد لەنێوان١٠بۆ١٨، بۆ٢٥دینارو

---

* کە نووسین ونامەکەم نارد بۆ هاورێی وخۆشەویستم مامۆستا حەمە نوری تۆفیق بۆ ئەوەی لەگۆڤارەکەیاندا(گۆڤاری سلێمانی) بڵاوی بکەنەوە لای خۆیەوە هەوڵیدابوو ئەم زانیاریانەی سەرەوە وەربگرێت و لەگەڵ نووسینەکەدا بڵاوی بکاتەوەز سوپاسی دەکەم و بەپەسەندم زانی ئەم زانیارییەش لەکتێبەکەدا بڵاوبکەمەوە.

بەوەش حاڵو گوزەرانی مەلاکان گۆڕردرا، هەروەها مووچەی مجێورو کارمەندانی تری وەك ئەوان لە مزگەوتەکاندا کرا بە(٦،٤) دینارو بەپێی ساڵانەی خزمەتیان تەرفیعیان ئەکرد، دیارە ئەوپیاوە کارێکی وایکردبوو، کە مەلاکانی مزگەوتەکان لەشارولادێکاندا مووچەیان بچێتە سەر دەوڵەت، کە مەلاکانی گوندەکانیشی گرتەوە، خوالێخۆشبوو (شێخ عەبدولکەریمی شێخ کاکە حەمە)ش وەکو شێخو مەلا کە لەباوکو باپیرانیەوە مەلایەتی مزگەوتی گوندی سۆڵەیان بۆ ماوەتەوەو دۆستی شێخ مەحمودیش بووە داوای لەشێخ کردوە کە بەپێی ئەو بەرنامە نوێیەی ئەوقاف وەك فەرمانبەرێك لەو مزگەوتەدا دابمەزرێو شێخیش ئەو نامە جوانەی بۆ خوالێخۆشبوو عەبدولرەحمان خضر بەڕێوەبەری گشتی ئەوقافی عیراقی لەبەغدا نووسیوە، کە ئێستا وێنەکەی لای کوڕە گەورەی حاجی شێخ عوسمان ماوەتەوەو پێشکەشی گۆڤاری سلێمانی کردوە، کە سوپاسێکی زۆری ئەکەین هەروەها سوپاسی کاك جەمیل شەکیب ئەکەین بۆ ئەو زانیاریانەی، سوپاسی براو هاوڕێمان کاك شێخ محەمەد سۆڵەیی ئەکەین. کە بەپەسەندی زانیوە لە گۆڤاری سلێمانی بڵاوبکرێتەوە.

**محەمەد نوری تۆفیق**

# پێشمەرگە کێیە...؟

چەك وچەكداری: دوو دیارەدەی كۆمەلایەتین و بە دوو شێوە بەكارهێنراوە: بۆ چەوساندنەوەو سەركوت و داگیركردن، لە هەمان كاتیشدا لەدێرزەمانەوە، مرۆڤ بۆ بەرگری لەسەروسامانی، شوێنی دانیشتن و حەوانەوەو هۆكارەكانی ژیانی، پەنای بردۆتە بەر(چەك)...چەك بەهەموو جۆرەكانیەوە، بەكۆن ونوێوە، هەروەكو چۆن ئامرازی چەوساندنەوە بووە، ئامرازی خۆپاراستن و بەرەنگاربوونەوەی مرۆڤیش بووە لە دوژمنانی...ئەو كەسانەی پەنایان بۆ چەك بردووە، یان چەك بۆتە هاوڕێی ژیانیان و هەڵیان گرتووە لە كۆنەوە تا ئێستا بەپێی سەردەم و قۆناغی مێژوویی، لە ناو كۆمەڵی مرۆڤایەتی و گەلاندا بە چەند ناو ناسراون، وەك:

(پارتیزان، كۆماندۆ، فیدایی، جەنگاوەر، میلیشیا، چەكدار، سوارە، تفەنگچی، پێشمەرگە، گەریلا، وڵات پارێز،...هتد)

لەمێژووی گەلی كوردا،(چەكدار، سوارە، تفەنگچی)بەو كەسانە وتراوە كە ئامادەبوون بە رەزامەندی خۆیان چەك هەڵ بگرن و پارێزگاری لە میرو میرنشینە كوردییەكان، دەسەڵاتدارانی كورد بكەن...لە كاتی شۆڕشی قازیو دروستبوونی كۆماری مەهاباد دا ساڵی(١٩٤٦)، لە بۆنیەكی ئەو شۆڕشەدا، لەجیاتی ئەو سێ ناوەی سەرەوە، وشەی(پێشمەرگە)هاتە پێشەوە، لەو كاتەوە زاراوەی(پێشمەرگە)وەك زارەوەیەكی سیاسی شۆڕشگێڕ لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلەكەماندا چەسپاوەو شوێنی خۆی كردۆتەوە.

كاتێك شۆڕش لە كوردستانی توركیا دەستی پێكرد، زاراوەی(گەریلا، وڵات پارێز)لەو دەڤەرەدا خۆی سەپاند، دیارە بنەچەی زاراوەی(گەریلا)ش وشەیەكی ئیسپانیە.

دەبابزانین، ئەوكەسانەی چەك بۆ مەبەستی چالاكی پێشمەرگانەو كاری سیاسیو شۆڕشگێڕی هەڵ ئەگرن، كێن و دەبێ چۆن بن و ئەركەكانیان دیاری بكەین:

## پێشمەرگە کێیە...؟!

وشە یان زاراوەی پێشمەرگە، لەڕووی زمان و ڕێزمانییەوە، وشەیەکی لێکدراوە و لە دوو وشەی سادە پێکهاتووە،(پێش)و(مەرگ). لە ڕووی واتاوە، بەو کەسانە دەوترێت کە دەکەونە پێشی مەرگ و چاوەڕوانی مەرگی ئاسایی ناکەن، لە پێناوی ئامانجێکی گشتی و پیرۆزدا ئامادەن خۆیان بەخت بکەن.

لەڕووی گوزارشتی سیاسی و شۆڕشگێڕییەوە، ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لەسەر خواست و ئارەزووی خۆیان لە مەیدانی خەباتی سیاسییەوە شێوە خەباتی چەکداری هەڵ دەبژێرن و چەك هەل ئەگرن و دەبنە چەکداری سیاسی، درێژە بە شێوازێکی تری خەباتی شۆڕشگێڕی ئەدەن، بەهۆی چەکەکانیانەوە پارێزگاری لە بیری چینایەتی، نەتەوایەتی، نیشتمانی ئەکەن، بەحوکمی پیشەکەیان، دەبنە پشت و پەنای چەوساوە و ستەمدیدە و ڕەنجدەران و زۆر لێکراوان، بەرگری لەمافی پێشێلکراوی خەڵك ئەکەن، سنگیان دەکەنە قەڵغان لە ڕووی داگیرکەران، گیانیان دەکەنە سووتەمەنی لەپێناوی خۆش گوزەرانی و سەرفرازی کۆمەڵانی خەڵك و گەل و نیشتماندا..دروشمی خەبات و بەڵێنی کۆڵ نەدان لای خۆیان بەرجەستە ئەکەن، لە پێناوی گەیشتن بە ئامانج، بێ ترس و سڵکردنەوە لەمردن چالاکی پێشمەرگانە دەکەنە پیشەی هەمیشەیی. ئەم دیاردەیە بەڕادەیەك بەرجەستە ئەبێت و دەنگ ئەداتەوە تا دەبنە جێگای متمانە و لەهەڵمەتی پێشمەرگەدا ئاسۆی سەرکەوتن ئەبینن.

لەکاتی شەڕدا تەنیا ئومێدی ڕزگاری و سەرفرازیان هیمەتی مەردانەی پێشمەرگەیە، لەکاتی سەرکەوتن و ئاشتی و ئارامیدا پارێزگاری لە دەستکەوتەکان ئەکەن و دەبنە شوورەی پۆلایین، پێشمەرگەیە دەبێتە وڵات پارێزێکی دڵسۆز و بە ئەمەك، بوار نادات بەرهەمی ڕەنج و خەبات و ماندووبوونیان بەفیڕۆ بڕوات.

کۆمەڵانی خەڵك متمانەیان پێ ئەکەن لەپاراستنی سەروسامانیان. کەسایەتی پێشمەرگە لەناو کۆمەڵ و جەماوەری خەڵکدا وەك توخمێکی شۆڕشگێڕی سیاسی بەهێز شوێنی خۆی ئەگرێت. واتە (پێشمەرگە تێکۆشەرێکی سیاسی چەکداری ڕێگای ئازادی و سەرفرازی چینایەتی و نەتەوایەتی و گەل و نیشتمانە).

هەڤاڵی بەڕێز(مام جەلال)لە پێناسەی پێشمەرگەدا ئەڵێت:

((پێشمەرگە تێکۆشەرێکی سیاسی چەکدارە، دەبێت وێڕای دڵسۆزیو فیداکاریو گیان بازی لە پێناوی خەڵکو نیشتماندا، تێکۆشەرێکی (دەستودەموداوێن پاك بێت) دەبێ ئەهمیەتو بایەخی ئەرکی پیرۆزی پێشمەرگایەتی بزانێت، کە رزگاری گەلو نیشتمانو پاراستنی(ی.ن.ك)و سەرخستنی سیاسەتەکەشێتی)).

**ئەرکەکانی پێشمەرگە**

١. لەکاتی ئاشتیدا

٢. لەکاتی شەڕدا

**ئەرکەکانی پێشمەرگە لە ئاشتیدا:**

١. گوێ رایەڵی هەموو فەرمانێکی سەرەوەی خۆیو رێزگرتن لە فەرماندەکان.

٢. جێبەجێکردنی فەرمانەکان بەدڵسۆزیو لەخۆبوردویی.

٣. ئیلتزامی تەواو بەکۆبونەوەی سیاسیو عەسکەری.

٤. هەستان بەواجباتو حەرەسیات رۆژانەو پاراستنی بارەگاکان.

٥- جێبەجێکردنی مەشقی سەربازیو گرنگی دان بە فێربوونی مەشقو زانیاری عەسکەری.

٦. خۆگۆش کردن لە ڕوی سیاسیو وشیاریو فیکریەوە.

٧. پاراستنی هەموو نهێنییەکی ناو بارەگا وەك ژمارەی پێشمەرگە-بارەگا-چەكو تەقەمەنی-ناوی فەرماندە-شوێنوبینای بارەگا-خالی حەرەسیاتو...هتد.

٨- پاراستنو پاککردنەوەو ئیدامەکردنی چاكو تەقەمەنیو هەڵگرتنیان لە شوێنی ئەمینو پارێزراو.

٩- پاراستنی هەموو کەلوپەلێکی ناو بارەگاو بەکارهێنانیان بە شێوەیەکی دڵسۆزانە.

١٠. ئیلتیزام کردن بە دەوامی رۆژانەو ماوەی مۆڵەت وەرگرتن(اجازە)

١١. دانەبەزینیان بۆ ناو بازاڕو شوێنە گشتیەکان.

**ئەرکەکانی پێشمەرگە لەکاتی شەڕدا:**

أ- ئیلتیزام کردن و گوێ رایەڵی کردن و جێبەجێکردنی هەموو بڕیارو فەرمانێکی فەرماندە بۆ بەرگری کردن یان هێرش بردن و پەلاماردان.

ب . لەکاتی بەرگری کردن و شەڕی بەرگری، پێشمەرگە ئەم ئەرکانەی لەسەرە:

١- لێدانی سەنگەرو قایم کردنیانبە شێوەیەك کە بیانپارێزێ لە تۆپباران و هێرشی دوژمن.

٢. دڵنیابوون لە پەکنەکەوتن و سەلامەتی چەك و تەقەمەنیەکانیان.

٣. بەوریایی واجب گرتن و پاراستنی بێ دەنگی و نهێنی شەو.

٤. وریایی بەردەوام و غافڵ نەبوون بەشەوو رۆژ.

٥-چاودێری کردنی شەڕگەو جموجوڵی دوژمن بە تایبەت دەوروپشتی سەنگەرەکان.

٦- خوڵقاندنی کەش و هەوای ورەبەرزی بە پەیڕەوکردنی دڵسۆزی و لەخۆبوردویی و خۆشەویستی لەناو هێزی پێشمەرگەدا.

٧. پاراساتن و باش بەکارهێنانی چەك و تەقەمەنی و دەست گرتن پێوەی.

٨. باش بەکارهێنانی ئاووخواردەمەنی و دەست گرتن پێوەیان.

ج . لەکاتی هێرش و هەڵمەت برندا پێشمەرگە ئەم ئەرکانەی لەسەرە:

١. گوێ رایەڵی و جێبەجێکردنی هەر بڕیارێکی فەرماندە بەگورج و گۆڵی.

٢-خۆئامادەکردن و دڵنیابوون لە سەلامەتی چەك و تەقەمەنیەکانی.

٣. هەڵگرتنی پێداویستی گرنگی شەڕ لە- زەمزەمی ناوو پێداویستی برین پێچی.

٤- پاراستنی بێ دەنگی نهێنی شەوو گەیاندنی راسپاردەکان لەکاتی رۆیشتن و نزیك بونەوە لەدوژمن.

٥- لەپێش ئەنجامدانی هەر هێرشێك پێویستە شوێنی هاوسەنگەران لە شوێن و جێگای دوژمن جیابکاتەوە.

٦-گرنگی گوێ رایەڵی و جێبەجێکردنی فرمانەکان لەم کاتەدا دەردەکەوێت، بۆیە پێویستە پشت گوێ نەخرێت.

٧. تەقەکردن بە بڕیاری فەرماندە دەکرێت، پێشمەرگەش جێبەجێی دەکات بە کۆنترۆڵ کردنی نەفس و ئاگاداری ئاڕاستەکردنی چەکەکانیان رووەو دوژمن.

٨. لەکاتی هێرش بردن بۆ سەر ناوچەیەکی مەدەنی تەقە لەو شوێنە دەکرێت کە تەقەی لێوە دەکرێت و زیان و ئازار بە خەڵکی مەدەنی ناگەیەنرێت بەرەچاوکردنی مافەکانی مرۆڤ.

٩ـ لەکاتی سەرکەوتندا دیل و برینداری دوژمن دەپارێزرێت و دەگوازرێتەوە سەنگەرەکانی داوە بە بڕیاری فەرماندە.

١٠. دەستکەوتەکان کۆدەکرێتەوەو تەسلیم بەفەرماندە دەکرێت.

١١ـ یەکسەر سەنگەرەکانی دەوروپشت قایم دەکرێت و پڕدەکرێتەوە بۆ بەرگری لە دژەهێرش و بەهیچ شێوەیەك کەس خۆی خەریك ناکات بەشتی لاوەکی و نابەجێ و غافڵ گیری.

١٢ـ ناو و ژمارەی شەهید بریندراری خۆیان لەناو هێزەکەو لەوکاتەدا بڵاوناکرێتەوە تا ئارام بوونەوەی شەڕەکە.

١٣ـ دەبێت ورەبەرزی و لەخۆبوردویی و دڵسۆزی لە ناخی پێشمەرگەدا جەستەیەکی زیندوبێت کە رەفتارو رەنگدانەوەی پێشمەرگەی دڵسۆزو شۆڕشگێڕە.

١٤. لەکاتی کشانەوەشدا پێشمەرگە بە هەمان شێوە گوێ رایەڵی فەرمانەکان دەبێت و بەپێی ئەو نەخشەی داڕێژراوە دەکشێتەوە سەنگەرێکی دواتر، واتە چۆن بەفەرمان هێرشی برد بە هەمان فەرمان دەکشێتەوە، بۆیە نابێت ورەی پێشمەرگە بەکشانەوە دابەزێت.

١٥ـ دەبێت پێشمەرگە کشانەوە بەشکست نەزانێت، چونکە کشانەوە بە سودوقازانجی هێزەکە دەگەڕێتەوەو شکست بە شکست دەدات.

١٦. نابێت لە کشانەوەدا بە پەشۆکاوی فەرمانەکان جێبەجێبکرێت.

١٧. تا ئەو جێگایەی لە توانادا بێت، نابێت شەهیدوبریندار بەجێ بمێنێت تەنانەت هیچ چەك و تەقەمەنی و کەلوپەلێکیش بۆ دوژمن بەجێ نەهێڵدرێت.

١٨ـ ئەو چەك و تەقەمەنیانەی کە توانای گواستنەوەیان نییە پێویستە بتەقێندرێنەوەو لەناوبدرێن بۆ ئەوەی دوژمن سودی لێ نەبینێت، ئەویش بە بڕیارەی فەرماندە.

١٩ـ لەكاتی شەڕوپێکادانداا نابێت پێشمەرگە خۆی بەماندو بزانیو بەتوڕەییو بێزاریەوە کارەکان بەنیوەچڵی ئەنجام بدات.

ئەمانەن ئەركو فەرمانەكانی پێشمەرگە، بۆیە نابێت لێی بێزار بێت، بەڵكو دەبێت لێهاتوانەو زیرەكانەو چاونەترسانە ئەنجامی بدات چونكە ئەمەیە واتای ڕاستی پێشمەرگەو پێشمەرگایەتی.

كادیرەكان لەناو(ه.پ.ك)دا دەبێت چاودێری ژیانو گوزەرانی پێشمەرگەكان بكەنو ماوە نەدەن دزی بكرێتو یان ئازوقەو كەلوپەل بەفیڕۆ بچێت.

كادیرەكان دەبێت كۆڕو زەماوەندو كۆرانیو نەشیدو هەڵپەڕكێو كاری وەرزشی مومكن بۆ پێشمەرگەكان سازیدەن.

*ئەم نووسینە لە ژمارە یەكی گۆڤاری ڕابەری سیاسی كە بەشی ڕاگەیاندنی مەڵبەندی پێشمەرگە دەریدەكرد لەساڵی ١٩٩٦ دابڵاوكراوەتەوە.

# ماموّستا كەریم رهل دووربینانە بیری لەسیایەتی تەعریبی كوردستان دەكردەوە

دوای نسكۆی ساڵی ١٩٧٥، رژێمی فاشی بەعس بەرنامەیەكی درێژخایەنی بەمەبەستی تەعریبكردنی كوردستان دارشت، سیاسەتی تەعریب و بەبەعسكردن و پاكتاوی رەگەزیی كردە دروشمێكی سەرەكیی حزبەكەی و چەندین شێوەو شێوازو پلانی دانا، فاشی ئاسایانە كەوتە وێزەی خەڵكی كوردستان، بوارێك لەژیانی كوردەواریدا نەما پەلاماری نەدات، شوێنێك شارێك لەكوردستاندا نەما لای نەبووبێت بەقەڵای بەرگری و نەخشەی رووخانی بۆ دانەنێت..لەكۆتایی ساڵی ١٩٧٥داو لەسەرەتای ساڵی ١٩٧٦دا، وە بەبەرنامەیەكی چڕو پڕی بەعسیانەی راگواستن و تەعریب و تەبعیس كردن، كەوتە گیانی خەڵكی كوردستان، سەرەتا بەو فەرمانبەرو ماموّستاو كرێكارانە دەستی پێكرد كە لەناو شۆرشەوە گەڕابونەوە، زۆربەیانی لیست بەلیست فەرمانی گواستتنەوەو رەوانە كردنیان لە كوردستانەوە بۆ ناوەڕاست و خوارووی عێراق دەردەچوو من یەكێك بووم لە راگوێزراوەكان.

لە قوتابخانەی ئامادەیی حەیی كوڕان لەقەزای حەیی پارێزگای كوت گیرسامەوە، وەكو ماموّستای زمان و ئەدەبی كوردی..

بەڕێوەبەری قوتابخانەكە(حسێن عەبد عەلی) و معاونەكەی(كەریم رهل)بوو بەپێویستی دەزانم، لە سیاسەتی تەعریبی بەعسیان هەڵوێست و دووربینی كەسێكی عەرەب لەو رۆژگارەدا باس بكەم..كە چەند دووربینانە لەو سیاسەتەی دەڕوانی..ئەو كەسەش ماموّستا(كەریم رهل)بوو، ماموّستای زمانی عەرەبی و معاونی بەڕێوەبەری قوتابخانەكەو بەعسی و ئەندامی دەستەی نیقابەی ماموّستایانی قەزای حەی بوو. لە عەشیرەتی عگێلی لە بنەماڵەیەكی ناوداری ناوچەكە بوو، خۆی و بنەماڵەكەیان پەیوەندی دۆستانەیان لەگەل بنەماڵە كوردە

فەیلییەکانی حەییدا هەبوو. کاتێ منو (٣) مامۆستای تری کوردو فەرمانبەرێکی زراعە رەوانەی حەی کراین...یەکەم مامۆستای عەرەب بوو پەیوەندی لەگەڵماندا گەرم کردو میوانداریییەکی باشی کردین لەماڵی خۆیان. حەزی بەتێکەڵاوبوونمان دەکرد، شارەزاییەکی باشی لەسەر کورد هەبوو، بەئاگابوو لەکارەساتەکانی بەسەر کوردا هاتبوو.

ساڵی ١٩٧٦-١٩٧٧کە رژێمی بەعس کەوتە جێبەجێکردنی سیاسەتی تەعریبکردنی کەرکوك‌و خانەقین‌و شوێنەکانی تری کوردستان، بڕیارو فەرمانی بۆ هەموو ئەندامانی حزبی بەعس‌و عەشایەرە عەرەبەکان دەکرد، کە وەکو ئەرکێکی حزبی‌و نەتەوەیی بەدەنگی بڕیارو فەرمانی حزبەکەیانەوە بچن، بۆ ناونووسین کردن‌و خۆئامادە کردنیان لەشوێنەکانی خۆیانەوە بۆ گواستنەوەو نیشتەجێ بوونیان لەناوچەکانی کوردستان، بەمەبەستی پیادەکردنی سیاسەتی تەعریب..هەر چەندە بڕیارەکە نهێنی بوو بەڵام من لەڕێگەی کوردە فەیلی‌و عەرەبە باشەکانەوە، ئاگاداریم لێی هەبوو، ئەوەشم دەزانی بۆ جێبەجێکردنی سەرکەوتنی سیاسەتەکەیان چ ئیمتیازاتێکی لەڕادەبەدەرو سەرنج ڕاکێشیان تەرخان کردوە، وە ئەوەشم دەزانی کەڕۆژانە بەعسییەکان وە عەشایەرەکان ناویان دەنووسن‌و خەریکی کۆکردنەوەی خەڵکن.

رۆژێك مامۆستا کەریم بانگی کردم بۆ ژوورەکەی...بەدەم چا خواردنەوە کەوتینە قسەکردن..وتی کاکە رات چییە بەماڵەوە بچم بۆ(شیمال) وتم شیمال بۆ کوێ؟ وتی با بڵێین کەرکوك..وتم: ئەوە پەیوەندی بەبڕیاری خۆتەوە هەیە..من یەکسەر تێگەیشتم کەباسی ئەو بڕیارە دەکات کە دەرچووە. خۆم واپیشاندا کەلێی بێئاگام، پێم وت تۆ لێرە خانوو دوکان‌و مەسڵەحەتت هەیەو لەناو کەسوکاری خۆتدا دەچیتە ئەوێ بەم وەزیفەیە کە کرێی خانووی لێ بدەیت بڕوا ناکەم بتوانیت بژیت، وەکو منت لێ دێت، وتی: ئەی ئەگەر زەوی‌و پارەی عەقارو دە هەزار دینارو وەزیفەی باشترم بدەنێ‌و ئەوانەشی لێرە هەمە وەکو خۆیان بمێنێتەوەو، خانوەکەشم‌ودوکانەکەشم بدەم بەکرێ؟

وتم: جا ئەگەر وابێت بۆ لێی رادەوەستیت و ناچیت..هەلێکی باشە، بۆت هەڵکەوتووە، مرۆڤ لەژیانیدا کەم هەلی وای بۆ هەڵدەکەوێت، ئەگەر خێزان و خزمان و منداڵەکانت رازین سێ ودووی لێ مەکە...کەرکوکیش پارێزگایەکی خۆش وگەورەیەو، لەسلێمانی وهەولێرەوە نزیکە..پێکەنی و وتی:کاکە دەبێ سجلی نفوسم بگوێزمەوە بۆ ئەوێ، وتم: جا چی تێدایە..ئێمە کە گوێزراوینەتەوە بۆ ئێرە، هەر ئاگاشمان لێ نەبووە! سجلی نفوسمان لەسلێمانییەوە گوێزراوەتەوە بۆ کوت. پێکەنییەوەو، وتی کاکە گاڵتە دەکەی یان بەڕاستە کە دەڵێیت بچۆ؟ وتم: بۆ گاڵتە دەکەم زۆر بەڕاستمە..وتی:چوونەکەم بەمەبەستێکی تایبەتەو من قەناعەتم بەو سیاسەتە نییە..وتم: من ئەوە نازانم ئەگەر چونێکی ئاساییەو خۆت حەزت لێیەتی من لام خراپ نییە.

پێکەنی وتی: کاکە ئەوەی ئێمە وەکو ئەوە وایە ئێستا حکومەت بەفەرمانێ تۆ بخاتە خانوەکەی منەوەو من لەخانووەکە دەربکات. وتم: چۆن..؟ وتی: کاکە کەرکوک خاوەنی خۆی هەیە خاوەنەکەی ئێستا بێدەسەلاتە..وەکو چۆن کەدەتنێرنە خانووەکەی من و من هیچ دەسەلاتێکم بەسەرتا نییە، بەلام هەر چاوم لەخانوەکەمەو چاوەڕوانی رۆژێک دەکەم دەسەلاتم هەبێت لەخانوەکەم دەرت بکەم، کەرکوکیش خاوەنکەی ئێستا دەسەلاتی نییە هەر رۆژێ دەسەلاتی هەبوو هەرکەسێ نێردرابێتە ئەو شارە بەزۆر دەری دەکەن و دوورنییە زۆریشیان نەکوژن. وتم: ئەوەی خانوەکەی تۆو ئەوەی کەرکوک جیاوازە، وتی: بەلای منەوە یەکن، بۆیە ئەوکەسانەی ئێستە رۆژانە خۆیان بۆ کەرکوک و خانەقین و شوێنەکانی تر دەنووسن زۆر هەڵەن و رۆژێک دێت کەزۆر پەشیمان ببنەوەو لەویش بن و لەشوێنەکانی خۆشیان بن..

وا ئەمڕۆ ئەو دووربینیەی ئەو مامۆستا عەرەبە هەیبوو، هاتەدی و رژێمی بەعس رووخێنراو هەموو ئەو ناوچانەی لەژێر دەستەلاتی رژێمدا مابوونەوە رزگار کران..ماڵە عەرەبەکانی خانەقین و دەوروبەری دەرکران و دەبێت ئەوانەشی هاتوونەتە کەرکوک ئەگەر تا ئێستە نەڕۆیشتبن لەپاشە رۆژدا بڕۆن و کەرکوک بەجێ بهێڵن. خۆزگە ئەو عەرەبانەی کە لەو ساڵانەدا بەڕاسپاردەی بەعس و

رژێمەکەی هاتنە سەر زێدی کوردو دەوڵەمەند بوون. وەکو مامۆستا کەریم دووربین دەبوون پێشبینی ئەوەیان بکردایە کە میللەتێك، نەتەوەیەك بەسیاسەتی هەڵەو رەگەزپەرستانە لەناوناچێت..

دە عەرەبە تەعریبکەرەکان دڵگران مەبن..ئەگەر کورد بێتەسەرتان و بەتۆپزی بتان نێرێتەوە بۆ شوێن و زێدی خۆتان، خۆیان لەشوێن و زێدی خۆیان نیشتەجێ ببنەوە، ئەوکاتە هاتن دەبوو ئەمڕۆژەتان لەپێش چاو بوایە..یادت بەخێر مامۆستا کەریم نازانم لەژیاندا ماوی یان بەخەمەکانتەوە سەرت ناوەتەوە.

# لەداستانی قڕگەوە بۆ داستانی بەنی هەریر

کاتێ بوویتە پێشمەرگە گەنجێکی سوورکاری خوێن گەرمی بزێو بوویت یەشتا مووت لێنەهاتبوو، بە بێ ئاگاداری باوکت بڕیاری شاخ و پێشمەرگایەتیتدا.

باوەڕت وابوو، لە تەمەنی تۆدا(گەلەکەت سەرفرازو کوردستان ڕزگارو سەربەخۆ دەبێت)... تۆش بە کەماڵی ئیسراحەت تیایدا دەحەوێیتەوە... چۆن لە چوونە دەرەوەتدا، پەلەت کرد، لە ژیانی پێشمەرگانەشدا هەڵپەو پەلەی زۆرت ئەکرد، حەزت ئەکرد شەوانە یەخە بە دوژمن بگریت و نەیەڵیت بحەوێتەوە.

هاوینی ساڵی ١٩٨٣ بوو دەمێك نەبوو پێشمەرگە بوویت لەگەڵ دەستەیەك پێشمەرگەی جەربەزەی خۆت ئاسادا، بەور ئاسا خۆتان کرد بەناو شاری سلێمانیدا ئەوەی بۆتان دانرابوو ئەنجامتاندا...

لەگەڕانەوەتاندا دوژمن کەمینێکی دوژمن ئاسای بۆ دانابوون، لە قڕگە ڕووبەڕووی هێرش و دەست ڕێژی گوللە بوونەوە... قڕگە بووە گۆمی خوێن شەوەزەنگی گەرمی هاوین ئەوەندەی تر ڕەش بوو... هەمووتان نۆزدە هەڵۆ، نۆزدە پێشمەرگەی بەور ئاسای ئەم کوردستانە بوون... حەڤدەتان خەڵتانی خوێن و مەرگ بوون و داستانی حەڤدە شەهیدی قڕگەتان لە مێژووی گەلەکەتاندا تۆمار کرد. پشتی حەڤدە باوکتان شکاند، جەرگی حەڤدە دایکتان کردە برێشکە، دەنگی شەپوورەتان لە حەڤدە ماڵدا بەرز کردەوە، بەڵام تۆو فەرەیدون بە برینداری گیانتان شەلاڵی خوێن بوو، هەڵۆ ئاسا خۆتان لە ناو ئەو تەنورەی مەرگەدا بەسکە خشێ دەرباز کردو بەدەم ئازاری گوللەو زامی کاریگەری لەشتانەوە خۆتان گەیاندە ناو هێزی پێشمەرگە... بەڵێ ئا ئەو کاتە لە قڕگەدا شەهید نەبوویت...

من ئەو کاتە نەمئەناسیت، بەڵام لێتەوە نزیك بووم چونکە لەیەك سەنگەردا بەربەرەکانێی دوژمنمان ئەکرد، تۆ لەشاخ و من لەشار، خەمی ئەو حەڤدە شەهیدە بۆ ئێمە زۆر قورس و خەمێکی یەکجار گەورەو جگەر بڕ بوو...

دەرچوونی ئێوەش لەو کارەساتەدا بوونە دەرس و هەڤالانی ڕێکخستنمان پێ گۆش ئەکرد...

بەهاری ١٩٩٣ لە مەڵبەندی شارەزوور لەکۆبوونەوەیەکی حیزبیدا باسی هەڤاڵە تێکۆشەرو بەتواناکان کرا... یەکێك لەو هەڤالانەی ناوی هێنراو لێکۆڵینەوەی لەسەر کرا تۆ بوویت و، پێشنیاری ئەوە کرا بکرێیتە لێپرسراوی کۆمیتە.. لە لێکۆڵینەوەی پێشنیارەکەدا هەندێ هەڤاڵ ڕایان وابوو لەجیاتی کاری ڕێکخستن کاری پێشمەرگانەت بۆ دیاری بکرێت.

واتە قسە لەسەر ئەوە نەبوو شایستەی ئەو پلە حیزبیە نەبوویت، بەڵکە قسە لەسەر ئەوە دەکرا کام کار تۆ تیا سەرکەوتووتر ئەبیت، دوای ساڵێك تەشکیلاتی هێزی پێشمەرگە کرایەوەو، لەشکری (پێنجوێن شارباژێر) دروست کرا... لەو لەشکرەدا وەکو فەرماندەیەکی پێشمەرگە شوێنت بۆ دیاری کرا.. ئەو کاتەش من لە ڕێکخستنی هێزی پێشمەرگەدا کارم ئەکرد... لە ئەنجامی هاتوچۆ کردندا یەکمان ناسی...

دوای چەند جار یەکتر بینین و دانیشتن، تێتگەیشتم کە تەنها فەرماندەی پێشمەرگە نیت و بەس، بەڵکە فەرماندەیەکی ڕۆشنبیرو بەتواناو خاوەن بیرو بۆچوونی خۆتی. دەست بۆ نووسین دەبەیت زۆر حەز لە ئەدەب و خوێندنەوەی بەرهەمی ئەدەبی دەکەیت، پەیوەندیەکی توندو تۆڵ لە نێوانماندا دروست بوو. ڕاو بۆچوونمان ئاڵوگۆڕ ئەکرد، بەبێ ئەوەی کەسمان لەیەك بپرسین کێین و کوڕی کێین. لەئەنجامی لێهاتوویت کرایتە فەرماندەی لەشکر، کاتێ ڕووبەڕووی شەڕو نەبەردیەکان دەبوویتەوەبەهیمەتی پۆڵاین و بەگوڕو تواناو تاقەتێکی لە ڕادەبەدەر ڕۆڵی جوامێرانەت ئەبینی و چاوی دوژمنت ئەشکاند.

هەموو جار ئەتووت دوژمنەکان لە کۆڵ بوونەتەوە بەڵام یازوخ و حازر خۆرانی ناو کوردستان نایەڵن بحەوێینەوەو بەری ڕەنجی چەندین ساڵەمان بخۆین. ئازادیەك بەخوێن و ماندووبوونی خەڵك بەدەست هێنراوە بەڕەوای نابینن لە سایەیدا خەڵکەکەمان پشوویەك بدات. پیلانی داگیرکەران و دوژمنان بۆتە بەرنامەی هەندێ لەو لایەنانەو شەڕێکی ناڕەواو خۆکوژیان، بۆ ناوینەتەوە وابزانم یەکەیەکە هەمووومان هەڵئەچنێت بەرهەمی خوێنی شەهیدان و ماندوو بوونی خەڵکەکەمان بەفیڕۆ ئەڕوات.

# لەداستانی قڕگەوە بۆ داستانی بەنی هەریر

کاتێ بوویتە پێشمەرگە گەنجێکی سوورکاری خوێن گەرمی بزێو بوویت یەشتا مووت لێنەهاتبوو، بە بێ ئاگاداری باوکت بڕیاری شاخ و پێشمەرگایەتیتدا.

باوەڕت وابوو، لە تەمەنی تۆدا(گەلەکەت سەرفرازو کوردستان ڕزگارو سەربەخۆ دەبێت)... تۆش بە کەماڵی ئیسراحەت تیایدا دەحەوێیتەوە... چۆن لە چوونە دەرەوەتدا، پەلەت کرد، لە ژیانی پێشمەرگانەشدا هەڵپەو پەلەی زۆرت ئەکرد، حەزت ئەکرد شەوانە یەخە بە دوژمن بگریت ونەیەڵیت بحەوێتەوە. هاوینی ساڵی ١٩٨٣ بوو دەمێك نەبوو پێشمەرگە بوویت لەگەڵ دەستەیەك پێشمەرگەی جەربەزەی خۆت ئاسادا، بەور ئاسا خۆتان کرد بەناو شاری سلێمانیدا ئەوەی بۆتان دانرابوو ئەنجامتاندا...

لەگەڕانەوەتاندا دوژمن کەمینێکی دوژمن ئاسای بۆ دانابوون، لە قڕگە ڕووبەڕووی هێرش و دەست ڕێژی گوللە بوونەوە... قڕگە بووە گۆمی خوێن شەوەزەنگی گەرمی هاوین ئەوەندەی تر ڕەش بوو... هەمووتان نۆزدە هەڵۆ، نۆزدە پێشمەرگەی بەور ئاسای ئەم کوردستانە بوون... حەڤدەتان خەڵتانی خوێن و مەرگ بوون و داستانی حەڤدە شەهیدی قڕگەتان لە مێژووی گەلەکەتاندا تۆمار کرد. پشتی حەڤدە باوکتان شکاند، جەرگی حەڤدە دایکتان کردە برێشکە، دەنگی شەپوورەتان لە حەڤدە ماڵدا بەرز کردەوە، بەڵام تۆو فەرەیدون بە برینداری گیانتان شەلاڵی خوێن بوو، هەڵۆ ئاسا خۆتان لە ناو ئەو تەنورەی مەرگەدا بەسکە خشێ دەرباز کردو بەدەم ئازاری گوللەو زامی کاریگەری لەشتانەوە خۆتان گەیاندە ناو هێزی پێشمەرگە... بەڵێ ئا ئەو کاتە لە قڕگەدا شەهید نەبوویت...

من ئەو کاتە نەمئەناسیت، بەلام لێتەوە نزیك بووم چونکە لەیەك سەنگەردا بەربەرەکانێی دوژمنمان ئەکرد، تۆ لەشاخ و من لەشار، خەمی ئەو حەڤدە شەهیدە بۆ ئێمە زۆر قورس و خەمێکی یەکجار گەورەو جگەر بڕ بوو...

دەرچوونی ئێوەش لەو کارەساتەدا بوونە دەرس و هەڤاڵانی ڕێکخستنمان پێ گۆش ئەکرد...

بەهاری ١٩٩٣ لە مەڵبەندی شارەزوور لەکۆبوونەوەیەکی حیزبیدا باسی هەڤاڵە تێکۆشەرو بەتواناکان کرا... یەکێك لەو هەڤاڵانەی ناوی هێنراو لێکۆڵینەوەی لەسەر کرا تۆ بوویت و، پێشنیاری ئەوە کرا بکرێیتە لێپرسراوی کۆمیتە.. لە لێکۆڵینەوەی پێشنیارەکەدا هەندێ هەڤاڵ ڕایان وابوو لەجیاتی کاری ڕێکخستن کاری پێشمەرگانەت بۆ دیاری بکرێت.

واتە قسە لەسەر ئەوە نەبوو شایستەی ئەو پلە حیزبیە نەبوویت، بەڵکە قسە لەسەر ئەوە دەکرا کام کار تۆ تیا سەرکەوتووتر ئەبیت، دوای ساڵێك تەشکیلاتی هێزی پێشمەرگە کرایەوەو، لەشکری (پێنجوێن شارباژێر) دروست کرا... لەو لەشکرەدا وەکو فەرماندەیەکی پێشمەرگە شوێنت بۆ دیاری کرا.. ئەو کاتەش من لە ڕێکخستنی هێزی پێشمەرگەدا کارم ئەکرد... لە ئەنجامی هاتوچۆ کردندا یەکمان ناسی...

دوای چەند جار یەکتر بینین و دانیشتن، تێتگەیشتم کە تەنها فەرماندەی پێشمەرگە نیت و بەس، بەڵکە فەرماندەیەکی ڕۆشنبیرو بەتواناو خاوەن بیرو بۆچوونی خۆتی. دەست بۆ نووسین دەبەیت زۆر حەز لە ئەدەب و خوێندنەوەی بەرهەمی ئەدەبی دەکەیت، پەیوەندیەکی توندو تۆڵ لە نێوانماندا دروست بوو. ڕاو بۆچوونمان ئاڵوگۆڕ ئەکرد، بەبێ ئەوەی کەسمان لەیەك بپرسین کێین و کوڕی کێین. لەئەنجامی لێهاتوویت کرایتە فەرماندەی لەشکر، کاتێ ڕووبەڕووی شەڕو نەبەردیەکان دەبوویتەوەبەهیمەتی پۆلاین و بەگوڕو تواناو تاقەتێکی لە ڕادەبەدەر ڕۆڵی جوامێرانەت ئەبینی و چاوی دوژمنت ئەشکاند.

هەموو جار ئەتووت دوژمنەکان لە کۆڵ بوونەتەوە بەڵام یازوخ و حازر خۆرانی ناو کوردستان نایەڵن بحەوێینەوەو بەری ڕەنجی چەندین ساڵەمان بخۆین. ئازادیەك بەخوێن و ماندووبوونی خەڵك بەدەست هێنراوە بەرەوای نابینن لە سایەیدا خەڵکەکەمان پشوویەك بدات. پیلانی داگیرکەران و دوژمنان بۆتە بەرنامەی هەندێ لەو لایەنانەو شەڕێکی ناڕەواو خۆکوژیان، بۆ ناوینەتەوە وابزانم یەکەیەکە هەموومان هەڵئەچنێت بەرهەمی خوێنی شەهیدان و ماندوو بوونی خەڵکەکەمان بەفیڕۆ ئەڕوات.

ڕۆژی ۱۱/۱۰/۱۹۹۷ یەکترمان بینیو ئەملاو ئەولای یەکمان ماچ کرد، بۆنو تامی ئەو ڕیشە سوورەت لەگەڵ هەناسەمدا تێکەڵ بووەو دێتو دەچێت.. ئای چەند خۆش بوو هەواڵی سەرکەوتنەکانتم بیست لەبەنی هەریرو دۆڵی ئالانە.

شەهید بوونت هەواڵێکی چەند گورچك بڕبوو، خۆشبوو لەتەمەنتا ڕزگاری کوردستانت بینیو، ئای چەند کارەسات بوو نەیان هێشت لە سایەیدا بحەوێیتەوە..

چوومە لای باوکت وتی: کە سەریان بۆ هەڵدامەوە تێر ڕیشە سوورەکەیم ماچ کردو، چاوم تێبڕی ڕەنگە سوورە جوانەکەی وەكو لیمۆی لێهاتبوو، ڕیشی سووری ڕەنگی لیمۆیی نیشانەی شەهیدی بە باوکت بەخشی بوو، باوکت ئەیووت سەربەرزم مادام لە پێناوی گەلو خەڵکەکەیدا گیانی بەخشیوە.

ڕیشە گیان.. هاوینی (۸۳) لەداستانی قڕگەدا شەهید نەبوویتو لە پایزی (۹۷)دا لە داستانی بەنی هەریردا بەفڕۆکەی داگیرکەران لەسەنگەری بەرگریدا شەهیدیان کردیت، دوای چواردەساڵ لە داستانی بەنی هەریرەوە گەیشتیتەوە بە داستانی شەهیدانی قڕگە.

## ((تەنها..بەراوردەوهیچیتر...))

فامی کردەوە. بەسەر ئەو هەموو(گوێزو بادام ومێووژەدا(عەشقی)خورمای ترشاوی ئەوخوارەبوو...خرایە قوتابخانە. لەجیاتی ئەوەی بەدەوری مامۆستاکانیابێت و، بچێ،(عەشقی)ئامیر مەخفەرە رەشە لچ ئەستوورەکەبوو.. خوێندنی سەرەتایی تەواوکردو لە(شار)چووە پۆلی یەکی ناوەندی..کەبینی مامۆستای ئامیر مەخفەر ئاسا، لەناو شاردا زۆرە..وشەیەکی(ئوستازی) بەهەمو مامۆستاکانی نە ئەگۆڕییەوە...ئامادەیی تەواوکرد، گەیشتە پایتەخت و بەهۆی براکەی کە(یاوەری)یەکێك بوو لەسەرانی رژێم. لەدانشگاو لەو بەشەی خۆی ئەیویست وەرگیرا.. لەپایتەختەوە تفی لە(شاخ و لوتکەو بەفرە)کرد. لە(کەر گەوزەکەی بەعسیاندا) کەوتە(خۆ گەوزاندن).کولیەی تەواوکرد..خزمەتی سەربازی بە ئەرکی پیرۆز ئەزانی..هاوەڵەکانی لە شەبەقەوە تا ئێوارە(حەسیر مەیدانیان)پێ ئەکردن..ئەویش لەجیاتی(مەشقی پیرۆز) کرایە مامۆستای(قوتابی یەکانی دەزگای ئیستخبارات)....لەرەوی ساڵی(١٩٧٤)ی خەڵکی کوردستاندا بۆ ناوشاخ و دۆڵەکان..ئەوخەڵکەی بەگێل وگەلحۆ ئەزانی..

کاتێ کارەساتی هەرەسی(١٩٧٥) دوژمن شایلۆغانی زاڵ بوونی لەسەر دڵی جەماوەری ستەمدیدەدا ئەگێڕا، ئەو بەسەرکەوتنی ئەڵقە لەگوێیەتی خۆی ئەزانێ...لەگەڵ تەراتێنی دوژمن لەکوردستاندا ئەکەوتە کۆکردنەوەی ئیمزاو پەنجەمۆر، لەسەر یاداشت بۆ گۆڕینی خوێندنی قوتابخانەکان بۆسەر(زمانی ئوستازەکانی)ئەوو کەسانیتری وەك ئەو خەڵکی ساویلکەیان لەخشتە ئەبردو کۆئەکردەوە، هاواری یان ئەکردو ئەیان وت:

(دارگوێزو داربەروی شاخەکان بەعسین).

ساڵی(١٩٧٦) کەبڵیسەی شۆڕش بەرزبۆوە، ناوچەکەیان پڕبوو لەپێشمەرگە..ئەو ئەوکاتە ژیانی بەوەگەشەی ئەکرد. کە هەفتانە راپۆرت لەسەر پێشمەرگەو جم و جۆڵیان بنوسێت و، بۆ(ئوستازەکان)ی بەرزکاتەوە.

خەڵکانی تریش..بەپێچەوانەی ئەو، لەمندالییەوە(شەیدای) وشەو خوێندن‌و شیعرو ئەدەبی کوردی بوون، خەویان بەفلیم‌و ئەفلام کارتۆنی کوردییەوە ئەبینی. لەپێناوی ئامانجەکانیدا بەشانازییەوە هەوڵی ئەدا. تالاّونۆشین‌و ئەشکەنجەو دەردی سەری بەسەر بەرزی ئەزانی...

ئەویان...ژیانی خۆی بۆسەرفرازی گەل‌ونیشتمانی تەرخان کردبوو..سەنگەری ململانێی چۆڵ نەکردو کۆڵی‌نەدا.. لەشار بۆشاخ، لەشاخەوە بۆشار...لەشارەوە بۆ کونی رەشی ئەمن‌و ئیستخبارات‌و سزاوئەشکەنجەی فاشییەکان..بۆ بەردەمی دادگاو توندکردنی لەزیندانی رەشی بەعسیان..بۆ لەناوچوون‌و بەرێکەوت دەرباز بوون..ئەویتریان..بەناو ئەدیب‌و نووسەرو رۆژنامەنووس..سەردەمی بەعس ئامادە نەبوو قەڵەمەکەی نووچ بدات..قیرسچمە بوو نەبووە شایەرو بەشان‌و باڵی دکتاتۆریا هەڵ نەدا..لەبەر ئەوە لای(ئوستازەکانی ئەو.)

کەسێکی دزیوەو نەفرەت لێکراوبوو.

ئەوی تریان..بەرێوەبەری قوتابخانەبوو..لە بەرتەمەنی خزمەتی..داوایان لێ کرد سیاسەتی بەعس جێبەجێ بکات نەیکرد...سیاسەتەکەی بەرەوانەزانی ملی بەفەرمانیان نەدا...هەر زوو بەزوو بەنووکە قەڵەمێکی رەش لەبەرێوەبەری دەرکرا...وتی چش خۆسەربەرزم..

ساڵی(٩٩٢) وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی فیدراڵی کوردستان دەرگای بۆ موقابەلەی(موشرفی ئیختصاصی‌و موشرف تەربەوی) کردەوە..رۆژی دیاری کراو کە چووینە دیوانی وەزارەت کە سەرنجمان دا(کاکی ئوستازی...) یەکێك بوو لەوانەی لەلایەن بەرێوەبەرێتی پەروەردەوە هەڵبژێردراوە بۆ ئەوکارە نوێیە..سەیرە چۆن لە سەردەمی بەعسدا سەری بەهەموو کونێکا ئەکرد، بۆ ئەوەی دەمی چەوربکات وا ئێستاش هەڵپەی خۆیکردووەو، لەبەردەمماندا قووت بۆتەوە..

کاتێ چاوم وردکردەوە هەر ئەونەبوو لەو بابەتەی ئەوی زۆرتیادا بوو ئێمە لای خۆمانەوە ئەمان وت:

(ئەوانە لەهاتنەکەیانداتەنها ماندو بوونەکەیان پێ ئەبرێ)وەزارەتی پەروەردە هەرگیز ئەوجۆرەکەسانە ناکاتە(موشرف...) ئەگەر ئەمانە بکەنە موشرف ئەی

موشـرفەکانی تـر بـۆ ئـەگۆرن...؟(موقابەلـە..) کـراین و گەڕاینـەوە...دوای چـەند ڕۆژێ لیسـتی نـاوی موشـرفەکان هاتـەوە...بـەقودرەتی وەزەرەت، نـاوی ئەو(سێیەمین)ناو بوو.. ئەوانەی تری تێدا نەبوو.

دیارە لەو موقابەلە گەورەوهەمەلایەنەی بەردەم لیژنەکەدا، کاری کراوئەوانە وەرگیران و، نەئێمـە دەنـگ و نـە ئـەوان دەنـگ. ئـەوانیش بوونـە موشـرفی ئـەمرۆ داهاتووی پەروەردەی قوربەسەری حکومەتی فیدراڵی کوردستان.

# جیاوازی لەنێوان هێزی مەشق دیدەو نەدیدەدا چییە؟

مەشق واتا پەروەردە کردن، راهێنان،فێرکردن، شارەزاکردن. هەموو هێزێکی چەکدار(سوپای نیزامی-لەشکری میلیشیات)پێویستی بە پرۆسەی مەشق کردن هەیە. دووبارە ئەو مەشقەش لەسوپایەکەوە بۆ سوپایەکی ترو، لەولاتێکەوە بۆ ولاتێکی تر دەگۆڕێت. هەموو سوپایەکی نیزامی کەدروست ئەبێ، لەمەیدانی مەشقەوە کە سەربازەکانی لەتشکیلەدا دادەمەزرێت.. لەیەکەم رۆژی پەیوەندی کردن بەسوپاوە خۆی لەتەشکیلەی نیزامیدا دەبینێتەوە، هەر لەمەیدانی مەشقدا رادەهێنرێت و فێردەکرێت و پەروەردە دەکرێت، هەر لەومەیدانەوە سنفەکان جیا دەکرێنەوە. شارەزابوون و فێربوونی چەکەکان بەهەموو جۆرەکانیەوە لەمەیدانی مەشقداو لەمەیدانی مەشقدا دەبێت.

لەگەڵ هەموو سوپایەکی نیزامیدا هێزی چەکدار هەیە کە هەرولاتەو هەر لایەنە بەناوێك ناوی دەبات و بەگشتی پێیان دەوترێت (میلیشیات) واتە(هێزە غەیرە نیزامیەکان)، ئەم هێزانە هەریەکەیان بەهۆی جۆراو جۆرەوە دروست دەبێت، تەشکیلاتیان سابت نییە. بەبەردەوامی لەئاڵوگۆڕدایە، کەمتر خۆیان بەمەسەلەی مەشق و ئیلتیزاماتی عەسکەریەوە دەبەستن، دیارە ئەو هێزانە دەچنە مەیدانی مەشق و ئارەقی مەشق دەرێژن، شارەزاوبەتوانا دەبن. خۆراگر دەبن. زیاتر بەرگەی برسێتی وتینوێتی وماندوبوون و رۆیشتن وشەونخونی و گوێرایەڵی دەبن، بەپێی فەرمانی فەرماندە جموجوڵ دەکات چ بۆ هێرش و پەلاماردان چ بۆ وەستان و کشانەوەو پارێزگاری.

بۆیە ئەو هێزەی کە بە بەردەوامی مەشق دەکات و مەیدانی مەشق چۆڵ ناکات هێزێکی بەهەڵمەت و دەست وەشێن و کارامە دەبێت، لەکاتی شەڕو هێرش بردنداو سەرکەوتن مسۆگەر دەکات، پاریزگاری لەخۆی و لەدەست کەوتەکانی و ئەوسنوورەی بۆی دانراوە، دەکات و دەیپارێزێت بەپێچەوانەوە ئەو هێزانەی پشت لەمەشق وفێر بوون و پەروەردەکردن و فێربوون دەکات، هێزیکی بەرەڵاو و بێ سەروبەرو دەبێت و، لەکاتی شەڕدا لەهەر قۆڵێکەوە بەرێکەوت سەرکەوتنیش بەدەست بهێنێت کاتێ دەبینین و ئەو کارو ئەرکەی بۆی دیاریکراوە، پێی

سـپێراوە ناتوانێـت وەك پێویسـت جێبـەجێی بکـاتو پارێزگـاری لـەخۆیو دەسـکەوتە نەتەوەیی ونیشـتمانیەکان بکـات، بۆیـە دەبینیـت هێـزە نیزامیـەکان بەگران هەڵدەوەشێتەوەو هێزە غەیرە نیزامیەکان زوو زوو هەڵدەوەشێنو پـەرتو بڵاودەبنـەوە. بـەکورتی مەشـق ئەوەنـدە گرنگـە وەك دەڵـێن چـەندی لەمەیـدانی مەشقکردندا ئارەقەبڕێژیت ئەوەندە لەمەیدانی شەڕدا خوێن کەمتر دەڕێژێت.

# چۆن هێزی پێشمەرگە تۆکمەتر ئەکەین..؟

هێزی پێشمەرگەی کوردوستان، ئەو هێزە بەورە ئاسایەیە کەچەندین ساڵە بەگیانبازیوبەوپەری لەخۆبردووییەوە جوامێرانەرووبەڕووی داگیرکەران بۆتەوە، شێلگیرانە پەلامار لەسەرپەلاماریان بۆسەر سووپاودامودەزگاکانی رژێمەیەك لەدوایەکەکانی داگیرکەران داوە، زەبری کوشندەوکاریگەریان پێ گەیاندوە، ئەم هیزە چەندێ لەروی چەندایەیتەوە کەمبوون و لەرووی جۆنایەتیەوە بەهەرەکەت و گورزوەشێنبووە، ئەم هێزە بەپێی قۆناغ و بارودۆخی شۆڕشی گەلی کورد هەردەم لەگۆڕانکاریدا بووە، نەك تەنها لەرووی جەندایەتی و چۆنایەتیەوە، بەڵکە لەرووی تەشکیلات و دابەشکردنیشەوەو بەلاّم لە هەموو گۆڕانکاری قۆناغەکاندا هێزێکی بەرگریوهەڵمەتبەرو کۆڵنەدەر بووە....ئەم هێزە لەهەموو روویەکی فیکریو هەڵسوکەوت و رەفتاری لەسوپای داگیرکەر جیاواز بووە. سوپای داگیرکەر هێزێکی قێزەون و ئابڕوبەرو دڕندەوسەرکوتکەرو وێران کەر بووە، بەپێی پەروەردەی سیاسیانەی رژێمەکانیان پەروەردەکراون، کوێرانە سیاسەتی دڕندانەو فاشیانەی رژێمەکانیان جێبەجێکردوە، هەڵگری بیروباوەڕی نیشتمانی و نەتەوەیی نەبوون. بۆیە دەبینین چوبێتە سەر هەرناوچەو شوێنێك شوێنەواری خراپ و پڕکارەکاستیان بەجێ هێشتووە.

بەپێچەوانەوە هێزی پێشمەرگە هێزی خاوەن باوەڕو چەکدارێکی شۆڕشگێڕو سیاسیەکی شۆڕشگێڕو، خۆنەویست و گیانبازێکی بێوێنەی بیروباوەڕی نیشتمانی و کوردایەتی بووە. لەپێناوی مافی گەلەکەیدا بەسۆزانەو خۆنەویستانە ساڵەهای ساڵ جەنگاوەرو، رێزەکانی لێك نەترازاوەو لەناو کۆمەلانی خەڵکدا هێزی خۆشەویست بووە. پارێزەی گەل ونیشتمانیان لەبەرنامەدا داناوەو سەرکەوتنی ئەو هێزە بە سەرکەوتنی گەلی کوردو مافەکە رەواکانی نراوە. ئەو هێزە چەندین جار توشی شکست و گەلان بووەو بەمۆدێرترین چەك و تەکنەلۆژیای عەسکەری لێی دراوەو شالاّوی براوەتە سەر،

بەڵام سەربەرزانە لەو هەموو قەیران و بارە ئاڵۆزە قوتاربووەو، هەربە پارێزگاری گەل و نیشتمان ماوەتەوە.

ئەم هێزە..هەر چەندە ئێستا هێزێکی تۆکمەیەو بەپێی پەیڕەوی ناوخۆی هێزی پێشمەرگەو تەشکیلاتی بۆ کراوەو ڕۆژانەو مانگانە لەفەرماندەی گشتییەوە، چاودێری ئەکرێن و پاکسازی تیادا ئەکرێت، بەڵام لەگەل ئەوەشدا ئەگەر بمانەوێت ئەم هێزە تۆکمەتر بێت دەبێت رەچاوی ئەم خاڵانە بکرێت:

*مەشق بکرێتە بنەمایەکی سەرەکی بۆ پێگەیاندن و پەروەردەکردن.

*تەشکیلەی هێزەکان لەسەر پەیرەوی ناوخۆی پێشمەرگە پیادەبکرێت و تاوایلێبێت ببێتە دەستوور بۆسەقامگیر بوونی هێزەکە.

*دەورەی بەردەوام بۆ فەرماندەکان بکرێتەوەو لەو دەورانە هونەری فەرماندەیی و شەڕوخۆپاراستن هەڵمەت بردن فێربکرێن.

*پاکسازی بەردەوام لەناوهێزی پێشمەرگەدا بکرێت کەم ئەندام، پیروپککەوتەو منداڵ و نەخۆش لەهێزەکە بژار بکرێت.

*موحازەراتی بەردەوام بدرێتە پێشمەرگە لەبارەی:

-مێژووی کورد وشۆڕشەکانی

-مێژووی شۆڕشەکانی گەلانی دنیا.

-گۆڕانکارییەکانی دنیا ودەوروبەر

-مێژووی حزبەکان و بەراووردکردنی لەگەڵ مێژووی(ی.ن.ك)و دەرخستنی رۆڵی سەربەرزانەی یەکێتی لەروی سیاسی و ناوچەیی و پێشمەرگایەتیەوە.

-جوگرافیای کوردستان

*لەهەر فەرماندەییەك، لەشکرێکی تایبەتی هەبێت، کە ئەو لەشکرە تایبەتە هەر هێزەی لەشکرێك بێت و پێکهاتنی پێشمەرگەی کارامەو ئازاو بەتاقەت و خاوەن ئەزموون و راهاتوو، چاکتروایە ئەو لەشکەرە تایبەتە بایەخی تایبەت و مەشقی تایبەت و ئیلتیزامی تایبەتیان هەبێت.

*پێویستە هەر فەرماندەیەك هێزێکی پشتیوانی پڕچەکی هەبێت. لە پێشمەرگەی شارەزاو خاوەن ئەزموون و لێزان لەچەکە قورسەکان

*ئەگەر بکرێت پێویستەو چاکتروایە هەموو هێزێك بیکەیسی ودۆشکەو ئاربیجی هەبێت.

*هەوڵ بدرێت کە هەموو پێشمەرگەیەك چەك و تاقمی پێویستی تەواوی پێشمەرگانەی بۆ دابین بکرێت.

*پێویستە پێشمەرگە فێربکرێت و رابهێنرێت کەبایەخ بەپاککردنەوەو پارێزگاری چەکەکەی بدات. ئەگەر کەموکوڕی هەبوو ئاگاداری فەرماندەکەی بکات تابۆی بگۆڕێت و یان کەموکوڕیەکەی بۆچاك بکەنەوە.

*پێویستە پێشمەرگە فێری نزام بکرێت، دەوامی بەنزام بێت و ئیجازەو رۆیشتنی بەنیزام بێت، دیارە. بەلاموبالاتی و خۆدزینەوە پێشمەرگایەتی ناکرێت.

*ئەوکەسانەی کاروکاسپی تر ئەکەن و ناتوانن بەتەواوی خۆیان تەرخان بکەن بۆ پێشمەرگایەتی دوورخرێنەوەو یان نەکرێنە پێشمەرگە چونکە کورد ئەڵێیت دوو گوندۆرە بەدەستی هەڵناگرێت.

*ئاماری راستی هێزی پێشمەرگە یەکێکە لەبنەماسەرەکیە گرنگە کانی هێزی پێشمەرگە، بۆ هەموو حاڵەتێکی شەروئاشتی بۆیە دەبێت ئامارو سەرژمێری بدرێتە فەرماندەی گشتی.

*پێویستە فەرماندەیی بەبەردەوامی لەسەردان و چاودێری هێزی پێشمەرگە دابێت، کەموکوڕیەکان بۆبدۆزرێتەوە چارەسەریان کات و پرسینەوەو سزادان و رێنمای بەردەوام هەبێت.

*پێویستە کۆبوونەوەی بەردەوامی فەرماندەیی فەرماندەییەکان لەفەرماندەی گشتی بکرێت.

*هۆشیاری و پەروەردەکردنی پێشمەرگە لەرووی سیاسی و تیوریەوە لەئەستۆی رێبەرەسیاسیەکانە، بۆیە پێویستە بایەخی تەواو بدرێتە رێبەرە سیاسیەکان و، بۆ ئەوەی بەبەردەوامی کاری سیاسی خۆیان بکەن، بەپێی بەرنامەی مانگانە کۆبوونەوە بەهێزەکان بکەن.

*ئیدارە بەشێکی گرنگە بۆ راپەراندنی ئیش وکارو پێداویستی پێشمەرگە. بۆیە دەبێت ئیدارەی هێزی پێشمەرگە ئیدارەی بەهێزو بەتوانا و شارەزاو گورج و گۆڵ بێت. نەیەڵێت کەموکوڕی ئیداری بەهێزی پێشمەرگەوە دیاربێت.

*دەبێت پێشمەرگە رابهێنریت لەسەر پاراستنی کەلوپەلی بنکەو بارەگانیان، دەست بەخواردنو تەقەمەنییەوە بگرن چەکەکانیان نەفرۆشنو نەگۆڕنەوە جامبازی بەسەیارەی شۆڕشەوە نەکەن.

*زۆرکەس لەناوچەجیاجیاکان حەزدەکەن پێشمەرگەبنو پەیوەندیان بەهێزی پێشمەرگەوە هەبێت، بەلام باری ژیانو رێکەوتی کۆمەلایەتی مۆلەتیان نادات، کە راستەوراست ببنە پێشمەرگەو بەفعلی لەناو ئەم هێزە خۆیان ببیننەوە، بۆیە بەرای من باشتر وایە ئەو جۆرە کەسانە دەستیان لێ بەرنەدرێتو رێکبخرێن، نەك لەناو هێزە کاراکەی پێشمەرگەدا، بەلکە بەجیا وەکو هێزێکی پشتیوان لەهەرناوچەیەك تەشکیلاتی هێزیان بۆ دروست بکرێت..لەمالی خۆیان بن هەر کاتێ هێزی پیشمەرگە کەوتە شەرو بەربەرەکانییەوە، ئەو هێزانەش ئاگادار بکرێنەوە. کاریان پێ بسپێردرێت بەمەرجێ ئەو ماوەیەی کاریان دەخرێتە ئەستۆ هەموو مەسرەفێکی هێزەکەیان بکێشرێتو، یارمەتی تایبەتیان بدرێت لەرووی چەكو تەقەمەنیو مووچەو ئازوقەو کەلوپەلی تری پێویستەوە، ئەم جۆرە هێزەو بەم شێوە کارناکەنە سەر ئاماری فعلی.هێزی پێشمەرگەو، ئەو مەسرەفە لەرادە بەدەرەش سەرف ناکرێت، کە بەداخەوە ئێستا دەتوانم بلێم لەزۆر ناوچە هێزی لەوبابەتانە زۆرە کەلەسەر مالو کێلکەی خۆیان دانیشتوانو خەریکی کاروکاسپی خۆیانو لەهەمان کاتیشدا بەناو پێشمەرگەن.

*پێشمەرگە دەبێت واپەروەردەبکرێت، ئەو کاتانەی کەواجبی بەردەوامیان نییەو حەوانەوەن. بەپێی بەرنامەیەکی مانگانە جەولەی دێهاتەکانی سنوورەکەیان بکەنو، خەلکی گوندەکان بەسەربکەنەوە کە ئەم جۆرە جەولەوسەردانانە کاری راستەوخۆی لەسەر هێزی پێشمەرگە هەیە. لەبنکەو بارەگاکان دوور ئەکەونەوە، خەلکی گوندەکان بەسەر ئەکەنەوەو پەیوەندی لەنێوان گوندەنشینەکانوپێشمەرگەدا پەیدا ئەبێت، دەتوانن گوێ لەکێشەو گرفتەکانیان بگرنو ئەوەی بۆیان چارەسەرکرا بیکەنو ئەوەشی نەکرا بەرزی بکەنەوە، جەولەو رۆیشتنی پێشمەرگە لەتەمەلیو دوورئەخاتەوە، شارەزایی تەواو لەناوچەکەیدا پەیدا ئەکات، لەرووی جوگرافیی جیپۆلەتییەوە، کاتی سەردانی گوندەکان دەتوانن کۆبونەوە بەخەلکی گوندەکان بکەنو ئەمجۆرە کۆبوونەوانەش گەشە بەرێکخستن ئەدات.

*کاتێ پێشمەرگە لەبارەگاکەی دادەنیشێت و کارێکی ئەوتۆی پێشمەرگانەی نییە باشتروایە رۆژانە بەیانیان زوو فەرماندەکەیان بۆماوەی بەلای کەمەوە دووسەعات مەشق و وەرزشیان پێ بکات. و لەکاتی هاوین و پایزدا کەم و کوڕی بنکەو بارەگاکانیان پێ چاك بکاتەوەو ژووروشوێنی پێویست بۆ هێزەکەیان دروست بکەن.

*مەسەلەی مۆڵەت و مانەوەو لەشوێن و بارەگاکان. ئەم دیاردەیە دیاردەیەکی خراپە. کە پێشمەرگە لەخۆڕاو بەبی پرس بنکەو بارەگاکەی بەجێ دەهێڵێت و دەڕۆن، باشتروایە کە یاسایەك بۆ مۆڵەتی پێشمەرگە دابڕێژرێت بەپێی ئەویاسایە مۆڵەت بدرێت. بە داخەوە ناچارین بڵێین زۆر شوێن سەیتەرەو رەبایەمان هەیە کە پێویست ئەکات ژمارەیەکی دیاری کراوی پێشمەرگەی لێبێت، بەڵام کە سەردانی ئەکەیت و سەیر ئەکەین ئەوشوێنە چەند پێشمەرگەیەکی لێیە کە لە ئاستی پێویستدا نین.

*هێزی پێشمەرگە هێزێکی زیندوە دەبێت ئەم هێزە گەشە بکات، پێش بکەوێت زیادبکات، لەچەندایەتی و چۆنایەتیەوە گۆڕانکاری بەسەردابێت. خەڵکی تازەو توخمی نوێی بچێتە ناوەوە، چونکە وەك وتمان ئەم هێزە زیندووە، واتە وەك چۆن کەسێکی زیندوو، پێویستی بەخوێنی تازەی هەمە جۆرهەیە، بۆ ئەوەی گەشە بکات. .ئێمە ئیعتماد هەر لەسەر پێشمەرگە کۆن ودێرینەکان بکەین و رێگانەدەین پێشمەرگەی نوێ، خەڵکی نوێ، ببێتە پێشمەرگە، ئەوە بەدڵنیاییەوە هێزەکە بەرەو پووکانەوەو، لەدوارۆژێکی نزیکدا، بەرەو نەمان دەچێت، من ناڵێم پێشمەرگەی کۆن خەڵکی ماندوو خەباتکەرو، شۆڕشگێر پشتگوێبخرێت و وازیان لێ بهێنرێت، بەپێچەوانەوە پێشمەرگە کۆن و خاوەن ئەزموونەکان بکەینە هەوێنی سەقامگیربوونی هێزەکان بەتایبەتی. ئەوانەی تواناو تاقەتی پێشمەرگایەتیان ماوە، بەڵام لەدنیادا دەستووری ژیان و یاسای کارکردن بۆ مرۆڤ لە تەمەنێکی دیاریکراودان، ئەو مرۆڤەی لەتەمەنی ١٨ساڵی و تا ٢٥ ساڵی ئەو تاقەت وتوانایەی هەیەتی جیاوازی هەیە لەو مرۆڤەی کە لەتەمەنی ٢٥ ساڵی تا ٣٥ ساڵی و هەروەها توانای ٣٥بۆ٤٥،٥٠ تا٦٠وزەی جموجۆڵی جیاوازە ئێمە پێزیستە زۆر بەی هێزەکەمان لە تەمەنی ١٨وە بۆ ٤٥ ساڵ بێت.

ئەم هێزە هەرچەندە هەمووکاتێ هێزێکی نابەرامبەر بووە لەگەڵ هێزەکانی دوژمندا، لەرووی چەك و ئیمکانیاتی سەربازیەوە، بەڵام لەرووی باوەڕورەفتارو هەڵسوکەوتیەوە هێزێکی جیاواز بووە لەهێزەکانی داگیرکەر. هێزێکی چەکداری خاوەن بیروباوەڕی نەتەوەیی و نیشتمانی و شۆڕشگێڕی سیاسی حەق پەرست بووە، لەپێناوی مەسەلەیەکی رەوادا سەربەرزانە جەنگاوە. کە مەسەلەی گەلەکەیەتی. ئەو گەلەی کە لە هەموو مافێکی ژیانی سەردەم بێ بەشەو دووچاری سیاسەتی شۆفێنیانەی داگیرکەران بووە، بەناڕەواو زۆر درندانەو بەزەبرو زەنگ دەیانەوێت لەناوی بەرن. ئەم هێزە لەپێناوی گەلە ستەم دیدەکەیدا بەسۆزانەو خۆنەویستانە ساڵەهای ساڵە دەجەنگێ و، ریزەکانی لێکنەترازاوە، لەناو کۆمەلانی خەڵکی کوردستاندا خۆشەویستەو تاقە هێزی دەزانن بۆ مسۆگەر کردنی مافەکانیان. سەرکەوتنی و بەهێزبوونی بەسەرکەوتنی گەلەکەمان مافەرەواکانی زانراوە هەر چەند زۆر جار تووشی کارەسات و شکست و هەڵدێربووە چ بەهۆی بەدەسەڵاتی و بەهێزی سوپای داگیرکەران و گەلەکوژمەکیی رژێمە دوژمنەکان، چ بەهۆی نەزانی و بێ دەسەڵاتی سەرکردەکانەوە وەیان بەنوێترین و مۆدێرترین چەکی سەردەم و تەکنەلۆجیای سەربازی لێ دراوە شالاوی براوەتە سەر بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لەو قەیرانەو بارە ئاڵۆزانە قوتار بووەو، هەربە پارێزەری گەل ونیشتمان ماوەتەوە.

هێزی پێشمەرگە..لە مێژووی دروستبوونییەوە تا ئەمڕۆ، ئەوەندە داستانی قارەمانانە وبێوێنەی لەمێژووی گەلەکەیدا تۆمار کردووە، کە لەژمارە نایەن و داستان لەداستان گەورەترو کوشندە تربووە، ئەوەندە رۆڵەی بەجەرگی پەروەردەوپێگەیاندووە، کە لەمێژووی گەلاندا بەدەگمەن هەیە شان لەشانیان بدەن. گیڤارا جەنگاوەر بووە، بەڵام ئەگەر براووردی ئەو پڵنگانەی ناو هێزی پێشمەرگە بکرێت، هەرگیزاوهەرگیز بەبالای کورتی یەك جەنگاوەری پێشمەرگەی کوردستان ناگات، ئەم هێزە هەرچەندە ئێستا هێزێکی تۆکمەیەو، بەپێی پەیڕەوی ناوخۆی هێزی پێشمەرگە پێکهاتووە، رۆژانەو هەفتانەو مانگانە هەڤاڵی بەڕێز مام جەلال وەك فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، رێنوێنی و سەرپەرشتی دەکات، جێگری فەرماندەیی گشتی و فەرماندەیی گشتی و مەڵبەندی پێشمەرگە بەبەردەوامی چاودێری و رێنمایی دەکەن و

پاكسازی تیادا دەكەن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر بمانەوێت ئەم هێزە زیاترو باشتر تۆكمەتر بكەین دەبێت رەچاوی ئەم خاڵانەبكرێت.

١. هێزە كەلەهیچ روویەكەوە، كەلەپێشەوە باسی‌مانكرد پشتگوێ نەخرێت

٢. ئیمكانیاتی تەواوی بۆ تەرخان بكرێت

٣. بایەخ بەپێشمەرگە گەنج و بەتواناكانمان بدەین و بەباشی پەروەردەیان بكەن.

٤. پێشمەرگە خاوەن ئەزموونەكان بكەن یەهەوێنی پتەوكردنی هێزەكە.

٥. هەر پێشمەرگەیەك رووبەڕووی كێشەو نەخۆشی بۆوە بەزوییی بەدەنگیەوە بچن و یارمەتی بدرێت.

٦. ژیانی پێشمەرگە بەتەواوی باشبكرێت

٧. لەرووی سیاسی و نەتەوەیی و نیشتمانییەوە ئاستیان بەرزبكرێتەوە.

٨. مەشقی بەردەوامیان لەسەر هەموو جۆرەكانی چەك پێبكرێت.

# ( خەباتی ژن )

لەو سەردەمەوەی ململانێ لەنێوان چین وتوێژەکانی کۆمەڵدا خەستبۆتەوە لەپێناوی ئازادی و سەرفرازی مرۆڤ لە کۆت وبەندی ستەمی زۆردارانی دژی چەوساندنەوەی چینایەتی و نەتەوایەتی. ژن لەلایەك وەك نیوەی کۆمەڵ و دایکی نیوەکەی تری رۆڵی دیارو بەرچاویان هەبووە، بەمەبەستی رزگاربوون لەکۆتی قورسی سەپێنراو بەسەر ژنانداو، ئاسوودەیی لەژیانی چینایەتی سەربەستیە دیموکراتیەکان، ئەگەر چاوێك بەمێژووی دوورونزیکی گەلاندا بگێرینەوە، بێگومان چەندین کەڵەژنی شۆڕشگێڕو خەباتکەر لەبزووتنەوەی رزگاری خوازی گەلاندا دێتە پێش چاو، لەدنیای شارستانی، جەنگ و داهێنان و بەرگریدا. کە مێژوویەکی پرشنگداریان بۆ خۆیان تۆمار کردووە. مرۆڤایەتی هەرگیز ناتوانێت لەبیریان بکات.

لەورۆژەوەی کوردستان دابەش و داگیر کراوەو گەلەکەی کراوەتە سووتەمەنی سیاسەتی شۆڤێنیانەی دوژمنە داگیرکەرەکان و، لە هەموومافێکی فەرهەنگی و مێژووی و زمان و نەتەوەیی بێ بەری کراو بزووتنەوەی نەتەوەیی و رزگاریخوازی گەلی کورد بەرێبازی کوردایەتیدا شۆڕشگێڕانە رووبەرووی داگیرکەران بۆتەوە. بە بەردەوامی خەباتی کردووە.

ژنی کوردیش شان بەشانی پیاوان بەوپەڕی سەربەرزیەوە هاوبەشیان کردوە، جێگای دیاری خۆیان بینیوە، ئەگەر بە مێژووی بزوتنەوەی گەلی کوردا بچینەوە. بەدەیان شاژن لە مەیدانەکەدا دەبینین، کە لەپێناوی مافی ژنان و مافی زەوتکراوی نەتەوەکەیاندا خەباتی بێووچانیان کردووە. قەدەمخێروحەپسەخانی نەقیب ئەگەر نموونەیەکی سەردەمی خۆیان بووبن. وە لەشۆڕشی ئەیلوولدا شەهید لەیلا قاسم نموونەی کچی بەرسێدارەبوو، لەشۆڕشی نوێی گەلەکەشماندایە ئامینەو مامۆستا سروەو مامۆستا نەسرین وخوشکەعەتیە.

نموونەی فیداکاری و گیانبەخشینبوون و لەگەڵ ئەمانیشدا. ژنان بێ سڵەمینەوە. هاوبەشی خەباتی سەختی گەلەکەیان کردووە، هەر

لەرێکخستنەکانی ناوشارەوە تادەوری ژنانی گوندەکان، لە هاوکاریی و یارمەتی دانـی مـەفره زه سـەرەتاییەکان و بەشـداری بەرچـاویان لەراپەڕینـەکان و بەرەنگاربوونـەوەو، پەیوەنـدی کـردن بـەریزەکانی شۆڕشـەوەو، ناکرێـت هـەرگیز ناتوانرێـت رۆڵـی ئـەو دایـك و خوشـکە سـەر بەرزانـە لـەیادبکرێت، کـە لەئـەنجامی شاڵاوی رۆژانەی دوژمندا کەدەکرایە سەریان لەشارو شارۆچکەکان، یان لەسـەر کـوڕوبراو هاوسـەرەکانیان بەنـدەکران و. ئـازارو ئەشـکەنجە دەدران و رەفتـاری نامرۆڤانـەو دوژمانـەیان لەگەڵـدا دەکـردن بەنـدیان دەکـردن و رەوانـەی شارۆچـکەکانی ناوەڕاسـت و خـوارووی عیراقیـان دەکـردن.. دڵنیـام شـارەکانی ناوەڕاسـت و خـوارووی عێـراق، رۆڵـی جوامێرانـەی ئەوخێزانانـەیان لەبیرناچێتەوەو، رۆژێ لەرۆژان شاهیدی راستیەکان دەبن...ئەو ژنـە چلەنگانە ئەوەندەمەردو نەبەزبوون. لەو هەموو گوشارەی لەسەریان بوو یـەك ژنیـان ئامادە نـەبوون یـەك نامـە بـۆ پێشـمەرگەیەك بنووسـن بـۆ گـەڕانـەوە وازهێنـان، بەڵکـە بەپێچەوانەوە بەنامـە کوڕوهاوسـەرەکانیان هـان ئـەدا کـەزیاتر رق ئەسـتووربن و مەیدانی خـەباتی کوردایـەتی چـۆڵ نەکـەن، سـەنگەرەکانیان باشـتروزیاتر گـەرم بکـەن، زۆر ژن وکچـی رووسـووری کـورد، لـەپێناوی مـافی رەوای گەلەکەیانـدا گیانیـان بەخشـی و بوونـە قوربـانی و هـەرگیز رۆڵـی ئـەو دایـك و خوشـك وژنە رووسوورانە لەبیرناچێتەوە، لە کاتێکدا کوڕوبراوهاوسەرەکانیان شەهیددە بوون کۆڕی پرسـەیان بەسروودولاواندنەوەی سـەربەرزانەوە گـەرم دەکـردو نـەفرەتیان لەدوژمن دەکردو رقی خەڵکیان ئەستورتر دەکرد.

ئەگەر سەرنجێکی سەر پێی بدەین ژنی کورد لەخەباتی کوردایەتیـدا هـەرگیز ناتوانرێـت پشـتگوێ بخرێـت، بەڵکـە زۆربەشـانازیەوە. رۆڵـی جوامێرانـەیان بـە پرشـنگداری دەبینرێـت لەڕاپەرینـەکانی جـەماوەری خـەڵکی کوردسـتاندا ژنـان لـەریزی پێشـەوە بـوون و گیانیـان بەگوللـەی داگیرکـەر شـەلاڵی خـوێن کـران و شەهیدکران..بۆیە دەبینرێت لەهـەموو سـەردەمەکانی خـەباتی نەتەوەکەماندا ژن پێشەنگی کاروانی خەبات و کۆڵنەدانبوون.

# ( شانۆگەری گۆڕستانی بێگۆڕو موچڕکەکانی ئەنفال )

کارەساتی شومی ئەنفال لەناخی هونەرمەندانی شانۆییدا پەنگی خواردبووەوە، ئازارەکانی مەرگەساتەکە، لە ویژدانیاندا مرقی ئەدا...بۆیە کۆمەڵێ هونەرمەندی بەتوانا، شاسواری مەیدانی شانۆ...شانۆگەری گۆڕستانی بێگۆڕیان کردە خەنجەرو لەکالان رایانکێشاو، ئاراستەی دوژمنانو ئەنفال چییەکانو ویژدانی مردوویی مرۆڤایەتییان کرد. دەمەوێ بڵێم لەدوای راپەڕینەوە، بەدەیان شانۆگەری نمایش کراوە، زۆریانم بینیوە تاکە تاکەیان کاریان تێکردوم، بەداخەوە زۆر کەسیان لەئاستی مەرگەساتی گەلەکەماندا نەبوون...لەکاتێکدا لەسەردەمی رژێمدا زۆربەی زۆری شانۆگەرییەکان شانۆگەری روبەڕوبونەوەو بەرەنگاریی بوون. نازانم بۆ دوای راپەڕینو باهۆزی ئازادی کوردستانو، ئازادی شانۆ...شانۆی کوردی بۆ نەبووە خوێندنگای نمایشی گێڕانەوەی کارەساتەکانی گەلەکەمانو، هونەرمەندانی شانۆ بۆ بەچڕوپڕی یەکە یەکەی، مەرگەساتی گەلەکەمانیان شانۆیی نەکرد؟ بۆئەوەی ویژدانی مرۆڤایەتییان پێبهەژاندایەو ئەو وتە بەنرخەیان بسەلماندایە کە(شانۆو قوتابخانەی گەلە...)دەبێ بڵێین کارەساتی ئەنفالو کیمیابارانی کوردستان، کارەساتی ئەوتۆن کە نەلەبیر دەچنەوەو نەدەبێت لێیان بێدەنگبین.

رۆژی ٨/٤/٢٠٠١رومکردە هۆڵی رۆشنبیری سلێمانی بەمەبەستی بینینی شانۆگەری گۆڕستانی بێگۆڕ...بەچوونەژورەوەو دانیشتنم سەرنجی شانۆکەمدا...بەلێواری شانۆکەدا کەلو پەلی پەرشوبڵاوم بینی. ئەو کەلوپەلانە، شوێنەواری(کوتەڵی ئەنفال)بوون، بۆیە حەزم دەکرد زوو پەردە لابدرێت، ئەو دیوی پەردەی شانۆکە ببینم...پەردە والاکراو، ئەکتەرەکان کەوتنە نمایش کردن، لەیەکەم دەنگەوەبەبێ چاوتروکان، لەگەڵ یەك بەیەکی دەنگەکانو وشەورستەکان، هەڵسوکەوتەکاندا تێکەڵاو بووم. لە نرکەی هەر ئەکتەرێکدا لەخوێندنەوەی هەر وشەیەکی ئەنفالدامچڕکە بە هەموو ئەندامەکانی لەشمدا دەهاتو، دڵم پڕبوو لەقوڵپی گریانو چاوەکانم فرمێسکیان ئەڕشت...دەنگە

دڵێرەکەی عەلی کەریم و هاتوچۆوهەڵگەڕان وهاتنە خوارەوەکانی لەلایەك و دەنگە پڕوچڕوکپەکانی ئازاد جەلال و دەنگە بەسۆزەکەی خوشکە ژیان و نەنە حەپسەو جەبارو بانگەکانی یاسین بەرزنجی و سیماو سەرنج ڕاکێشەکەی بە مێزەرو جبەوە، دەنگی کوڕی زیکرو تەپڵ و دەفی ئەو کۆمەڵەوە..........گوڵاو پرژێنی بینەران...هەستمدەکرد هەر من نەبووم...بەتەواوی نوقمی نمایشەکە بووبووم..بەڵکە سەرجەمی بینەران لەهەمان حاڵەتدا بوون و، هەر هەموو حەسرەتیان هەڵدەکێشاو دەگریان...چەند ماوەی شانۆگەرییەکە کورت و کەم بوو. بەلام ئەوەندە کاریگەرو سەرکەوتو ئاراستە کراوبوو، تراژیدیای مەرگەساتی گەلەکەمانی دەهێنامەوە پێش چاو.

بیرۆکەی ئەم شانۆگەرییە، دیارە لە هۆنراوەییەکی شاعیری برامان (قوبادی جەلیل زادە) وەرگیرابوو، کاکە حسێنی هونەرمەندو بەدەسەلات دەرهێنەری بوو....ئەم شانۆگەرییە خەنجەرێکی دەبان بوو تا ئێستا لە کالاندا قەتیس مابوو. وا ئەمڕۆ هونەرمەندە بەتواناکان هەڵیان کیشاو، بەبێ ترس و بێ سڵەمینەوە ئاڕاستەی هەموو ئەوانەیانکرد، کە ئەنفالیان بەحەق زانی و گوێیان ئاخنی و چاویان نووقاو ویژدانیان مراند. ئێستاش ئەوانە شەرم دەکەن و پێیان تاوانە وشەی نەگریسی(ئەنفال) ناوبهێنرێت و بنوسرێت و باس بکرێت و،دەیانەوێت ئەنفالی میللەتێ فەرامۆش بکرێت..............

براکانم حسێن و عەلی و ئازادو جەبارو یاسین...خوشکەکانم ژیان و نەنە حەپسە...بەڕاست سەلماندتان هونەرمەندن، شانۆکارن، هەڵگری بیری نەتەوەیی و کوردایەتیین، دەرکەوت خەم و مەرگەساتی گەلەکەتان بەکوڵەوەیە ناخ و ویژدان و ژیانتان دەخواتەوە. دەستتان خۆش و هونەرتان بەرزو شانۆتان هەروا گەرم و پڕبێت.

*ئەم شانۆگەرییە لە هۆڵی ڕۆشنبیری سلێمانی لە ١٦/٤/٢٠٠١و ڕۆژانی دوایی لەلایەن ئەو کۆمەڵە ئەکتەرەوە نمایشکراو منیش ئەمەم لەسەر نووسی لەکوردستانی نوێدا بڵاومکردەوە.

## ( پرۆفیسۆر د. جەلیلی جەلیل ومۆزەخانەی سلێمانی )

پرۆفیسۆر دکتۆر جەلیلی جەلیل لەمیانەی سەردانیدا بۆ کوردستانی ئازاد بەمەبەستی بەسەرکردنەوەی دامو دەزگاکانی حکومەتی هەرێم سەعات(١٢) نیوەڕۆی ڕۆژی١٣/٥/١٩٩٩سەردانی وەزارەتی ڕۆشنبیری کرد. مامۆستا جەمال عەبدول وەزیری ڕۆشنبیری پێشوازیەکی گەرمی لێکرد، بەپێی بەرنامەیەکی داڕێژراوو بەمەبەستی شارەزابوونی لە دامودەزگاکانی وەزارەت سەری لە هەموو بەڕێوەبەرایێتیەکانی ناو وەزارەتدا.

دکتۆرجەلیل بەپێی شارەزایی‌خۆی لەبواری ڕۆشنبیریدا، راوبۆچوونی خۆی بۆ هەر بەڕێوەبەرێتییەك دەردەبڕی‌و، دەست خۆشی لەکارەکنی وەزارەت دەکرد.

یەکێك لەو شوێنانەی مامۆستا جەمال مەبەستی بوو، بەپەسەندی زانی دکتۆر جەلیل سەردانی بکات‌وبیبینێ(مۆزەخانەی سلێمانی) بوو. بە گەیشتنی دکتۆر جەلیل بۆهۆڵی مۆزەخانە لەلایەن فەرمانبەرو، پسپۆرەکانی مۆزەخانەوە، پێشوازی گەرمی لێکرا. بەوردی‌و زۆر بەبایەخەوە شوێن بەشوێنی هۆڵی مۆزەخانە گەڕاو، گوێی بۆڕوونکردنەوەکانی (رافیدە) خان پسپۆری مۆزەخانە دەگرت...ئەوەی بووە جێی سەرنج‌وداخی دکتۆر جەلیل چۆڵی جامخانەکان بوو... بەسەرسوورمانەوە پرسیاری کرد بۆ ئەم جامخانانە چۆڵن‌و..؟ بۆهەندێکیان شکاون..؟

(رافیدە خان) وەڵامی دایەوە وتی: ئەمجامخانانە هەر هەموو پڕبوون لە پەیکەرو، ئامێری کۆن‌و شتی نەختینەی ئەوتۆ، کە بەدەگمەن دەست ئەکەون. بەداخەوە کاتی ڕاپەڕینی١٩٩١ خەڵکی‌نەفس نزم وتێ نەگەیشتوو هەڵیان کووتاوەتە سەرمۆزەخانەکەو پەلاماری پەیکەروشتی جامخانەکانیانداوە، ئەوەی بە عەقڵی خۆیان بەکەڵکیان هاتووە لەشوێنی چەسپکراو هەڵیان کەندوەو، جامخانەیان شکاندوە بردوویانە. بە پارەیەکی کەم فرۆشتوویانەو ئاودیوکراوە، بەڕێوەبەرێتی مۆزەخانە لەترسی ئەودیاردە ناشارستانییەو ئەو خەڵکەبەرەڵا و

چاوچنۆکانە ئەوەی ماوەتەوە لە کارتۆندا کۆیکردوونەتەوەو لەشوێنی تایبەت پارێزراون....

د. جەلیل وتی بەنیاز نین دەریان هێنین‌و مۆزەخانەکەی پێ ئاوەدان بکەنەوە...؟چونکە مۆزەخانە لە دنیادا زۆر گرنگەو لەلایەن ولاتانی دنیاوە بایەخی زۆرو تایبەتی پێ ئەدرێت... ڕووی شاراوەی شارستانێتی نەتەوایەتیە...کۆنینەی شوێنەوارداهاتووی لەسەر دادەڕێژرێت... میللەتانی دنیا شانازی پێوە دەکەن.

(ڕافیدە خان) وتی: بەڵێ زۆر ڕاستە...حەزدەکەم ئەوەش بزانن کە ئەم مۆزەخانەیە سێیەم مۆزەخانەیە لە عێراقدا. تا ئێستا لەبەر بارودۆخەکە بە چاك نەزانراوە شتەکان دەربهێنرێن‌و بخرێنە ڕوو. هەر کات وەزارەت بریارێکی لەوبابەتە بدات بەزووترین کات دەیکەینەوە بەمۆزەخانەکەی جاران.

مامۆستا جەمال وتی: لە هەوڵداین‌و بەدەستمانەوەیە پاش چاککردنەوەی تەڕەشوعی بنمیچی هۆڵەکە، کار بۆ دانانەوەی شتەکان بکەین. مۆزەخانەکە ببووژێنینەوە. بۆ ئەمەش پێویستمان بە ئیمکانیەتی ماڵی هەیەو بەم ئیمکانییەتە کەمەی هەمانە توانیومانە ئەوەندەی کراوە بیکەین.

پێش جێهێشتنی دوا شوێنی هۆڵەکە، دکتۆر جەلیل وتی زۆر شادمانم بەو مژدەیەی داتانمێ بەوەی کەزۆربەی کەل‌وپەلەکان ماوەو، دەتوانن مۆزەخانەکەی پێ ئاوەدان بکەنەوە. وە وتی پێویستە حکومەتی هەرێم بایەخێکی تایبەت بەشوێنەوارو ئەم مۆزەخانەیە بداتو، بیکەنە سەرچاوەیەکیش بۆ داهات، لەلایەك لەلایەکیتر بۆ ناساندنی سامانی شوێنەواری گەلەکەمان، بەو بیانیانەی دێنە کوردستان‌و بۆئەوەی ڕابردووی نەتەوەکەمان بناسن خوێندکارەکانی زانکۆ دواناوەندی بهێنرێن‌و ئەم شتانە بەچاوی خۆیان ببینن...

# ڕوونکردنەوەیەك لە بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی وەزارەتی ڕۆشنبیرییەوە

یەکێك لەنیشانە سەرەکییەکانی شارستانییەتی هەر کۆمەڵگایەك، بوونی یاسایە، لەو کۆمەڵگایەدا بە پلەی یەکەم و پەیڕەویکردن و ملکەچ بوونی هاووڵاتیانە، بۆ ئەویاسا و ڕێنماییانەی کە لەلایەن حکومەت و دەسەڵاتی ئەو کۆمەڵگایەوە دەردەچێ.

سەبارەت بە کورد، لەدێرزەمانەوە بارودۆخێکی وای بەخۆوە نەدیوە ناوبەناو نەبێ لێرەولەوێ و بۆماوەیەکی کورت بەڵکە، هەرملکەچی ئەو یاسایانە بووین، کە ئەم و ئەو بۆ بەرژەوەندی خۆیان سەپاندوویانە بەسەرماندا. ئەم حاڵەتەش وای لێمانکردووە کە پەیوەندیکردنی هەر یاسایەك بەلامانەوە بەئەرکێکی قورس دابنێین. تەنانەت ئەگەر ئەو یاسایەش پەرلەمانێکی کورد، خۆی دایبنێ.

دوای ڕاپەڕین و هەڵبژاردنی نوێنەرانی میللەت و پێکهێنانی حکومەتێکی شەرعی لەبەشێکی کوردستاندا، شتێکی زۆر ئاسایی بوو، کە ئەوپەرلەمانە هەندێ یاسا دابنێ، یا دەسکاری یاسا کۆنەکانی بکات، بەجۆرێك لەگەڵ بارودۆخی تازەوبەرژەوەندی میللەتی کورددا بگونجێ، ئەوەی سەبەستمانە لێرەدا ئاماژەی پێبکەین، یاسایی ژمارە(١٠)ی ساڵی ١٩٩٣یە(یاسای چاپەمەنی هەرێمی کوردستانی عێراق)، بەپێی حوکمی بڕگەی(١)لەماددەی(٥٦)ی یاسایی ژمارە(١) ساڵی ١٩٩٢و لەسەر پێشنیازی وەزیری ڕۆشنبیری و بڕیاری ئەنجومەنی وەزیران، ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان لەدانیشتنی ڕۆژی١٨/٤/١٩٩٣دا بڕیاری دەرکردنی ئەو یاساییەی پەسەند کرد.

لەمادەی شازدەهەمی ئەویاسایەدا هاتووە کە وەزیری ڕۆشنبیری بۆی هەیە ڕێنمایی پێویست دەربکا، بۆ ئاسانکردنی جێبەجێکردنی ئەو یاسایەو، لەبەر ڕووناکی ناوەڕۆکی ئەو ماددەیەدا، وەزیری ڕۆشنبیری لەساڵی١٩٩٥دا ڕێنمایی ژمارە(٣)ی دەرکرد، کە لەبڕگەی چواردا دەڵێ: هەموو گۆڤارو ڕۆژنامەیەك دەبێ(١٥٠٠)دینار ڕەسمی مۆڵەت و(١٠٠٠)دینار ساڵانە بۆ ڕۆژنامەی ڕۆژانەو

(٥٠٠) دینار ساڵانە بۆ رۆژنامەیان گۆڤار ئەگەر هەفتانە یان وەرزی بێت بۆ تازەکردنەوە، بدات بە بەڕێوەبەرێتی گشتیی راگەیاندن.

بەڵام ئەوەی جێی داخە دوای تێپەڕبوونی زیاتر لەپێنج ساڵ بەسەر دەرچوونی ئەو یاساو رێنماییانەدا، هەندی لەو بەڕێزانە کە لەبواری رۆژنامە گەریدا کاردەکەن، ئەو یاسایەیە بڕیارێکی وەزیری رۆشنبیری دادەنێن و، لەوەش زیاتر وەزارەتی رۆشنبیری بە کۆسپێك دادەنێن، لە بەردەم رۆشنبیریدا!، ئەمەش هەر لەبەر ئەوەی کە وەزارەت، لەو (٥٠٠)دینارەی رەسمی یاسایی بۆ گۆڤارەکەیان نەیبەخشیون، کەیاسای ناوبراو ئەو دەسەڵاتەی نەداوە بەوەزیر بۆ بەخشینتان.

*ژمارە ١٦٩ی رۆژنامەی هەرێم لە ١٩٩٩/١٢/٢٧دا بڵاوکراوەتەوە

# (( ڕوونكردنەوەیەك لەوەزارەتی ڕۆشنبیریەوە ))

لەژمارە(٥٠)ی ڕۆژنامەی (ڕێگای یەكبووندا)، (ئومێد ڕێكانی)بابەتێكی بڵاوكردۆتەوە بەناونیشانی (نامەیەكی كراوە بۆ بەڕێز وەزیری ڕۆشنبیری لەسلێمانی..) لەو بابەتەدا نووسەر ڕەخنەو پلاری ناڕەوای ئاراستەی بەڕێوەبەری گشتیی چاپ وبڵاوكردنەوە، كردووەو ویستویەتی لەو دەرگایەوە سووكایەتی بە وەزارەتی ڕۆشنبیری حكومەتی هەرێمی كوردستان بكات. كە پێویستی بەوەڵامدانەوەو لەسەر ڕۆیشتن هەیە، ئێمە وەك مافێكی ڕەوای خۆمان بەباشمانزانی ئەم چەندخاڵەی خوارەوە بخەینە پێش چاوی خوێنەران و هەمووئەوانەی پەیوەندیان بەمەسەلەكەوەیە بۆدەرخستنی ڕاستی لەو بارەیەوە....

لەمانگی١١/١٩٩٠دا برادەری نووسەر دەس نووسی كتێبێكی هێناو بۆئەوەی ژمارەی سپاردنی بدرێتێ تا چاپیبكات. لەبەرئەوەی نووسینەكە هەندێ بابەتی تێدابوو دوور بوون لەڕاستیەوە، وەك لەخوارەوە دەردەكەوێت ئەونووسینە مۆڵەتی چاپكردنی پێنەدرا...وادیارە ئەوەش ئەو برادەرەی زۆر نیگەران وبێزاركردووە. بەڕادەیەكی وا كە لەحاڵەتی هەڵچووندا مەسەلەكان بە ئاوەژو بخاتە ڕوو. بەمەش كەسانێكی تر چەواشەبكات، ئێمە پێش ئەوەی بچینە سەرباسەكە هەندێ خاڵی نووسینی ئەو برادەرە دەخەینە ڕوو، بۆئەوەی خوێنەران بزانن ئەوبرادەرە بۆچوونەكانی تاچ ڕادەیەك دوورن لەڕاستیەوە، ئەمانەش بەنموونە دێنینەوە ئەو برادەرە دەڵێ: (من تێڕوانینی خۆم بۆ بزاڤی عەلمانیەت و هۆیەكانی سەرهەڵدانی و لەسەربنەمایەكی زانستی و بەپشتبەستن بەسەرچاوەی بەردەست و بەدەر لەهێرش و تەشهیر...خستۆتە ڕوو)..

یەكەم:بەپێویستی دەزانین ڕوونیبكەینەوە كە ئەو نووسینە تێڕوانینی ئەو برادەرەنییە بۆ(سیستمی عەلمانیەت)نەك (بزاڤی عیلمانیەت) وەك ئەو دەڵێ بەڵكو نەقلكردن و گواستنەوەی چەند بۆچوون و لێكدانەوەی نووسەرانی عەرەبە. كە ڕێبازێكی تایبەتیان هەیەو هەر لەسەرەتاوە وشەی عەلمانیەتی

بە(لادینی)لێکداوەتەوە. کە ئەمەش ڕاست نییە، سیستمی عەلمانیەت واتە دەسەڵات قورخ نەبێ بۆ پیاوە ئاینیەکان و ئەرکی پیاوانی ئاینی بە زۆری دەبێ لەبواری ڕێنمای کردنی موسڵماناندا بێت، لەکارو باری ئاینیدا، نەك جڵەوی دەسەڵات گرتنەدەست و خۆتێهەڵقورتاندن لەهەمووکارێکی وردودرشتی دنیاییدا، دیارە ئەمەش هیچ کاتێك بە مانای(بێ دینی) یا(لادینی نییە وەك ئەودەڵێ) ڕەنگە نووسەریش ئاگای لەوفەرمودەیەی پێغەمبەر(د.خ) بێت هەبێت کە دەفەرموێت(انتم اعلمُ بامور دنیاکم..).

دووەم: نوسەر لەبابەتەکەدا دەڵێ: (ماوەیەکە هەندێ دیاردە دەبینین کە ڕۆژانی ڕابردوومان دەخەنەوە یاد..)واتە سەردەمی ڕژێمی بەعس و پێش ڕاپەڕین..ئێمە نازانین ئەم برادەرە بەچ ماف وویژدانێکەوە توانیوێتی زات بکات بەراوردی ئەم سەردەمەی ئێستای کوردستان و حکومەتی هەرێمی کوردستان لەگەل سەردەمی ڕژێمی بەعسدا بکا..ئایا لەسەردەمی ڕژێمدا ئەووکەسانیتر ئەیانوێرا تەنیا بیرلەوەبکەنەوە کە نووسینێك بڵاوبکەنەوە لەدووریشەوە پەیوەندی هەبوایە بەکێشەی ڕۆژانەی موسڵمانانەوە..؟..

سێیەم: لەبڕگەیەکی تری نووسینەکەیدا دەڵێ: (لەزمانی بەڕێوەبەری چاپ وبڵاوکردنەوە)ئەم نوسینە لەگەڵ سیاسەتی خۆماندا ناگونجێن و ئامادەش نین مۆڵەتی بڵاوکردنەوەی پێبەدەین. ئەم بڕگەیە دوورە لە ڕاستییەوە چونکە مەسەلەکە بریتییە لەوەی ئێمە وەك وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان پەیڕەوی یاسای چاپەمەنییەك دەکەین کە پەرلەمانی کوردستان دایناوەو، هەموو حیزبەکان هاوبەشن لەپەرلەمان و حکومەتداو، هیچ لایەنێکیش لەسەر پرۆژەی ئەو یاسایە تائێستا نارەزاییان پیشان نەداوە، ئێمە هەر چاپکراوێك کە بزانین لەهەندی بواردا لەگەڵ ئەویاسایەدا ناگونجێ، ئەوا ڕێگای بڵاوکردنەوەی پێنادرێ...ئیتر مەسەلەکە پەیوەندی بەخۆمان وخۆتانەوەنییە، وەك ئەو لێکی دەداتەوە. ئەولایەنەش نووسەری بابەتەکە خۆی سەربەوان دادەنێ بەشداری حکومەتن و ئەگەر تێڕوانینێکی تایبەتیان هەبوایە بەرامبەربەو یاسایە بێگومان بێدەنگ نەدەبوون و، هەر بڕیارو یاسایەکیش، کە لەحکومەتی هەرێمی کوردستانەوە دەردەچێت ئەگەر کەم وکوڕیشی تێدابێت هەموو لایەنەکانی بەشداری حکومەت لێی بەرپرسن.

چوارهەم: لەبڕگەیەکی تری بابەتەکەدا دەڵێ: (هەر لەزمانی بەڕێوەبەری گشتیی چاپ وبڵاوکردنەوەوە) (خۆمان دەزانین چی لەوچاپخانەیە دەکەین کە چاپی دەکات). ئەمەش هەر دەچێتە خانەی ئاوەژووکردنی راستیەکانەوە. چونکە وەك لەسەرەوە وتمان ئێمە پابەندی یاسای چاپەمەنین، ئەو یاسایەش سزایەکی بۆ ئەو چاپخانانە داناوەو ئێمە لەخۆمانەوە ناتوانین هیچ هەڵوێستێك وەربگرین، لەچوارچێوەی ئەو یاسایە بەدەربێت، ئەمەش نووسەران و رۆشنبیران دەزانن. لەکاتێکدا ئەو وەك خۆی دەڵێ وتوویەتی(دەچم لەوەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەولێر مۆڵەتی بۆ وەرئەگرمو بەو مۆڵەتە لەسلێمانی چاپی دەکەم) ئەم قسەیەی ئەو برادەرە جێدێڵین بۆخوێنەران و ئەوانەی لەبواری چاپەمەنیدا شارەزاییان هەیە...

پێنجەم: لەبڕگەیەکی تری بابەتەکەدا دەڵێ: (ئایا ئەمە سەرەتایەك نییە بۆ لەقاڵبدانی ئازادییەکان؟) وادیارە ئەم برادەرە تائێستا بەتەواوی لەواتای وشەی ئازادی نەگەیشتووە..ئازادی مانای ئەوەنییە کەهەر کەس چی ویست بیڵێ، چی ویست بیکا،..ئەگەر بەم شێوەیە لە ئازادی بگەین و مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، ئەوە دەبێتە بەرەڵایی و ئازادی وەك هەرشتێکیتر سنووری خۆی هەیە، ئەگەر سنوورەکەی خۆی بەزاند ئەوە دەبێتە دەست درێژیکردنە سەر ئازادی کەسانیتر..

شەشەم: لەبڕگەیەکی تری بابەتەکە دادەڵێ: (پاشان نازانم خۆمان یەکێتی؟ تاوەکو ئیتر لەمەودوا بەپێی سیاسەتی خۆمان بنووسین؟)ئایا بانگەشەی ئازادی دەربڕین چ سەنگێکی دەمێنێ کاتێك بەڕێوەبەری چاپ، هەموو ئەو نووسینانە رەت بکاتەوە کە لەگەڵ بۆچونەکانیدا رێك ناکەوێ؟) بۆ ئەوەی تیشك بخەینە سەر راستی و ناراستی ئەم بڕگەیە ناچارین لە کۆتایی نووسینەکەماندا ئاماری ئەو کتێب و نامیلکەو گۆڤارو رۆژنامانەی لەساڵی(١٩٩٩)دا چاپکراون بخەینە بەرچاوی خوێنەران. تاخوێنەر ئاگاداری ئەوەبێ کە ئەو نووسەرە چ حوکمێکی نارەوا و ناراستی داوەو ئەوەشمان بۆ روون بێتەوە، کە تاچ رادەیەك ئەو کتێب و نامیلکانەی بڵاوکراونەتەوە پەیوەندیان بەبیرو بۆچوونی ئێمەو کەسانی ترەوە هەیەو، چۆن نووسیویە کە(هەموو)ئەو نووسینانە رەتکراونەتەوە ئێمە لەئامارەکەدا بەژمارە ئەو کتێبانەی مۆڵەتیان لەوەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

دەخەینە روو. بزانین ئەو ئەتوانێ ژمارەی(هەموو)ئەو کتێبانەمان بداتێ کە وەك دەڵێت رەتکراونەتەوە...

حەوتەم: لەبڕگەیەکی تری بابەتەکەدا دەڵێ: (لەکتێبخانەکانی ناوشاری سلێمانیدا بەدەیان کتێب و نامیلکەی غەیر ئیسلامی بە رچاودەکەوێ کە ڕەنگە وەزارەتی رۆشنبیری پرسەگورگانەیەکیشی پێنەکرابێ، کاتێك لەچاپ دراوە).

وەزارەتی رۆشنبیری ئەودیاردەیە دەزانێت و لەبەرنامەیدایە کە بەپێی رێنمای یاسای چاپەمەنی بەهاوکاری هەمولایەك چارەسەربکات و رێگا لەچاپ خانەکان وکتێبخانەکان بگرێت، کە بەئارەزووی خۆیان کتێب چاپ بکەن و بڵاویبکەنەوەو دیاردەی بەرەڵای بنەبڕبکەین.

نامانەوێت لەمەزیاتر روونبکەینەوە لەسەر ئەو بابەتە. بەڵام بەپێویستی دەزانین) کە بە(ئومێد رێکانی)بڵێین حەقە باش بزانێت کە(وەزارەتی رۆشنبیری لەسلێمانی)نییە وەك نووسیوێتی بەڵکە(وەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستانە) یاسای چاپەمەنی هەیەو بۆ ئارەزووی هیچ کەسێك بڕگەکانی فەرامۆش ناکات. مافی خۆشمانە گلەیی لەرۆژنامەی(رێگای یەکبوون)بکەین و بڵێین دەبوو سەرنووسەری رۆژنامەکە پێش بڵاوکردنەوەی بچوایەتە بنج وبناوانی ناوەڕۆکی ئەونووسینە، ئینجا مافیان بەخۆیان بدایە بۆبڵاوکردنەوەی. چونکە وەزارەتی رۆشنبیری لەمانگی رابوردوودا رێنماییەکانی یاسای چاپەمەنی بۆ هەموو دەزگا حکومی وحیزبی و رێکخراوەیی و راگەیاندن و رۆشنبیرییەکان ناردووە. باوەڕناکەین دەزگایەك یان شوێنێك هەبێت، ئەو رێنماییانەی پێ نەگەیشتبێ.

بەردەوام رۆژانە نووسەران و رۆشنبیران بەبێ ناسنامە کتێب ونامیلکەبە داوایان پێشکەشی وەزارەت دەکەن وەزارەتیش بەپێی رێنماییەکان دوای سەیرکردن و هەڵسەنگاندن، پاش چەند رۆژێ ئەنجامکەی وەردەگرنەوەو، هەر بابەتێ لەگەڵ بڕگەکانی یاسای چاپەمەنیدا بگونجێت ژمارەی سپاردنی دەدرێتێ..

بەراشکاویش دەیلێم هەر نوسەرو رۆشنبیرێك رووی کردبێتە وەزارەتی رۆشنبیری و بەڕێوەبەرێتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوە بەپێی داب و نەریتی کوردەواری و رەوشتی بەدەر لەکاری وەزیفی رێزی لێگیراوەو بەڕێزیشەوە

بەرێکراوە، تا ئێستا کەسێکمان لەبەردەرگا رانەگرتووەو یان نەکردۆتە دەرەوە...

ئەمەش ئاماری رۆژنامەو گۆڤاروکتێبو نامیلکەی مۆڵەتدراولە١/١(١٩٩٩)تا ١٩٩٩/١٢/١ئەوانەشی مۆڵەتیان نەدراوەتێ بەم شێوەیەیە(٨) رۆژنامە، (٢٠)گۆڤار مۆڵەتی یاساییان پێدراوە (٤٩٢) کتێبو نامیلکە ژمارەی سپاردنیا وەرگرتووە، لەو(٤٩٢) نامیلکەو کتێبە)(١٣٨)کتێبونامیلکەیان بابەتی ئاینیین. (١٠)کتێبو نامیلکە، بە هەموو جۆرەکانییەوە ژمارەی سپاردنیان نەدراوەتێ.

# وەزارەتی رۆشنبیری پابەندی یاساکان دەبێو بۆ ئارەزووی کەس رەوتی خزمەتکردنی رۆشنبیری کوردی راناگرێت...

وەزارەتی رۆشنبیری لە دروستبوونی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە دامەزراوە..بەپێی بڕیاری ژمارە(٢٤)ی ٢٥/٤/١٩٩٤ی ئەنجوومەنی نیشتمانی کوردستانو پشت بەستن بە حوکمی بڕگەی(١)یمادەی(٥٦)ی یاسای ژمارە(١)ی ساڵی ١٩٩٣و لەسەر پێشنیازی وەزیری رۆشنبیریو لەسەر داوای ئەنجوومەنی وەزیران. ئەنجوومەنی نیشتمانی کوردستان لەدانیشتنێکی رۆژی١٨/٤/١٩٩٣دا بڕیاری دەرکردنی یاسای ژمارە١١٠ی ساڵی ١٩٩٣ی یاسای چاپەمەنی هەرێمی کوردستانی دەرکرد.

وەزیری رۆشنبیری بەدوای ئەو بڕیارو یاسایەدا، رێنمایی ژمارە(٣)ی ساڵی ١٩٩٥ی سەبارەت بە ئاسانکردنی یاسای چاپەمەنی دەرکردوە، لە شوێنی فەرمانی وەزارەتی ژمارە(٢١٥٠)ی ١٠/٧/١٩٩٣ی گرتۆتەوە...هەمان رێنمایی لەسەر بڕیاری وەزیری رۆشنبیری بە ژمارە(١)ی ساڵی ١٩٩٩ی بۆجێبەجێکردنی یاسای چاپەمەنی بەنوسراوی ژمارە ٩٨ لە ١٠/١٠/١٩٩٩ بۆگشت دەزگاو بنکەکانی راگەیاندنی حکومیو حزبیو رێکخراوەییو ئەهلی پەخشکراو باوەڕناکەم گۆڤارێك یان دەزگایەكوبنکەیەك هەبێت ئەو رێنماییانەی پێنەگەیشتبێ.

لەساڵی ١٩٩٧وە تاکۆتایی ساڵی ١٩٩٩ (٣٣) رۆژنامەو(٦٥ )گۆڤارو مۆڵەتی رەسمی وەزارەتی رۆشنبیرییان وەرگرتووەکە دەکاتە(٩٨)رۆژنامەو گۆڤاری جۆراوجۆر لەسنوری هەرێمدا، دەردەچێت. لەو (٩٨)ە(٤٢) یان لەرەسمی یاسایی بەخشراونو لەماوەی ئەم(٣)ساڵەشدا تاکە تاکە بڵاوکراوە نەبێت بیریان لەتازەکردنەوەی ساڵانە نەکردۆتەوە یان دەتوانین بڵێین لەوەزارەتی رۆشنبیری کەسێك تەرخان نەکراوە خەمخۆری چەسپاندنی یاساکەی بێتو ساڵانە ئەو گۆڤارو رۆژنامانە بۆ تازەکردنەوە بەسەر بکاتەوە. ئەمە بەلای منەوە کەم تەرخەمیو بەهەند نەگرتنی یاسای چاپەمەنی وەزارەتی رۆشنبیرییە، کە لەلایەن

خودی وەزارەت و وەزیری رۆشنبیرییەوە پشت گوێخراوە..لە هەمووسیستمی دنیادا یاسایەك دەردەچێت و دەکرێتە بڕیارو بڵاودەکرێتەوە ئەو یاسایە کاری پێدەکرێت و، یاساش ناکەوێتە ژێر ئارەزووی خاڵ بەخاڵی جێبەجێبکرێت و ئەوەی پەیوەندی بەویاسایەوەیە ئەرکی سەرشانیەتی ملکەچی بێت..وەزارەتی رۆشنبیری لەماوەی(٣)ساڵدا بەداخەوە نازانم (چ هۆیەك بووە)نەیویستووە بەڕێوەبەرێتیەگشتیەکانی وەکو هەموو وەزارەتەکان دابمەزرێنێت و وەزارەت هەروەکو بەڕێوەبەرێتیەکی گشتی و وەزیریش وەك بەڕێوەبەرێکی گشتی کارەکانی ئەنجامداوە. کە لەڕاستیدا نەدەبوو وابوایە.

لە ١٩٩٩/٨/١بەڕێز مامۆستا جەمال عەبدول وەزیری رۆشنبیری بڕیاریدا کەبەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە دابمەزرێت و لەگەڵ دامەزراندنیدا بەرنامەیەکی داڕێژراو. بەهەوڵ و کۆششێکی زۆر توانیمان لەماوەی دوومانگدا پەیکەری بەڕێوەبەرێتیەکەمان دروستکرد و بەئەرشیفی هەموو وەزارەتدا بچینەوە، ئەوەی مەبەست بووو پەیوەندی بە بەڕێوەرێتیەکەمانەوە هەبوو، تۆمار بکەین و رێکیبخەین. یەکێك لەوکارانەی کرا جیاکردنەوەی دۆسیەی مۆڵەتی رۆژنامەو گۆڤارەکان و مۆڵەتی ژمارەی سپاردنی نامیلکەو کتێبەکان بوو.

لەسەر فەرمانی بەڕێز مامۆستا جەمال و لە کۆبوونەوەی ئەنجوو مەنی وەزارەتدا بڕیاردرا، کە ئەو رێنماییانە گۆڕانکاری تیادا بکرێت و رێکبخرێتەوە کاتێ گۆڕانکاری لەوەزیرە بەڕێزەکاندا کرا لەجێی بەڕێز مامۆستا جەمال بەڕێز شێخ محەمەد شاکەلی پۆستی وەزارەتی رۆشنبیری وەرگرت و بەسەریا سەفەریکرد. بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بوونە وەزیری رۆشنبیری بەوەکالەت. ئەو رێنماییانەی پێشکەشکراو بەڕێزی پەسەندی کرد...بەڕێزی لەڕێگای بەڕێوەبەری گشتی دیوانەوە پێی راگەیاندین، کە هیچ گۆڤارو رۆژنامەیەك بەرەسمی مۆڵەت نەبەخشرێت کە بەڕێز وەزیری رۆشنبیری گەڕایەوەو کەوتە سەروکاری ئێش وکارەکانی وەزارەت بەرەسمی ئاگاداری کردین کە.

١. ئەو رۆژنامەوگۆڤارانەی قەرزاری تازەکردنەوەی مۆڵەتن، نووسراویان بۆ بکەین کە پێش کۆتایی ساڵی ١٩٩٩ قەرزەکە بدەنەوە بەژمێریاری دیوانی وەزارەت و. مۆڵەتیان بۆ تازەبکرێتەوە.

٢. بۆ جێبەجێکردنی راسپاردەی بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران هیچ گۆڤارو رۆژنامەیەك لەرەسمی یاسای مۆڵەت نەبەخشرێن

٣. بەپێی بەرنامەیەکی گونجاو بۆ بەرژەوەندی گەشەکردنی رۆشنبیری کوردیو، دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردیو، هاندانی نووسەرانو رۆشنبیران دەرگای هاوکاریو یارمەتی بخرێتە سەرپشت بۆ چاپکردنی ئێمە دوای پەخشکردنی رێنماییەکانو گەڕان بەناو ئەرشیفی بەڕێوەبەرێتیەکەماندا، ئەو رۆژنامەو گۆڤارانەی مۆڵەتیان تازە نەکردبۆوە قەرزاری تازەکردنەوەبوون، بەپێی ساڵی دەرچوونیان بۆمان دەرکەوت(٢٣) رۆژنامەو(٣٨) گۆڤار مۆڵەتیان تازە نەکردۆتەوە کە دەکاتە(٦١) رۆژنامەوگۆڤار. ئێمەش بەنوسراوی ژمارە(٥٩٩ )لە ٢٠/١٠/و نووسراوی ژمارە(٦٠٠)لە ٢٠/١٠/١٩٩٩ ئاگاداری هەموو سەر نووسەری ئەو گۆڤاورورۆژنامە بەرێزانەمانکرد کە مۆڵەتیان نوێ نەکردۆتەوە بەمەبەستی نوێکردنەوەی ساڵانەی مۆڵەتەکانیان سەردانمان بکەن، بۆ ئەم کارەمان زۆربەی رۆشنبیرانو نووسەرانو دامو دەزگا رۆشنبیریەکان دەست خۆشیانلێکردین. بەکارێکی باشو یاساییان لەقەڵەمداو بەدەنگی نوسراوەکەمانەوە هاتن.

لەوانە(بەڕێز عادل موراد)و مەکتەبی راگەیاندنی(ی.ن.ك) بوون. کە(٣) ساڵی رۆژنامەی کوردستانی نوێو(٢) ساڵی رۆژنامەی (الأتحاد) قەرزار بوو بەیەکجار قەرزەکەیان دایە ژمێریاری دیوانی وەزارەتو بەدوایاندا دەزگای چاپوبەخشی سەردەمو دەزگای ناوەندی گۆڤاری(شەهید) گۆڤاری(هەندرێن)داوای بەختیاری کرد. خاوەنی ئیمتیازی هەردوو گۆڤارەکە سەردانیان کردینو گفتوگۆمان لەگەڵ بەرێزیاندا کرد. قەرزەکەیان داو مۆڵەتیان بۆ تازەکرایەوە..

گۆڤاری تایم نامەیەکیان ئاراستەی من کردبوو بە ئیمزای خاوەن ئیمتیازو، سەرنووسەر کە لە ١٤/١٢/نووسرابوو، بۆ وەلامی نووسراوی (٥٩٩)٢٠/١٠/١٩٩٩ بەرێوەبەری گشتی چاپوبلاوکردنەوە ئەو دەسەلاتەی پێنەدراوەو نیەتی، کە خاوەن گۆڤارو رۆژنامە لە دانی رەسمی مۆڵەتو تازەکردنەوەی ببەخشرێن، بۆیە دەبێت داواکە بۆ بەرێز وەزیر بەرزبکاتەوە لەرێگای بەرێوەبەری گشتی دیوان. منیش لە ١٦/١٢/ بەیاداشتێکەوە داواکەیانم بەرزکردەوەو، بەنوسینی پەراوێزیی بەرێوەبەری گشتی دیوان بۆ بەرێز وەزیر بەرزکرایەوەو قسەم

لەسەرکرد. بەڵام بەڕێزی بە پەسەندی نەزانی لەبەرنامەو بڕگەکانی یاسای چاپەمەنی لابدرێتو، پێیراگەیاندم کە نوسراویان بۆ بکەمەوە لەسەر فەرمانی بەڕێز وەزیر نووسراوی ژمارە(٧٨٠) بە مێژووی ١٢/٢١ بۆمانکردو بۆماننااردن، لەنووسراوەکەماندا داوامانکردوە، کە سەر لە بەڕێوەبەرێتیەکەمان بدرێت.

ئێمە چاوەڕوانی ئەوە بووین یەکێك لەو بەڕێزانە سەردانی بەڕێوەبەرێتیەکەمان بکەنو لەگەڵماندا قسەوگفتوگۆ لەسەر گرفتی گۆڤارەکەیان بکەینو نەقسەو پلار بۆ هاوکاریان دابڕێژین. بەڵام بەداخەوە ئەو بەڕێزانە لەجیاتی بەدەنگەوە هاتنمان لە ١٢/٢٢ نامەیەکی تریان ئاراستەی من کردووە، بە ئیمزای بەڕێز پارێزەر خاوەنی ئیمتیازی گۆڤاری تایم وتویەتی نامەکەیداوە بە بەڕێزان مام جەلالو کاك کۆسرەتو شێخ محەمەد شاکەلیو(٣) ڕۆژنامەو گۆڤارێك... ناوەڕۆکی نامەکەی لەم خاڵانەدا کۆ دەبنەوە:

١. ئاگادارتان دەکەینەوە کە ئێمە لەبەر کەم دەرامەتی ناتوانین ئەو پارەیە بدەین کە هەزار دینارە.

٢. جێی داخە کە لەم رووەوە هەستمان بەهیچ هاوکارییەك لەلایەن بەڕێوەبەرێتیەکەتانەوە نەکردووە.

٣. پێمانوایە ئەم بڕیارەی ئێوە خزمەت بەرەوتی رۆشنبیری ناکاو دەبێت هۆی کزکردنی بزوتنەوەی رۆژنامەگەری.

٤. ئێمە لەکاتێکدا چاوەڕوان بووین وەزارەتی رۆشنبیری دەستمان بگریو کۆمەڵو یارمەتیمانبدا.

٥. پێمان ناخۆشە وەزارەتی رۆشنبیری خۆی ببێتە ئێستە کۆسپ لەبەردەم رۆشنبیری

٦. ئێمە جەنابتان ئاگاداردەکەینەوە کە گۆڤارەکەدا دەخەینو ژمارەکانی دەرناکەیت.

٧. ئەو مافەش بۆ خۆمان بەرەوا دەبینین کە ئەم مەسەلەیە لەرۆژنامەکاندا بوروژێنینو بەرگری لە هەڵوێستی خۆمان بکەین.

٨. بە ئومێدی ئەوەی وەزارەتی رۆشنبیری خزمەتی رۆشنبیری بکا..منە وەڵامی ئەم نامە چاوەڕواننەکراوە پەرویز لەگەڵ بەڕێز وەزیری رۆشنبیری بە پەسەندمان زانی لە رۆژنامەی هەرێمدا رونکردنەوەیەك بنوسینو لەلاپەرە٣ی

ژمـاره١٦٩ی ١٢/٢٧ی رۆژنامـەی هەرێمـدا بەناونیشـانی(رونکردنەوەیـەك لـە بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوە) وەڵامێکی کورتی ناڕاستەوخۆی ئەو بەڕێزانەماندایەوەو هەر ئەوەندەمان بە پەسەند زانـی. بەڵام ئەو بەڕێزانە بەپێی خاڵی(٦)ی نامەکەیان ئەو مافەیان بە خۆیان داوەو لە لاپەڕە(٥ی گۆشەی(رای گشتی رۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە(٢٠٣٦) ١٢/٢٦سەر نووسەری گۆڤاری تایم بەڕێز رەفعەت محمەد یاسین لەژێر ناونیشانی(ئەو نەریتەی کە مامۆستا جەمال عەبدول دا یهێنـا حەقە وەزارەتـی رۆشـنبیری پەرەپێبـدات) نووسـینێکی بڵاوکردۆتـەوە.. لەبـەر ئـەوەی نووسـینەکە راسـتەوخۆ ئاراسـتەی مـن دەکـاتو دەشـیەوێ خشـکەیی رۆڵـی وەزارەتـی رۆشـنبیری لـە خزمـەتکردنی رۆشـنبیری کوردی بکاتە قوربانی بۆ چوونە ئاراستەکەی لەبەر ئەوەی نامەکەو نووسـینەکە تاوانبـار کردنـی تیادایـە لەبەرامبـەر رەوتـی رۆشـنبیریو رۆژنامەگـەری کوردیـدا بۆیە ناتوانم لێیان بێدەنگ ببمو وەڵامیان نەدەمـەوە.. بـۆ وەڵامـی نامەکـەی ئـەو بەڕێزانە دەمەوێت خاڵبەخاڵ وەڵام بدەمەوە...

١. لـەخاڵی (ا) دا وەکـو دەسـەڵاتێکی بـەرزتر لـە وەزارەتـی رۆشـنبیری قسـە لەگەڵ وەزارەتدا دەکەنو، دەڵێن(ئاگادارتـان دەکەینـەوە...)پێم سـەیرە کەسێکی یاسایی و خاوەنی بڕوانامەی کۆلێژی یاسا بـەم زمانـەو بـەم شێوەیە قسـە لەگـەڵ وەزارەتێکی حکومەتی هەرێمدا بکات، لە کاتیکدا وەزارەت هاوکاری کردووە.

٢. بـەڕێزیان ئەوەنـدە خۆیـان لـەوەزارەتو بـەڕێوەرێتی گشـتی وەزارەت بـەزلترو بـەتواناتر دەبیـنن، بۆیـە لـەخۆیانناگرنو نایانـەوێت سـەردانی وەزارەت بکـەن بەنامـە گۆڕینـەوە: گفتوگـۆ لەگـەڵ وەزارەتـدا دەکـەن. بـە ناحـەقی تفـەنگ بەتاریکیەوە دەنێت..

٣. لەخاڵی(٣)دا دەڵێن(پێم وایە ئەم بڕیارە...) ئەو بەڕێزانـە تـەنها خۆیـان بەخاوەنی وشـەی کـوردیو خـەمخۆری رۆشـنبیری کـوردی دەزانـن. نـازانن ئێمـە بڕگەکانی یاسا یەك جێبەجێدەکەین، کە هەموو رۆشنبیرانی کورد چەندین ساڵە هەناسەی بۆ هەڵئەکێشنو، خەباتی بۆ ئەکـەینو ئاواتیان بێتـەدی..کە ئەویش یاسـای حکومەتێکـە بـە نـاوی(حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتانە)و لەسـنووری دەسـەڵاتی ئـەم حکومەتـەدا لـەماوەی(٣)سـاڵدا(٩٨)بڵاوکـراوەی جۆراوجـۆر لـە رۆژنامـەو گۆڤـار مۆڵـەتی پێـدراوەو دەردەچێت. کـە هـەر هـەموویان یاسـای

چاپەمەنی وەزارەتی رۆشنبیری دەیانگرێتەوە..لەو(٩٨) بڵاوکراوەیە ئەگەر گۆڤارێك یان چەند گۆڤارو رۆژنامەیەك لەبەر هەر هۆیەك بێت دوابکەوین و دەرنەچێت وەکو(گۆڤاری تایم و) چەند گۆڤارێکی تر کە ئێمە لێیان ئاگادارین باوەڕ ناکەم کاریگەری لەسەر بزووتنەوەی رۆشنبیری و رۆژنامەگەری کوردی هەبێت..بۆیە لام سەیرە ئەو بەڕێزانە وابیرکەنەوە ئەگەر گۆڤاری تایم راوەستا یان دەرنەچوو ئیتر کەلێنێکی گەورە دەکەوێتە رەوتی بزوتنەوەی رۆژنامەگەری و رۆشنبیری کوردی گۆج وئیفلیج دەبێت و رۆشنبیرانی کورد دەستەوئەژنۆدادەنیشن.

٤. بەڕێزان لەدوورەوە تفەنگ بەتاریکیەوە دەنێنین و لە خۆیان ناگرن بێن بۆ وەزارەتی رۆشنبیری و دەردە دڵی خۆیان باس بکەین تابزانین وەزارەتی رۆشنبیری گوێیان لێئەگرین یان دەست بەروویانەوە دەنێین.

٥. لەم حالچەدا نیگەرانی خۆیان بەناحەق دەردەبڕن و تۆمەتی کۆسپ و دروست کردن بۆ رەوتی رۆژنامەگەری کوردی دەخەنە پاڵ وەزارەتی رۆشنبیری بۆیە دەبێت لەو بەڕێزانە بپرسین کۆسپ چییەو کام کۆسپ خراوەتە بەردەمی ئێوەو ئەو گۆڤارو رۆژنامانەی دەردەچن.ز چەسپاندنی یاسایەك حکومەتی هەرێم بڕیاری لەسەرداوە دەکرێنە کۆسپ و خەتی راست وچەپ بەسەر هەمووکارەکانی وەزارەتی رۆشنبیریدا دەهێنرێن.

٦. ئەو بەڕێزانە ئەوەندە خۆیان لەوەزارەت بەگەورەتر دەزانن ئاگادارمان دەکەنەوە کە گۆڤارەکەیان دادەخەن.زئەم مەسەلەیە ئاو زۆر دەکێشێ، ئەم برادەرانە لەبەر کەم دەرامەتی و بێ بودجەیی گۆڤارەکەیان داخستووە...بەڵام سەیر لەوەدایە وەزارەتی رۆشنبیری دەکەنە بیانوو...خەڵکین بەئێوە دەڵێم ئەمە شەڕیشە بەئێمەو وەزارەتی رۆشنبیری دەفرۆشن. برادەرینە ئێوە کە توانای دارایتان نییەو بودجەیەکی دیاریکراوتان بۆ پاشەکەوت نەکردووە. بۆ خۆتان دووچاری کارێکی وا قورس کرد کێ رووپلێتان ناو چەندتایمان بەکیسەو بۆدەربکەن...؟!

من لێتان ناشارمەوە رەنگە یەکێك بووم لەو کەسانەی کە ژمارەیە ژمارەی گۆڤارەکەتانم خوێندۆتەوە...بەڵام هەرگیز نەمزانیوە ئێوە بەوشارەزاییەی خۆتان سەرچاوەی بودجەی تایبەتتان بۆ دابین نەکردووە.

٧. لەخاڵی حەوتدا پارێزەرانە ماف دەدەنە بەخۆیان لەدژی وەزارەتی رۆشنبیری لەجیاتی دەرکردنی ژمارەکانی گۆڤاری تایم لاپەڕەی رۆژنامەکان بکەنە مینبەری وروژاندن وەزارەتی رۆشنبیری..من نازانم ئەم بەڕێزانە چۆن بیردەکەنەوە رۆژنامەکان لەکێ دەوروژێنن...؟هەڵوێست لەبەرامبەری وەزارەتی رۆشنبیری لەچی وەردەگرن؟ لەسەرچی و لەبارەتەقای چییدا رۆژنامەکان لەسەر وەزارەتی رۆشنبیری دەوروژێنن و هەڵوێست لەبەرامبەری وەردەگرن. وەزارەتی رۆشنبیری چی بەرامبەریان کردووە کەسی ناردۆتە سەر بارەگای گۆڤارەکەیان. نوسراوی کردۆتە سەریان بۆ داخستن زوڵمی لێکردووەو کەسیانی بۆ دادگاو یاخوانەخواستە بۆ شوێنێکی تر راکێشاون... باشە خۆتان لەهەردوو نامەکەتاندا ئاماژەتان بۆ هاوکاری وەزارەتی رۆشنبیری کردوە. ئەم وەزارەتە هەر ئەو وەزارەتەنییە هەر لەبەر ئەوەی تەنها وەزیرەکەی گوردران ئەگەرل وەزیری رۆشنبیری پێشوش هاوکاریکردین هەر دەکاتە وەزارەتی رۆشنبیری چونکە وەزیری رۆشنبیری لەسەرموچەی خۆی ئەو هاوکاریەی نەکردووە.

٨. لەکۆتایی نامەکەیاندا خۆیان ئاسا رێنمایی وەزارەتی رۆشنبیری دەکەن. لام سەیرە مرۆڤ ئەوەدەندە لەخۆی رازی بێت و بەوشیچوە. بیر بکاتەوەو قسە بکات.

بۆ وەلامی رەفعەت محەمەد یاسین سەرنوسەری گۆڤاری تایم دەبێت پەرەگراف بە ناوەرۆکی نوسینەکەدا شۆڕبینەوە. یەکەمجار ناونیشانی نوسینەکە لەپێش چاو، دەگرین کە مامۆستا ئاسا ئامۆژگاری وەزیری رۆشنبیری و وەزارەتی رۆشنبیری دەکات(نەریتی مامۆستا جەمال عەبدول دایهێناوە بکرێتە بەرنامەو پشتاوپشتی ئەم وەزارەتە لەسەر برۆن. ئەمەش تەنها بۆ ئەوەیە کە مامۆستا جەمال گۆڤارەکەی لەرەسمی یاسای مۆڵەت بەخشیون). دەڵێت (ساڵی ١٩٩٧ کە گۆڤاری تایمان دەرکرد هیچ سەرچاوەیەکی داراییمان نەبوو ئێستاش نیمانە..) من تێناگەم ئەم برادەرانە بەبێ دابین کردنی سەرچاوەیەك چۆن زانیان شان بدەنە بەرکارێکی وا قورس و بۆچی پێش بڕیاری دەرکردنی کاری جیدیان بۆ دابینکردنی بودجەیەك نەکرد وەکو هەموو دەڵێن(کاتێ بەرەسمی داوای مۆڵەتیان لەجەنابی وەزیری رۆشنبیری پێشوو کرد بەخۆشحاڵیەوە بڕیارە وەزارەت رەسمی مۆلچەت پێدانمان لێنەسێنێت من

ناچارم لێرەدا بڵێم مامۆستا جەمال کادرێکی باشی لەگەڵدا نەکردوون. یەکەم بەبەخشینی رەسمی مۆڵەت یاساکەی خۆی پوختەی کردبوو ئیمزایکردبوو نەیهێشت بچەسپێتو دووەم بەو بەخشینە کەمە خۆی لە هاوکاری دەرچوونی ئەو گۆڤارەوبەبڕێکی تر لەوپارەی رەسمە زیاتر چەندجارێ هاوکاری گۆڤاری تایمی بکردایە.. )

یان دەڵێن(کاتێک بەرەسمی داوامان لەبەڕێوەبەرێتی گشتی چاپ وبلاوکردنەوە کرد...)بەنوسراوی ژمارە٧٨٠لە١٢/٢١ وەلامی داینەوە کە بەڕێوەبەرێتیەکەی داواکەمان رەتدەکاتەوە. بۆ ئەوەی رۆشنبیران بزانن ئێمە لەسەر فەرمانی بەڕێز وەزیری رۆشنبیری ئەم شێوەیە نوسراومان بۆ کردوون.

بۆ/خاوەن ئیمتیازی گۆڤاری تایم.

ب/نوێکردنەوەی رەسمی یاسایی مۆڵەت: لەسەر بڕیاری بەڕێز وەزیری رۆشنبیری لەنوێکردنەوەی رەسمی یاسایی مۆڵەت نابەخشرێن بۆیە بەپێویستی دەزانی ئاگادارتان بکەینەوە، بۆجێبەجێکردنی یاسای چاپەمەنی وەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان سەر لە بەڕێوەبەرێتییەکەمان بدەن، بۆ ئەو مەبەستە هاوکاریتان مایەی سوپاسە. ئێمە کە ئاگادارمان کردوون سەرمان لێبدەن لەبەرنامەماندا بووە کە کارێك بکەین نەشیش بسوتی ونەکەباب بەلام ئەم برادەرانە دیارە لەبەر هەر هۆیەك بووە بڕیاریانداوە گۆڤارەکەیان دابخەنو بەداخەوە منو، وەزارەتی رۆشنبیری دەکەنەبیانوو..ئەگەر ئەوبرادەرانە ئەوەندە پەرۆشن بۆ رەوتی بەرەوپێش چوونی رۆژنامەگەری کوردی، بۆ لەخۆیان نەگرتو سەریان لەوەزارەت نەدا...وەزیر دەرگای بەرووی کێدا داخستوە دەیان چ فەرمانبەرێکی وەزارەت خۆی لەخەڵکی رۆشنبیرو خاوەن ئەزموون جیاکردۆتەوە کێ پرسگەی هەیەو رۆژانە دەیان رۆشنبیرو نووسەر سەر لەوەزیرو بەڕێوەبەرەکانی وەزارەت دەدەن، دەڵێن(ئەو مافەمان بۆخۆمان هێشتەوە کە بەرگری لە هەڵوێستی خۆمان بکەین...) باشە من لێتان دەپرسم کامتان هاتنە وەزارەت، کێ مافی پێشێل کردوون کێ زوڵمی لێکردوون کێ هاتەسەرتانو گۆڤارەکەتانی داخست کێ کێتانی پەلکێش کرد. کێ وکەی فەرمانی داخستنی گۆڤارەکەتانی دەرکدووە؟ هەڵوێست لەبەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپوبلاوکردنەوە لەکام سەنگەری دژ بەگەلو رۆشنبیری کوردیدا وەردەگرن؟

وەزارەتەکانی حکومەتی هەرێم ئەو گۆڤارورۆژنامانەی ئێوە پەنایی بۆدەبەن هەروەکو گۆڤارەکەی لەمەڕ ئێوە بەپێش یاسای چاپەمەنی وەزارەتی رۆشنبیری ناڕۆنو هەمان یاسا نایانگرێتەوە تەنانەت ئەو رۆژنامەیەی کەنوسینەکەی تیادا بلاوکردۆتەوە خۆی(٣)لەبەشێکی تری نوسینەکەیدا دەڵێن(ئێمە دامەزراوێك ئێمە کە داراییەکی زۆرمان هەبێت.زگۆڤارەکەشمان گۆڤارێکی لێبڕا لەو هیچ حیزبێكو لایەنێکی سیاسی لە پێشییەوە نییەو بەبودجەکەی بەهەزار فەلاکەت داین دەکرێت.)

خەڵکینە کورد بدوێنە شەرعی خۆیدەکات، باشە ئێوە بێ سەرمایەو دەست مایە کێ لێیان پاڕایەوە گۆڤاریان بۆ دەربکەین هەر دەرتان دەکرد بۆ روتاننەکردە دەزگاکانی حکومەتی هەرێمو حیزبو لایەنو رێکخراوەکان ناکەم تا زۆری هەر ژمارەیەك هاوکاریتان بکرێت. بەهەزار فەلاکەت گۆڤار چۆن چاپ دەکرێتوبلاودەکرێتەوە. لەوەنابێتەوەو دەڵێن(هەر ژمارەیەکیش دەریدەکەین نزیکەی شەش هەزار دینار زەرەر دەکات)و دیسان دەڵێن(کەچی بەڕێوەبەری گشتی چاپو بلاوکردنەوە وا تێگەیشتووە کە گۆڤارەکەمان قازانج دەکاو دەیەوی لەو قازانجە رەسمی خۆیان لەم ولاتەدانو هەر خۆشیان رۆشنبیرورۆژنامەگەری کوردی نیە. برادەرینە بەڕێوەبەری گشتی لە حەفتاکانەوە خەریکی دەردی سەری گۆڤارو رۆژنامەیەو زۆرجار دەزانین حاڵی رۆژنامەگەری کوردی چۆنەوباش دەزانین رۆژنامەیەك یان گۆڤارێك نییە ئێستا لە کوردستاندا دەربچێتو نەك قازانج بکات بەڵکە زەرەی زۆریش نەکات بەلام ئەمانە هەر هەموو ناکاتە ئەوەی کە یایای چاپەمەنی حکومەتی هەرێم وەلابخرێنو بۆ ئلرەزووی کەسێك یان چەند بدرێت.. کەسیش باسی زەرەرو قازانجی لەگەل ئێوەدا نەکردووە. مامۆستا جەمال لەبەرئەوە مامۆستاو وەزیری چاك بووە تەنها لەبەر ئەوەی ئێوەی بەخشیوە بەلام منووەزیری رۆشنبیری هەر هەموو پیاوی خراپ کۆسپین لەبەردەم گەشە کردنی رۆشنبیری کوردیدا...زۆر سەهونو موعادەلەکەتان تێکچووە باشتر وایەبەخۆتاندا بچنەوە. لەبەشێکی تری، نوسینەکەیدا دەڵێن(خودی وەزارەتی ئەو وەزارەتە...مووچەیان وەرنەگرتووە.)من نازانم بەڕێز رەفعەت ئەم زانیاریەی لەکێولەچ سەرچاوەیەکەوە وەرگرتووە کە پێینەدراوە. باشە وەزارەتی رۆشنبیری یەکێك نییە

لەوەزارەتەکانی حکومەتی هەرێم؟ حکومەتی هەرێم ماوەی ساڵێکە مانگانە بەردەوام مووچە نادەنە فەرمانبەران.)؟

چۆن ئەم بوختانە بۆ حکومەتی هەرێم دەکات، بیرلەوە ناکاتەوە کە بوختانی وادەبینن لێپرسینەوەی هەبێتو کوردستانی نوێ دەدرێتە ئەنتەرنێتو بانگەشەی لەم جۆرە بۆ ناوبانگی حکومەتەکەمان خراپە. ئەگەر وەزارەتی رۆشنبیری وەك ئەو دەڵێنبودجەی لەلایەن حکومەتی هەرێمەوە بۆ تەرخاننەکراوە ئەی چۆن لەساڵی(١٩٩٩) (٣٧)چاپ دەکاتو(٤) کتێبو گۆڤاروکۆمەكوهاوکاری دەکات، گۆڤاری هەزارمێردو رۆژنامەی هەرێمو گۆڤاری یەکێكو دەردەکاتو رادیۆی هەرێم رۆژانە کاردەکات..بۆیە من لێرەدا داوا لەبەرپرسان دەکەم کە لەسەر ئەم بوختانەی رەفعەت محەمەد بێ دەنگ نەبنو بزانن ئەو زانیاریە ئاراستەی لەچ سەرچاوەیەکەوە وەرگرتووەو مەبەستی لەم بوختانە چییە.

دیسان لەبەشێکی نووسینەکەیدا هاتووە(بەرێوەبەرێتی گشتی چاپوبڵاوکردنەوەش لەباتی ئەوەی هەلومەرجێکی لەبار بۆ دەرچوونی ئەو گۆڤارانە فەراهەم بکات، خۆی ( رەنگە بەبێ ئەوەی کەبەستی بی)دەبێتە هۆی یان چەند سەربەرزیە تەنها خۆی نەبینێنو ئەمەی رەنجو ماندووبوونی کەسانی تریش لەپێش چاوبگرێتو، چەندیش دزێو قەیزەونە کە تەنها خۆی بەهەمووشت بزانێتو رێزی کەسانیتری لانەبێتو پاك بێت لەئاستی ویژدانی.
بۆیە دەبێت لێی بپرسم. نوسەرانی بەرێوەبەری چاپو بڵاوکردنەوەی کردوە یان بەریوەبەری گشتی چاپوبڵاوکردنەوە چ فەرمانێکی دەرکردووە بێ یاساییەکی کردووە؟ تەنها لەبەر ئەوەی دەیەوێت یاسا لەم وڵاتەی ئێمەدا سەروەربێت فارس یوسفو رەشە کوژی پلاری بی ویژدانانە دەهاوێت خوا وەزارەت بگرێت کە یاسای چاپەمەنی وەزارەتی کرد بۆوە چاپخانەوەو دەرگای لەسەر کلۆم دابوو..من هەمووکەس دەزانین نەك لەبەر هەزار دینار رەسمی یاسای کە دەبێتە داهاتی حکومەتی هەرێم دەبمەخاوەنی هەڵوێست بەڵگە زۆر زۆر لەو برادەرانە یەخەی رەوتی رۆشنبیریو رۆژنامەگەری کوردیە ئەگەر ویژدان مابێت خەڵك باش دەزانێت تەمەنێکم لەسەر داناوە...گلەییان لێناکەم خۆیان وتەی لیبرالو لیبرالیس تۆمەی لەسەر نییە. )

# ( وەزارەتی رۆشنبیری وتایبە تمەندێتی
# کارو چالاکییەکانی بالە پێش چاوبگرێت.. )

لەدوا ستوونی ژمارە(٢٤٧٩)ی کوردستانی نوێدا، مامۆستا(جەزا عەلی ئەمین). چەند بۆچوون و سەرنجێکی، لەسەر چاپ و چاپکردن و، بەڕێوەبەرێتی گشتیی چاپ وبلاوکردنەوەی سەر بەوەزارەتی رۆشنبیری نووسیبوو. دلنیام نووسەر لەڕوانگەی پەرۆشی، بۆ رەوتی بەرەو پێش چوونی ڕووناکبیری گەلەکەی و گرنگی وەزارەتەکە، ئەو نووسینەی نووسیوە بەراوردەکەشی لەگەڵ دەزگاکانی جیا لە وەزارەتەکە، بەهەند گرتنی تایبەتمەندێتی کارەکانی وەزارەتە، لە قۆناغی ئێستای حکومەتی هەرێمدا، بۆیە بە پێویستمزانی چەند خاڵێك بۆ نووسەروخوێنەران ڕوونبکەمەوەو ڕاو سەرنجی خۆم بخەمە پاڵ بۆچونەکانی:-

١. بەڕێوەبەرێتی گشتیی چاپ و بلاوکردنەوە، لەناوەڕاستی ساڵی(١٩٩٩)دا دامەزراوە، لەدامەزراندنییەوە تائێستا بە دەرامەتێکی کەم (٧٤) کتێبی جۆراوجۆری چاپکردووەو (١٣) نووسەرو رۆژنامەو گۆڤاری هاوکاریکردووە.

٢. وەزارەتی رۆشنبیری،لەم بارودۆخەی ئێستای حکومەتی هەرێمدا، ئەرکی گەورەی مێژوویی بۆ بوژاندنەوەو ساغکردنەوەی شوێنەوارو مێژوو، فەرهەنگ و کەلەپوورو هونەرو بەرەو پێشبردنی روناکبیری گەلە کەمانی کەوتۆتە ئەستۆ. بۆ بەئەنجام گەیاندنی، ئەو ئەرکە مێژووییە، وەزارەت پێویستی بەژمارەیەکی زۆر لە نووسەران و ڕووناکبیرانی شارەزاو بەتواناو خاوەن ئەزموون هەیە. کەلە وەزارەتەکەدا کار بکەن و لێوەی نزیکبن.

دەبوو ئێستا وەزارەت پڕبووایە، لەو جۆرە نووسەرو ڕووناکبیرانەو، بەداخەوە وەزارەت لەو ڕووەوە بێکەس و هەژارە.

لەکاتێکـدا دەزگـا جیاجیاکـانی بـەدەر لـەوەزارەت، پـڕن لـە نووسـەرانو، ڕووناکبیران. بۆیە هەر دەزگایەك لە شوێنی خۆی جێگای وەزارەتی ڕۆشنبیری گرتۆتەوە.

٣. وەزارەتی ڕۆشنبیری دەبوو ئێستا، باشترین چاپخانەو زۆرترین ئامێری چاپکردنو، هـەموو ئامێرێکی چاپخانەو کادری چاپو چاپکردنی هەبوایـە. بەڕێوەبەرێتییـە گشـتیەکانی شـوێنو جێگـای گـەونجاویان بەهـەموو پێداویستیەکانەوە بۆ دابین بکرایە.

بوودجـەی پێویسـت بـۆ کـارو ئـەركو چـالاکییەکانیان تـەرخان بکرایـە. سیستەمی گونجاو بۆ ڕاپەڕاندنی کارو چالاکییەکان دابنرایەو، کار ئاسانی لە هـەموو ڕوویەکـەوە بـۆ بکرایـە. کـە بەداخـەوە، وەزارەت لـەو ڕووانـەوە فەرامۆشـکراوەو، کەوتۆتـە پـەراوێزی دەزگـاو بنکـەو ناوەنـدە ئەدەبیو ڕووناکبیریەکانی جیا لەوەزارەت.

ئەگـەر بـەراوورد لـەنێوانی وەزارەتو، ئـەو دەزگایانـەدا بکـەین لـەڕووی دەرامەتو کارو سیستەمیانەوە، هەست بەجیاوازییەکی لە ڕادە بەدەر دەکرێت، کە وەزارەتـی لێبـێ بەشکراوە. حکومەتی هـەرێمی کوردسـتان، ئەرکی قورسو گەورەو مێژوویی کەوتۆتە ئەستۆ، بۆ بەرەو پێش بردنـی ڕەوتـی و بوژاندنـەوەی کەلتورو فەرهەنگ و مێژوو هونەرو شوێنەواری گەلەکەمان. بۆیە دەبوو ئێستا لەم وەزارەتەو بەڕێوەبەرێتی گشتیی چاپوبڵاوکردنەوە، زۆرترین لە نووسەرانو ڕووناکبیران،و پسـپۆرانی خـاوەن ئـەزموونی بـواری نووسـینو، وەرگێـڕانو زمانـەوانیو هەڵسـەنگاندن، چـاپو چـاپکردن، کۆببوایەتـەوەو جمـەی بهاتەیەو.سوود لەتواناو پسپۆڕیان وەربگیرایـە. بـەڵام ئەم دیاردەیە زۆر کزەو هیچ وەکو پێویست نییەونابینرێت. بەپێچەوانەی، دەزگاکانی دەرەوەی وەزارەتە لەم ڕووەوە دەوڵەمەندو بەختەوەرن، من سوپاسی ئەو دەزگایانەو ئەو بەڕێزانە دەکەم کە هاوکاری دڵسۆزانەمان دەکەن لەکاروئەرکەکانماندا...

٤. سـەبارەت بـە(دەسـت خۆشـانەی نووسـەران)وەك نووسـەر ئامـاژەی بـۆ کـردووەو، لای ئێمـە (پاداشـتی نووسـەرانە)، لەسـاڵی(٢٠٠٠)دا یاسـایەك بەناوی(ڕێنماییەکانی کۆمەککردنو چاپکردنی کتێب لە وەزارەتی ڕۆشنبیری) دەرکـرا، لـە ڕێنماییەکانـدا هـەموو لایـەنێك ڕەچـاو کـراوە، بەپاداشـتی نووسەرانیشەوە. لەچاپکردنی چەند کتێبێکدا. پەیڕەوی ڕێنمایەکانکرا. بەڵام

هەر لە هەمان ساڵدا، ڕێنماییەکان پشتگوێ خران و پاداشتی نووسەران بوو بەچوار یەکی بەرهەمە چاپکراوەکە...دڵنیام ئەگەر بەو ڕێنماییانە کار بکرایە گلەیی نووسەرونووسەران روبەڕومان نەدەبووەوە. بە ئومێدین بگەڕێینەوە بۆ ڕێنماییەکان.

٥. وەزارەت بەرنامەی کۆمەککردن و چاپکردنی کتێبی، ساڵانەی لەساڵی ٢٠٠٠دا کردە چوار وەرز.بۆ هەر وەرزە بەرنامە دارێژرا. لەناوەڕاستی هەمان ساڵدا وەزارەتی دارایی و ئابووری بوودجەیەکی سێ مانگ جارێکی بۆ چاپکردنی کتێب تەرخانکرد. هەرچەندە بوودجەکە لەچاو دەزگاکانی تردا زۆر کەمبوو، بەڵام لاکردنەوەیەکی دڵسۆزانەو هەنگاوێکی زۆر باشبوو بۆ ڕاپەڕاندنی بەرنامەی وەرزەکانی وەزارەت. لەهەمان ساڵدا دووجار ئەو بوودجەیە وەرگیراو، بوو بە هۆی چاپکردنی کۆمەڵێ کتێبی باش و کۆمەککردنی چەند نووسەرو گۆڤارو ڕۆژنامەیەك. لەساڵی(٢٠٠١)دا دەبوو ئەو بوودجەیە لە یەکەم مانگی وەرزەکەدا وەربگیرایە، بەڵام وەرزەکە تەواوبوو، لە کۆتای مانگی یەکەمی وەرزی دووەمدا وەرگیرا....

دیارە هەموو دواکەوتنێکی بوودجەکان دەبێتە هۆی دواکەوتن و تێکچوونی بەرنامەی وەرزەکان.

سەبارەت بە ئەدەبی منداڵان کە نووسەر بە دڵسۆزییەوە خەمی بۆدەخوات، وەزارەت ئەو بوارەی زۆر بەلاوە گرنگ بووە. لەسەردەمی مامۆستا(جەمال عەبدول)دا گۆڤارێکی مانگانەی منداڵانە بەناوی(جریوە) دەردەچوو، خزمەتی باشی بەو بوارە دەکرد. بەڵام ئەو گۆڤارە لەبەر بێدەرامەتی، راوەستا. لەو کتێبانەی چاپکراون و کۆمەککراون زیاتر لە(١٤)ە یان ئەدەبی منداڵانە.دوای ڕاوەستانی (جریوە) دووساڵە بە بەردەوامی لە هەوڵداین، بۆ دەرکردنی گۆڤارێکی مانگانەی منداڵان لەشێوەی(جریوە وپەپولە) بەڵام تائێستا هەوڵەکەمان لەبەر بێدەرامەتی سەرینەگرتووە.

لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێ بەرهەمی باشی ئەدەبی منداڵانمان لا کۆبۆتەوە، لەبەرنامەماندایە.کە لەوەرزەکاندا چاپیان بکەین. خواستی نووسەرو منداڵانی کورد تاڕادەیەك بهێنێتە دی.

٦. نووسەر باسی (مافی لەچاپدانەوەی) کردووە. ئەو مافە کە زەوتکراوە. لەبڕگەیەکی بەندی دووەمی ڕێنماییەکاندایەو ئەگەر لەسەر ڕێنماییەکان

بڕۆیشتینایە. ئەو گلەییەش نەدەکرا. بەڵام ئێستا لەسەربڕیاری وەزیر ئەو مافە ڕەها کراوە. ڕێگا لەهیچ نووسەرێك ناگیرێت.

نووسەرو لەکۆتایی نووسینەکەیدا سەرباری تێگەیشتن و دەرخستنی راستیەکان، داوای لە بەڕێز سەرۆکی حکومەتی هەرێم و بەرپرسانی حکومەتی هەرێم کردووە. گرنگی زیاتر بدەنە وەزارەت و بەڕێوەبەرییێتی گشتیی چاپ وبڵاوکردنەوە. پێداویستیەکانیان بۆ دابین بکرێت و دەرامەتی زیاترو باشتریان بۆ تەرخان بکرێت....وەزارەتی رۆشنبیری هاودەنگن لەگەڵ نووسەردا، پەرۆشی پێشکەوتنی رەوشی روناکبیری کوردە. دەیەوێت ئەوەی بۆیدەکرێت لەبواری کارەکانیدا، بەپێی دەرامەتەکەی جێبەجێی بکات.... بۆیە لەڕێگای ئەم نووسینەوە داوا لەبەڕێز سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان و وەزارەتی دارایی و ئابووری دەکەین...تایبەتمەندێتی کاروئەرك و چالاکییەکانی وەزارەتەکەمان و بەڕێوەبەرییێتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوەو بەرپوەبەرێتیەکانی تر لەپێش چاو بگرن. بایەخی زیاترو باشتر بدرێتە وەزارەتەکە..شێوەو جۆری کارکردنی رەچاو بکرێن. رەچاوی ئەوەش بکرێت که ئەم وەزارەتە یەکێکە لەو وەزارەتانەی کە بڕیاری(٩٨٦) نایگرێتەوە، ئەرك و کارەکانی ئەم وەزارەتە لە ئەرك و کارەکانی وەزارەتەکانی تر جیاوازە هەر وەکو لەخاڵی دووەمدا ئەرکی مێژوویی وەزارەت دەست نیشانکراوە.

بەپێویستی دەزانم بڵێم ئەرك و کارەکانی بەڕێوەبەرییێتی گشتیی چاپ وبڵاوکردنەوە، دەقاو دەق وەکو کارو ئەرکەکانی (دەزگای چاپ وپەخشی سەردەم)ە ئەو سیستەمەی ئەوان کاری لەسەر دەکەن، دەبێت ئەم بەڕێوەبەرێتیەش بەو سیستەمە کار بکات. بەستنەوەی بەچەند بەندو بڕیارەوە دەبێتە هۆی راوەستانی کارو چالاکیەکانی وەزارەت. جا بۆ ئەوەی نووسەران و روناکبیرانی گەلەکەمان لەم هەلومەرجەی ئێستای کوردستاندا، لە ڕێگای وەزارەتی رۆشنبیرییەوە، دەست گیرۆیی کۆمەکبکرێت بۆ چاپکردنی بەرهەمەکانیان وا دەخوازێت کە بەکاروئەرکەکانی وەزارەتەکەدا بچینەوە، بەڕێز سەرۆکی حکومەتیش پاڵپشتی وەزارەت بێت لەنزیکەوە لەداواکانی بکۆڵێتەوەو کێشەو گرفتەکانی بۆ چارەسەر بکات، لە کۆتاییدا سوپاسی مامۆستا (جەزا) دەکەم کە بواری بۆ رەخساندین لەڕێگای ئەم نووسینەوە سەرنج و بۆچوونەکانی دەوڵەمەند بکەین.

## (گۆنگرەی دەی مامۆستایان دەبێت لەخزمەتی مامۆستایاندابێت)

لەساڵی ١٩٩٩لەسنوری حکومەتی هەرێمی کوردستاندا، زۆربەی رێکخراوە پیشەیی و جەماوەرییەکان. ئازادانەو لەکەش و هەوایەکی دیموکراسیانەدا پرۆسەی هەڵبژاردنیان ئەنجامدا...هەڵبژاردن پرۆسەیەکی دیمکراتیانەی گرنگەو هەنگاوێکی دڵخۆشکەرە...لەم پرۆسانەدا چەند خاڵێك رەچاودەکرێ.

١-هەموو ئەندامانی رێکخراوەکان مومارەسەی مافێکی گرنگی خۆیان دەکەن لە خۆهەڵبژاردن ودەنگداندا.

٢-دەستەی سەرکردایەتی رێکخراوەکان ئاڵوگۆڕیان تێدەکەوێت و کەسانی نوێ دێنە پێشەوەو هەندێ کەسی بێتوانا وبێدەسەڵات لادەکەون.

٣-کۆنگرە بەپێی بارودۆخی نوێ بەرنامەی رێکخراوەکەی دەگۆڕێت و بەنەفەسێکی نوێکار بۆ جێبەجێکردنی دەکرێت.

٤-کۆنگرە بەکاروئەرکەکانی دەستەی پێشوودا دەچێتەوە، ئەوەی جێبەجێکراوە هەڵسەنگاندنی لەسەر دەکرێت، بەپێی چۆنێتی جێبەجێکردنی و ئەوانەشی ماونەتەوەو جێبەجێنەکراون بەرنامەی بۆ دادەنرێت.

یەکێتی مامۆستایان یەکێکە لە رێکخراوە پیشەییە فراوان و بایەخدارەکان، لەدوای راپەرینەوە یەك کۆنگرەی بەستووەو بەپێی بارودۆخی نوێی کوردستان بەرنامەی نوێی پەیرەوی نوێ بۆ داڕێژراوە، بەداخەوە لەماوەی ئەم چەند ساڵەدا دەبوو(ی.م.ك)چەند گۆنگرەیەکی ببەستایە. بەڵام دیارە ئەوەش بەهۆی بارودۆخی کوردستان و شەڕە ماڵ وێرانکەرەکەی کوردستانەوە، نەتوانراوە کۆنگرەی مامۆستایان ببەسترێت... وەکو لەسەرەوە ئاماژەم بۆکردووە، لەم ساڵەدا یەکێتی مامۆستایانی کوردستانیشی گرتۆتەوە، ئومێد دەکەین کۆنگرەکە بەسەر کەوتوویی کارەکانی ئەنجامدات و لەئاست وخواستی مامۆستایاندابێت، بەرنامەی نوێ و دەستکەوتی نوێ بۆ مامۆستایان دەسەبەربکات. کۆنگرەیەك هەر بۆ کۆگرەنەبێت. بەڵکە لە کۆنگرەکەدا گۆڕانکاری بنەرەتی لەهەموو بەرنامەکان(ی.م.ك)بکات، رۆڵی کاریگەر بۆ بواری پەروەردەو فێرکردن دابڕێژێت.

# شۆڕش و گفتوگۆ و( مەنعی تەجەول )ی ١٩٨٥و ڕێکخستنە نهێنیەکانی ناو شار..

**سەرەتا..**

یەکێتی نیشتمانی کوردستان، دوای کارەساتی گەورەی هەرەسی شۆڕشی ١٩٧٥، لە بار و دۆخێکی یەکجار سەخت و پڕ مەترسیدا و لە ساڵی ١٩٧٦، شانی دایە بەر هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش، بانگەشەی هەرەس بە هەرەسی، لە ڕۆژگارێکدا کرد، بەعس و ڕژێمەکەی سەرقاڵی شایلۆغان و ئاهەنگی سەرکەوتنیان بوون، بەسەر شۆڕشی کورد و بزووتنەوەی کوردایەتیدا.. سەرکەوتنەکەیان ئەوەندە لا گەورە و کاریگەر بوو، لە رادە بەدەر لوتبەرزی و لە خۆ بایيبوونیان پێوە دیار بوو... بێ باکانە لە هەموو کۆڕو کۆبوونەوە و بۆنەیەکدا، رایاندەگەیاند(دار خورما لە سەر لوتکەی شاخەکان دەڕوێت، بەلام جارێکی تر شوڕشی کورد و بزووتنەوەی کوردایەتی دروستنابێتەوە)... بەڵێ لەو بار و دۆخەدا(یەکێتی) بە بەرنامەیەك شۆڕشگێڕانەی نوێ بە نەفەسێکی درێژ و لەخۆ بوردوانەوە، شۆڕشی نوێخوازی گەلەکەمانی هەڵگیرساندەوە... بۆ بەعس و ڕژێمە دیکتاتۆریەکەی سەلماند، کە کورد و بیرو باوەڕی کوردایەتی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردستان، بە هەموو توانای بەعس و سیاسەتی شۆڤێنیانەی، لە ناو نابرێت و گیانی شۆڕشگێری پێ کپ و خامۆش ناکرێت بۆیە.. لە هەڵمەتی مەفرەزە سەرەتاییەکانی پێشمەرگەوە هەر زوو سڵەمیەوە و ئاهەنگی سەرکەوتنەکەیان لێتێکدرا و هەر زوو کەوتنە خۆیان بۆ بەرەنگاری و سەرکوتکردنەوەی شۆڕش... بەلام بە توانای هەموو دام و دەزگا سەرکوتکەرەکانی، بە بەهێزی سوپا پڕ چەك و تێر و تەسەلەکە، بە هەموو خۆفرۆش و خەڵکە بەزیوەکان، بە هەموو توانای دارایی، نەیتوانی بڵێسەی شۆڕشی نوێخوازی گەلەکەمان، دامرکێنێتەوە. بەڵکە ڕۆژ بەڕۆژ و هەفتە بە هەفتە و مانگ بە مانگ. مەفرەزەی پێشمەرگە زیادی دەکرد و خەڵکی شۆڕشگێڕی

کوردستان، پەیوەندییان بە هێزی پێشمەرگەوە دەکرد.. کار گەیشتە ئەوەی کە ڕژێم و هەموو دام و دەزگاکانی بە تەواوی شپرزە بووبوون...
شۆڕش بێ وچان لە حەفتاو شەشەوە تا کۆتایی ساڵی هەشتا و سێ لە چالاکی و نەبەردی و داستانی پێشمەرگانەدا بەردەوام بوو، ناوچەکانی جێگیر بوونی هێزەکانی پێشمەرگە لە کوردستاندا ڕۆژ بە ڕۆژ زیادی دەکرد و داگیرکەر پاشەکشەی تیادا دەکرد.

## ساڵی ١٩٨٣ و نەبەردییەکانی پێشمەرگە : -

لە ساڵی هەشتا و سێدا، بە پێی بەرنامەیەکی داڕێژراو لە لایەن سەرکردایەتی و مەکتەبی عەسکەرییەوە، چالاکی پێشمەرگە ڕۆژانە لە زیادبووندا بوو، هەر ڕۆژە لە قوڵێك و ناوچەیەکەوە، داستانی سەرکەوتن تۆمار دەکرا. سوپا داگیر کەرەکەی ڕژێم و هەموو چەکدارە جاشەکانی ڕژێم، ڕۆح بە گیانیان زەرد نەدەبوو، لە هەر کات و ساتێکدا هەڵمەتی پێشمەرگەیان بکرایەتە سەر بێ بەرگری و بێ وەڵامدانەوە، خۆیان سەربازگە و ڕەبیە و مۆڵگاکانیان دەدایە دەست هێزی پێشمەرگە.. داستانی گرتن و پاککردنەوەی بێتواتە.. بە تەواوی چاوی خۆفرۆش و چەکدارەکانی ڕژێمی شکاند.
چالاکی و دەستوەشاندنی هێزی پێشمەرگە هێزەکانی بەعسی شپرزە و سەر لێشێواو کردبوو، لە لایەکی ترەوە هێزەکانی ئێرانیش پەلاماری یەك لە دوای یەکی عیراقیان دەداو، گوشارێکی ئەوتۆیان خستبووە سەر ڕژێمی عیراق.. هەستی دەکرد لە ناوچەکانی کوردستان هیچ دەسەڵاتێکی نەماوە و گەر بەو شێوەیە بارو دۆخەکە بمێنێتەوە، ناچار دەبێت کە ناوچەکانی کوردستان چۆڵبکات... لە ئەنجامی چالاکی پێشمەرگە و فشاری زۆری هێزەکانی ئێران. بەعس ملی لە بەردەم ئیرادەی شۆڕش و گەلی کوردا دانەواند. بە ڕێگای تایبەتی ناچار بوو داوای وتووێژ لە سەرکردایەتی شۆڕش بکات بۆ ڕێکەوتن و چارەسەر کردنی کێشەی ڕەوای گەلی کوردستان... سەرکردایەتی( ی. ن. ك) یش لە بەر ئەم هۆیانە وتووێژی لە گەڵ ڕژێمدا قبوڵکرد : -

١ـ باوەڕبوونی هەمیشەی بە وتوویژ و دانوستاندن، بۆ چارە سەر کردنی کێشەی گەلەکەی.

٢. ماوەی ( ٨ ) ساڵی ڕەبەقبوو.. پێشمەرگە لە شەڕدا بوو.

٣ـ هێزی پێشمەرگە ماندو و بێ تاقەتبووبوو، پێویستی بە حەوانەوەیەك هەبوو.

٤. هێزی پێشمەرگە لە ئەنجامی شەڕ و بەر بڵاوی جەبهەکان، کەمدەرامەتی و بێ تفاقی لە ڕووی چەك و تەقەمەنی پێوە دیار بوو.

٥ـ هێزەکانی پێشمەرگە و ڕێکخستنەکان، لە بەر ئاڵۆزی بار و دۆخەکە نەدەپەرژایە سەر بە خۆدا چوونەوە و خۆ ڕێکخستنەوە بۆیە پێویستی بە پشوویەك هەبوو، بۆ حەوانەوە و خۆڕێکخستنەوە و خۆ سازدانەوە.

٦. جەماوەری خەڵکی کوردستان لە گوندەکان و ناو شارەکان تەواو ماندوو بووبوون بە دەست فشار و توند و تیژی ڕژێمەوە، وپێشبینی ئەوە دەکرا کە بە تێکەڵاوبوونی هێزی پێشمەرگە بە جەماوەری شارەکان.. دەتوانرێت زەمینەی لە بارتر بۆ بەرەو پێشچوونی شۆڕش بڕەخسێت و خەڵکەکەش پشوویەك بدات...

٧. گفتوگۆ دانوستان لە گەڵ حکومەتدا، داننانە بە شۆڕش و داخوازییەکانی گەلی کورد و سڵەمینەوەی چەکدارە خۆفرۆشەکانە لە ئەڵقە لە گوێی و خۆ فرۆشی و پاشگەز بوونەوەی ئەو کەسانەیە کە بۆ پلە و پایە و پارە بوونەتە پیاوی ڕژێم و دژی شۆڕش و گەلەکەیان ڕاوەستاون.

دوای داستانی بێتواتە لە ٢٢ / ١٠ / ١٩٨٣لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٣ سەرکردایەتی(ی.ن.ك) پرۆژەیەکی بۆ داخوازییەکانی گەلی کورد ئامادە کرد و وەفدی بۆ وتو ویژ دیاریکردو، دەستکرا بە هاتوو چۆی وەفد لە نێوانی شۆڕشو حکومەتدا و، بەڕەسمی لە نێوانی حکومەت و شۆڕشدا شەڕ ڕاوەستا...

## ماوەی وتوویـژ و شەڕ ڕاوەستان و جەماوەر و ڕێکخستنی ناو شارەکان و هێزی پێشمەرگە : -

لە سەرەتادا ڕژێم زۆر بە پەرۆشەوە، کەوتە هاتوو چۆ بۆ کوردستان، بە پێی هەڵس و کەوتەکانی، سەرکردایەتی و جەماوەر، وای بۆ دەچوون، کە ڕژێم دەیەوێت چارەسەری کێشەی کورد بکات بە دانووستاندن و ئاشتی.. مەفرەزە و هێزەکانی پێشمەرگە بارەگا و بنکەکانیان لە شار و شەقامە گشتیەکان نزیککردەوە بێ سڵەمینەوە و ترس دەهاتنە ناو شارەکان و تێکەڵاوی جەماوەر دەبوون جەماوەریش بێ ترس هەڵس و کەوتیان لە گەڵدا دەکردن.

لە سەرکردایەتیەوە، ڕاسپاردەی ڕێکخستنەکانی ناو شار کرا، کە خۆیان بۆ ئاهەنگی ڕاگەیاندنی ڕێکەوتن ئامادە بکەن، بۆ ئەم مەبەستە چەندین دروشم و ئامۆژگاری نێردرایە خوارەوە بۆ ڕێکخستنەکان و لە لایەن ڕێکخراوی سلێمانی و شارەکانەوە لیژنە بۆ ڕاپەڕاندن و سەرپەرشتی ئاهەنگەکە پێکهێنرا.. لە ماوەی وتوویـژدا خەڵکێکی زۆر ڕوویانکردە ڕێکخستنەکان ژمارەیەکی زۆر بوونە پێشمەرگە.. تەنانەت لە چەکدارەکانی ڕژێم ( جاشەکان ) زۆریان پەیوەندیان بە ڕێکخستن و فەرماندەکانی هێزی پێشمەرگەوە کرد. شان بە شانی چەکدار و جەماوەر، لە ناو ریزەکانی سوپادا پەیوەندی زۆر دروستکرا... ڕێکخراوی سلێمانی بۆ پێشوازی و قۆزتنەوەی خەڵکەکە بۆ ناو ریزەکانی ڕێکخستن، چەندین ڕێنمایی و ئامۆژگاری بە پەخشنامە دابەزاندە خوارەوە بۆ کەرت و پۆلەکان.. بەرنامە و شێوازێکی نوێ بۆ وەرگرتن و قۆستنەوەیان دانرا.. هەموو ئەو کەسانەی کە تازە دەهاتنە ناو ڕێکخستنەوە، ژمارەی تایبەتیان وەکو ناوی نهێنی بۆ دانرا.. بەو ژمارە تایبەتە لە ڕێکخستنە کۆنەکان جیا دەکرانەوە هەر هەموویان لە شانەی تایبەت و هێڵی تایبەتدا ڕێکخران. ئەمەش بۆ ئەوە بوو دوور بینی کرا، لە سەر نەگرتنی وتوویـژ و بۆ پاراستنی هاوڕێیانی کۆن و ئاشکرا نەبوونیان.

ئەو ڕووکردنە ڕێکخستن و هێزی پێشمەرگەیە لە هەموو توێژ و چینەکانی جەماوەری گەلەکەمانەوە. سوودی تایبەت و بایەخی خۆی هەبوو. پشتیوانێکی ئەستوور بوون بۆ شۆڕش و پشتگیرییەکی بە هێز بوون.. کاتێ وتو وێـژ

هەڵوەشـایەوە. زۆر لەوانــە بوونــە مـوڵکی باشــی ریکخســتن و زۆریـان بوونــە پێشمەرگە و زۆریشیان کشانەوە و بە دڵسۆزی لە شوێنی خۆیان دانیشتنەوە.. وەرگرتنی ئەو خەڵکە کارێکی وای کرد زۆربەی زۆری خەڵکی کوردستان بوونە لایەنگر و هەواداری (ی.ن.ك) و شۆڕش. ئەو چەکدار و سەربازانەی پایوەندیان کردبوو یان پەیوەندیان پێوە کرا، کاتی شەڕ بوونەوە، شۆڕش سوودی زۆری لیـوەرگرتن و زانیـاری بـە کـەڵکیان دەگەیانـدە شـۆڕش و هێـزی پێشـمەرگە و رێکخستنەکان.

ئەو ماوەیەی وتو وێژ گەرمبوو، ئاشتی و ئارامی لە کوردستاندا هەبوو. جم و جووڵێکی باشی کاری بازرگانی و بازاڕ بە گەرمی دەستی پێکردو باری ئابووری خەڵکی کوردسـتان بووژایەوە، جووڵانەوەیەکی کۆمەڵایـەتی بەرچاو لـە ئاهـەنگ گێڕان و سەیران و ژنهێنان و شاییکردن دەستی پێکرد. بە شێوەیەك بوو کە زۆر کـوڕی گەنجـژنیان هێنـا و کچـی عـازەب شـوویان کـرد. جـەماوەر ئەوەنـدە پێشـمەرگەیان لا پـیرۆز و خۆشەویسـتبوو. زۆربـەی گـەورە کچـەکان دەیانویست شوو بە پێشمەرگە بکەن و کەس و کاریشیان شانازیان بەو دیاردەیـەوە دەکرد.. رێکخستنی ناو شارەکان لـە کـاتی پـێش وتـو وێـژ سەرقاڵتر و پڕ ئیشتر بوون.. بەهار و هاوینی ساڵی هەشتا و چوار دوو وەرزی زۆر خۆشی ئەو ساڵە بوون. کە زۆر دەمێك بوو خەڵکی کوردستان بەهار و هاوینی وایان نە دیبوو..

## ساڵی هەشتا و چوار و خۆدزینەوە و پیلانی دوژمنکارانە : -

رژێم لە کۆتایی هاوینی ساڵەکەوە، کەوتە خۆدزینەوە و پاشە کشە لە بەڵێن و پەیمانـەکانی بـۆ رێکـەوتن.. شـان بـە شـانی پاشـگەز بوونـەوەی بـەرێگای دام و دەزگاکانی ئەمن و ئیستیخبارات و خۆفرۆشەکان کەوتە پیلان و پیلانگێڕی دژی شۆڕش و کەمین و بۆسەنانەوە بۆ فەرماندە و کادرەکانی ناو هێـزی پێشمەرگە و چاو ترساندنی جەماوەر بە ڕەفتاری دڕندانەو نامرۆڤانە. هەر لەسەرەتای پـایزدا کۆمەڵی کوڕی گەنجی بە ناوی سەربازی ڕاکردووەوە گرت و بە بێ دادگاییکردن بە پـێش چاوی جەماوەرەوە لـە نـاو شـاری سلێمانیدا گوللەبارانیکردن، (جمـال حـاجی ئیسماعیلی) کەڵـەکن پێشمەرگە بـوو لـەماڵـەوە لـە گـەڵ دایکیـدا چـوو بـۆ

خەستەخانەی جمهوری، کۆمەڵێ لە پیاوانی حکومەت هەڵیان کوتایە سەری و ڕفاندیان و بە بێ دادگا و بە بێ هۆ شەهیدیان کرد، لە نێوانی بنگرد و دووکاندا کەمینیان بۆ دەستەیەك پێشمەرگە دانا و چەند پێشمەرگەیەکیان بە خەستی بریندار کرد، لە سەر گۆڕی حەپسەی دایکی شەهید ئەکرەم لە شەهیدان، لوغمیان بۆ کاك مستەفا چاوڕەش دانا، بۆ ئەوەی کاتێ چوو بۆ سەر کۆڕەکە پیا بتەقێتەوە. بە ماجیدی برای شەهید ئەکرەمدا تەقیەوە و قاچێکی پەڕاند.

لە ١٥ / ٩ / ١٩٨٤ کەمینیان لە تاسلوجە بۆ فەرماندەی سەرکردە ملازم سەید کریم دانا و بە دەستی چەند خۆ فرۆشێك شەهیدیان کرد ...

## شەهید کردنی مولازم سەید کەریم و هەڵمەتی تۆڵە : -

دوای شەهید کردنی فەرماندەی سەرکردە مولازم سەید کەریم، سەرکردایەتی و مەکتەبی عەسکەری هێزی پێشمەرگەی کوردستان بڕیاریاندا لە تۆڵەی سەید کەریمدا هەڵمەت ببرێتە سەر هەموو شەقامە گشتیەکانی نێوانی شارەکان و ئەو رەبایە و سەربازگانەی لە سەر شەقامەکانن.. بۆیە دوای یەك رۆژ بە سەر شەهید کردنیدا، هەموو تیپەکانی پێشمەرگە کۆنترۆڵی سەرجەم شەقامە گشتیەکانی کردو، بۆسەیان بۆ پیاوانی رژێم و ئەفسەر و خۆ فرۆشان داناو، لەو هەڵمەتەدا ژمارەیەکی زۆریان لە پیاوان و ئەفسەر و خۆفرۆشەکان بە سزای گەل و شۆڕش گەیاند... ئەو رۆژەی سەید کەریم شەهید کرا لە پارێزگای کوتەوە خێزانێکی فەیلی دۆستمان بەسەردان هاتبوون و بردمن بۆ دێلێژە... ئێوارە هەواڵەکەمان پێگەیشت بەیانی بەیەکەوە گەڕاینەوە بۆ سلێمانی، کە گەیشتینە سەر شەقامی گشتی سلێمانی لە لای ئەڵلایی.. پێشمەرگەکانی تیپی(٥٧) سەگرمە بە درێژی شەقامەکە بە لای ئەڵلاییدا دامەزرابوون و زیاتر لە(٥) تەرمی کوژراو لە سەر قەراغی شەقامەکە کەوتبوون و بە لای بەری بازیانیشدا چەند دەبابە و مودەرەعەیەك راوەستابوون و سەرباز و جاشەکان لە بۆسەدا بوون.. ئێستاش لە بیرمە(شێخ مەحموود) بەرپرسی پێشمەرگەکان بوو، کە ئێمەی دی وتی.. مامۆستا پەلە بکەن و زوو رەتبن با ئەم میوانانەتان تووشی کێشە نەبن.

هەر ئەو رۆژە.. دەبوو بچووینایە بۆ قەلادزێ چونکە دەعوەتی میوانەکانیان کردبووین، کەوتینە ڕێ بۆ قەلادزێ.. لە تاسلوجەوە مەفرەزەی پێشمەرگە لە سەر شەقامەکە پەرشبووبوون. لە کانی وەتمان و چایخانەکان ژمارەیەکی یەکجار زۆر پیشمەرگەی لێبو. منداڵەکانی میوانەکەمان، کە پێشمەرگەیان دی بەو شێوەیە لە خۆشیدا هەر ئەوە بوو تووشی گەشکە نەدەبوون. لە داری قەمتەران دەبابەیەکی زۆر بەسەر زنجیرە شاخەکەدا بلاوبووبوونەوە، سەربازێکی زۆر لە سەنگەردا بوون. لە بازگەکە سەربازێك رایگرتین سەیری ناسنامەکانی کرد، ناسنامەی (فەوزی عەواد) پارێزگای کوت بوو، وتی مەرگ هەڵیگرتوون لە کوتەوە گەیشتوونەتە ئێرە لەم رۆژەدا؟ وتی بۆ کوێ دەچن وتمان دەچین بۆ قەلادزێ وتی بابە لە ناو رانیە و لە بەردەم کێوە ڕەشدا شەڕە.. بۆ کوێ دەچن و نەیهێشت بڕۆین و گەڕاینەوە.. لە بێستانەوە لاماندا بەرەو شەقلاوە و بۆ پێش نیوەڕۆ گەیشتینە شەقلاوە. نیوەڕۆ لەوێ نانمان خوارد و عەسر گەڕاینەوە. لە گەڕانەوەماندا لە هەموو ئەو شوێنانەی پێشمەرگەی لێبوو هەر مابوون. کە گەیشتینە ناو شار و دابەزین.. چووم بۆ لای(کاك برایمی حەمە عەلی) چونکە ئەو کاتە(من و مامۆستا شێخ محەمەدشێخ غەریب باساکی و مامۆستا سەربەست بابە شێخ و هاوڕێ ئیبراهیم مەحمود) بە یەکەوە بووین لە یەك کەرتدا. کاك برایمی حەمە عەلی بەرپرسمانبوو ماڵەکەیان لە بەر سەرا بوو. کە چووم لە ماڵەوە بوو، کەوتینە باسی بار و دۆخەکە و منیش ئەو چیرۆك و سیناریۆیەم بۆ گێڕایەوە.

ئامۆژگاری و ڕێنمایی لە ڕێکخراوەوە هاتبوو... بە پەخشنامەیەك وتی بەشکم هەر ئەمشەو پەخشنامەکە بگەیەنیتە هەردوو مامۆستا و هاوڕێ برایم و خۆت و ئەوانیش هەر ئەمشەو برادەران بێنن و ئاگاداریان بکەنەوە و پەیڕەوی ئامۆژگاری و ڕێنمایی و خاڵەکانی پەخشنامەکە بکەن. ئەو شەوە بە ناچاری میوانەکانم بە جێهێشت و پەخشنامەکەم گەیاندە برادەران و هەموو برادەرانی پۆل و هێڵەکانی لای خۆمم بەسەر کردەوە و بینیمن..

ئەو هەڵمەتەی هێزی پێشمەرگە گوڕ و تینێکی دایەوە بەر پێشمەرگە و جەماوەری دڵخۆشکردو، چاوشکێنێکی زۆر چاکبوو بۆ هێزەکانی بەعس و سوپا داگیر کەرەکەی..

بە دوای ئەو کارە ناجوامێرانەیەی ڕژێمدا بۆ شەهید کردنی سەید کەریم..
ئیتر هەموو هەڤاڵانی سەرکردایەتی و فەرماندە عەسکەرییەکان و کادرەکانی ناو شۆڕش مەترسیان پەیدا کرد و سڵەمینەوە و بە وریایی و بەرنامەوە نەبوایە دانەدەبەزین و، بە شەقامە گشتیەکاندا نەدەڕۆیشتن. هەر بەدوای ئەو ڕەفتارە ناجوامێرانەیەدا، بارەگا و بنکەکانی پێشمەرگە وردە وردە لە شەقامە گشتیەکان دوور کەوتنەوە.. ڕێکخراوی سلێمانی.. بە زنجیرە کەوتنە دەرکردن و پەخشکردنی پەخشنامەی هەفتانە و مانگانە.. ڕێنمایی دەرکرا بۆ قایمکاری و وریایی کار کردن و هەلس و کەوت و جۆر و شێوە و شوێنی کۆبوونەوەکان و یەکتر بینین و پەیڕەو کردنی ئامۆژگاری و ڕێنمایی خاڵەکانی پەخشنامەکان و چۆنێتی گەیاندنی هەواڵ و دەنگ و باسەکانی شۆڕش بە ڕێکخستن و جەماوەر. چۆنێتی کۆکردنەوەی هەواڵ و زانیاری و دەنگ و باس لە سەر ڕژێم و پیاوانی و دام و دەزگاکانی و سەربازگە و سوپاکەی و بەرزکردنەوەیان.

## ساڵی هەشتا و پێنج و پیلانی شەهید کردنی مامە ریشە و داستانی دابان هەلاج :-

هەرچەندە... رایەڵەی گفتوگۆ بە تەواوی نەپچڕابوو.نوێنەری شۆڕش و نوێنەری حکومەت هاتوو چۆیان دەکرد و بە تەواوی بانگەوازی دەستپێکردنەوەی شەڕ نەکرابوو..لە ڕۆژی٢٤ / ١ / ١٩٨٥ لە پیلانێکی نەخشە بۆ کێشراودا، لە ڕێگای لەیلان – قادر کەرەم زۆر بە نامەردانە لە لایەن خۆفرۆشانەوە، کەمین بۆ مامە ڕیشە دانرا و، شەهیدیانکرد، شەهید کردنی(مامە ڕیشە) کاریگەری زۆری لەسەر پێشمەرگەکانی ناوچەی گەرمیان و قەرەداخ کرد.
هەموو خەڵکی کوردستانی هەژاند و بەگشتی سەرجەمی پێشمەرگە و خەڵکی کوردستان بۆی بە داخ بوون.. لە لایەکی ترەوە پیاوان و سەرانی ڕژێم وەکو سەرکەوتنێکی پیلانگێڕی ئاهەنگ و شایی لۆغانیان بۆ شەهید کردنی گێڕا.
دوای شەهید کردنی سەید کەریم و بەدوایدا مامە ڕیشە، سەرکردایەتی بڕیاریدا کە هێزی پێشمەرگە ڕێکخەنەوە.. بۆ ئەمەش مەکتەبی عەسکەری بە پێی بەرنامەی داڕێژراو. تیپەکانیان ڕێکخستەوە. گۆڕانکاری و ئاڵو گۆڕ لە تیپ

و كـەرت و مـەفرەزە و دەسـتەكان و سـەرتيپ و فەرمانـدەی كەرتەكانيانـدا كـرا. بەسـەر ناوچـەكاندا بـۆ چـالاكی پێشـمەرگانە دابـەش كـران.. هـەموو هێـزی پێشـمەرگە ساز و ئامادە كرايەوە بۆ هەڵمەت و بەرگری،.. چەك و تەقەمەنی و ئازوقەی باش پاشەكەوت كرابوو بەسەر تيپەكاندا دابەشكران.. پێشمەرگە بۆ تۆڵەی سەيد كەريم و مامە ڕيشە خۆيان دەخواردەوە، مامە ڕيشە پێش شەهيد كردنـی لـە تۆڵـەی سـەيد كەريمـدا لـەڕێگای سـلێمانی-كـەركوك كـەرتی چـواری جەباری بۆسەيان دانا و ئوتومبيلێكی ئيستيخبارات كەوتە كەمينەكەوە و لێيـان داو (١١) ئيستيخباراتيان بە سزای گەل و شۆڕش گەياند.

مەكتەبی عەسكەری بە بەرنامەيەكی داڕێژراو لە شەوی ١٤ لەسەر ١٥ / ٢ / ١٩٨٥ لـە چـەند قۆڵـەوە، هەڵمـەتيان بـردە سـەر هـەموو مۆڵگـا و سـەربازگە و ڕەبيەكانی زنجيرە شاخی دابانهەلاج و لە ماوەی كەمتر لە (١٢) سەعات سەرپاكی زنجـيرە شـاخی دابانهـەلاج پاككرايـەوە و دەيـان دەبابـە و سـەربازگە و مۆڵگـا دەستيان بە سەردا گيرا و بە دەيان ئەفسەر و سەرباز كوژران و بە دەيان بەديل گـيران و دەستكەوتێكی زۆر لـە چـەك و كـەل و پـەل و ئازوقـە و تەقەمـەنی دەس پێشمەرگە كەوت.

ئەو داستانە لە تۆڵەی سەيد كەريم و مامە ريشەدا ئەنجام درا و بەو هەڵمەتی تۆڵەيـە.. هێـزی پێشـمەرگە بـە تـەواوی هۆشـی هاتـەوە بـەر خـۆی و ورەيان بـەرز بـۆوە و پـۆلا ئاسـا خۆيـان سازدايەوە بـۆ چالاكی باشتر و گەورەتر. جـەماوەری خـەڵكی كوردسـتانيش بـەو داسـتانە گەشـانەوە و دەسـت خۆشـيان لـە هێـزی پێشمەرگە دەكرد.

## ڕێکخستنی ناو شارەکان و خۆ ساز دانەوە : -

لە دوای شەهید کردنی سەید کەریم و مامە ریشە و داستانی دابانهەلاج ڕێکخراوی سلێمانی بە بەرنامەیەکی نوێ، بە شێوازێکی تازە، بە گوڕ و تینێکی شۆڕشگێڕانەی پشوو درێژی کەوتنە کار کردن... هەفتانە پەخشنامە پەخشدەکرا. گۆڕانکاری لە کەرت و پۆل و شانە و هێڵە تایبەتەکاندا کرا. ناوی نهێنی کەرت و پۆل و شانەکان و هاوڕێیان گۆڕدران. ناوی نهێنی تازەیان بۆ دانرا. کات و شوێنی کۆبوونەوە و یەکتر بینین گۆڕدرا، بە پێی ڕێنماییەکانی ڕێکخراو هەموو هەڤاڵێکی کەرت و بەرەو ژوور، دەبوو شوێنی تایبەت و قایم لە ماڵەوەی بۆ هەڵگرتن و قایمکردنی ئەدەبیات و بەڵگە نامەکانی ڕێکخستن دروست بکات.. هەر جۆرە شتێك کە پەیوەندی بە ڕێکخستنەوە بوو، لە بەر دەست و بەر چاودا دانەنرێت لە قسە کردن و هەڵس و کەوت و ئەنجامدانی کارەکاندا، هێمن و لە سەر خۆ و وردە کاری بکرێت. هەواڵ و دەنگ و باسەکانی شۆڕش و هێزی پێشمەرگە بە زیرەکانە بگەیەنرێتە ڕێکخستنەکان و جەماوەر. هەواڵ و دەنگ و باس و زانیاری ناو دام و دەزگاکانی ڕژێم و سەربازگە و مۆڵگاکانی جاش و خۆفرۆشان بە چڕوپڕی کۆبکرێتەوە و بەڕاپۆرتی تایبەت بگەیەنرێتە سەرەوەو، چاوەڕوانی ڕاپۆرتی مانگانە نەکرێت... هێڵ و ڕێکخستنی تایبەت لە هەموو فەرمانگە و دەزگایەکی حکومی ئەهلیدا دروست بکرێت.

**١٧ / ١٠ / ٨٥ و مەنعی تەجەول :-**

لە سەرەتای مانگی / ١٠ / ١٩٨٥ لە هەموو هێڵەکانی ڕێکخستنەوە، هەواڵ و زانیاری بەرز دەکرایەوە، کە ڕژێم خەریکی خۆ ئامادە کردن و هێز کۆکردنەوەیە لە هەموو شارەکانی کوردستان و عیراق.. لە بەر ئەوەی خۆ ئامادە کردنەکە لە ڕێگای دەزگا تایبەتەکانی( ئەمن و ئیستیخبارات و موخابەرات و مەنزومەی شیمالی و حزبیەکانەوە ) بوو.. ئەوانە کە هەواڵەکەیان دەزانی مەبەستەکەیان لێ ڕوون نەبوو.

ڕێکخراوی سلێمانی، هەر زوو کەوتە کار قایمی و بە پەخشنامە ئامۆژگاری و ڕێنمایی سەرجەم هەڤاڵانی ڕێکخستنی دەکرد.. کە قایمکاری بکەن و وریاتر و کارامانە ترکارەکانیان ئەنجام بدەن.. هەوڵبدرێت لە هەموو هەڵس و کەوتێکی دام و دەزگاکانی ڕژێم ئاگاداربن و، لە سەر ئەو هەواڵ و زانیاریانەش ناوەندی کۆمەڵە و سەرکردایەتی ئاگادار کرایەوە... ڕۆژانە هەواڵەکان زۆرتر و گەرمتر دەبوون. سێ ڕۆژ پێش مەنعی تەجەولەکە.. لە هەموو شارەکانی کوردستان و عیراقەوە هێز بۆ دەوروبەری سلێمانی بەڕێدەکراو، دوو ڕۆژ پێش مەنعی تەجەولەکە هەموو دەزگاکانی پۆلیس و ئەمن و سوپا لە سلێمانی و دەورو بەری خرانە ژێر ئینزارەوە.. ئەو هێزانەی لە شارەکانەوە دەنێردران بەرەو سلێمانی لە هێزەکانی جەیشی شەعبی، قوات خاصە و پۆلیس و عەسکەریە و ئەمن و ئیستیخبارات.. هتد بوون و هەواڵی بەر بڵاوی ئەو هێزە گەیشتە ریزەکانی ڕێکخستن. ڕۆژی ١٦ / ١٠ / ١٩٨٥ دەنگ و باسی هێنان و بەڕێوەبوونی هێزێکی زۆر لە هەموو ڕێگاکانی، هەولێر و کەرکووك و کەلار و ڕانیەوە، لە ناو بازاڕ و هەموو شوێنێکی شاردا بڵاوبۆوە.. خڕ کردنەوەی ئەو هێزە زۆر و هەمە چەشنە و چەك و تەقەمەنی و ئالیاتەوە، ئاڵۆزی و مەترسی و دڵە ڕاوکێی زۆر بۆ خەڵکی شاری سلێمانی دروست کرد.. ئەو کاتە من لە بازاڕی نەقیب دوکانم هەبوو. لە هەمان کاتدا بەڕێوەبەری ناوەندی زانستی ئێواران بووم، بەیانیان لە دوکان دەبووم و ئیوارانیش دەچووم بۆ قوتابخانە. بەیانی ڕۆژەکە، کە دوکانم کردەوە، زۆری پێنەچوو بە هۆی ئەو کەسانەی بۆ کاری بازاڕ و بازرگانی لە ( هەولێر، کۆیە، ڕانیە، قەڵادزێ، کەرکوك، چەمچەماڵ، کەلار، کفری،و دەربەندیخانەوە ) دەهاتن بۆ بازاڕەکانی سلێمانی. وردە وردە پەیدا بوون..

زۆریـان دەهاتنـە لام و دوکانـداری گوزەرەکـانی نـاو شـاریش زۆربـەیان دەهاتنـە لام.. پەیوەنـدی بـاش و متمانـە پێکـراوم لـە گـەڵ زۆربەیانـدا هـەبوو. ئـەو رۆژە هەرچـی لـە دەرەوەی شـار و نـاو شـارەوە هاتنـە لام.. باسـی هـاتنی ئـەو هێـزە زۆرەیان دەکرد کە بـۆ سلێمانی بەڕێوەیە.. بۆیە.. ناچار تەلەفونم بۆ کوڕەکان کـرد.. کـە بێن بـۆ لام هـەر کوڕەکـەم هـات لـە سـەعات دەوە، دوکـانم بەجێهێشت چووم بۆ لای برادەران و دەنگ و باسەکەم پێ گەیاندن و برادەرانـی لای خۆشـم بە سـەر کـردەوە و رێنمـایی و ئامۆژگـاریم کـردن، سـەبارەت بـە وریـا بوونیـان بـۆ خۆپارێزی لە هاتنی ئـەم هێـزە زۆرەی کـە نازانرێ بۆچـی هێنـراوە.. هـەر زوو لـە پێش وەختیش ئەو رۆژە چووم بۆ قوتابخانـە. هـەر مامۆسـتایەکیش دەهـات لای خۆیـەوە، بـە دزیـەوە هەواڵەکـەی پـێ دەوتم.. چـوومەوە بـۆ ماڵـەوە.. کۆمـەڵێ ئەدەبیات و شتم هەبوو.. هێنامن و لـە گەنجینـەی قوتابخانـەدا حەشـارمدان. ئـەو ئێوارەیە دەوامی وام نەکرد. زۆربەی برادەرانم بینی.. کەسمان سەرمان لە هاتنی هێزەکە دەرنەدەکرد. بۆ ئابڵۆقـەدانی سلێمانی و کـاری پشـکنینەیان بـۆ پـەلامار دانی هێزی پێشمەرگە و سەرکردایەتیە.

ئێـوارە.. بە تـەواوی هـەواڵمان پێگـەیشـت کـە سـەربازگەی معسـکر سـەلام و تاسلوجە و تانجەرۆ و عەربەت پڕ بووە لە هێز و بە دەیان مودەرەعـە و دەبابـەیان لە گەڵ خۆیان هێناوە.

شــەو.. بەشــتەکاندا چـوومەوە، کتێبخانەکـەم گـەڕام، کۆمـەڵێ شـتی تـرم دۆزیـەوە، کۆمکردنـەوە.. ئێـوارە هـەموو هێڵـی تەلەفونـەکان ڕاوەسـتان تەلـەفون ئیشـی نـەدەکرد، هەرچـەند ئێمـە ئامۆژگـاری برادەرانمـان کردبـوو کـە بـۆ کـاری رێکخستن هەوڵبـدەن زۆر بەکـەمی تەلـەفون بـەکار بهێنن و ئەگـەر بەکاریش هـات زۆر بـە زیرەکانـە بـەکار بهێنرێت بـۆ ئـەوەی دەزگـا سیخوڕییەکانی رژێم کـەڵکی لێوەرنەگرن.

شەو لە سەعات دەوە، دەنگی زنجیری دەبابـە و مودەرەعـە و ئوتومبیـل شـاری سلێمانی هەژاند...هەر کەسە لە شوێن و ماڵی خۆیـەوە دەترسا.. هـەر یەکـە بـە جورێ.. ئێمـە وەکـو رێکخسـتن و هـەبوو وەکـو سـەربازی ڕاکـردوو، هـەبوو وەکـو کـەس و کـاری پێشـمەرگە.. ئـەو حاڵـە تـا سـەعات دووی شـەو دەوامـی کـرد. لـە سـەعات دووەوە وڕەو دەنـگ نـەما و شـار خامۆشـبوو. مـن تـا سـەعات دوو

نەنوستم.. ئەو کاتە ڕێکەوت وابوو. ماڵی ئێمە و کاکەم و محێدین لە یەك خانوودا بەیەکەوە بووین کاکەم ترسی منی هەبوو. دەیزانی شتم هەیە وتی ڕۆڵە ئەگەر شتێکی وات هەیە بۆم بێنە من لە ژێر کەوا و سەڵتەکەمەوە لە پشتی دەبەستم کەس لە من ناپرسێت و مەولودیشم قەرار داوە، پشت بە خوا هیچمان بۆ نابێت،.. ئەو شەوە ماڵی محێدین هەویریان شێلابوو بۆ نان کردن. سەعات دوای دوو خەوم لێ کەوت بەیانی لە دەنگی فڕۆکەی هەلیکۆپتەر و بانگەوازی ناو فڕۆکەکە خەبەرم بووەوە. کە لە فڕۆکەکەوە بانگەوازێ ڕایدەگەیاند و ئاگاداری هەموو خەڵکی دەکردەوە(کە کەس لە ماڵ نەچێتە دەرەوەو هاتو چۆ و ماڵە و ماڵ قەدەغەیە) ... فڕۆکەکان بە سەر گەڕەکەکانی شار بە نزمی بەسەر ماڵەکاندا دەسووڕانەوە... ئەو شتانەی شەو کۆمکردبوونەوە و دامنابوون.. هێشتا دنیا تاریك بوو، خستمنە نایلۆنەوە و بردمنە ناو ئەو شیوەی نێوانی ماڵمان و ناوەندی کانێسکان و لە شیوەکەدا حاشارمدان... کاکەم بانگی کردم وتی چیت هەیە بۆم بهێنە با لە پشتی ببەستم مەترسن.. هیچ نابێت دیار بوو شەو ئەو هێزە، بە سەر هەموو گەڕەکەکانی شار و دەورو بەری شاردا، دابەش کرابوون. زۆربەی قوتابخانەی گەڕەکەکان کرابوونە بنکەی هێز و هەموو دام و دەزگاکانی حکومەت لە ئینزاردا بوون. دەورو بەری سەعات(١١) ی نیوەڕۆ.. هێزە پشکنێرەکە گەیشتە گەڕەکەکەمان و کەوتنە گەڕان و پشکنینی ماڵ بە ماڵ.. کۆمەڵێکیان روویان کردە ماڵی محێدین کە بینیان نان دەکەن و زۆر خۆیان لە گەڵ خەریك نەکرد، هاتنە سەرەوە بۆ ماڵی ئێمە ئەفسەرێك و چەند سەربازێك بوون. لە پێشەوە ئەفسەرەکە هاتە ژوورەوە.. لە هەیوانەکەدا وەستا بووم. دایکم لەبەر دەرگای ژوورەکەی خۆی لە سەر بەرماڵ دانیشتبوو تەزبیحاتی دەکرد. ئەفسەرەکە چاوێکی بە هەیوانەکەدا گێڕا و کتێبخانەکەی بینی.. وتی ئیشت چییە و ناسنامەکەم نیشاندا کە بەڕێوەبەری ناوەندی زانستیم.. وتی دەرچووی کوێیت وتم بەشی کوردی بەغدا، وتی دیارە زۆرت حەز لە خوێندنەوەیە وتم لە منداڵیمەوە ئالودەی خوێندنەوەم وتی ماشاڵڵا کتێبی باشت هەیە. وتم بەڵێ کتێبی باشم هەیە.. یەکێك لەسەربازەکان خۆی کرد بە ژوورەکەی دایکما بە نیازی ئەوەی کەنتۆر و بۆفیەکان بپشکنێت.. نەیهێشت بگاتە کەنتۆرەکە تێی خوڕی کە بێتە دەرەوە ویستیان سەیری کتێبخانەکە بکەن وتی پێویست

ناکات.. سەربازەکان چوونە دەرەوە وتی من کوردم خەڵکی بادینانم یەك مانگە ئێمەیان ئاگادار کردووە کە خۆمان ئامادە بکەین تا نەهاتینە سلێمانی نەمانزانی بۆ چییە و بۆ کوێیە. وتی ماڵەکانی خوارەوەش هی ئێوەن وتم برامن وتی بە نیازێکی زۆر خراپ پەلاماری سلێمانی دراوە. من هیوام ئەوەیە لەم گوزەرەی مندا کەس تووشی زیان نەبێت ئومێدیش دەکەم هەروا بێت. بۆ نیوەڕۆ خوڵکم کردن وتی ناکرێت.. نان بخۆین.. تا بەر دەرگا لە گەڵی چووم وتی مامۆستا هەر هێزێکی تر هات بۆ تەفتیش بڵێ هێزی(...) تەفتیشیان کردووە. بە داخەوە ناوەکەم بیر چۆتەوە.

پشکنینی ئەو گەڕەکەی ئێمە و دەورو بەرمان عەسرێکی درەنگ تەواو بوو.. کە هێزەکان ئێوارە پاشە کشەیان کرد.. زانیمان کە محەمەدی وەستا برایمی جۆلایان گرتووەو، بە شۆفلێ ماڵەکەیان ڕووخاندووە و وەستا برایمیشیان گرتووە و بردوویانە.

**ئەنجامی مەنعی تەجەولەکە :-**

بەیانی رۆژی ١٨ / ١٠ / ١٩٨٥ ئەنجامی شالاوی پشکنین و ئابلۆقەکە دەرکەوت کە لەو شالاوەدا.. ژمارەیەك لە خەڵکی گەڕەکەکانی شاریان گرتووە، چەند ماڵێکیشیان بە شۆفڵ ڕووخاندووە. لەوانەی لەبیرم ماون یان زانیاریم لە سەر وەرگرتوون..

١ـ ماڵی مامۆستا شێخ محەمەد شێخ غەریبی باساك لە برایم پاشا ڕووخێنرابوو، مامۆستا خەباتی کوڕیشیان گرتبوو.. مامۆستا بۆ ڕۆژی دوایی ئازاد کرا و خەباتیان لە ١٨ / ١٠ لە گەڵ چەند گەنجێکی تردا لە فولکەی نالی گوللە باران کرد.

٢ـ ماڵی مامۆستا حسەین شەریف لە برایم پاشا ڕووخێنرا، خۆی و ردەشتی کوڕی و برازایەکی بە ناوی ئاوات محەمەد شەریف گرت و ،وانیشیان لە گەڵ خەباتدا لە فولکەی نالی لە ١٨ / ١٠ گوللە باران کرد. لە بەر ئەوەی پۆستەرێکی خوێندکاران بە بۆنەی کۆچی کوڕەکەیەوە لە ماڵیاندا گیرابوو.

٣. ماڵی تاهیر محەمەد عومەر لە سەرگۆل ڕووخێنرا و خۆی و دوو کوڕی بە ناوی ئاسۆ و ئامانج گیران و لە فولکەی نالی و لە ١٨ / ١٠ گوللە باران کران، ئەمە لە بەر ئەوەی وێنەیەکی مام جەلال و مامە ریشە لە ماڵیاندا بوو.

٤ـ ماڵی دلێر عەبدوڵڵا عەزیزیان ڕووخاند و خۆیان گرت و لە ١٨ / ١٠ لە فولکەی نالی گوللە بارانیان کرد، لە بەر ئەوەی وێنەیەکی مستەفا چاو ڕەشیان لە ماڵداگیرا بوو.

٥. ماڵی مامۆستا لەتیف حەمە عارف لە گەڕەکی گردی سەرچناریان ڕووخاند و خۆیان گرت. لە بەر ئەوەی لە لیستی ئەو ناوانەی پێیان بوو، لە ناوێکیان دەچوو. دوا جار بەردرا.

٦ـ ماڵی وەستا ئیبراهیمی محەمەدی جۆلایان لە گەڕەکی مامۆستایان ڕووخاند لە بەر ئەوەی(محەمەدی) کوڕی لە ماڵی خوشکەکەی گیرا و سەربازی ڕاکردوو بوو. وەستا برایم و محەمەدیان گرت.. محەمەد لە گەڵ کۆمەڵێکی تردا لە ١٧ / ١٠ / ٨٥ گوللە باران کرد و باوکی لە بەندیخانە کۆچی دوایی کرد. خەڵکی گەڕەك بە هەزار حاڵ تەرمی مام برایمیان وەرگرتەوە.

٧. ماڵی ئەحمەد غەفوریان ڕووخاند و ئامانجی کوڕیان گرت لە بەر ئەوەی چەند وێنەیەکیان لە ماڵدا گرتبوون و لە ١٠/١٨ لە فولکەی نالی گوللە باران کرا.

٨. محەمەد و ئەحمەدی کەریم شەکریان لە گەڕەکی شێخ محێدین ڕووخاند و خۆشیان گرتن لە بەر ئەوەی نووسینێك لە سەر دیوارەکەیان نووسرابوو.

٩. ماڵی شێخ عوسمانیان رووخاند و کوڕەکەی بەناوی سەردار گیرا.

١٠. هیوا فائقیان گرتو ماڵەکەیان ڕووخاند.

١١. ئارام محەمەد کەریمیان گرت و ماڵەکەیان ڕووخاند.

*ئەو ڕۆژە تا ئێوارە ژمارەیەکی زۆریان لە گیراوەکان گوللە باران کرد کە سەربازی ڕاکردوو بوون. و ئەم کەسانە بوون: –

١. ئەبو بەکر حسین محەمەد سالح

٢. ڕێبوار عوسمان میرزا

٣. کەمال ئەحمەد عەبدولرەحمان

٤. ئیبراهیم عومەر مەعروف

٥. جەزا حەمە ئەمین کەریم

٦. کەریم مەحمود عەلی رەحیم

٧. محەمەد عەلی ئەحمەد

٨. جەبار محەمەد شەریف

٩. ئاراس کەریم میرە

١٠ محەمەد ئیبراهیم محەمەد

١١. کاروان ئیسماعیل محەمەد

١٢. هوشیار فەتاح کریم

١٣. شوان مەحموود عەلی

١٤. حەمە رەئوف سەعید زۆراب

١٥. عەزیز ئیبراهیم عەزیز

١٦. سامان محەمەد سەڵتە ( گەورە )

١٧. سەرسەنگ محەمەد سەڵتە ( گەورە )

١٨. ئیبراهیم عەبدوڵڵا عەولا

١٩. فەرهاد محەمەد عوسمان

٢٠. خالد حەمە کەریم رەسول

٢١. نەوزاد حسین عارف

*ئەم ناوانەش لەو شالاوەدا گیران و لە ١٧ / ١٢ / ٨٥ گوللە بارانیان کردن :
–

١. هیوا فائق فارس

٢. سەردار عوسمان فەرەج

٣. ئارام محەمەد کەریم(ئارامە بچکۆل).

*ئەم ناوانەش لەم شالاوەدا گیران و لە ١٩ / ١٠ / ٨٥ گوللە باران کران: –

١. کاوە نامق حەمە سوور

٢. سۆران رەزا موعین

٣. ئازاد شەریف ئەحمەد

٤. خالد عبدالله میر حەسەن

٥. محەمەد عومەر حەمە شەریف

٦. شۆڕش محەمەد سەعید

٧. فەریق محەمەد کەریم

٨. بەهرۆز عوسمان رەحیم

*ئەم ناوانەش لە شالاوەکەدا گیران و لە ١٨ / ١٠ لە ژێر ئەشکەنجەدا شەهید بوون: –

١. وەستا ئیبراهیم محەمەد جۆلا

٢. بەهرۆز سەردار عەبدولرەحمان

٣. دلێر فائق عەلی

*سەرجەمی گیراوەکان زیاتر لە(٥٠) کەس بوون و لەوانە(٤٤) یان شەهید کران. ئەوانەشی شەهیدیان کردن بە بێ دادگایی کردن و بەبێ لێکۆڵینەوە و بە

حوکمێکی قەرە قوشی و زۆر بە دڕندانە گوللە بارانیان کردن و تەرمەکانیشیان نەدانەوە بە کەسوکاریان.

حەز دەکەم لێرەدا ئەوە بڵێم.. زوربەی ئەو کەسانەی لەو شاڵاوەدا، بەرکەوتن و گیران.. هیچیان لە سەر کاری ڕێکخستن و بە بەڵگە نامەی ڕێکخستنەوە نەگیرابوون.. هەڤاڵانی ڕێکخستنەکان لە سەر ڕێنماییەکانی ڕێکخراوی سلێمانی پێشوەخت قایمکاری تەواویان کردبوو... ڕژێم ئەو شاڵاوەی بۆیە هێنایە سەر شاری سلێمانی، بەو نیازە بوو کە ئەنفالی ڕێکخستنەکانی ناو شار بکات، هەرچی هێڵی ڕێکخستن هەیە بیان دۆزێتەوە و برادەرانمان، بەو بڕیارەی بە دەستیانەوە بوو بەو دەسەڵاتەی پێیان درابوو. وەکو چۆن ئەو ژمارە خەڵکە بێ گوناهەیان لە خۆڕایی گەللە باران کرد. ئاوها هەڤاڵانی ڕێکخستن گوللە باران بکەن. بەڵام خۆشبەختانە، نەك هەڤاڵانی ڕێکخستنیان بەر دەست نەکەوت بەڵکە نەیان توانی سەرە داوێکی ڕێکخستنیش بدۆزنەوە.. لە کاتێکدا لەو بارو دۆخەدا، ڕێکخستنی ناو شاری سلێمانی لە هەموو کات و ڕۆژگارەکان زۆرتر و پڕ ئیشتر و کارامەتر و بەر بڵاوتر بوون. باوەڕ ناکەم لە ناو شاری سلێمانیدا فەرمانگەیەك و گوزەرێك، قوتابخانەیەك، گەڕەکێك و کۆڵانێك، شەقامێك، کارگەیەك و شوێنێك هەبوو بێ، هێڵی ڕێکخستنی تیادا نەبووبێ.. ڕێکخراوی سلێمانی چەندین کەرتی ڕێکخستن و کەرتەکانیش چەندین پۆل و شانەیان هەبوو، جگە لە شانە و پۆلەکان، چەندین هێڵی تایبەت و دەستەی پێشمەرگەی نهێنی ناو شار هەبوو.. دەستەکانی پێشمەرگەی ناو شار چەندین جۆری چەك و تەقەمەنیان هەبوو.

دیارە.. شاڵاوی مەنعی تەجەولی مانگی / ١٠ / ١٩٨٥، خەڵکی سلێمانی بیری ناچێتەوە، چونکە شاڵاوێکی ئەوتۆ بوو. کە ڕژێم ویستی شاری هەمیشە زیندوو، خۆڕاگر و چاو نەترسی سلێمانی لە بازنەیەکی مەرگدا و بەو پەڕی دڕندانە ئابڵوقە بدات و بە خەیاڵی گڵاوی خۆی خامۆش و کپی بکات و خەڵتانی خوێنی بکات و بە هەزاران خانوو و ماڵ و گەڕەك بە سەر یەکدا بڕووخێنێ و بەو ڕەفتارانەی چاو شکێنی خەڵکی سلێمانی بکات و لە خەبات و ململانێ و ڕێبازی شۆڕشگێڕی دووریان بخاتەوە.. حەز دەکەم ئەوەش بزانرێت کە بۆ یەکەمجار بوو.. ماڵ و خانووی هاووڵاتی لە ناو شاردا، بە بیانوی ئەوەی شتی لە ماڵدا

گیرا بڕوخێنرێ.. بەڵام.. پیلان و نەخشەی نەگریسی دوژمن، پووچەڵ کرایەوە و بە سەلیقەی وردی هاوڕێیانی ڕێکخستن توانرا بەو پەڕی سەرکەوتوویییەوە خۆ پارێزی بکرێت. ئەو بەرنامەیەی دوژمن بۆ سلێمانی دانابوو، وەکو خۆی دەیویست سەر نەگرێ و هەڵبوەشێتەوە و ڕێکخستن لە جاران باشتر و تۆکمەتر و کارامانەتر کارەکانی ئەنجام بدات.

## دوای شاڵاوەکە و ڕێکخستن و ڕێکخستنەوە : -

بە دوای ئەو شاڵاوە دوژمنانەیەدا، ڕێکخراوی سلێمانی هەر زوو کەوتەوە خۆی و بە کار و ئەرك و شێوەی ڕێکخستنەکاندا چۆوە، شێوازێکی نوێتری داڕشتەوە و جارێکی تر ناوی نهێنی هاوڕێیانی ڕێکخستن و ناوی شانە و پۆل و کەرتەکان گۆڕدرایەوە، چەندین هێڵی تری تایبەت و هێڵی تاکی و دەستەی نوێی پێشمەرگەی ناو شار دانرایەوە و دروستکرا.. ئاڵو گۆڕ لە بەرپرسی پول و کەرتەکاندا کرایەوە، پەخشنامەی مانگانە بە چەندین هەواڵ و زانیاری و چەندین خاڵی ئامۆژگاری و ڕێنمایی دەردەکرا و ناوەڕۆکەکەی دەگەیەنرایە هاوڕێیان و شانەکان و هەواڵەکانیش دەگەینرایە جەماوەر... ئەو شاڵاوە هەرچەندە لە ڕادە بەدەر قورس و گران بوو، خەڵکی شار و زۆر خەڵکی ترسان بەڵام.. بوو بە هاندەرێکی تر و زۆر ڕۆڵی خۆی بینی لە گەشە کردن و زۆرتر بوونی هەڤاڵانی ڕێکخستن و جەماوەری شاری سلێمانی زیاتر و زیاتر ڕق ئەستوورتر و بە هەڵوێستتر کرد.

لەم نوسینەدا جێگەی خۆیەتی، ئەو هاوڕێیانەی لە ڕێکخستنە نهێنیەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لەو سەردەمە سەخت و ڕۆژگارە ناهەموارانەدا، کارم لە گەڵدا کردوون و کاریان لە گەڵدا کردووم.. بۆ ڕێز گرتن لە ڕۆڵی جوامێرانەیان بۆ مێژوو ناویان تۆمار بکەم.. تا بزانرێت ئەم ڕۆژەی ئێستا کە بەسەربەستی ئەم نووسینانەی تیا دەنووسین هەروا لە خۆیەوە، نەڕەخساوە، بەڵکە بەری ڕەنجی هەزاران شەهید و ڕۆڵەی جەربەزەی خەڵکی ئەم کوردستانەیە، کە لە پێناوی مافی ڕەوای گەلەکەیاندا ڕووبەڕووی دوژمنانی گەلەکەمان، دەبوونەوە، سنگیان دەنایە بەر گەللەوە و ملی خۆیان دەکرد بە سێدارەدا..

دڵنیاین ئەم هاوڕێیانەی لەم لاپەڕەیەدا، ناویان دێنم ڕۆڵە و پیاوی بە هیمەتی گەلەکەمان بوون،بەو پەڕی دڵسۆزی و لە خۆ بردووییەوە، زۆر بە پەرۆشەوە، بێ گوێدانە ژیان و گوزەرانی خۆیان و خێزان و منداڵیان، بێ بیر کردنەوە لە ماڵ وێرانی و گرتن و کوشتن، مەردانە و چەلەنگانە، لە ناو ناخی هەموو دام و دەزگا سەرکوتکەرەکانی بەعسدا، خەباتیان دەکرد، تێدەکۆشان، ململانێیان دەکرد، دەستیان بە چاوی دوژمندا دەکرد، چاودێری هەڵس و کەوت و ڕەفتارەکانی یەکە یەکەی پیاوان و دەزگاکانی ڕژێمیان دەکرد و ترس و دڵەڕاوکێیان خستبووە دڵی دوژمنەوە، کە بە داخەوە دەڵێم..ڕەنگە ئێستا زۆر لەو تێکۆشەرانە، وەکو پێویست، خەبات و تێکۆشانیان لە بەر چاو نەگیرابێت و پشت گوێ خرابن، ئەوانەشی کاریان پێدراوە لە ئاستی خەبات و ماندوو بوونیاندا نەبێت.

فەرموون بزانن.. ئەوانەی کە تەنها من ناسیومن و یان ئەوانەی منیان ناسیوە و ناسینەکەش لە پێناوی هەڵبژاردنی ڕێبازی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستاندا بووە، بۆ خەباتکردن لە پێناوی مافی ڕەوای گەلەکەمان.. جا ئیتر بزانن.. لە چەند شوێن و کەناڵی ترەوە بە دەیان گروپ و کۆمەڵی تری لەم جۆرە، تێکۆشەرە لە ناو بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی گەلەکەمان و لە شۆڕشە نوێخوازەکەی و لە ریزەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەران و ی. ن.ك)، خەبات و تێکۆشانیان کردووە.

ئەم ناوانە تەنها ئەو ناوانەن، کە لە کار کردندا یەکترمان ناسیوە و کارمان بەیەکەوە کردووە لە پۆل و کەرتەکاندا و هەر یەکێکیش لە مانە بەر پرسی شانە و پۆل و کەرت و هێڵی تایبەت بوون و هەر یەکەیان چەندین کەسیان لە تێکۆشەران لا بووە: –

١. شەهید مامۆستا جەمال تایەر
٢. شەهید مامۆستا عەزیز مەحمود
٣. شەهید حەسەن خاوێی
٤. شەهید حەمە ڕەشید شەریف شارەزووری
٥. شەهید حەسەن سلێمان
٦. مامۆستا محەمەدی مەلا حسین، ماوەیەك لێپرسراومبوو

٧. مامۆستا جەمال عەزیز، ماوەیەك لێپرسراومبوو

٨. خوالێخۆشبوو مامۆستا شێخ محەمەد شێخ غەریب باســـاکی

٩. مامۆستا ئەحمەد سالح

١٠. مامۆستا شێخ عەزیز محەمەد، ماوەیەك لێپرسراومبوو

١١. مامۆستا سەربەست بابە شێخ

١٢. مامۆستا ئەحمەد مەلا محەمەد

١٣. مامۆستا جەمیل مەحموود

١٤ـ مامۆستا شەفیق حەمە بچکۆل(کە بەخائین دەرچوو لەدوای ڕاپەڕین بەسزای خیانەتیگەیەندرا.)

١٥. هاوڕێ شێخ عەبدول(عەبدولرەحمان غفور)، ماوەیەك لێپرسراومبوو

١٦. هاوڕێ عەلی سالح سلێمان

١٧. هاوڕێ وەستا لەتیف هەورامی.

١٨. هاوڕێ ئیبراهیمی حەمە عەلی

١٩. هاوڕێ ئیبراهیم مەحموود

٢٠. هاوڕێ عوسمانی هەلاج

٢١. هاوڕێ عەبدوڵڵا کۆمەڵە

٢٢. هاوڕێ کامەران عەبدوڵڵا ئێستا ناسراوە بە(خەباتە سوور)

٢٣. هاوڕێ عەبدولعەزیز عومەر، پێشگرتنم لێپرسراومبوو

٢٤. هاوڕێ هەمزە عەلی دەدە

٢٥. هاوڕێ شێخ سالحی شێخ نجم الدینی دوکاندار

٢٦. هاوڕێ سەروەر محەمەد

٢٧. هاوڕێ حەسەن شێخ ئیسماعیل

٢٨. هاوڕێ جەمیلە شێخ مەحمود

٢٩. هاوڕێ پەروین کاکە حەمە

٣٠. هاوڕێ شەوقیە کاکە حەمـــە

٣١. هاوڕێ قادری محافڤەزە

٣٢. مامۆستا جەلال غەریب

٣٣. هاوڕێ پەخشان شێخ سالح

٣٤. مامۆستا سەردار حمە ساڵح

٣٥. مامۆستا جەمال ئەمین

٣٦. هاوڕێ سوارە

٣٧. مامۆستا عەلی حاجی محەمەد

٣٨. هاوڕێ ئەحمەد کەریـــم

٣٩. هاوڕێ ئەحمەد شێخ مەحمود

٤٠. هاوڕێ محێدین شێخ عەبدولکەریم

٤١. مامۆستا سدیق محەمەد ئەمین

٤٢. مامۆستا رەئوف ئەحمەد ئالانی

٤٣. مامۆستا غازی عەبدولکەریم

٤٤. مامۆستا رەئوف بێگەرد

٤٥. هاوڕێ حەمەنووری ئەحمەد گەرمیانی

٤٦. مامۆستا حەمەنوری تۆفیق

٤٧ـ هاوڕێ بەختیار عەبدولرەحمان

٤٨. هاوڕێ تایەر لەتیف

٤٩. هاوڕێ گیلاس محێدین

٥٠. هاوڕێ لەمیعە کاکە حەمە.

٥١. هاوڕێ کەژاڵ کاکە حەمە.

٥٢. هاوڕێ بەختیار عومەر

٥٣. مامۆستا فەوزی مەلا مەحموود

٥٤. مامۆستا عومەر مستەفا

٥٥. مامۆستا محمد رەئوف محەمەد

## کونفرانسی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان: -

لــە ســاڵەکانی( ٨٣ و ٨٥ ) دا، یــەکێتی مامۆســتایانی کوردســـتان دوو کۆنفرانســـی بەســـت. لـــەو کۆنفرانســـانەدا ژمارەیـــەکی دیـــاریکراو لـــە مامۆستاتێکۆشەرەکانی رێکخستنی نهێنی ناو شارەکانی سلێمانی و کەرکوك و هەولێر و دهۆك) بەشدارییان تیادا کرد.

*کۆنفرانســی دوو، کــە لــە ســەرەتای مــانگی/ شــوباتی/ ١٩٨٣ لــە بالیســان بەسترا ئەو مامۆستا بەرێزانەی لە سلێمانیەوە بەشداریان لە کۆنفرانسەکەدا کرد، ئەوەی لە بیرم مابن ئەم بەرێزانە بوون:-

١. مامۆستا محەمەدی مەلا حسین
٢. مامۆستا ئەحمەد ساڵح
٣. مامۆستا شێخ عەزیز محەمەد
٤. مامۆستا فەوزی مەلا مەحمود
٥. مامۆستا عومەر مستەفا
٦. مامۆستا محەمەد رەئوف محەمەد رەفیق
٧. مامۆستا سوعاد ئەحمەد
٨. مامۆستا وەسفیە بەنی وەیس
٩. مامۆستا شێخ محەمەد عەبدولکەریم سۆڵەیی.

* لە کۆنفرانسی سێ، کە لە گوندی سەروچاوەی سماقوڵی لە سەرەتای مانگی/ئەیلول/٨٥ بەسترا..ئەو مامۆستا بەرێزانەی لە سلێمانیەوە بەشدارییان لە کۆنفرانسەکەدا کرد ئەوەی لە بیرم ماون ئەم بەرێزانە بوون: -

١. مامۆستا محەمەدی مەلا حسین
٢. مامۆستا شێخ عەزیز محەمەد
٣. مامۆستا ئەحمەد ساڵح
٤. مامۆستا فوزی مەلا مەحمود
٥. مامۆستا عومەر مستەفا
٦. مامۆستا شێخ محەمەد عەبدولکەریم سۆڵەیی

* لـه کۆنفرانســی دوودا، مامۆســتا دکتـۆر کـەمال خۆشـناو کـە ئـەو کاتـە لێپرسـراوی مەڵبەنـدی سـێ بـوو، ڕۆڵـی بـەر چـاوی بینـی لـە بـەڕێوەبردن و سەرکەوتنی کۆنفرانسەکەدا، لە یەکەم ڕۆژەوە تا تەواو بوونی هاوکاری تەواویان کردین.

* لە کۆنفرانسی سێدا، هەڤاڵ کاك کۆسرەت ڕەسول کە ئەو کاتە بەرپرسی مەڵبەندی سێ بوو، ڕۆڵی جوامێرانەی خۆی بینی لە بەڕێوەبردنی کۆنفرانسەکە تا تەواو بوو، هاوکارییەکەی بە ڕادەیەك بوو کە کۆنفرانسەکە بە سەرکەوتوویی کۆتایی بە کارەکانی هێنا.

*دوای کۆنفرانسـەکان لیژنـەی پارێزگـای سـلێمانی، بەوپـەڕی چـالاکیەوە کارەکـانی ڕێکخراوەیـی لـە نـاو جـەماوەری مامۆسـتایاندا جێبـەجێ دەکـرد و پەیوەندی بە زۆر مامۆستاوە کرا سەبارەت بە کارکردنیان لە(ی.م.ك) دا.

*لە هـەردوو کۆنفرانسـی(٢–٣) مامۆسـتایان محەمـەدی مـەلا حسـێن و فەوزی مەلا مەحمود وەکو نوێنەری سلێمانی بە ئەندامی سکرتاریەت هەڵبژێردران.

*مامۆسـتا محەمـەدی مـەلا حسـێن لـە دوای کۆنفرانسـی(٢–٣) وە بـوو بـە بەرپرسی لیژنەی پارێزگای سلێمانی.. تا ساڵی ١٩٩٠.

*مامۆستا شێخ محەمـەد عەبدولکـەریم لـە دوای هـەردوو کۆنفرانسـەکەوە بوو بە لێپرسراوی ڕێکخستنی لیژنەی ناوچەی سلێمانی تا ساڵی ١٩٩٠.

بەپێویستی دەزانم سوپاسی مامۆستا محەمەد نوری تۆفیق بکەم، کەهاندەرم بوو بۆ نووسینی ئەم نووسینە.. هیوادارم نموونەیان زۆربێت.

<u>تێبینی: –</u>

أ. داوای لێبوردن، لەو هاوڕێیانە دەکـەم، کـە لـە گـەڵ یەکدا کارمـانکردووە، لـە بەر بیر چوونەوە ناویان نەنووسراوە، یان ئەو هاوڕێیانەی کە تەنها ناوی خۆیانم نووسیوە و ناوی باوکیانم نەزانیوە.

ب . بۆ نووسینی ئەم بابەتە.. سوودم لەم نووسین و هاوڕێیانە وەرگرتووە: –

١. کتێبی مامە ڕیشە پێشمەرگە پۆڵایینەکە.

٢ـ نووسینێکی مامۆستا محەمەدی مەلا حسین کە لە کوردستانی نوێدا بڵاوکراوەتەوە.

٣. گۆڤاری خەباتی مامۆستا ساڵی/١٩٨٥ سەردەمی شاخ.

٤. کاک ئاراسی شێخ محەمەدی باساکی.

٥. کاک شێخ ساڵحی شێخ نجم الدین.

٦. هاوڕێ جەمشید(فەریدون).

٧. بەڵگە نامەکانی کاک شێخ جەمال شێخ نوری.

٨. بەڵگە نامەکانی مامۆستا تەها بابان لە کتێبی(عالم الکرد المرعب).

٩ـکتێبی رەشەبای ژەهرو ئەنفال بەرگی یەکەم

ئەم نووسینە لەکتێبی مەنعەتەجەولی ساڵی ١٩٨٥ دا کە شارەوانی سلێمانی چاپیکردووە بڵاوکراوەتەوە.

# ماموٚستا شێخ محەمەدو چەند بیرەوەرییەك

لەحەفتاکانەوە یەکترمان دەناسی...ئەوەندەی شارەزایبووم پیاوێکی دڵسۆزی گەل و نیشتمانەکەی بوو. ماموٚستایەکی پەروەردەیی و خەمخۆری ماموٚستاو خوێندکارەکانی بوو، لەناو ماموٚستایان وقوتابیاندا بەڕێزو خۆشەویستبوو، لەناو سلێمانی و ناوچەکەیاندا، کەسێکی کاراو خاوەن کەسایەتی بوو. رۆڵی سەرەکی لە چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکاندا دەبینی. لەناو پیاوانی ئاینیدا رێزی تایبەتی هەبوو. من نەمدەزانی کۆمەڵەیە..

*ساڵی هەشتاو دوو لە ناوڕیزی رێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستاندا، ئاڵوگۆڕ لەبەشەکاندا کرا...کاك ئیبراهیمی حەمەعەلی رۆژێ هات بۆ لام بۆ قەیسەری نەقیب..بەو ناوە نهێنییەی درابوو پێم وەکو لێپرسراوی بەشەکە..خۆی پێناساندم...هەرهەمان رۆژ، رۆژو کات و شوێنی کۆبوونەوەی دانا. رۆژی کۆبوونەوەکە..لە هاوڕێکاندا یەکێك لەمەوعیدەکە دە دەقیقە دواکەوت..کاك برایم وتی ئەو هاوڕێیەمان هیچ کات دواناکەوێت..کاتێکمانزانی سەرکەوت و هەرلە بەردەرگاکەوە وتی دوا کەوتووم خوا میوانی ناوەخت بگرێت..داوای لێبوردنتان لێدەکەم..هاتە ژوورەوەو وتی شێخ محەمەد ئەوە خۆتی و روویکردە ماموٚستا سەربەست وتی برا سێ بەدووین، کاك برایم وتی ئەو هاوڕێیەش هەر لەخۆتانە، من تاقانەم لەناوتانا..کە دانیشت وتی کاکە من و قەرزێکی ئێوە..لە راستیدا من لەو باوەڕەدا نەبووم ماموٚستا شێخ محەمەد ئەندامی کۆمەڵەبێت چەندە رێزی لام بوو ئەوەندەی تر بەرێزتر بوو لام.

*لەهەموو کۆبوونەوەکاندا ماموٚستا لە ئێمە باشترو کاراتر راپۆرت و هەموو کارەکانی جێبەجێ دەکرد..هەر هاوڕێیەك کارەکانی بەباشی رێك نەخستایە بەتوندی رەخنەی لێدەگرت و دەیوت لام سەیرە ئێوە بەو گەنجیەتان کەم تەرخەمی لە کارەکانتا دەکەن، ئینسان هەرکارێکی کەوتە ئەستۆ نابێت تەمەڵی تیادا بکات و، ئەم کارەی ئێمەش وەکو هیچ کارێکی ترنییە..ئەگەر لەجێی من بونایە چیتاندەکرد؟

*ڕۆژێ لەماڵی مامۆستا سەربەست لەسەرچنار کۆبوونەوەمان هەبوو، کە مامۆستا هات وتی تسەور دەکەن بەچی هاتبم؟ وتمان غەیر بەتەکسی، وتی بە ماتۆڕ..هاوڕێ برایم بە پێکەنینەوە وتی بە ماتۆڕ چۆن هاتی؟ وتی ئاراسی کوڕم ماتۆری پێبوو لەگەڵ ئەو سوار بووم ئێمە دەستمان کردە پێکەنین وتمان مامۆستا تۆو سواری ماتۆڕیان نەوتووە. وتی چیبکەم فریا نەدەکەوتم و قەرزار ترتان دەبووم..مەبەستم ئەوەیە لەمەوعید دوانەدەکەوت و زۆر پابەندی کات بوو.

*ڕۆژێ لەماڵی مامۆستا کۆبوینەوە..چایان بۆ هێناین، پاش ماوەیەك قاوەیان بۆ هێناین..دواجار میوەیان بۆ دانایین، کاك برایم وتی پێشنیاریدەکەم بیکەینە بڕیار..ئیتر هەموو کۆبوونەوەکان لێرە دەکەین. مامۆستا وتی زۆرم پێخۆشەو بەدەعوەتی نیوەڕۆیەکیش قەرزەکەشتان دەدەمەوە.

*بۆ کۆبوونەوەیەکمان لە ماڵی ئێمە..مامۆستا وتی شێخ محەمەد ئەگەر من هاتم و کاکەتم بینی چی بکەم؟ وتم نات بینێ..کەهات بۆ ماڵی ئێمە لەبەردەرگا تووشی کاکەم دەبێت..کاکەم بەحسابی خۆی بۆ ماڵی ئەوان دەچێت، مامۆستا کە لادەدات بۆ ماڵی ئێمە کاکەم پێی دەڵێت قوربان ئەوە ماڵی محەمەدی برامە، پێی دەڵێت بەخوا زۆر باشە هەندێ ئیشی مەکتەب و تەربیەم پێیەتی حەزدەکەم بیبینم و، دواجار دێمە خزمەتتان. هاتە سەرەوە وتی چیم وت وا دەرچوو، تووشی کاکەت بووم ناچار وەعدم دایە دوای ئێرە بچم بۆ لای.

*ڕۆژێ بەیان و بڵاوکراوەی زۆرمان بۆ هاتبوو. دەبوو زوو دابەشبکرێن کاك برایم وتی دەبێت ئەمشەو دابەش بکرێن و نابێت هیچ هاوڕێیەك دوای بخات.

مامۆستا وتی..بۆ دوادەکەوێت، من ئەوەندەی دەیدەمە برادەران ئەوەندەش خۆم دابەشی دەکەم، ئەگەر برادەرانیش وا بکەن ئەوە دواناکەوێت و هەر ئەمشەو تەواو دەبێت.

*لە مەنع تەجەولی ساڵی هەشتاوپێنج دا..کەزانیم خانووەکەیان ڕووخاندووە و مامۆستا وخەبات و سۆرانی کوڕیان گرتووە، چووم بۆ لای. بۆی گێڕامەوە و وتی..نازانم لەپشکنیندا چییان دۆزییەوە، یەکسەر من و خەبات و سۆرانیان پێچایەوە. بەهەولی منداڵەکان بە شەقازللەیەك منیان بەرداو نەیان بردم. دەوری نیوەڕۆ کۆمەڵێك بە شۆفڵەوە بە سەرپەرشتی یاسر هاتن..یاسر وتی هاتووین خانووەکەت دەڕوخێنین، وتی ویستم هەوڵ بدەم نەیڕوخێنن،

یاسر وتی تۆ بەعسیت؟ ئەگەر بەعسیت نایڕوخێنین. وتی منیش پێم وت نەخێر بەعسی نیمو ناشبمە بەعسی، وتی ئیتر دەستیان کرد بەڕووخاندنی خانووەکەمان.

وتی کاکە هەر چەندە خانووەکە رەنجی چەند ساڵەمە دەربەست نیم ماڵی دنیا دەبێتەوە بەڵام خەمی کوڕەکانمە...بەورە بەرزیەوە وتی بۆ خەمی ئەوانیش بخۆم..لەسەر دزیو پیاوخراپی نەگیراون...کوردینو دژی بەعسین کوڕی منو خەڵکی تریش دەگرن، میللەت قوربانی دەوێت بەڵام لام سەیرە ئەم حکومەتە بەم سیاسەتە دەیەوێت کورد لەناو بەرێتو شارێکی وەکو سلێمانی خامۆشکاتو بیترسێنێ..بەم رەفتارانەی خەڵك رق ئەستوور دەبێتو زیاتر دژی دەوەستنەوە...

*ساڵانێك بەیەکەوە کارمانکرد..لەو ساڵانەدا رۆژ بەرۆژ رێزو خۆشەویستی لە نێوانماندا زیادی دەکرد..رۆژێك نەمدی لە ئیشو کاری دوابکەوێتو بەو تەمەنەوە زۆر جیدیبوو ئێمە هەمووجار بەخیلیمان بە لەش سوکیو گورجو گۆڵی ئەودەبرد لەو تەمەنەیدا لەهەڵسو کەوتو کارکردندا لە گەنجێکی خوێن گەرم دەچوو.

لەبەر ئەوەی ئەزموونێکی زۆر باشی لەکارکردندا هەبوو، کەڵکی زۆرمان لە ئامۆژگارییو وردەکارییەکانی وەردەگرت...هاندەرێکی باشمان بوو بۆ کارو راپەڕاندنی کارەکانمانو رێنمایی بەردەوامی دەکردین..زانیاری زۆری دادەنێ.

لە کۆتایدا دەمەوێت بڵێم..دەبوو..مامۆستا شێخ محەمەد کاتێ کە کۆچی دەکرد، وەکو کادرێکی پێشکەوتووی مەڵبەندی رێکخستنی سلێمانی بوایە، پلەشی لە ئەندام مەڵبەند بەرەو ژوورتر بوایە، چونکە بەحەق مەڵبەندی سلێمانی لەبنچینەدا لەسەر دەستی ئەو مامۆستایەو چەند تێکۆشەری تر بەردی بناغەی دانراوە...ئەوە ماوە بڵێم هاوڕێ(ئامۆژگار) ئەو مامۆستا تێکۆشەرو کۆڵنەدەرە بوو، کە لە گۆڕەپانی خەباتی کوردایەتی(٥٥)پەنجاوپێنج ساڵ بەبێ دابڕان خەباتی لەپێناوی مەسەلەی رەوای گەلەکەیداو(٣٣)ساڵ بەوپەڕی دڵسۆزییەوە لەبواری پەروەردەو فێرکردندا خزمەتی بە نەوەکانی گەلەکەی کردو سەربەرزانە ژیاو سەربەرزانە گیانی سپارد بەخاکی نیشتمانەکەی..

سوپاستان دەكەم كە ئەم هەلەتان بۆ رەخساندم لە خزمەتتاندا بە كورتییەكی كورت رۆڵی جوامێری مامۆستا شێخ محەمەد لە چەند بیرەوەریەكدا باس بكەم.

٢٠٠٢/١١/٨

# ماموّستا شێخ محەمەدوتەمەنێك بۆ تێكۆشان

ئەو تێكۆشەرەی لە بیستەكاندا چاویهەڵهێناو لەسییەكاندا ئەلف و بێی كوردی فێربوو. لە چلەكاندا ڕێبازی كوردایەتی هەڵبژارد. لە پەنجاكاندا كەوتە پەروەردەو فێركردنی منداڵانی كوردو لە شەوی٢/١٠/٢٠٠٢ دڵە گەورە پڕ لەهیواكەی لە لێدان كەوت. ئەوە ماموّستا شێخ محەمەدی شێخ غەریبی باساكە..كە بە(هاوڕێی ئامۆژگار) ناسرابوو. شانازیە بتوانم كورتەیەكی مێژووی ژیانی ئەو تێكۆشەرە بنووسمەوە، بۆ ئەوەی ڕۆڵی جوامێرانەی ئەو ماموّستا تێكۆشەرو كوردپەروەرەی گەلەكەمان، لای نەوەكانی گەلەكەمان شاراوە نەبێت..

ماموّستا شێخ محەمەد..لە١٩٢٧لە گوندی چەوتان لەگەڵ كۆچ رەوی شێخ مەحمودی نەمردا لە دایكبووە. لە١٩٣٤دا لە بەرزنجە دەستی بەخوێندن كردووە لە١٩٤٧دا لە(دار المعلمینی ریغی) لە محامیل وەرگیراوە...لە١٩٤٨دا بەشداری لە ڕاپەڕینەكانی(وثبة)دا كردووەو بەو هۆیەوە دەردەكرێ..لە١٩٥٢دا لە بەغدا بەشداری خۆپیشاندانەكانی لەدژی ئینگلیزی كردووە. لە ١٩٥٦دا بۆتە ماموّستاو بۆ یەكەمجار لە گوندی ژاژلێی ماوەت خولی نەهێشتنی نەخوێندەواری بۆ نەخوێندەوارانی گوندەكە كردۆتەوە.

لە١٩٤٨وە تێكەڵاوی بزوتنەوەی كوردایەتی دەبێت و١٩٥٨دا دەبێتە ئەندامێكی چالاكی پارتی دیموكراتی كوردستان. لە ١٩٦٢ دەگیرێت و دوای بەربوون بۆ ماوەی چوار سال دوور دەخرێتەوە. دەبێتە بەرپرسی پارتی لە(شامیەو مشەو حەمزەوسماوە)لە ١٩٦٦دا لەگەڵ باڵی مەكتەبی سیاسی درێژە بەخەبات دەدات، تا یەكگرتنەوەی ساڵی ١٩٧٠. لە ١٩٧٤ لەسلێمانی دەمێنێتەوەو سەرپەرشتی ڕێكخستنەكانی ناوچەی سلێمانی پارتی و سكرتاریەتی ماموّستایان وكرێكاران و جوتیاران دەكات..١٩٧٦پەیوەندی بە ریزەكانی كۆمەڵەی رەنجدەرانی كوردستانەوە دەكات و لە خۆپیشاندانەكەی ئەوساڵەدا كۆڕێكی بەناوی(ئاراس) دەگیرێت.. لەڕیزەكانی كۆمەڵەدا..چەند پلە دەبڕێت و چەندین كەس بۆناو ریزەكانی كۆمەڵە رادەكێشێت و بە بەردەوامی كار

دەکات بەوپەڕی دڵسۆزیو بە پەرۆشییەوە ئەرکو کاری ڕێکخستن لە ئەستۆ دەگرێت، پیاوێکی مولتەزیم، مامۆستایەکی پەروەردەیی..بەتواناو ئازاو کارامە بوو، لەرۆژانەی خەباتیدا لە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستاندا،ڕوبەڕوی ناخۆشیو کارەساتی قورس بۆتەوە...لە رۆژی مەنعی تەجەولەکەی١٧/١٠/١٩٨٥دا جگە لەوەی خانووەکەی دەڕووخێننو لەبەرامبەری یاسر ڕادەوەستێتو پێی دەڵێن.(نەخێر من بەعسی نیمو ناشبمە بەعسی)دوو کوڕی یەکێکیان بەناوی مامۆستا خەباتو ئەویتریان بەناوی سۆران بەر شاڵاوی گرتن دەکەونو مامۆستا خەبات لە١٨/١٠/٨٥ بەگوللەبارانکردن شەهیدی دەکەنو سۆران لەبەندیخانەدا دەمێنێتەوە تالێبوردنی١٩٨٨..لە٢٣/١٢/١٩٨٩جارێکیتر لەلایەن ئەمنی سلێمانیەوە دەگیرێتو ڕەوانەی ئەمنی هەولێر دەکرێتو پاش ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر دوای چەند مانگێك بەردەدرێت.

مامۆستا شێخ محەمەد کە لەناو ریزەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستاندا کاریدەکرد، بە(هاوڕێ ئامۆژگار) ناسرابوو..تێکۆشەرێکی خاوەن ئەزموونی ڕێبازی کوردایەتیو پیاوێکی نەفەس درێژو ئازاو بەتواناو خۆڕاگرو دڵسۆزی مەسەلەی ڕەوای گەلەکەی بوو.

بەبێ ترس لەپێناوی مافی ڕەوای گەلەکەیدا خەباتیدەکرد...بەو تەمەنە زۆرەیەوە وەکو گەنجێکی خوێن گەرمی زۆر بەتوانا هەڵدەسوڕاو ئەرکو کارەکانی بەبێ دواکەوتن ئەنجام دەدا..کوڕوکچوخێزانوکەسوکارەکانی بەبیروباوەڕی کۆمەڵە پەروەردە دەکردو ماڵەکەی تەرخان بوو بۆکاری ڕێکخستنو بەخانەوادەیی خۆیان پێشوازی لە هەموو تێکۆشەرێك دەکرد کە ڕوویدەکردە ماڵەکەیان.

ئەو پیاوە، ئەو مامۆستایە چونکە تێکۆشەرێکی پاكوکوردپەروەرو دڵسۆزی گەلو نیشتمانەکەیبوو. لەماوەی ژیانیدا لەمەیدانی خەباتی کوردایەتیدا گرتنو ئەشکەنجەو کارەسات..لەورەی نزم نەدەکردەوەو کاری لێنەدەکردو هەمیشە بەوپەڕی خۆشەویستییەوە کاری دەکردو کۆڵی نەدەداو جاری لەدوای جار ئازایانەترو کارامانەتر رق ئەستوورتر دەبوو ڕووبەڕووی دوژمن رادەوەستا.

ماموٚستا بەهەڵوێستی کوردپەروەرانەی..خوٚی لەدڵی کوٚمەڵانی خەڵکی ناوچەکەیان و سلێمانیدا خوٚشەویست کردبوو. ببووە کە سایەتیەکی خاوەن ئەزموون و ماموٚستایەکی کوٚمەلایەتی و ئایینی و کوردایەتی.

بوٚیە گوێیان لێدەگرت و بەقسەیان دەکرد و بوو بەپریش سپی و دەم سپی خەڵکی ناوچەکەو لەهەموو کێشە کوٚمەڵایەتیەکاندا بەشداریدەکردو بە ئاسانی کێشەکانی چارەسەر دەکردن..ئەوەندە پەروٚش و دڵسوٚز بوو لەبواری پەروەردەو فێرکردن و زانستیدا..لەناو توێژی ماموٚستایاندا یەکێکبوو لەماموٚستا خوٚشەویست و بەرێزەکان و دڵسوٚزی خوێندکارەکانی بوو.

لەراپەرینە شکوٚدارەکەی۱۹۹۱دا لەگەڵ کورو کچ و خێزانەکەی روٚڵی ئازایانەیان لە دروستکردنی شانە چەکدارەکاندا بینی و بەشداری دلێرانەیانکرد.

دوای راپەرینیش وەکو ئەندامی کوٚمیتە لەمەڵبەندی سلێمانی کاریدەکردو دواقوٚناغی تێکوٚشانی لە مەکتەبی کوٚمەڵایەتی تەواوکرد..کە بەداخەوە دوای(۳۳)ساڵ خزمەتی پەروەردەو زانست و فێرکردن و(۵۵)ساڵ خەبات و تێکوٚشانی درێژخایەن لە۲/۱۰/۲۰۰۲دڵی ئەو تێکوٚشەرە گەورەیە لە لێدان کەوت و ماڵئاوایی لە خێزان و کەسوکارو هاورێکانی و گەل و نیشتمانەکەی کرد...

*ماموٚستا شێخ محەمەد شێخ غەریبی باساکییە لە ۲/۱۰/۲۰۰۲بەنەخوٚشی کوٚچی دوایکرد لەسلێمانی.

## دیمانەت بەخێر پەرلەمان...(                    )

شەڕ..خوێنی مژین، رەچەڵەکی دەرهێنااین، لێکی هەڵوەشاندین ئێسقانەکانی لەشمانی کرۆشت، سەروسامانی بەهەدەر بردین. خەبات و قوربانی ساڵەهامانی کردە دیاری پێشکەشی دوژمنانمانی کرد. شەڕ چی پێنەکردین و چی لێنەکردین. ماڵی وێرانکردین..رەنجی چەند ساڵەمانی دا بەدەم خوێنەوە..

ناشیرینی کردین.. کردینیە ئاردی ناو دڕک و خواست و ئاواتەکانمانی لە گۆخست..نغۆری کردین. مردووەکانمانی مراندەوە، شەهیدەکانمانی یارچە پارچەوشیپرزە کرد. تواناو تاقەتی شارستانی رووخاندین. فەرهەنگ و کەلتوورو مێژوو شوێنەوارو پەروەردەو ئەدەب و رۆشنبیری و هونەری قێزەونکردین. خوێندکاری خوێندنگاکانمانی چەواشەکرد. گەنجەکانمانی رەهەندەی هەندەرانکرد..شەڕ دەستی خستە بینەقاقامان، دەیویست بمانخنکێنێ..شەڕ پەیوەندییە ئیقلیمیەکانی جیاکردینەوە. دبلۆماسیەتی کوردی بە ئاقاری خراپ و ترسناکدا برد.. دۆستەکانمانی دڵگران و تۆران و ساردکردەوە، دوژمنەکانمانی دڵشادو راستکردەوە. شەپرزەی بڕین. بەرهەمی خوێنی شەهیدانی لێونکردین..پەرلەمان. پەرلەمانتارانی لێونکردین، حکومەتی هەرێمی کوردستانی کەرت و پەرتکردین. دەسەڵاتە یاسایی و ئیداری و سیاسی و فەرهەنگییەکانی دابەشکردین. تیرۆریستانی لێرەو لەوێ قوتکردەوە. هەلپەرست وخۆپەرستی نزیککردەوە. بازرگانانی شەڕ بەخوێنی شەهیدانمان کۆشك و تەلاریان بەرزکردەوە. سیاسەتی کوردایەتی لە کوردپەروەری دوورخستەوە. گۆڕستانی شەهیدانمانن سیخناخ و وڕسکرا.

هێزی پێشمەرگەمانی پارچە پارچە کردو بەگژی یەکیدا کردن و گوللەیان ئاڕاستەی سنگی یەکتر کرد.. لوتکەی شاخەکانمان، دەشت و دۆڵ و هەردەکانمان لێوەرەسبوون و نەفەرتیان لێکردین و کانی وکارێزەکانمان لێخن هەزاران منداڵمان بێ باوك و هەزاران ژنمان بێ مێرد مانەوە، هێزە سیاسیە

ڕەسەنە کوردییەکانی لەیەکدوور خستەوە، چەند هێزی نامۆ بەکوردو خاکی کوردستان خڕ کردەوە. پیاوانی ڕژێم و دوژمنانی گەلەکەمانی دەستگرت و لەناو ریزەکانی کوردایەتیدا جێکردەوە.

شەڕ ئەو پەرلەمانەی لەئەنجامی خوێنی شەهیدان و ئەنفالکراوان و کیمیابارانکراوان و زیندەبەچاڵکراوان و قارەمانانی زیندان، لەسێدارە دراوانمان هاتە بەرهەم، لێی شاردینەوە..شەڕ ئەنفال و کیمیاباران و سووتماککردنی کوردستان و تەرحیل و تەبعیس و تەهجیری بیربردینەوە. ئازادی مافی مرۆڤ دیموکراتی، پێشکەوتنخوازی و شارستانی بەتوندوتیژی و رق و رقلێبوونەوەی گۆڕینەوە. شەڕ بازاڕو بازرگانی شارەکانی ی‌چەواشەکرد، دراوەکانی ناو کوردستانی بەرزو نزمکرد، هەمو توانای ئابووریمانی بۆ کڕینی چەك و تەقەمەنی راکێشا، فێری درۆ و فێڵ‌ودزی و سەنگەر سەنگەرێنەو بەدرەوشتی و داوێن پیسی کردین. شەهیدەکانمانی بیر بردینەوە. منداڵ و خێزانەکانیانمان پشتگوێ خست..پارتی و یەکێتی لەیەکدوور خستەوەو حکومەتی هەرێمی کوردستانی کردینە دوو حکومەت..پەرلەمانی لە هۆڵی کۆبوونەوەی پەرلەمان بێبەریکرد..نەفرەت لەشەڕو شەڕخوازان...پەرلەمان دیمانەت بەخێر.بەدیدارت ماڵەکانمان دڵی هەمووما‌نت ڕووناککردەوە...یەکێتی وپارتیت یەکخستەوە.

مام جەلال‌وکاك مەسعودت گەشکردەوە گەلەکەمانت شادکردەوە، خیتابی سیاسی کوردت یەکخستەوە...دەستکەوتی و بنووی ساڵەهامان پێی شادبووینەوە. پەرلەمان دیمانەت بەخێر..پەرلەمانبە، پەرلەمانی یەکگرتووی کوردستانبە، چقڵی چاوی دوژمنانبە. وا لەگەڵ خۆتا دۆستی دێرینی کوردو خەمخوری پەرلەمان و مافەکانی گەلی کوردت هێناوە.. خاتوو دانیال میترانت هێناوەتەوە...بەخێربێی دانیال بەخێر بێی بۆ پەرلەمانی کوردستان... پەرلەمان دەبا ئیتر لەهۆڵی کۆبوونەوەکانتەوە بڕیاری چارەی خۆنووسین و هەڵبژاردنەوەی پەرلەمانێکی ترو فیدراڵی و سەربەخۆیی و یەکگرتنەوەی حکومەتی هەرێمی کوردستان بدرێت.. دەبا لە هۆڵی کۆبوونەوەکانەوە دوژمنانمان تێبگەن، ناتوانن بە ڕێگای تیرۆرو سەرکوتکردن و پیلانگێری لەناومان بەرن، دەبا لەهۆڵی کۆبوونەکانتەوە، دۆستەکانمان خۆشحاڵ و دوژمنەکانمان بێزار بکەین. دەبا لەهۆڵی کۆبوونەوەکانتەوە. توانا دارایی و ئیداری و سیاسییەکانمان

یەکبخەینەوەو کوردستانی پێ ئاوەدان بکەینەوەو، ژێرخانی ئابووری کوردستانی پێببوژێنینەوەو گەلەکەمانی لێ فەراهەم بکەین. دەبا لە هۆڵی کۆبوونەوەکانتەوە، بڕیاری تەحریم کردنی شەڕ بدرێت و شەڕوشەڕەنگێزی وازی لێبهێنرێت، دەبا لەهۆڵی کۆبوونەوەکانتەوە..بڕیاری بووژاندنەوەی زمان و ئەدەب و رووناکبیری و هونەرو مێژوویی کوردبدرێت و، کتێبخانەی کوردی بە بەرهەمی زانستی و فەرهەنگی و ئەدەبی و مێژوویی پڕبکرێتەوە. دەبا لەهۆڵی کۆبوونەوەکانتەوە، خیتابی سیاسی کورد یەکبخرێتەوە، پەرلەمان دیمانەت بەخێر..بەخێربێیتەوە..بەتۆوە گشت کەناڵەکانی راگەیاندنەکان جوانن. بەتۆوە دەنگ و باسەکان خۆش و وشەکان رەوانن. بەتۆوە کەناڵەکانی دنیا سەرقاڵن.

پەرلەمان...بەنەوازشەوە...بەناوی هەموو منداڵ و ژن و پیاوی کوردەوە، بەناوی گەلی کوردستانەوە، دەست بەسنگەوە بگرەو زۆر بەگەرمی پێشوازی و بەخێرهاتنەوەی دۆستی دڵسۆزی دێرینمان خاتوو دانیال میتران بکە. پێی بڵێ بەخێر بێیت بۆ پەرلەمانی بەخێربێیت بۆ کوردستان...بەخێربێیت گوڵی بەشەوق و بۆنخۆشی دایکی گەورەو خۆشەویستمان. هۆڵی پەرلەمانت پرشنگدار کرد، بەخێربێیت هاتوویت لەنێوانی مام جەلال وکاک مەسعودو لەناو پەرلەمانی کوردستاندا دابنیشێت و، هاتوویت وتاری یەکگرتنەوەی پەرلەمان و دۆستایەتی و دڵسۆزیت لە پەرلەمانی کوردستانداو، بۆ خەڵکی کوردستان بخوێنیتەوە. بەخێر بێیت دایکە بەسۆزەکەی کورد.

خۆشەویستەکەی خەڵکی کوردستان. بەخێربێیت دایکی تەنگانەمان و رێنیشاندەری رۆژانی شەڕو ئاشتیمان..هاتوویت مژدە بەخەڵکی کوردستان و دۆستەکانی کورد بدەیت، کە لەپەرلەمانی کوردستان کەوتەوە کۆبوونەوەکانی، بەگوێی دوژمنانمانیدا بدەیت، کە خەیاڵیان خاوە کورد دایک و دۆستی دڵسۆزی وەکو تۆی هەیت، قەلاچۆ ناکرێت و لەناو ناچێت، بەخێربێیت..ژنە گەورەو مەزنەکەی فەرەنسا و هاوسەری میتەرانی دۆستی کورد. پەرلەمان و هۆڵی پەرلەمانت رۆشنکردەوە. کوردستان و خەڵکی کوردستان مژدە بەخشکرد..بەخێرهاتنت دەکەین لەزاخۆوە تا خانەقین دەستەونەزەر لە ئاستی بەرزی مەزنیت دەست بەسنگەوە دەگرین و رادەوەستین. دیمانەتان بەخێر

پەرلەمان و خاتوو دانیال میتران. دیمانەتان بەخێر..پەرلەمان بەوردی گوێ بۆ ئامۆژگاری دۆستانەی میوانەکەتان بگرن.

لەهۆڵی کۆبوونەوەکانتەوە..لەم بارودۆخەی ئێستای دنیادا کە بڕیاری گۆڕانکاری لەسەر دەسەڵاتداری عێراق و ناوچەکەدا هەیە. دەبێ چارەنووسی گەلەکەمان و دوارۆژی لەسەر دەستی پەرلەمانەوە دەسە بەربکرێت، دەبا لەهۆڵی پەرلەمانەوە، بەختیاریی سیاسی یەکگرتووی کورد. هەڕەشەی دوژمنان و پیلاننیان پووچەڵبکرێتەوە...پەرلەمان..کورد چاوی لەتۆبڕیوە. چاوەڕوانی بڕیارەکانتە...دیمانەت بەخێر پەرلەمان

# میهرەجانی مەولەوی‌وکۆنگرەی هەورامانناسی‌و هاوئاهەنگی رۆشنبیران

زۆر دەمێکە رۆشنبیری کورد. لەکوردستانی ئێران‌و کوردستانی عیراق‌و تامەزرۆی ئەوەبوون. بەیەکەوە راوبۆچوونەکانیان لەسەر رەوتی رۆشنبیری کوردی تاوتوێی بکەن

لەرۆژانی(٢٥/٢٦/٢٧/٤/٢٠٠٢)دا وەزارەتی رۆشنبیری بۆیادوبیرەوەری شاعیری پایەبەرزی کورد مەولەوی مەزن. میهرەجانی مەولەوی لەشاری سلێمانی ساز کرد...بۆ میهرەجانە کە، کۆمەڵێ لەرۆشنبیرانی کوردی کوردستانی ئیران‌و بانگهێشت کرابوون. رۆژی ٢٤/٤ وەفدی رۆشنبیریەکەی کوردستانی ئێران گەیشتینە سنووری هەرێمی کوردستان‌و پێشوازی گەرمیان لەلایەن وەزارەتی رۆشنبیری‌و لیژنەی باڵای میهرەجانەوە لێکرا، هاتن‌و گەیشتنی وەفدەکە لەکات‌و رۆژی خۆیدا بۆ بەشداری میهرەجانەکە ئاسۆگەیەکی گەشی نیشاندا، لەوپەیوەندییەی نیوان کۆماری ئیسلامی ئێران‌و حکومەتی هەرێمی کوردستاندا، تێکەڵاوبوون‌و باوەش بەیەکدا کردنی رۆشنبیرانی کوردی ئێران بەرۆشنبیرانی کوردی شارۆشارۆچکەکانی کوردستان ئەو رۆشنبیرە کوردانەی لەبەغداوە هاتبوو دەستپێکردنێکی نوێ‌و هیوای نوێ‌و دوارۆژێکی رۆشنی هێنایە کایە... ئالوگۆڕکردنی بیروراو مەسەلە هەنووکەییەکان رۆشنبیری کوردی ئومێدێکی گەورەی دروست کرد. دوای تەواو بوونی میهرەجانەکە مژدەی کۆنگرەیەك درا بەناوی کۆنگرەی هەورامانناسی لەشاری سنە.. رۆژانی ٧/٨/٩ کۆنگرەکە دەستی پێکردو بۆئەم کۆنگرە یەش، ژمارەیەکی زۆر لەرۆشنبیرانی کوردی ئێران لەهەمووشارەکانەوە بانگهێشت کرابوون وەفدی وەزارەتی رۆشنبیری بانگهێشت کرابوون..وەفدی وەزارەتی رۆشنبیری رۆژی ٦/٩ گەیشتە سەیرانگای دڵگیری زرێباری مەریوان‌و لەشاری سنەی رازاوەدا بەدیداری رۆشنبیرانی کوردستانی ئێران شادبوون.

سێ ڕۆژ لەسلێمانیو سێ ڕۆژ لەسنە کەرنەفالی یەکترناسینو یەکتربینینەوەوبیرو ڕاگۆڕینەوەیەکی ئەوتۆ بوو. کە لەمێژووی ڕۆژشنبیری کوردیدا لاپەڕەیەکی پرشنگداری داگیرکرد، من لای خۆمەوە ئەوەندە بەوتێکەڵاو بوونە دڵخۆش بووم وام دەزانی سنوور لەنێوانی هەردووپارچەکەی کوردستاندا نەماوە و بووینەتەیەکپارچە. کەدەمدی مامۆستا ئەیوبو مەهابادیو مامۆستا کەریم زەندی سلێمانی بەکلێتەکانیانەوە لەهۆڵەکەدان دادەنیشنو کەدەمدی پرۆفیسۆر د.عیزەدینو د.عەلی لەسەریەك مێزو شانۆ دادەنیشن، کۆڕەکە بەڕێوەدەبەنو کەدەمبیست وتەی مامۆستای پایە بەرز مەلا عەبدولکریم مدرس، لەجیاتی خۆی مژدانە دەنێرێ بۆ میهرەجانو کۆنگرەکان ئەوندەیتر ئاهم پیادادەهاتەوە. کاتی پارێزگای سنە لە تەلاری پارێزگا لەگەڵ وەفدی وەزارەتی ڕۆشنبیری کۆدەبووەو بەوردی گوێی لەراوبۆچونەکان دەگرت، کاتێ دەمبینی ڕۆژی یەکەمی میهرەجان هەموو وەفدی میوانی ڕۆشنبیران سەرشاتەی مەزاری مەولەوی بەسەردەکەنەوەو کەرنەڤالی کردنەوەی مەزارەکە بەڕێوەدەبەنو کاتێ دەمبینی لەدوا ڕۆژی گۆنگرە پانۆرامای کاروانی ئوتۆمبیلی پڕ لە ڕۆشنبیران لەسنەوە بەرەو هەورامانی تەختو مەزاری شاعیری پایە بەرزی کوردبێسارانی دەکەینەوە، لە ڕێورەسمێکی پرشکۆدا کردنەوەی مەزاری پیرۆزی بێسارانی دەکەنەوە، کاتێ دەمبینی لەپێشوازیدا لەسەر ئاوی باشماخ کار بەدەستانی کۆماری ئیسلامی ئێران بەرەسمیو ئەوپەڕی خۆشحاڵیەوە میوانداری وەفدی وەزارەتی ڕۆشنبیریو حکومەتی هەرێم دەکەنو، هەنگاوهەنگاو دەستیان دەگرێت، کاتێ دەمبینی لەگەڕانەوەی وەفدەکەدا کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی و ڕۆشنبیرانی کۆماری ئیسلامی ئێرانی بەو پەڕی ڕێزوشکۆداریەوە، خواحافیزی لەوەفدەکە دەکەنو دیاری پێشکەش بە هەریەك لەئەندامانی وەفدەکە دەکەن، ئا ئەمانە هەر هەمووی ئاواتەکانمی سەوزکردنەوە.

## چاو پێکەوتن:

**پ: ئێوە وەك بەشداربوویەکی پێشانگای یەکەمی جیهانی کتێب پێشنیازتان چییە بۆ ئایندەو پێشانگاکە چۆن دەبینن؟**

پێشانگای یەکەمی جیهانی کتێبو هەموو پێشانگایەکی تر کراونەتەوەو دەکرێنەوە جووڵانەوەیەکی باشی دنیای کتێبو رووناکبیرییە....ئەم جۆرە پێشانگایانە، بایەخی تایبەتی خۆی هەیە. بۆ ئەمڕۆی کوردستانو حکومەتی هەرێم، لەلایەن حکومەتێکی وەکو کۆماری ئیسلامییەوە، ئەنجام دەدرێت.

کوردستانورووناکبیرانی کورد، لەبەر ئەوەی تا ئێستا رێگایەکی رەسمی بۆ هێنانی کتێبو ناردنەدەرەوەی چاپکراوەکان نییە...بەدەگمەن چاپکراوی وڵاتانی دنیا دەگەنە ناو کوردستانو چاپکراوی ناو کوردستانیش تاكوتەرا دەگەیەنرێتە دەرەوە. بۆیە ئەمجۆرە پێشانگایانە دەبێتە هۆی دەوڵەمەند کردنی کتێبخانەی کوردی لەلایەكو رووناکبیری کورد بەچاپکراوی نوێ جیهانی ئاشنا دەبێت، خۆزگا وڵاتانی دەوروبەر بەتایبەتی ئێرانو تورکیا..رێگایان دەدا. کەئێمەش ساڵانە لەوڵاتەکانیاندا پێشانگای کتێبی کوردیمان بکردایەتەوە.

پێشانگاکە کەموکوڕی زۆری هەبوو، ناکرێت لەوەڵامی پرسیارێکدا تۆماربکرێت. پێشنیارم بۆ ئاینده بۆ وەزارەتی رۆشنبیریو کتێبخانەی گشتی سلێمانی ئەوەیە تەنها ئەرکیان ئەوە نەبێت پێشانگا بکرێتەوە.بەڵکە پێویستە کە هەر وڵاتولایەنێك داوای ئەوە دەکات لە کوردستاندا پێشانگا بکاتەوە... بەرنامەیان هەبێت...مەرج هەبێت...بەرنامەکە چۆنێتی کردنەوەی پێشانگاکەو ماوەکەیی و کاتەکانیو شێوەی بەڕێوەبردنی مەرجەکانیش..دانانی نرخی کتێبەکانو رێژەی داشکاندن جۆری هێنانی کتێبەکان ئەو، کتێبانەی وەزارەتی رۆشنبیری دەیەوێت بیانکڕێت حیسابێکی تایبەتیان لەنرخەکەیدا بۆبکرێت، بۆ ئەوەی بتوانرێت هەموو کتێبخانەکانو ئەودەزگایانەی کە پێویستیان بەکتێبە، بەئاسانی کتێبەکانیان بۆ دابینبکرێت...بۆ ئەمەش لیژنەیەکی شارەزا لەوەزارەتو ئەولایەنەی دەیەوێت پێشانگاکە بکاتەوە، نرخی کتێبەکانو رێژەی

کەمکردنەوە دابنێت. سەبارەت بەپرسیاری دووەمیان، وەکو لەوەلامی پرسیاری یەکەمدا ئاماژەم بۆکردووە، کردنەوەی پێشانگاکە خۆی لەخۆیدا گواستنەوەی زانستو رۆشنبیریو شارستانیەتە لەولاتانی دەرەوە بۆ ولاتێکی ئابلوقەدراوی وەکو کوردستان...بەشێوەیەکی گشتی ئاستی پێشانگاکان لەرووی بابەتی کتێبەکانەوە زۆر باشبوون...بەرای من ئەم پێشانگای یەکەمی جیهانی کتێبە...لەدانانی نرخەکاندا فێل لەوەزارەتو رۆشنبیری کورد کرابوو. کە نەدەبوو وابوایەو بەرای من ئەوە یەکێکە لەکەمو کورییەکانی پێشانگاکە. وەکو هەستم پێکردوە. زۆربەی رۆشنبیری کوردی گلەییان لەنرخەکان هەبوو..ئێمە حەزدەکەین ئەو پێشانگایانە بۆ ئەوەبکرێتەوە کەخزمەتی باشی خوێنەرورۆشنبیری کوردبکات. نەك بۆمەبەستی بازرگانی کردن بێت..وەکو من بزانم لەم جارەوە وەزارەتی رۆشنبیری ئەزمونێکی باشی وەرگرتووە بۆ داهاتوو. هیوادارم لەمەودوا بەبەرنامە پێشانگا بکرێتەوە، کردنەوەی پێشانگا بۆ پێشانگا کردنەوە نەبێتو بەس.

# بۆ دەستەی ڕێزلێنانی نووسەران وهونەرمەندان لەوەزارەتی ڕۆشنبیری

بەپێی بڕیاری ژمارە(٨٦)ی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران لەرۆژی٢٠٠٢/١٢/٢١سەبارەت بە ڕێزلێنانی نووسەران و هونەرمەندان:

١. یەکێتی نووسەرانی کورد بەنوسراوێکەوە لیستێکیان بەناو نووسەران ئاراستەی دەستەکەتان کرد لەو لیستەدا ناوی من تۆمار کرابوو.

٢. جارێکی تر لەسەر داوای دەستەکەتان یەکێتی نووسەران فۆرمێکیان بەسەر نوسەراندا دابەشکردو، منیش ئەو فۆرمەم بەپێی خاڵەکان پڕکردەوە..کۆمەڵی نوسین و شیعرم وەکو بەڵگەی نوسین هاوپێچ کردو ناردمەوە بۆ یەکێتی نوسەران.

٣. ئەو فۆرم‌ونوسینانە لەلایەن یەکێتی نوسەرانەوە جارێکی تر پێشکەش بەدەستەکەتان کرا.

٤. کاتێ دەستەکەتان کەوتنە شەن‌وکەو کردنی نوسەران...ناوی(من)بەڕەوا نەزانراوە بخریتە لیستی ڕێزلێنانەکەوە.

٥. لەساڵی ١٩٧١ەوە ئەندامی دەستەی یەکێتی نوسەرانی کوردم.

٦. ئەم نوسەرە بەڕێزانەش لەنزیکەوە ئاگاداری نوسینەکانمن و لەهەر کەسێکیان پرسیار بکرێ یەکسەر ئەو حەقەم دەدەنێ، ئەو بەڕیزانەش ئەمانەن:(د.عیزەدین مستەفا، د.کاوس قەفتان، د.ئیحسان فوئاد، مستەفا ساڵح کەریم، جیهان عومەر، حەمەنوری تۆفیق، رەئوف بێگەرد، شێرکۆ بێکەس، حسێن عارف، سەلام مەنمی، فوئاد قەرەداغی، عەبدولکەریم شێخانی، دەیانی تر...)

٧. من نازانم لەسەر چ بنەمایەك دەستەکەتان نووسەرانیان هەڵسەنگاندوە بەڵام لەسەر هەر بنەمایەك بێت(ناحەقی بەرامبەرم کراوە)، ناڕەزاییم لەسەر هەڵسەنگاندنەکەتان هەیەو داوای مافی خۆم دەکەم، کەوەکو نوسەرێك ئەو

بڕیاری ڕێزلێنانە بمگرێتەوە کەلەپێش ساڵانی ١٩٧٠وە من دەنوسمو بەبێ دابڕان لە ساڵی ١٩٧٠وە نوسینم لەرۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوکرۆتەوەو لەچەند رۆژنامەو گۆڤارێکدا کارم کردوە ئەوەی بۆ من سەربەرزییە ئەوەیە کەرۆژێ لەرۆژان یەك وشەم بۆ بەعس نەنووسیو، بۆیە داوا دەکەم کە دەستەکەتان بەشەن و کەوەکەتاندا بچێتەوە. مافی نوسەران پێشێل نەکرێت لەگەڵیا مافی منیش...ئەگەر هۆیەکتان لا بەرجەستە بووە..ئەو هۆیەم بۆ روونبکرێتەوە چاوەڕوانی بڕیاری گونجاوی دەستەکەتانم.

لەگەڵ ڕێزدا

٢٠٠٣/٦/٣

<u>تێبینی</u>:

لەساڵەکانی ١٩٧٠ وە بەناوی محەمەد عەبدولکەریم بەرزنجی نووسینەکانم بڵاودەکردەوە.

وێنەیەك بۆ/یەکێتی نووسەرانی کورد لقی سلێمانی بۆ ئاگاداریتان– وە راتان سەبارەت بەنارەزاییەکەم بۆ دەستەی ڕێزلێنان لەگەڵ ڕێزدا.

**بەڕێز د.بەرهەم ئەحمەد صالح سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان**

**بەڕێز وەزیری رۆشنبیری/سەرۆکی دەستەی رێزلێنانی نووسەران و هونەرمەندان**

**بەڕێز دەستەی هەڵسەنگاندنی نووسەران و هونەرمەندان**

**بەڕێز یەکێتی نووسەرانی کورد لقی سلێمانی**

**نارەزایی( اعتراض)**

سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران بەمەبەستی رێزگرتن لەنووسەران و هونەرمەندانی کورد رۆژی ۲۰۰۲/۱۲/۲۱ بڕیاری ژمارە(۸٦)ی دەرکرد سەبارەت بەهەڵسەنگاندنی دەستەکەو تۆمار نەکردنی ناوەکەم ناڕەزاییم لەکارەکە هەیە بەچەند خاڵێك شێوەی ناڕەزاییەکەم رووندەکەمەوە.

یەکەم: وەکو ئاگاداریان کردم یەکێتی نووسەرانی کورد لیستێکیان بەناوی ئەو نووسەرانەی حەقی ئەو رێزلێنانەیان هەیە، ناردووە بۆ دەستەکەتان و لەناویاندا ناوی منیش وەکو نووسەرێك تۆمارکراوە.

دووەم: لەسەر داوای دەستەکەتان(ی.ن.ك) فۆرمێکی بەسەر نووسەراندا دابەشکرد، فۆرمەکەم پڕکردەوەو چەند نووسینێکم لەو نووسینانەی دەستم کەوتن، هاوپێچی فۆرمەکەم کردو پێشکەش(ی.ن.ك)م کردەوە. بە ئامادەبوونی خۆم لەژووری وەزیر لیستی ناوەکان و فۆرمەکان پێشکەشی وەزیرکرا.

سێیەم: لەساڵی ۱۹۵۹وە شیعرونووسین دەنوسم و یەکەم شعرم بەناونیشانی (رۆژێ لەرۆژان)بەناوی(م.گوڵ)لەرۆژنامەی پیشکەوتندا بڵاوکرایەوە، لەوکاتەوە بەبەردەوامی نووسیومە تا ساڵی ۱۹۷٤ وەدەستپێکردنەوەی شۆڕشی کورد کەبەبۆنەی ئەوەی بوومە پێشمەرگە نووسینەکانم لەچەند دەفتەرێکدا کۆکرابوونەوە لەگوندەکەمان بوو کاتی سوپای داگیرکەری عێراق چەند جار هێرشی بۆ گوندەکەو ناوچەکە کرد ئەو دەفتەرانەم لەناوچوون.

چوارەم: لەساڵی ۱۹٦۸وە بەبۆنەی ئەوەی لەزانکۆی بەغدا وەرگیرام چوومەتە بەغداو تاکۆتایی ساڵی ۱۹۷۳ لەبەغداو بووم ئەو ساڵانە بەبەردەوامی شیعرونووسینم لەرۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکاندا بڵاودەکردەوە، لەچەند

ڕۆژنامەو گۆڤارێکیشدا کارم کردووە، یەکەم بەرهەمم لەگۆڤاری(نۆبەرە)ی کۆلێژی ئاداب لە ١٩٧٠دا بەناونیشانی (نەورۆزی ئەهریمەن تەزێن)بڵاوکرایەوەو کە ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکەش بووم.

پێنجەم: ساڵانی ١٩٧٤ بۆ ١٩٧٥ کە پێشمەرگە بووم بەبەردەوامی شتم دەنووسی لەکۆتایی ساڵی ١٩٧٥ چوومە پارێزگای کوت وەك ئاوارەو دەرکراوێك لەکوردستان تا ساڵی ١٩٨٠ ئەو ساڵانەش بەبەردەوامی شعرونووسینم هەبووە بەڵام زۆربەکەمی شتم بڵاو کردۆتەوە ساڵانی ١٩٨٠بۆ ١٩٩٠ بەبەردەوامی لەسلێمانی شعرونووسینم دەنووسی بەڵام لەبەرئەوەی لەهەموو کردارو سیاسەتەکانی رژێمی بەعس قارس بووم نووسینم نەدەنارد بۆ ڕۆژنامە روو رەشەکانی(ئاسۆ، بزاڤ) وەکو هەندی نووسەر نووسینم بۆ (بابە سەدام) نەنووسیوەو قەتیش وتارەکانیم وەرنەگێڕاوە بۆ کوردی، وەکو هەندێ نووسەر بەشانازییەوە دەیانکرد خۆم بەسەربەرز دەزانم لەژیانمدا کۆپلەیەکم بۆ دوژمن نەنووسیوە.

شەشەم: لەساڵی ١٩٧١ەوە ئەندامی(یەکێتی نووسەرانی کورد)م.

حەوتەم: دڵنیام کە ئەم نووسەرە بەڕێزانە ئاگاداری نووسینەکانی منن‌ولەهەر یەکێکیان پرسیار بکرێت بەبێ رامان پشتگیریم دەکەن‌و هەقم دەدەنێ، ئەو نووسەرە بەڕێزانەش ئەمانەن(د.عیزەدین مستەفا، د.کاوس قەفتان، د.ئیحسان فوئاد، مستەفا ساڵح کەریم، جیهان عومەر، حەمەنوری تۆفیق، رەئوف بێگەرد، شێرکۆ بێکەس، حسێن عارف، عەبدولکەریم شێخانی، دەیانی تریش...)

هەشتەم: کاتێ دەستەکەتان کەوتە شەن‌و کەو کردنی نووسەران بەووردەکاریتان بەحسابی خۆتان لەبێژنگتان دان‌و نووسەرانتان ناونووس کرد، ناوی من لەو شەن‌و کەوەتاندا، لەلیستەکە (چن)کراوە. من نازانم لەسەر چ سیستەم‌وبنەمایەك کارتان کردوە بەڵام لەلیستی ناوەکاندا ناوی سەیرو سەمەرە بەرچاو دەکەون دیارە لەبواری نووسین‌و ئەدەبیشدا ماستاوکردن‌و واستەونزیکی‌و دەعوەتکردن دەوری کاریگەر دەبینێت، کەسانێك هەن ناویان نەنووسراوە نووسەری کۆن‌و دیارن هەشە نووسراوە نەتەمەنی ژیان‌و نەتەمەنی نووسینیان ناگاتەو ئەو ڕێزلێنانە. بەڕای من هەردوو دیاردەکە سووکایەتیکردنە بەهەقی نووسەرونووسەران‌و مێژووی

ئـەدەبی و رۆشـنبیری کـوردی کـراوە، دەسـتتان خـۆش بـێ دەسـتەی شـەن و کەوکردن.!!

نۆیـەم:کاتـێ دەسـتەکان چـەند کۆبوونەوەیـەکی کـردو ناوەکـانی هەڵبـژارد. ئاگادار کرام کەناوی منی تیادا نییە. منـیش قسـەم لەگـەڵ وەزیروحاکم قوبـاد دا کردو وتیان نابێت تیا نەبێت و ئەگە رتیانەبێت لەکۆبونەوەی داهاتووماندا قسەی لێ دەکەین و چارەسەری دەکەین.

دەیەم: بڕیارێکی وا گرنگی حکومەت، لام سەیرە ژێر بەژێر بەنهێنی کاری بـۆ بکرێ...دەبوو وەزیری رۆشنبیری بەئەندامانی دەستەکەی رابگەیاندایە کە پـێش ئــەوەی ناوەکــان بکرێنــە بڕیــار لەرۆژنامــەو کەناڵــەکانی راگەیاندنەکانــدا بڵاوبکرایەتـەوە، بەمەبەسـتی ئـەوەی(کـێ رەخنـەو نـاڕەزایی و کەموکوڕییــەك) لەناوەکاندا بەدی دەکات بۆ دەستەکەی بنووسێت، یان کێ بیرچووەو نەنوسراوە بیریـان بخرێتــەوە دوای دراســەکردنی رەخنـەو کەموکوڕییــەکان. ئینجـا نـاوە پاڵێوراوەکـان بکرانایەتـە بڕیـارو لەگـەڵ ئەوەشـدا دەبـوو وێنـەیان بدایەتـە( ی.ن.ك)و(ی.هـ.ك) بۆ راو سەرنجیان لەسەر ناوەکان.

یانزەهــەم: مــن داوا دەکــەم لــەوەزیری رۆشنبیری‌ودەسـتەکەو(ی.ن.ك) کەرەچاوی ئەم خاڵانە بکەن:

١. ئەو(٩٣)ناوەی نێردراوە بۆ ئەنجومەنی وەزیران بەدوو نووسراو..بەناوو پسـپۆڕی و کـۆی سـاڵانی خزمـەتی و بـڕی هاوکارییەکـەی و مێـژووی تەمـەنیان بـەپێی ناسـنامەی شارسـتانی لەرۆژنامـەدا بڵاوبکرێتــەوە بـۆ ئـەوەی هــەموو نووسەران بزانن ئەو نووسەرانە کێن.

٢. داوای فـۆرم و ئـەو نووسـینانەم بکـەن کـەوەکو بەڵگەنامـە هاوپێچـی فۆرمەکەم کردوە.

٣. راو سەرنجی(ی.ن.ك) لەو بارەیەوە بەهەند وەربگرێت.

٤. ئـەو کەسـانەی کەشایسـتەی ئـەو رێـزەنین کـە نەتەمـەنی ژیانیـان و نەتەمەنی نووسینیان ناگاتە(خاڵی سێیەمی) بڕیارەکە، لەلیستەکە دەربهێنـرێن و زیادەکەشیان لێوەربگرێتەوە یان ئەوکەسانەشی کەلەبەر هەر هۆیەك وەلا خـراون ناویان بخرێتە لیستەکەوەو حەقەکەی خۆیان بدرێتێ.

لەبەر هەر هۆیەك ناوی من(چز) كراوە بۆم روونبكرێتەوەو بەڵگەی مەنتیقم بدرێتێ چونكە بەراشكاوی دەڵێم(ناڕازیم)لەوەی كە حەقم پێشێل كراوە بەمافی خۆمی دەزانم كەداوای حەقی خۆم بكەم.

چاوەڕوانی وەڵاموبڕیاری حەقانیمو ئەگەر ئەو حەقە لەلایەن سەرۆكی دەستەكەو دەستەكەتانەوە پشتگوێ بخرێت ناچار دەبم ناوی ئەوكەسانەی بەناحەقی و لەسەر بنەمایەكی نادروست خزێنراونەتە ناو لیستەكەوە لە رۆژنامەكاندا بڵاویان بكەمەوەو لەسەر هەر یەكەشیان ئەو زانیاریانەی لامە بیان نووسم.

# لەمافی خۆم‌ونووسەرانیش بێدەنگ نابم

دوای نووســـــینی یاداشـــــتێکی(یەکێتی‌هونەرمەندانی‌کوردســـــتان) وپێشکەشــکردنی بەبــە ڕێــز د.بەرهــەم ئەحمــەد ســالَح ســەرۆکی‌ئەنجوومەنی وەزیــران‌و، بەهەنــد وەرگرتنــی یاداشــتەکەو وتووێژوقســەکردن لەگــەلَ چــەند نووسەرو ڕۆشنبیرێکدا..٢٠٠٢/١٢/٢١سەرۆکایەتی ئەنجومــەنی وەزیـران بڕیاری ژمارە(٨٦)ی بۆ ڕێزلێنانی نووسەران‌و هونەرمەندان دەرکرد. بڕیارەکە لە یانزە مادەدا کۆکراوەتەوەو بە پاشکۆیەك هۆیەکانی دەرچوونی بڕیارەکە بەم شێوەیە نووسراوە، (لە چوارچێوەی بەرنامەی حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ ڕێز لێنان لەکۆشــش‌وداهێنانی‌ئەو نووســەرو هونەرمەندانــەی کــە بەشــێکی بەرچــاوی تەمــەنیان لــە پێنــاوی خزمــەتکردنی بوارەکــانی ئــەدەب‌و هونــەرو زانســـتە مرۆی‌وسروشـــتیەکان تــەرخانکردبوو..بەمەبەســتی ڕێزلێنــان‌و دابینکردنـــی گوزەرانێکی شایستە بۆ خۆیان‌و کەس‌و کاریان ئەم بڕیارەمان دەرکرد).

دیــارە دەمێکــە نووســەران‌و هونەرمەنــدان چاوەڕوانی بڕیــارێکی لــەم جــۆرە دەکــەن. دوای(١١)ســالَ بەســەر دامەزرانــدنی حکومــەتی هــەرێمی کوردســتاندا، بەبڕیارێکی وا ڕێز لە خاوەن قەلَەم‌و بەهەرەکان دەگرێت، دەسکەوتێکی گرنگ‌و پڕبایەخەو، دەلالاتی زۆری هەیە، کە لەسایەی حکومەتی هەرێمدا، هەنگاوی وا بنرێت.

سەبارەت..بەو بڕیارە بەڕای من دەکرا دامەزرانــدنی سندووقەکە لــە وەزارەتــی ڕۆشنبیری بوایە..بەلاَم باشتر وابوو، سەرۆکی ئەو لیژنەیەو ئەندامانی لیژنەکەو ســکرتێری لیژنەکــە، لەیــەکێتی نووســەرانی کــورد‌و(یــەکێتی هونەرمەنــدانی کوردستان)و ئەندامێتی چەند نووسەرو هونەرمەندێکی خاوەن ئەزموونی هەموو شــارەکانی کوردســتان، لەهــەردوو یەکێتییەکــەو چــەند کەســێکی تــری شــارەزاو بەتەمەنی هەردوو بوارەکە پێکبهاتایە.

بەهەر حالَ.. لەخالَی(١)بەندی دووەمی بڕیارەکە دامەزراندنی سندووقەکەو، چۆنێتی پێکهێنــانی(دەستەکە)دیاریکراوە، بەسەرۆکایەتی وەزیــری ڕۆشنبیریی ئەنـــــدامێتی نوێنــــەری وەزارەتــــی دارایــــی‌و ئــــابووریی‌و نوێنــــەری هــەردوو(ی.ن.ك)و(ی.ھ.ك)و ژمارەیــەك ئەنــدامی تــر کــە لەلایــەن ســەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیرانەوە دیاری بکرێت.

لەبڕگەی(د) خاڵی(٣)ی بەندی دووی بڕیارەکەدا نووسراوە(هەڵسەنگاندنی ئەو داواکاریانەی پێشکەش بەدەستەی سەرپەرشتیاری دەکرێن بەمەبەستی پاڵاوتنیان بۆ رێزلێنان بەپێی ئەم بڕیارەبەڕاوێژکردن لەگەڵ لیژنەیەکی پسپۆڕو شارەزا لەبواری نووسین وهونەر کە لەلایەن سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانەوە دەستنیشان دەکرێت).

لەبڕگەی (هـ)لەخاڵی(٣)ی بەندی دووی بڕیارەکە نووسراوە(بەرزکردنەوەی لیستی ناوی ئەو نووسەرو هونەرمەندانەی کە دەپاڵێورێن بۆ سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران بەمەبەستی بڕیاردان لەسەر تەرخانکردنی مووچەی رێزلێنانی مانگانە بۆیان بەپێی ئەم بڕیارە). من لێم روون نییە لەسەر خاڵەکانی بەندی(دوو)چی کراوەو چۆن کراوە،؟ بەڵام ئەوەی دەمەوێت لەم ووتارەدا بینووسمو روونی بکەمەوەئەو ناحەقیەیە کە دەرحەق بەمنو چەند نووسەرێك کراوە..قسەکردن لەسەری و نارەزایی دەربڕینو رەخنەگرتن لەئەندامانی دەستەکەیەو بەمافێکی رەوای خۆمی دەزانمو، هەرگیز لێی بێدەنگ نابم، من تەنها رەخنەو گازەندە ئاراستەی لیژنەی نووسەران دەکەم، کارم بەهونەرمەندانەوە نییە، لۆمەی وەزیری رۆشنبیریش ناکەم وەکو سەرۆکی لیژنەکە، چونکە دڵنیام ئەو سەیری دەمو رای ئەندامانی لیژنەکەی کردووە، رەخنەو نارەزایی و گلەییم لەئەندامانی لیژنەکەیە وەسەبارەت بەبڕیارەکەو بنەمای جێبەجێکردنی بەرای من دەبوو:

١. سەرۆکی لیژنەکەو ئەندامانی لیژنە لەسەر بناغەیەکی پتەوی وابوایە کە ئاگادارییەکی وردو بەئاگایان لەڕەوتی ئەدەبی رووناکبیریدا هەبوایە، تەمەنی ژیانو تەمەنی نووسینیان زۆر لەو تەمەنە زیاتر بوایە کە لەبەندی سێ بڕیارەکە دیاریکراوە.

٢. لیژنەکە دەبوایە حیسابی بۆ پاڵێوراوانی(یەکێتی نوسەرانی کورد) بکردایە. ئەو لیستو ناوانەی لە(یەکێتی نوسەرانی کورد)ەوە بۆیان دەنێردرا لێکۆڵینەوەیان لەسەر نەکردایە، تەنها لێکۆڵینەوەیان لەسەر داوای ئەو نوسەرانە بکردایە کە لەڕێگای دەستەکەوە داواکاریان پێشکەش دەکرد. من هەرچەند سەیر دەکەم هەموو ئەندامانی لیژنەکە ئەندامی (ی.ن.ك)ن کەچی ئەو بەڕێزانە لیستی یەکێتی نوسەرانیان پشتگوێ خستووەو کاریان پێ نەکردووە، نازانم

ئەگەر ئەو بەڕێزانە خۆیان لەیەکێتییەکە بەگەورەترو بەخاوەن حەق ترو خاوەن ئەزمونتر دەزانن بۆئەندامن..؟ئەگەر نا بۆ کاغەزیان نەخوێندونەتەوە..؟؟!

٣. ئەو لیژنەیە دەبوو لەگەڵ داواکردنی بەڵگە نامەی نوسیندا داوای ناسنامەی شارستانی نوسەرانیشیان بکردایە بۆ ئەوەی بەراوردی ژیانی نوسەران بکرایە لەڕووی تەمەنیانەوە.

٤. فۆرمی پاڵیوراوی نوسەران پێش بڵاوکردنەوە بدرایەتە(یەکێتی نوسەرانی کورد)بۆ سەرنج و رایان لەسەر ناوە پاڵێوراوەکان، دوای رەزامەندیان لەسەر ناوەکان ئینجا بدرایەتە لیژنەی(پسپۆڕیو شارەزای)سەرۆکایەتی ئەنجومەن.

٥. ئەو لیژنەیە ئەو لیستی ناوانەی بۆیان دەچوو وەیان هەر داواکارییەکیان پێشکەش دەکرا، دوای تاوتوێ کردنو هەڵبژاردنی ناوەکان، وەرگرتنی رای یەکێتی نوسەران دەبوو ناوەکانو بواری نووسینیانو تەمەنیانو ساڵی حساب بۆکردنیانو بدایەتە کەناڵەکانی راگەیاندنو لەرۆژنامەکاندا بڵاویان بکردایەتەوە، لەگەڵ بڵاوکردنەوەکەدا ئەوەشیان بنووسیایە هەرکەس هەر کەموکوڕیو ناتەواویو رەخنەیەکی لەناوەکانو برگەکانی فۆرمەکە هەیە وەیان هەرکەسێ داوای پێشکەش کردووەو ناوی نەنووسراوە لەماوەی بڵاوکردنەوەکەوە بەلای کەمەوە(دووهەفتە)دابنرایە بۆ پەیوەندیکردنیان بەلیژنەکەیانەوە، کە لەبەندی حەوتەمی بڕیارەکەدا نووسراوە نوسەر یان هونەرمەند دەتوانێ لەماوەی(١٥)رۆژ لەبەرواری دەرچوونی دەستەی سەر پەرشتیاری سندوق دواکاری(طعن)پێشکەش بەدادگای ئیستئناف لەسلێمانی بکات، دەبوو بۆ جێبەجێ کردنی ئەم بەندە ناوەکانیان بڵاوبکردایەتەوە.

٦. دوای لێکۆڵینەوە لەسەرجەم داواکارییەکانو، رەخنەکان ناوە پاڵێوراوەکان دابنرایانەو دیسان بڵاوبکرایەتەوە لەگەڵ وەڵامی هەریەك لەو نوسەرانەی رەخنەیان گرتبوو، ئینجا لیستی فۆرمی ناوەکان پێشکەش(لیژنەی پسپۆڕی شارەزای ئەنجومەن) بکرایەو ئەوانیش دوای پێداچوونەوە، بەفۆرمەکاندا لەگەڵ دوارای خۆیاندا پێشکەشی ئەنجومەنیان بکردایەو دوای ئەوە بڕیاریان لە ئەنجومەنەوە بۆ دەربچوایە.

بەداخەوە ئەوەی بەدیدەکرێت، ئەو لیژنەیە سەرپێیانە، ئارەزوومەندانە بەبێ رەچاوکردنی بنەمای یاسایی ئوسوڵی کارەکەیان ئەنجامداوە. حیسابیان بۆ مسئولیەیتی مێژوویی و ئەمانەتی ئەدەبی و زانستی و هونەری نەکردووە.

من لەپێش حەفتاکانەوە بە بەردەوامی شیعرو نووسین بڵاو دەکەمەوە. دیوانێکی شیعریم لەژێر چاپدایە بەم زووانە دەکەوێتە بەردەستی خوێنەران، دووکتێبی ترم بەدەستەیە، کە یەکێکیان کۆمەڵێ بەرهەمی چیرۆك و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی یە، نووسینی ترن و وە ئەویتریان(کەشکۆڵی بیرەوەرییەکانم) کە زۆر بابەتی بیرەوەری ئاسای لەخۆی گرتووە وەمن رۆژێك نە لەکاروانی خەباتی کوردایەتی و نەلەکاروانی ئەدەبی و رۆشنبیری کوردی دانەبڕاوم..بەڵام چی بکەم رێگام بەخۆم نەداوە قەڵەمەکەم دێڕێك، کۆپلەیەك بۆ بەعس و داگیرکەرانی کوردستان بنووسێت؟ چۆن نەفرەتم لەخۆفرۆشان و ئەڵقە لەگوێکانی رژێم کردووە، هەرواش نەفرەتم لەو قەڵەمە لەرزۆك و سەرشۆڕانەش کردوە کەلەپێناوپوول و پارەو پلەی وەزیفیدا بۆ بەعسییان نووسیوە، من ئەو کەسانە دەکەمە شاهیدی ئەو ناحەقییەی بەرامبەرم کراوە، کەخاوەنی قەڵەمی بەبڕشت و هەڵوێستی مەردانەو کوردانە بوون. من بۆ ئەوبرەپارەیە شپرزەنیم. بۆئەو ناحەقییە نیگەرانم کەدەرحەقم کراوە..

بەپێویستی دەزانم بۆ نوسەران و هەموولایەك ئەو ناحەقییەی بەرامبەرم کراوە. روون بکەمەوە لەدەرچوونی بڕیارەکەوە من چیم کردووە:

١. کە یەکێتی نوسەرانی کورد لیستیان پێشکەشی لیژنەکە کرد ئاگاداریان کردم کە ناوم لەلیستەکەیاندا پاڵێوراوە.

٢. کاتێ یەکێتی نوسەرانی کوردفۆرمیان دابەشکرد، فۆرمەکەم پڕکردەوەو لەگەڵ کۆمەڵێ نووسیندا، کە لەساڵی ١٩٧٠وە تیایدا بووە، وەکو بەڵگە پێشکەشیانم کردووە ئەوانیش بەلیستێکەوە فۆرمەکان و بەڵگەکانیان پێشکەشی وەزیری رۆشنبیری کرد بەئامادە بوونی خۆم.

٣. من پشتم لێکردەوە. بەڵام دوای چەند کۆبوونەوەی لیژنەکە بۆم دەرکەوت کەناومی تیادا نییە، بە (وەزیری رۆشنبیری)و(کاك حاکم قوباد)م وت وتیان لیستی دووەممان بەدەستەوەیە لەو لیستەدا ناوت بەرزدەکەینەوە.

٤. کاتێکم زانی هاوڕێ نوسەرەکانم، ئەوانەی لای خۆم دەوام دەکەن، دەچن بۆ وەزارەت بۆ وەرگرتنی مووچەی مانگانەکەیان.

٥. کاتێ پەیوەندیم لەگەڵ سکرتێری لیژنەکەدا کرد، ئاگاداریکردم کەناومی تیادا نییە، هەوڵمدا بەهەر شێوەیەك بوو ناوەکانم زانی، کەناوی هەندێ کەسم تیادا بینی و ناوی خۆم نەبینی زۆر نیگەران بووم و، لەئەنجامیدا یاداشتێکم پێشکەشی بەڕێز سەرۆکی حکومەت دکتۆر بەرهەم و وەزیری رۆشنبیریی و دەستەکەو یەکێتی نوسەرانی کورد کرد لەشێوەی نارەزایدا(أعتراض).

من و هەموو نوسەرێك بۆی هەیە بپرسێت لەوەزیری رۆشنبیری و دەستەی رێزلێنانەکە، بۆچی ئەوکارە بەنهێنی ئەنجامدرا؟ بۆ تا ئێستاش ناوەکان لە کەناڵەکانداولەرۆژنامەکاندا بلاونەکراونەتەوە..؟ لەکاتێکدا بڕیارەکە بڕیارێکی گرنگە چونکە پەیوەندی بەگوزەرانی توێژێکی هەڵکەوتووی گەلەکەمانەوە هەیە. دووساڵە لەیادی مامۆستا برایم ئەحمەددا هەر ساڵە رێز لە(٥)کەس دەگیرێت، ئەو رێزگرتنە بەئاهەنگێکی کورت رێك دەخرێت و دەدرێتە هەموو کەناڵەکان و لەرۆژنامەکانیشدا ناوەکان بلاودەکرێنەوە.کەچی لەبڕیارێکی سەرۆکایەتی حکومەتی هەرێمدا کە (٩٣)نوسەرو نازانم هونەرمەندانیش چەندن. مووچەیەکی مانگانەی باشیان بۆ بڕاوەتەوەو مووچەکە کارناکاتە سەر هەر مووچەیەکیش کە هەیبێت، ئەم بڕیارە بڕیارێکی گرنگ و هەنگاوێکی گەورەیە. بەداخەوە بڕیارەکە، بێدەنگی لێکراو هیچ بایەخێکی پێنەدرا، لەکاتێکدا دەبینرێت هونەرمەندێك یان خاوەن بەهرەیەك، یان نوسەرێك لەلایەنێکەوە رێزێکی لێدەگرێت ئەوەندە باس دەکرێت خۆیان لێی قارس دەبن. بەڕای من ئەو بڕیارە بۆیە بەو شێوەیە ئەنجامدرا وەچونکە دەستەکە دیزە بەدەرخۆنەیان تیادا کردووە. نەیانزانی بەری رۆژ بەبێژنگ ناگیرێ، ئەونوسەرانەی کە وەکو من لەناو پاڵێوراوەکاندا(چن)کراون هیچیشیان بۆ نەکردوون..

ئەوەی من بزانم(مامۆستا حەسەن عەبدوالکریم، تاهیر ساڵح سەعید،مەحمود زێوەر، عەبدولحسێن، محەمەد عومەر عوسمان، سوارە قەلادزێی، سەدرەدین عارف، حەمە رەشید هەورامی، سامی عەلی، هەمزە عەلی، رەئوف هەمەوەندی) کە هەر هەموویان نوسەری بەتەمەنن و بەردەوامیش بوون لەنووسیندا، وە

ناونوسکردن و پالاوتنی چەند نوسەرێك چ بەتەمەن و چ بەنووسین ناگەنە ئەو نوسەرانە. بۆیە من لای خۆمەوە داوا لە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران دەکەم:

١. لیژنەیەکی پسپۆڕو شارەزا لەنوسەران پێکبهێنرێت بۆ لێکۆڵینەوە لەو نوسەرانەی بەر ڕێزلێنانەکە کەوتوون، لەوانەشی بەر نەکەوتوون.

٢. لیژنەکە بەووردی لەتەمەنی ژیان و لەتەمەنی نووسینی هەریەك لەنوسەران بکۆڵێتەوە.

٣. ئاگاداری وەزارەتی ڕۆشنبیری دەستەکە بکرێت لیستی ناوەکان چۆنیان نووسیوە لەڕۆژنامەکاندا لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندندا بڵاو بکرێتەوە.

٤. داوا لەهەموو ئەو نوسەرانە بکەن کە بڕیارەکە دەیانگرێتەوە داواکاری پێشکەش بکەن ئەوانەشی داواکاریان پێشکەش کردووە ناویان دەرنەچووە بەنووسراوێك داوا لەلیژنەکە بکەن بۆ لێکۆڵینەوە.

٥. دوای لێکۆڵینەوە ئەگەر دەرکەوت ئەو نوسەرانەی بەناحەق پاڵێوراون ناوەکانیان بەفەرمانێ لەسەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانەوە هەڵبوەشێتەوەو ئەو پارەیەشی وەریان گرتووە لێیان وەربگیرێتەوە، وەئەو نوسەرانەی بەناحەقی نەپاڵێوراون بەهەمان شێوە بەفرمانێك بۆ ڕێزلێنانەکە دابنرێت و پارەی مانگانەکانیان بۆ خەرج بکرێت.

٦. لەسەر ئەو کارە نا یاسایی و نا زانستیانەی ئەو نوسەرانە ئەندامی دەستەکەبوون، سزا بدرێن و ناویان لەناوی پاڵێوراواندا دەربهێنرێت، بۆ ماوەی شەش مانگ وەکو سزایەکی یاسایی و ئیداری وە بڕیاریش بدرێت کە لەهیچ لیژنەیەکی تری نوسەراندا، بەئەندامی لیژنە دانەنرێن.

٧. لیژنەکە داوا لەیەکێتی نوسەرانی کورد بکات کە بەپێی شارەزاییان لیستێك بەناوی ئەو نوسەرانەوە کە بڕیارەکە دەیانگرێتەوە لەهەمووشارەکانی کوردستان پێشکەش بەلیژنەکە بکەن، لیستەکە لای لیژنە بەهەند وەربگیرێت.

٨. لیژنەکە داوا لە دەستەی ڕێزلێنانەکە بکا هەموو داواکاریی و لیست و فۆرم و بەڵگە نامەکانی نوسەرانیان بدەنێ بەوردی سەیری یەکە یەکەیان بکرێت.

٩. لیژنەکە داوا لەدەستەکە بکات، ئەو بنەمایانەی کاریان لەسەر کردووە چییە؟ و چۆنە؟ لەچییەوە وەریانگرتووە؟ وە ئەو ڕێنماییانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری بەپێی مادەی چواردەیەمی بڕیارە کە دەری کردووە چین و پشتیان

بەچ یاساو ڕێسایەك بەستووە، بە ئومێدی ئەوەی ئەم نوسینەو ناوەڕۆکەکەی لەلایەن بەرپرسان و سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانەوە بەهەند وەربگیرێت و کاری بۆ بکرێت.

*ئەم وتارە لە ژمارە(٣٠٩٧)ی ٢٠٠٣/٦/٢١ی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێدا بڵاوکراوەتەوە.

# ڕوونکردنەوەیەك بۆ ڕوونکردنەوەکەی لیژنەی ڕێزلێنانی نووسەران

لە ژمارە (٣١٠٨)ی ٣/٧/٢٠٠٣ی کوردستانی نوێ، لاپەڕەی ئازاد (قوبادی جەلی زادە، ئەرخەوان، فەرید زامدار) بەناوی لیژنەی ڕێزلێنانی نووسەرانەوە بەڕوونکردنەوەیەك وەڵامی نووسینێکیان داوەمەتەوە کە لەژمارە (٣٠٩٧) ٢١/٦/٢٠٠٣ ی کوردستانی نوێدا لەسەر لیژنەکەیان نووسیبووم، کاتێ ڕوونکردنەوەکەیانم خوێندەوە سەرنجمدا وەڵامەکەیان لە شێوەی گاڵتە جاڕیو هەڕەشە ئامێزدایە بۆیە ناچار بووم بەپێی خاڵەکانی ڕوونکردنەوەکەیان، وەڵامیان بدەمەوە:

١. لەخاڵی یەکەمی نووسینەکەیاندا، پەنایان بۆ مێژووی تەمەنو ئەدەبیو هونەریان بردووەو. یەکە یەکە نامەی ئەعمالیان دەور کردۆتەوە، هەر ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەو سێ کەسە پێیان خۆش بێت و پێیان ناخۆش بێت لە خۆیان بە گومانن، ئەگەر نا چ پێویستی بە نووسینەوەی ئەعمالی پرشنگداریان بوو!!

٢. لەخاڵی دووەمیاندا ئەوەیان پێناخۆشە کە باسی لیستی یەکێتی نووسەرانم کردووە. لێرەشدا دووپاتی دەکەمەوە، کە ئەوسێ کەسە با ئەندامی (یەکێتی نووسەرانی کورد)بنو یان بەرپرس بن، هەردەبوو چۆن یەکێتی هونەرمەندان لیستی خۆیانکردو لیستەکەیان پێشکەش لیژنە کردو هەر ئەو لیستەش بوو بە بنەمای بڕیاری ڕێزلێنانەکە، دەبوو نوسەرانیش هەمان لیستیان بکردایەو ئەو لیستەش بکرایەتە بنەمای بڕیار، نەك ئەو سێکەسی لیژنەیە بەئارەزووی خۆیانو لە ژێر کاریگەری چەند حوکمێکدا بڕیاری ڕێزلێنانەکەیان بدایە...لەکۆتایی ئەم خاڵەیاندا، نووسەران دڵنیا دەکەنەوە، کە هیچ فۆرمێك پشتگوێ نەخراوەو هەرهەمووی سەیر کراوە.. من ئەو سێکەسەو نووسەرانیش دڵێنیا دەکەمەوە ئەو پاکانەیە ڕاست نییەو نمونەشم ئەوەیە کە لەلیستی

یەکەمدا (٨٦)نووسەریان نووسیوەو لە لیستی دووەمدا (٧) نووسەری تریان نووسیوەو چەند نووسەری تریش ماون.

٣. لەخاڵی سێیەمدا دەڵێن (ئێمە هەموو نووسەران یان زۆربەیان باش دەناسین تەمەنیانمان لەبەرە)ئەگەر ئەم سێ‌کەسە ئەوەندە بەئاگان.. وەکو خۆیان دەڵێن تەمەنی هەموو نوسەرانیان لەبەرە، ئەی بۆ لەلیستی یەکەمدا حەوت ناویان لەبیرچووە. ناوی چەند نووسەری تریش کە شایستەی ئەو ڕێزە بوون لە بیر کردووە..

٤. لە خاڵی چوارەمیاندا ئەوەیان لا گرانە کەنووسیومە دەبوو پاڵێوراوانی نووسەران پێش بڵاوکردنەوە بدرایەتەوە بە یەکێتی نووسەرانی کورد. ئەوان پاساوبەوە دەهێننەوە کە گوایا قوبادی جەلی زادە ئەندامی باڵای نووسەرانەو د. دڵشاد عەلی سەرۆکی لقی سلێمانی نووسەرانە. ئەمەراستە بەڵام نەلیژنەی باڵاونە لقی سلێمانی بریتی نین لەودووکەسەو ئەو دووکەسە ئەگەر نوێنەری نووسەرانیش بن بۆ لیژنەکە ناکاتە ئەوەی خاوەنی بڕیاری لیژنەی باڵاولقی سلێمانی نووسەران بن.

٥. لەخاڵی پێنجەمیاندا،ئەوەیان لا قورسبووە، کەوتوومە دەبوو لیستی ناوەکان لەکەناڵەکاندا، بڵاوکرایەتەوە دەڵێن بە نهێنی نەکراوەو ناوەکان لەوەزارەت هەڵواسراون و تا ئێستا نەمان دیوە لیستی مووچە بڵاوبکرێتەوە... دەیڵێمەوە بڕیارێکی وا گرنگی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەوبڕیارانە کەمترنییە کە حکومەتی هەرێم بۆ خزمەتی هاووڵاتیان و فەرمانبەران دەریان دەکات و چەندین نووسینیان لەرۆژنامەکاندا لەسەر دەنووسرێن، بڕیارێکی وا گرنگ کە ساڵەهایە نووسەران و هونەرمەندانی کورد چاوەڕوانی دەکەن نەک ئەوەی دەهێنا لەرۆژنامەو کەناڵەکاندا بڵاوبکرایەتەوە، بەڵکە ئەوەشی دەهێنا کە بۆ یەکەم دابەشکردنی مووچەکان ئاهەنگێکی بۆ سازبکرایەو سەرۆکی حکومەت و سەرۆکی یەکێتیی نووسەران و هونەرمەندان و دەزگا پەیوەندیدارەکان و وەزیرەکان و خێزانی ئەونووسەرو هونەرمەندانەی کە بەر ڕێزلێنانەکە دەکەوتن ئامادە بوونایە.. لەلایەن سەرۆکی حکومەت و سەرۆکی هەردوو یەکێتی و دەزگا پەیوەندیدارەکان و وەزیرەکانەوە... مووچەکە پێشکەش بەنووسەران وهونەرمەندان بکرایە.. ئەو ئاهەنگە خۆی لەخۆیدا دەبوو

بەڕێزلێنانێکی مەعنەویتر.. ئەگەر ئێوە بە لاتانەوە گونجاو نەبوو بڵاوی بکەنەوەو بەپەسەندتان نەزانی، ئەوە ڕۆژنامەی هەواڵ لە ژمارە (٤٥) یدا چۆن بڕیارتاندا وە دەقاودەق ناوەکان بەتەمەن و موچەیانەوە بڵاو دەکاتەوە.

٦. لەخاڵی شەشەمیاندا، بەوە زۆر نیگەران بوون کە نووسیومە، کارەکەیان سەرپێیانەو ئارەزوومەندانە... ئەنجامداوە بۆیە لەم خاڵەدا پەنایان بۆ چەند شت بردوە سەبارەت بەکارەکەیان:

١. چەند مانگێك لە ژوورێکی بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیری گەلاوێژدا کارییان کردووە.

٢. لەبەردەم ویژدانی خۆیان و مێژوو نووسەرانداو... سەربەرزن.

٣. چەند مانگێك بێبەرامبەرو پاداشت کاریان کردووە.

٤. لیژنەکەیان(با بڵێین) ئەوسێکەسە لەسەر ئەو بەدناوکردنەیان بۆیان هەیە بچنە دادگاو شکات لە شێخ محەمەد بکەن، بەلام جارێ ئەوکارە ئەنجام نادەن.

٥. با شێخ محەمەد بچێتە دادگاو شکات بکات، بۆ ئەوەی لە ڕووی یاساییەوە مەسەلەکە بۆ تەواوی نوسەران ساغ ببێتەوە.

٦. جگە لەوەی لەلایەن شێخ محەمەدو ئەوانەی شمولی نەکردوون تانەو تەشەری ناڕەواو نا دروست ئاراستەی لیژنەکەیان کراوە.

٧. بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیری گەلاوێژ لە ڕووی دڵسۆزییەوە بۆ نووسەران ژورێکی بۆ ئیش و کاری لیژنەکە تەرخانکردووە. –بنکە کەوتۆتە بەر هێرشی ناڕەوای هەندێ نووسەر. –یاخود نەزانانە هەندێ نووسەری بەڕێز خەتابار کراون. –هەر ئەونووسەرانەی پێش دڵنیا بوون لەئەنجامی کارەکەهەڵچوون و قسەی ناحەقیان کردووە پەشیمان بوونەتەوە هاتون داوای لێبووردنیان کردووە. –چاکتر وابوو هەڵ نەچن نەك پەشیمان ببنەوەو داوای لێبوردن بکەن.

من بۆ وەلامی ئەم خالانە بەم چەند خاڵە وەلامیان دەدەمەوە:

١. کاتێ ئەنجوومەنی وەزیران، بڕیارێکی وا دەردەکات ورووبەروی وەزارەتێکی دەکاتەوە، چۆن حیسابی ئەوە ناکات کارێکی وا کە لیژنەیەك ئەنجامی بدا.. کات و شوێن و ئیمکانیاتی کارکردنی ناوێت؟

٢. كەكارەكە ڕووبەڕووی وەزارەتی ڕۆشنبیری کرایەوە بۆ لەوهەموو دام و دەزگایانەی هەیەتی شوێنی بۆ لیژنەکە تەرخان نەکردو پێداویستی تەواوی نەخستە بەردەستیان و بوودجەیەکی بۆ ڕاپەراندنی کاری لیژنەکە داوا نەکرد؟

٣. وەزارەتی ڕۆشنبیری چۆن ڕازی بوو کارێکی وا ئیداری وحکومی لە بنکەیەکی ئەدەبی و ڕووناکبیری غەیری حکومیدا جێبەجێ بکرێت..؟ و دۆسیەو ئەرشیفی ئەولیژنەیە لە شوێنێ دابنرێت و کاری لەسەر بکرێت؟ کە پەیوەندی بە کاری حکومەتەوە نەبێت؟

٤. نازانم چۆن زات دەکەن وا بەڕاشکاوی دەڵێن لەبەردەم ویژدانی مێژوو نووسەراندا سەربەرزن... کام سەربەرزییە بەوەی کە ئێوە دۆسیەی چەندین نووسەرتان وەرگرتووە کەتەمەنی نووسینیان (٥٠-٥٤-٥٧-٥٩) ساڵیان تیادایەو لەتەمەنی هەرسێ ئەندامی لیژنە (قوباد-ئەرخەوان-زامدار)٢٠ساڵ و ٢٥ ساڵ گەورەترن، وەپلەی بڕوانامەیان زۆر لەوان بەرزترەو تەمەنی ژیانیان زۆر لەوان زۆرترە، وە نووسەرانێکیشیان تێهەڵکێش کردووە نە بەتەمەنی ژیان و نە بەتەمەنی نووسینیان و نە بەبەرهەمیان نەگەیشتوونەتە ئاستی ئەوڕێزلێنانە، کە ئەو نووسەرانە لیژنەکە خاتری گرتوون گاڵتەیان بەو قسانەیان دێت

٥. من نەم بینیوە ئەوانە لە هیچ بوارێکدا، بێبەرامبەرکاربکەن. ئیتر لەم کارەیاندا بۆ بێ پاداشت و بێ بەرامبەر چونە بنکەو شەو ڕۆژ کارییان بە (خۆ بەخشی) کرد؟ حکوومەت و وەزارەت چۆن ڕازی بوو؟ حکومەتێ بتوانێت مانگانە مووچەیەکی باش بداتە زیاتر لە (٢٠٠) نووسەرو هونەرمەند بۆ ناتوانێت ئەرکی کارو ماندوو بوون بداتە ئەندامانی لیژنەیەکی وا..؟

٦. لیژنەکە (قوبادو ئەرخەوان و فەرید)کەبۆیان هەیە بچنە دادگاو شکات لە من بکەن، چاوەڕوانی چی دەکەن بۆ شکات ناکەن؟..ئێوە بەلای خۆتانەوە قانونی و چیرۆکنووس و شاعیرو نووسەرو هونەرمەندن.. چۆن بۆ ڕەخنەی نووسەران.. یەکسەر پەنا بۆ دادگا دەبەن؟ خۆ ئێوە بەقسەی خۆتان هەڵبژاردەی نووسەران و هونەرمەندانن (مەحبووبی جەماوەرن) !! کە سانێك کە بڕوایان بە دیموکراسیەت و ئازادی و پرۆسەی هەڵبژاردن بێت... چەند ڕەخنەی لێبگیرێت و قسەی ڕووبەڕوو بکرێت، پەنا بۆ شکات و شکاتکاری نابات... دیارە ئەوەتان لەپێش چاونییە. جۆرج W بۆش و تۆنی بلێرو جاك شیراك و پۆتین و تەنانەت

(خاتەمی) کە لەپرۆسەی هەڵبژاردنی ناو وڵاتی خۆیانداو بەدەنگی ملیۆنان خەڵك هەڵبژێردراون،کاتێ لە کۆنگرێس و پەرلەمانەکانیان ئەندامی پەرلەمان لێیان ڕادەپەڕن قسەیان پێدەڵێن و ڕەخنەیان لێدەگرن و ڕووبەڕوویان دەوەستن لەسەر ئەو بڕیارو کارانەی دەیکەن. یان ئەو خەڵکانەی وڵاتەکەیان لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن لەسەریان دەنوسن و زۆر بەتوندی ڕەخنەیان لێدەگرن یان لە گۆڕەپانەکان و بەردەم هۆڵی کۆنگریس پەرلەمانەکانیان خۆپیشاندان دەکەن و لافیتە دژیان بەرزدەکەنەوەو جۆرەها کاریکاتێریان لەسەر دەکەن.. تووڕەنابن و ناچنە مەحکەمەی وڵاتەکانیان شکات بکەن؟ مام جەلال و کاك مەسعود ڕۆژانە لێرەو لەوێ قسەیان پێ دەوترێت و لەسەریان دەنووسرێت و ڕەخنەیان لێدەگیرێت.. کەچی پەنا نابەنە بەر دادگاو شکات لە کەس ناکەن خۆ ئێوەش بەقسەی خۆتان نوێنەری نووسەران و هونەرمەندانی کوردن و لەپرۆسەی هەڵبژاردندا ئەوپلەوپایانەتان وەرگرتووە چۆن دەبێت وا زوو هەڵبچن و یەخەی دادگا لە نووسەران بگرن؟

*–ڕێنمایتان کردووم بچم شکات بکەم. من شکات ناکەم، ئەوەی لەو کارەی ئێوەدا بەناڕەواونادروستم زانیوە، لە ئیعترازەکەو لە نووسینەکەمدا لەسەرم نووسیوون،ئێوە (سێ‌قۆڵی..)دەتوانن لە مەحکەمەی سلێمانی بەوقانوونەی بەدەستانەوەیە شکات لەمن بکەن و ڕامکێشنە مەحکەمەکەتان.. وەکو چۆن لەمەحکەمەی سەورەی بەغداو لەلایەن عەواد بەندەرەوە بەسزای تاوانی کوردایەتی‌حوکم درام ئێوەش بەتاوانی ئەوەی دەستم بۆ کاری لیژنەکەتان بردووە سزام بدەن..

*–من ئاگام لەوە نییە کە کێ یەخەی پێ‌گرتوون، ئێوە بەقسەی خۆتان بێت هیچ کارێکی واتان نەکردووە شایستەی ڕەخنە بن، ئەی بۆوا نووسەرانتان لێ ڕاستبوونەتەوەو یەخەتان پێ دەگرن؟

*–من بەشبەحاڵی خۆم هەر نەمزانیووە لیژنەکەتان لەو بنکەیە کارەکانی کردووەو هیچ گلەیەکیشم لەو بنکەیەو کەسەکانی نییە، ناشزانم ئەوانە کێن هێرشی ناڕەوایان بردۆتە سەر بنکە.

*– من هیچ نووسەرێکم خەتابار نەکردووە و ناشزانم ئەو نووسەرانە کێن وا ئێوەی قارس کردووە و نووسەرانی تریان خەتابار کردووە.

***- لام سەیرە پیاو ئەوەندە هاوڕێی نووسەری لا سووكو کەم بایەخ بێت پێیان بڵێت ئەوانەی هەڵچوونو بەناهەق قسەیان کردووەو پەشیمان بوونەتەوەو داوای لێبوردنیان کردووە چاکتر وابوو هەڵ نەچن نەك پەشیمان ببنەوە، من نازانم ئەو نووسەرە بڕێزانە کێن کەوا هەڵچوونو پەشیمان بوونەتەوە، نووسەرێك لە بەعسو ڕژێمەکەی نەترسابێ، بۆ لە لیژنەیەك بترسێت کە مافی پێشێل بکات.**

لە خاڵی حەوتەمیاندا نووسیویانە لە بەیاننامەی ناڕەزاییەکەم و نووسینەکەی کوردستانی نوێدا داوای ئەوەم کردووە بۆ ناوی من لە ناوەکاندا نییە؟.. ئەو شتانەی لەم خاڵەدا نووسیویانە لە چەند خاڵێکدا کۆیان دەکەمەوە:-

١. بڕگەیەکی بڕیارەکەی ئەنجومەنو ئەو بنەمایەیان نووسیوە، کە کاریان لەسەر کردووە

٢. نامەی ئەعمالی منیان، لە ساڵی ١٩٧٠ تا ساڵی٢٠٠٢ نووسیوەو دوای طه رح و جەمع تەنها(٤) ساڵ خزمەتی ئەدەبیان بۆ من یەشتۆتەوە.

٣. نووسیویانە لە ساڵی١٩٨٧ پەخشانە شیعرێکی بڵاوکردۆتەوەو جارێك نووسیویەتی لە خەباتی مامۆستا ژمارە(٨) و جارێك دەڵێ لە بلێسەدا کە لە شاخ دەرچووە بڵاوکراوەتەوە.

١. لە نووسینەکەمدا نووسیبووم لە ڕۆژنامە روو ڕەشەکانی ئاسۆو بزاڤدا، شتم بڵاو نەکردۆتەوە ئەوانیش نووسیویانە، لە کاتێکدا(هاوکاری) یش هەر هەمان دەزگا دەری کردووەو شتی تیا بڵاو کردۆتەوە.

٢. نووسیویانە ئەی بۆچی لە ساڵی ١٩٩١ – ٢٠٠١ هیچم بڵاو نەکردۆتەوە؟

٣. پاشان بە گاڵتە جاڕییەوە پرسیار دەکەنو دەڵێن بەرهەمی ئامادە کراو بۆ چاپ حیساب نەکراوە.

٤. محەمەد سۆڵەیی وەکو پیاوێکی سیاسی شۆڕشگێڕ ناسرابێتو لەسەر هەڵوێستی نیشتمانی گیرابێ(سزا درابێ!!) ئەوە یەکێتی نیشتمانی کوردستان باشترین پاداشتی داوەتەوەو کاری بەڕێوەبەری گشتی لە وەزارەتی ڕۆشنبیری پێ سپاردووە. نووسیویانە ئەو حاڵە. لایەنێکە پەیوەندی نییە بە ئیبداع و

نووسینەوە. سەبارەت بەو نووسەرانە کە گوایە من خۆم کردووە بە پارێزەریان، هەندێکیان خۆیان هاتوون بۆلای لیژنەکەو لە هۆکەی ئاگادارکراون، هەندێکیان وەکو ئەو بە پێی ساڵی خزمەتو دابڕانیان شمولی نەکردوون. هەندێکی تریشیان باوەڕیان بەو ڕێز لێنانە نەبووەو نەهاتوون فۆرم پڕ بکەنەوەو داواکاری پێشکەش بکەن کاتێك کارەکە هاتە بەرهەم هاواریان لێ هەڵساوەو مامۆستا محەمەد لەبەر ئەوەی ئاگای لە کاری لیژنەکە نییە هەق نییە لە خۆڕا قسە بکات. نووسیویانە بە هەڵی دەزانین کە وەڵامی هەندێ لەو قسانە بدەینەوە کە لەملاو لەولا دەکرێنو پێمان دەگاتەوە، کە بە پێی هەندێ بۆ چوونی هەڵەو گریمان بێ بنەما دەکرێن دەڵێن هەندێ ناو لە لیستەکەدایە تەمەنی خۆیان یاخود تەمەنی نووسینیان ناگاتە ئاستی دەست نیشان کراو، بەڵام بەو پەڕی دڵنیاییو بڕوا بە خۆبوونو راستییەوە دەڵێین کە هیچ نووسەرێکی گەنج کە تەمەنی خۆیو نووسینی لەو ئاستەدا نەبێ لە لیستەکەدا نییە. دەڵێین هەموو نووسەرێك پێناسەی خۆیو بەڵگەنامەی یەکەم نووسینی کە کەمترینیان ساڵی(١٩٧٧) شمولی دەکات. دەڵێن لە بڕیارەکەدا بڕگەیەك هەیە دەڵێ لیژنەکە بۆیان هەیە نووسەری شایستە دەست نیشان بکەن. نووسیویانە ئەمە راستکردنەوەی هەندێ لەو ناراستیانەیە کە لە نووسینەکەی محەمەد سوڵەییدا هاتووە.

بۆ وەڵامی ئەم خاڵانەی خاڵی حەوتیان، ناچارم دەبێ خوێنەر هەندێ ماندوو بکەم، بۆ ئەوەی وەڵامێکی دەقاو دەقی ئەو تۆیان بدەمەوە کە ئەو خۆ لێگۆڕانەیان هێور بکەمەوە.

١. خاڵی یەکیان بۆیە نووسیوە تا خۆیان لە ڕەخنەی نووسەران دەرباز بکەن ئەگەر بە لیستەکەیاندا بچنەوە بۆیان دەردەکەوێت کە چییان کردووە.

٢. لە خاڵی(٢) دا بۆ پێداچوونەوە بە فۆرمەکەمدا، کەو کوژانەو دوژمن ئاسایانە، لە ژوورەکەی بنکەی گەلاوێژدا سێ قوڵی دانیشتوون، بە وردەکاری ئەو سێ کەسە تەرحو جەمعی ناعادیلانەیان کردووە، بە شێوەیەك کە باوەڕ ناکەم.. ئەو چەند مانگەی کە دەڵێن ڕۆژانە تا شەو ماونەتەوەو خەریکبوون بە هەموو فۆرمەکانەوە ئەوەندەی فۆرمەکەی من خەریکبووبێتن، هەقتانە شاعیرن، چیرۆك نووسن، هونەرمەندن.. ئائاوها تەمەنی نووسەرانتان لەبەرەو هەموو نووسەران دەناسن دیارە من ناناسن.. من ئێوە یەك یەك دەناسم، بەڵام بە

ویـژدانتان مـن تـەنها چـوار سـاڵ خزمـەتی ئـەدەبیم هەیـەو تـەنها(٧) شـیعرو نووسـینم بڵاوکردۆتـەوە..؟ دیوانەکـەم(دابـڕان) کـە لـەم ماوەیـەدا کەوتـە بـازاڕەوە(٣١٤) لاپەڕەیـەو هـەر هـەمووی شـیعر نییـە..؟ کـە زوربەشـی بڵاوکراونەتـەوە.. لـەو سـێ کەسـە دەپرسـم چـۆن نامـەی ئـەعمالی خۆتـان بـە پرشنگداری دەنووسـن و هـی منـیش وا دەنووسـن، لیژنـەی ڕێزلێنـان هـەر وەکو ئێوە دەبێت !

٣. سەبارەت بەو پەخشانە شیعرییەی کە بە ناونیشانی(سوار) لە گۆڤاری خەباتی مامۆستادا لە شاخ بڵاوم کردۆتەوە بەناوی(بڵێسە).. ئەوەنـدە بە قین و قارەوە سەیریان کردووە خۆشیان و خوێنەرانیشیان چەواشە کردووە. من نـەم نووسـیوە لـە ژمـارە(٨) خـەباتی مامۆسـتاو جارێـك لـە(بڵێسـە)دا کـە لـە شـاخ دەردەچـوو بـڵاوم کردۆتـەوە،من نووسـیومە لـە ژمـارە(٨)ی گۆڤـاری خـەباتی مامۆستا کە لە شاخ دەردەچوو بە ناوی(بڵێسە) وە بڵاوم کردۆتەوە.

٤. دەربارەی ئەو بەراوردەی ئەو بەڕێزانە، لە نێوانی ڕۆژنامـەی هاوکاری و ئاسـۆو بزاڤدا کردوویانـە، کـە مـن لـە هاوکاریـدا نووسـینم بڵاوکردۆتـەوەو نـەم ویستووە لە ئاسۆو بزاڤدا شت بڵاوبکەمەوە، کە گوایە هەر سێ ڕۆژنامەکە لەبەر ئەوەی لە یەك دەزگای ڕژێم دەرکراون، بەلای ئەوانەوە جیاوازییـان نییـە، مـن لـەو سـێ کەسـەو هـەموو نووسـەران و ڕۆشـنبیران و سیاسـەت مـەدارانی گەلەکـەمان دەپرسـم... ئـەو سـێ ڕۆژنامەیـە، وەکـو یـەك بـوون؟ هـەموو کـورد دەزانێـت کـە هاوکاری لە پێش ساڵی حەفتاکانەوە دەردەچوو، ڕۆژنامەیەك بوو کەسانی وەکو شەهید ئارام ئیشی تیادا دەکردو تیایا دەنووسی.. منیش کاتێ لەو ڕۆژنامەیەدا نووسیومە سـەردەمی بەیاننامەی(١١)ی ئـازار بـووە، بەڵام ئـەو دوو ڕۆژنامـە ڕوو زەردەی ئـەوان دیفـاعی لێدەکـەن و لـە گـەڵ هاوکاریـدا بـەراوردی دەکـەن.. دوو ڕۆژنامە بوون ڕژێمی سەدام بە مەبەستی کـەرت و پـەرت کردنـی زمـانی کوردی و کڕینی قەڵەمی نووسەران و دەستەمۆ کردنیـان و سـەر شـۆڕکردنیان دایمەزرانـد.. ئەوەبوو زۆر نووسەر کە لە ناو شۆڕش کۆڵیان دەداو دەبەزین بە دەستە وسـتانی تەسلیمی ڕژێـم دەبوونـەوە، هـەر لـەو دوو ڕۆژنامەیـەدا پاکانـەیان پێدەنووسـین و کاریـان بۆ دیـاری دەکـردن.. لـەو سـەردەمەی دکتـاتۆردا، زۆربەی نووسـەران بـە

نووسینەوە. سەبارەت بەو نووسەرانە کە گوایە من خۆم کردووە بە پارێزەریان، هەندێکیان خۆیان هاتوون بۆلای لیژنەکەو لە هۆکەی ئاگادارکراون، هەندێکیان وەکو ئەو بە پێی سالی خزمەت و دابڕانیان شمولی نەکردوون. هەندێکی تریشیان باوەڕیان بەو ڕێز لێنانە نەبووەو نەهاتوون فۆرم پڕ بکەنەوەو داواکاری پێشکەش بکەن کاتێك کارەکە هاتە بەرهەم هاواریان لێ هەلساوەو مامۆستا محەمەد لەبەر ئەوەی ئاگای لە کاری لیژنەکە نییە هەق نییە لە خۆڕا قسە بکات. نووسیویانە بە هەلی دەزانین کە وەلامی هەندێ لەو قسانە بدەینەوە کە لەملاو لەولا دەکرێن و پێمان دەگاتەوە، کە بە پێی هەندێ بۆ چوونی هەلەو گریمان بێ بنەما دەکرێن دەلێن هەندێ ناو لە لیستەکەدایە تەمەنی خۆیان یاخود تەمەنی نووسینیان ناگاتە ئاستی دەست نیشان کراو، بەلام بەو پەڕی دلنیایی و بڕوا بە خۆبوون و ڕاستییەوە دەلێین کە هیچ نووسەرێکی گەنج کە تەمەنی خۆی و نووسینی لەو ئاستەدا نەبێ لە لیستەکەدا نییە. دەلێن هەموو نووسەرێك پێناسەی خۆی و بەلگەنامەی یەکەم نووسینی کە کەمترینیان سالی(١٩٧٧) شمولی دەکات. دەلێن لە بڕیارەکەدا بڕگەیەك هەیە دەلێ لیژنەکە بۆیان هەیە نووسەری شایستە دەست نیشان بکەن. نووسیویانە ئەمە ڕاستکردنەوەی هەندێ لەو ناڕاستیانەیە کە لە نووسینەکەی محەمەد سۆلەییدا هاتووە.

بۆ وەلامی ئەم خالانەی خالی حەوتیان، ناچارم دەبێ خوێنەر هەندێ ماندوو بکەم، بۆ ئەوەی وەلامێکی دەقاو دەقی ئەو تۆیان بدەمەوە کە ئەو خۆ لێگۆڕانەیان هێور بکەمەوە.

١. خالی یەکیان بۆیە نووسیوە تا خۆیان لە ڕەخنەی نووسەران دەرباز بکەن ئەگەر بە لیستەکەیاندا بچنەوە بۆیان دەردەکەوێت کە چییان کردووە.

٢. لە خالی(٢) دا بۆ پێداچوونەوە بە فۆرمەکەمدا، کەو کوژانەو دوژمن ئاسایانە، لە ژوورەکەی بنکەی گەلاوێژدا سێ قۆلی دانیشتوون، بە وردەکاری ئەو سێ کەسە تەرح و جەمعی ناعادیلانەیان کردووە، بە شێوەیەك کە باوەڕ ناکەم.. ئەو چەند مانگەی کە دەلێن ڕۆژانە تا شەو ماونەتەوەو خەریکبوون بە هەموو فۆرمەکانەوە ئەوەندەی فۆرمەکەی من خەریکبووبێتن، هەقتانە شاعیرن، چیرۆك نووسن، هونەرمەندن.. ئائاوها تەمەنی نووسەرانتان لەبەرەو هەموو نووسەران دەناسن دیارە من ناناسن.. من ئێوە یەك یەك دەناسم، بەلام بە

ویـژدانتان مـن تـەنها چـوار سـاڵ خزمـەتی ئـەدەبیم هەیـەو تـەنها(٧) شـیعرو نووسـینم بڵاوکردۆتـەوە..؟ دیوانەکـەم(دابـڕان) کـە لـەم ماوەیـەدا کەوتـە بـازاڕەوە(٣١٤) لاپەڕەیـەو هـەر هـەمووی شـیعر نییـە..؟ کـە زوربەشـی بڵاوکراونەتـەوە.. لـەو سـێ کەسـە دەپرسـم چـۆن نامـەی ئـەعمالی خۆتـان بـە پرشـنگداری دەنووسـن و هـی منـیش وا دەنووسـن، لیژنـەی ڕێزلێنـان هـەر وەکـو ئێوە دەبێت !

٣. سەبارەت بەو پەخشانە شیعرییەی کە بە ناونیشانی(سوار) لە گۆڤاری خەباتی مامۆستادا لە شاخ بڵاوم کردۆتەوە بەناوی(بڵێسە).. ئەوەندە بە قین و قارەوە سەیریان کردووە خۆشیان و خوێنەرانیشیان چەواشە کردووە. من نەم نووسیوە لـە ژمـارە(٨) خـەباتی مامۆسـتاو جارێـك لـە(بڵێسـە)دا كـە لـە شـاخ دەردەچـوو بـڵاوم کردۆتـەوە،من نووسـیومە لـە ژمـارە(٨)ی گۆڤـاری خـەباتی مامۆستا کە لە شاخ دەردەچوو بە ناوی(بڵێسە) وە بڵاوم کردۆتەوە.

٤. دەربارەی ئەو بەراوردەی ئەو بەڕێزانە، لە نێوانی ڕۆژنامەی هاوکاری و ئاسـۆو بزاڤدا کردوویانـە، کـە مـن لـە هاوکاریـدا نووسـینم بڵاوکردۆتـەوەو نـەم ویستووە لە ئاسۆو بزاڤدا شت بڵاوبکەمەوە، کە گوایە هەر سێ ڕۆژنامەکە لەبەر ئەوەی لە یەك دەزگای ڕژێم دەرکراون، بەلای ئەوانەوە جیاوازییـان نییـە، مـن لـەو سـێ کەسـەو هـەموو نووسـەران و ڕۆشـنبیران و سیاسـەت مـەدارانی گەلەکـەمان دەپرسـم... ئـەو سـێ ڕۆژنامەیـە، وەکـو یـەك بـوون؟ هـەموو کـورد دەزانێـت کـە هاوکاری لە پێش ساڵی حەفتاکانەوە دەردەچوو، ڕۆژنامەیەك بوو کەسانی وەکو شەهید ئارام ئیشی تیادا دەکردو تیایا دەنووسی.. منیش کاتێ لەو ڕۆژنامەیەدا نووسیومە سـەردەمی بەیاننامەی(١١)ی ئـازار بـووە، بـەڵام ئـەو دوو ڕۆژنامـە ڕوو زەردەی ئـەوان دیفـاعی لێدەکـەن و لـە گـەڵ هاوکاریـدا بـەراوردی دەکـەن.. دوو ڕۆژنامە بوون ڕژێمی سەدام بە مەبەستی کـەرت و پـەرت کردنـی زمانـی کوردی و کڕینی قەڵەمی نووسەران و دەستەمۆ کردنیان و سەر شۆڕکردنیان دایمەزراند.. ئەوەبوو زۆر نووسەر کە لە ناو شۆڕش کۆڵیان دەداو دەبەزین بە دەستە وستانی تەسلیمی ڕژێم دەبوونـەوە، هـەر لـەو دوو ڕۆژنامەیـەدا پاکانـەیان پێدەنووسین و کاریـان بـۆ دیـاری دەکـردن.. لـەو سـەردەمەی دکتـاتۆردا، زۆربـەی نووسـەران بـە

هەڵوێستەوە، رازی نەدەبوون لەو دوو رۆژنامەیەدا بنووسن زۆر باش دەزانم کێ تەسلیم بۆتەوەو کێش لەو رۆژنامانەدا پاکانەی نووسیوەو کاری کردووە.

٥. نووسیویانە کە من بۆچی لە(١٩٩١ تا٢٠٠١) هیچم نەنووسیوە؟ من لە کۆتایی(١٩٩١) دا لە زیندان بەربووم، لە گەڵ بەربوونمدا دەستم بە نووسین کردووەو لە کوردستانی نوێو گۆڤاری پێشمەرگەو زۆر شوێنی تردا نووسینم بڵاوکردۆتەوە. من کە ئەو نووسینانەم نەخستۆتە پاڵ نووسینە کۆنەکانم.. وامزانی ئەو لیژنەیە خۆیان وتەنی: بە ئاگان لە رەوتی نووسینو ئەدەبی کوردی. بۆیە پێشکەشم نەکرد.

٦. ئەو گاڵتە جارییەی ئەوان لە بڕگەی(٧)ی خاڵی حەوتیان سەبارەت بە من نووسیویانە، نووسەران دەکەم بە حەکەم.. ئەوە شێوازی نووسینی نووسەرو هونەرمەندی کوردە؟ کە متمانەیان پێ کراوەو کراونەتە ئەندامی لیژنەی هەڵسەنگاندنو رێز لێنانی نووسەرانو هونەرمەندانی کورد، من وەکو ئەوان. دیارە ئەوانە نوێنەری حکومەتو هەموو نووسەرانو هونەرمندانن، ئەگەر رستەیەك لە شانو شەوکەتیان کەم کاتەوە، بۆیان هەیە لەسەر ئەو ڕستەیە دادگا بگرنوخەڵکی پەلکێشی مەحکەمە بکەن..

* سەبارەت بە بڕگەی(٧) لە خاڵی(٧) کە ئەوان گوایە حیسابیان بۆ بەرهەمی ئامادە کراو بۆ چاپ نەکردووە، ئەی ئەگەر هەبێت بەرهەمی نوسینو بەرهەمی ئامادەکراوی نەبێتو لەو لیستەدا ناوی هاتبێت..؟چی دەڵێن؟ کە بە ڕای من ئەوان دەبوو زیاتر حیساب لەسەر ئەو بەرهەمانە بکەن کە نووسەران بڵاویان نەکردۆتەوە، چونکە شاعیرو نووسەرە گەورەکانی کورد وەکو مەولەویو مەحویو نوری شێخ سالحو خانیو جزیریو حاجی قادر، لە کاتی خۆیاندا هیچیان بڵاونەکردۆتەوە، کاتێ دیوانەکانیان چاپکرا سوودی بە ڕەوتی ئەدەبیو رووناکبیری کوردی نەگەیاند..؟

١. لە بڕگەی(٧) لە خاڵی(٧) یاندا.. بێ ئەوەی حیساب بۆ وشەو مانای بکەنو بە لاقرتیەوە پلار دەگرنە منو دەڵێن وەکو پیاوێکی سیاسی شۆڕشگێڕ ناسرابێتمو لەسەر هەڵوێستی نیشتمانی گیرابمو(سزا درابم)!!. بە حیسابی ئەوان دوای بەربوونم یەکێتی لە بارتەقادا، کاری داوە پێمو کردوومی بە بەڕێوەبەری گشتی. خەڵکینە.. تەنها سەرنج لەم رستەو بۆچوونانە بدەن هەموو

راستییەکتان بۆ دەردەکەوێت. لیژنەیەك گاڵتە بە هەڵوێستی سیاسی کوردایەتی بکات، بڕیاری مەحکەمەی سەورەی بەغدای سەدام حسێن، لە بەرامبەری خەڵکی تێکۆشەرو نیشتمانپەروەرو کوردپەروەر بە سزای تاوان بزانێت، دەبێت ئەو لیژنەیە چۆن خاوەن بیرکردنەوەیەك بێت؟ بە لای منەوە هەر ئەمە بەسە بۆ تێگەیشتن لە مەرامەکانیان. بە دوایدا ڕوو لە یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەکەن، کە کردوومی بە بەڕێوەبەری گشتی، برادەرینە.. ئێوەش بە خۆتانتاندا بچنەوەو بزانن، هەر یەکێتی نیشتمانی کوردستان نییە... کردوونی بە حاکمو کردوونی بە ئەندامی دەستەی بنکەی گەلاوێژو ئەندامی مەکتەبی پەیوەندییەکانی دەرەوەو سەرنووسەری ڕۆژنامەی هەرێمو ئەندامی باڵای یەکێتی نووسەران؟ ئەی ئەوە نییە متمانەی حکومەتێکتان پێدراوە و کراونەتە ئەندامی لیژنەی ڕێزلێنانی نووسەرانی کورد؟ ئەو هەموو شانازیو لافو گەزافەی لە نامەی ئەعمالەکەتاندا نووسیوتانە دەگەڕێتەوە بۆ پاڵپشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان.. نووسەر نییە ئەو دیاردەیە باش باش نەزانێت، من شانازی بە هەڵوێستی کوردپەروەریو نیشتمان پەروەریمەوە دەکەم، سەربەرزم بەوەی کە لە لایەن دامو دەزگای ڕژێمێکی دوژمن بە گەلەکەم گیراومو زیندانی کراوم لە لایەن مەحکەمەیەکەوە حوکم دراوم کە تاکە مەحکەمەی دکتاتۆر بووە حوکمی کورد پەروەرانو نیشتمان پەروەرانی داوە. ئەگەر ئێوە ئەوە بە سزای تاوانی کوردایەتی من دەزانن، من بە حوکمێکی قەرەقوشی ناڕەواو دژ بە کورد پەروەرانو نیشتمان پەروەرانی دەزانم. بەلای ئێوەوە هەڵوێستی کوردایەتیو نیشتمان پەروەری پەیوەندی بە ئەدەبو نووسینەوە نییە، ئەوە ڕای خۆتانەو گلەییتان لێناکرێت.

خۆم نەکردووە بە پارێزەری کەس من حاکم قوباد نیم قانونیو حاکم بمو فەرید زامدار نیم ئەزموونی ئیداری و سەندیکاییم هەبێت!!... من ئەوەندە دەزانم کە لەو لیستەدا نووسەر هەیە ناوی نووسراوە، هیچ داواکاری و بەڵگەیەکی پێشکەش نەکردووە، بۆ موچەکەی منی ئاگادار کردووە بە لای منەوە کە دەبوو زوربەی نووسەران هەروەکو ئەو نووسەرە بەڕێزە حیسابیان بۆ بکرایەو نەخرانایەتە بەر نەشتەری لێوردبوونەوەو تەرحو جەمع کردنەوە. سەبارەت بەو رایەڵەیەی دروستیان کردووە لە ناو نووسەراندا وەکو(گوێبیست)

قسەی نووسەرانیان بۆ بردوون. ئەوەیان پێ وتوون کە پێیان دەڵێن نووسەر هەیە نە تەمەنی ژیان و نە تەمەنی نووسینی نەگەیشتۆتە ئاستی دەست نیشان کردن و ناویشی لە لیستەکەدا هەیە. ئەو سێ کەسە تەئکید لەوە دەکەنەوە کە هیچ کارێکی لەو جۆرە نەکراوە، بەڵام من جارێکی تر دڵنیایان دەکەمەوە کە چەند کەسی لەو جۆرەی تیادایە بە هۆی ڕاسپاردن و برادەرایەتی و نامەی بەرپرسانەوە ناوەکانیان خراوەتە لیستەکانەوە، دڵنیام من ئەگەر نامەی یەکێك لەو مەسئوولانەی خۆم دەیزانم بۆم بهێنانایە تووشی ئەم کێشەو سەریەشەیە نەدەبووم لە گەڵیاندا. سەبارەت بەوەی کە دەڵێن کەمترینیان ساڵی(١٩٧٧) شمولی کردووە نازانم ساڵی(١٩٧٧) تەمەنی نووسەرانە یان ساڵی دەست پێکردنی نووسینیانە؟ ئەگەر ساڵی تەمەنیان بێت ئەوە ئەگەر لە(١٥) ساڵییەوە دەستی بە نووسین کردبێ ئەو بڕیارە نایگرێتەوە، ئەگەر ساڵی(١٩٧٧) تەمەنی نووسینیان بێت تیایاندا هەیە کە لە دوای هەشتاکان و لە نەوەدەکانەوە دەستی بە نووسین کردووە، دەڵێن لیژنەکە بۆی هەیە نووسەری شایستە دەست نیشان بکەن، دیارە ئەم بڕگەیە بۆ ئەوەیە کە خۆیان لەو گلەیی و گازندەیە دەرباز بکەن کە ڕوو بە ڕوویان بۆتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا نازانرێت ئەو نووسەرە شایستانەی بەلای ئەوانەوە شایستە بوون کێن..؟چەند خۆشبوو بۆ نووسەرانیان ئاشکرا بکردایە..

٢. سەبارەت بە ڕاست کردنەوەی ناڕاستییەکانی من.. بەو سێ ئەندامی لیژنەی ڕێز لێنانە دەڵێم: زوربەی نووسینەکەم بە ڕاست دەزانم و ڕوونکردنەوەکەی ئێوەم پێ وەرناگیرێت و بە ڕاستیان نازانم تەنها بە بەراورد کردنی هەردوو نووسینەکەی من و نووسینەکەی ئێوە هەموو ڕاستی و ناڕاستییەك دەردەکەوێت.

لە کۆتاییدا بە پێویستی دەزانم ئەوە بڵێم: بۆ وەڵامی ئەو نووسین و یاداشتەی من، نەدەبوو، ئەندامانی ئەو لیژنەیە وەڵام بدەنەوە، دەبوو لیژنەیەك بۆ لێکۆڵینەوە پێك بهاتایەو ئەو لیژنەیە ڕاستی و ناڕاستییەکانی وەڵام بدایەتەوە، چونکە ئەم لیژنەی ڕێز لێنانە هەرگیز دان بەوەدا نانێن کە مافی نووسەرانیان پێشێل کردووە، وەکو کورد دەڵێت(کەس بە دۆی خۆی نالێ ترشە)..

## وەزارەتی پەروەردە چی بۆ بەرنامەی خوێندن کردووە؟

بەپێی یاسای هەموو شۆڕشێك لەجیهاندا لەهەر وولاتێکدا شۆڕش بەرپابوو..گۆڕانکاری لە هەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵدا ئەکرێت کۆمەلایەتی- ئابووری-پەروەردەیی سیاسی.هتد... کوردستانی ئێمە٣٥ساڵە بە بەردەوامی لەشۆڕشدا یە رووبەڕووی هەموو رژێمە یەك لەدوای یەکەکانی فەرمانڕەوایەتی عێراق وەستاوەتەوە.

قوربانییەکان لەژمارە نایەن. کارەسات و زەرەروزیانمان لەڕادەبەدەرە. ئەوسیوپێنج ساڵەی بەخەباتی پێشمەرگایەتیو نهێنی جەماوەری گەلەکەمانی پیاتێپەڕی سالانێکی سەختو دژوار بوو..بەلام خوشکەری شۆڕشوجەماوەری راپەڕینو سەرجەمی خەڵکی کوردستان بووە لەبەهاری١٩٩١ بەهۆی چەند هۆیەکی ناوەوەودەرەوەو جەماوەری گەلەکەمان راپەڕیو لەماوەیەکی کەمدا. بروسکە ئاسا کوردستانیان لە سەربازو پیاوانی رژێمی فاشی پاکسازی کردو دەتوانین بلێین شۆڕشێکی نوێو بەشێوازێکی نوێ بەرپابوو.

گۆڕانکارییەکی وا لەسەرجەمی کوردستاندا بمانەوێونەمانەوێ دەبێت گۆڕانکاری شۆڕشگێڕانە لەگەڵ خۆیدا بخولقێنێت.

بەڵێ گۆڕانکاری خولقاو پەرلەمانوحکومەتی فیدالی کوردستان لەدایك بوو. ئەمڕۆ کوردستان بەعسو رژێمەکەی تیادا نەماوە، یاسا پووچەڵو ناتەواو رەگەزپەرستانەکەی لێك هەڵوەشاوە، کەسی گوێ بۆ بەیتو بالۆرەکانی ناگریتو هەموو جەماوەر چاوی هیواوئاواتی بڕیوەتە پەرلەمانو حکومەتی کوردستانو چاوەڕوانی گۆڕانکاری بنەڕەتی لەهەموو بوارێکی ژیاندا ئەکەن.

لەهەموو دنیادا پەروەردەوفێرکردن بایەخی تایبەتی خۆی هەیە. رۆڵی سەرەکی دەبینێت بۆ وشیار کردنەوەو فێرکردنی منداڵان.

کوردستانیش چەندین ساڵە لەژێر سایەی پەروەردەیەکی پووچەڵی ناوەرۆكو بەعسیانەدا ئەنالێنێت منداڵان لە زمانو ئەدەبو مێژووی نەتەوەی بێبەری کراوە، خوێندکاری کورد بەمێژووی عەرەبونیشتمانی عەرەبو ئەدەبی

عـــەرەب ئاشـــناكراوەو، بـــێ ئاگايـــە لـــە زمان‌ومێـــژووجوگرافياى خـــۆى‌و نيشتمانەكەى. ساڵانێكى زۆر دەبوو منداڵى كورد هەر چووە قوتابخانە بۆ ئەوەى بچێت زمانى عەرەبى فێربێت زمانەكەى خۆى بيربچێتەوە ساڵانى ئەم دوايەش سياسەتى بەعس سەپاندى‌بەسەر منداڵى كوردا كە هەر بەيەكجارى دەبێت واز لەمافى كوردومێژووى كوردوجوگرافياى كوردستان بهێنرێت‌و هەر كەس بەبێ ئاگايش لە دەمى دەربچوايە ناوى كوردستانى بهێنايە سزاى ياسايى ئەدراو بەشۆفێنى جوودا خواز ئەدرايە قەڵەم.

چەند كەس لەسەر وشەى كوردستان‌و ناوى سەركردەكان لەسێدارە دراون، ساڵانى دواى ئەنفال بەهۆى چەندئەڵقە لەگوێيەك بەناو مامۆستاى كوردى سەدامى قاتل ئەيويست لە هەموو قوتابخانەيەكى كوردستاندا بەعەرەبى وانەيان دەوتەوە. بۆ ئەوەى تا هەموو قوتابخانەكە بكەنە عەرەبى‌و منداڵانەكانى لەورێگايەوە تەعريب بكەن‌و ئەو ئەڵقەلەگوێيانە پێش بركێيان ئەكرد بۆ كردنەوەى ئەو پۆلانە، ئێستاش هەندێكيان ئەگەر رێگا بدرێن بۆ كوردوموقەدەراتى كورد فرمێسكى دڵسۆزى ئەرێژن‌و هەندێ لايەنيش باوەشيان بۆ دەكاتەوە.. بۆيە ئەركى وەزارەتى پەروەردەيە كە بەسۆزانە.. هەوڵى جيدى بدات، بەرنامەى خوێندن‌و فێركردن لەخوێندنگاكاندا بگۆرێت.. ئەو بەرنامە پۆخڵانە وەلاخات كە بەعس دايرشتوون‌و منداڵانى كورديان پێ چەواشە كردووە. دەبێت وەزارەتى پەروەردە، پاكسازى لەدام‌ودەزگاكانى پەروەردەدا بكات. كۆنە بەعسيەكانى بووبوونە ئەڵقە لەگوێى رژێم بۆ جێبەجێكردنى سياسەتى تەعريب كردنى پەروەردە، لەپەروەردە دوور بخرێتەوە.

## مووچەی فەرمانبەران و چەند سەرنجێك

دەمێکە بەنیازم لەبارەی مووچەی فەرمانبەرانەوە چەند سەر نجێ بنووسم، بەمەبەستی لێکۆڵینەوەو پێداچوونەوەی هەمەلایەنە لەسەر کێشەی مووچە..وا لەم نوسینەمدا سەرنج و راوبۆچوونەکانم دەخەمە پێش چاوی بەرپرسان و لایەنە پەیوەندیدارەکانی حکومەتی هەرێم، بەو ئومێدەی ڕێگاچارەیەکی گونجاوی بۆ بدۆزرێتەوە، کە لەئاستی گۆڕانکارییەکانی دنیاو ئەمڕۆی ژیانی مرۆڤی کورددا بێت، کەرۆژانە ڕووبەڕووی دەبێتەوە.

بۆ ئەوەی بەوردی لەکێشەکە بکۆڵینەوە، ناچارم چاوێك بەلیستی مووچەی فەرمانبەراندا بخشێنم وسەرنجەکانم بەرجەستە بکەم.

١. دەرچـــــوویەکی کولیـــــە بــــە ١٤٨دینارودەرچـــــوویەکی پەیمانگابە١٣٩,٧٥٠دینارو دەرچووانی قۆناغەکانی خوارتر بە ڕێژەیەکی کەمتر دادەمەزرێن.

٢. دەرماڵە(مخصصاتی زەوجی)ی ژن٢,٦٠٠دوودینارو شەشسەد فلسەو دەرماڵەی منداڵ مخصصاتی منداڵ ٢,٦٠٠دوودینارو شەشسەد فلسە.

٣. (عــــلاوە)سەرمووچــــەی ســــالانە ١,٣٠٠دینارێــــك وسێسەدفلسەو(ترفیع)بەرزەمووچە٤,٠٠٠چوار دینارە.

٤. فەرمانبەرێکی دەرچووی کولییە گەر دامەزرێت مووچەکەی ١٧٥دینارە

دیارە ئەم سیستەمە سیستمی زۆر کۆنەو دەکرێت بڵێین بۆ ئەوسەردەمانە لەبارو گونجاو بووە، لەبەر ئەم هۆیانە:

١. دینارو تەنانەت فلسیش دراوی سەردەمەکە دراوێکی بەهێزبووە.

٢. ژیان وگوزەرانی ئەو سەردەمانەی مرۆڤ وەکوئێستا قورس وگران نەبووەو پێداویستییەکان ئەوەندە زۆرو قەبە نەبوون.

٣. هاتووچۆ نیشتەجێبوون وەکو ئەمڕۆ گران نەبووە.

٤. حکومەتــەکانی ئــەو ســەردەمانە لەگــەڵ ئەوەشــدادژی کۆمــەڵانی خەڵك وئازادیو سەربەستییەکانیان بوون و، بە خواستی میللەت نەهاتبوونە سەر

حوكم، بەلام زۆربەی پێداویستییەکانی هاوولاتیانیان بەڕێگای ئۆرزدباك وكۆمەڵە هەرەوەزییەکان وکۆمپانیای خۆراکەوە بەنرخی گونجاوی سەردەمەکە دابیندەکرد، دیارە حکومەتی هەرێم لەگەڵ ئەوەی بە خواستی کۆمەلانی خەڵك وبە خەبات و تێکۆشانی گەلەکەمان و بەخوێنی شەهیدان هاتۆتە بەرهەم، بۆ بەرژەوەندی گەل و نیشتمان و کارەکانی خستووەتە ئەستۆی، بەلام لەتواناو دەسەلاتدانییە ئەمرۆبتوانێت پێداویستییەکانی رۆژانەی هاوولاتیان وەکو پێویست دابینبکات، تەنهادەزگایەك کەباری خەڵکەکەی لەرووی دەرامەتی ژیانەوە مسۆگەرکردووە. بڕیاری(٩٨٦)ە کە لەرێگای کۆمپانیای خۆراکەوە خوردن دەدرێتە هاولاتیان.

٥. لەو سەردەمانەدا رژێمە دەسەلاتدارەکان رێگایان بەحزب وڕێکخراوو سەندیکا نەدەدا داکۆکی لەمافی هاوولاتیان بکەن، بەلام ئەمرۆ لەدوای راپەرینەوە بەهۆی باهۆزی ئازادیو دیموکراسییەوە چەندین حزب و رێکخراووسەندیکای جۆراوجۆر دروستبوون.

لەبارودۆخی ئێستای گەلەکەماندا کەوا بۆ دەساڵە کورد خۆی حوکمڕانی خۆی دەکات، حکومەتی هەرێم بەهەوڵی دلسۆزان لەسەر پێی خۆی راوەستاوەو کاروباری هاوولاتیان بەباشی بەرێوەدەبات و پارێزگاری لەسەرو سامان و بوونیان دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا بمانەوێت و نەمانەوێت کەموکوڕی هەیە، بۆیە بەپێویستی دەزانم کەموکورییەکان دەستنیشان بکرێن و هەوڵبدرێت رێگای کەمکردنەوەو چارەسەرکردنیان بۆ دابنرێت، لەم ئاسۆیەوە چەند خاڵێك تیشکیان دەخەمەسەر:

١. لەدوای راپەرینەوە لەکوردستاندا چەندین حیزب و رێکخراوویەکێتی وسەندیکای جۆراوجۆر دامەزراون، هەریەکەیان بە پێی بە رنامەیان دەبێت لەخزمەتی کۆمەلانی خەڵکدا بن و، داکۆکی لەمافەکانیان بکەن، ئەندامانی ئەو حزب و رێکخراوانە، کەسان و هاوولاتیانی توێژەکانی کۆمەڵی کوردەوارین، زۆری فەرمانبەرو کارمەندو کاربەدەستی حکومەتەکەن، بۆیە لەو حزب و رێکخراوانە دەپرسم چۆن تائێستا پرسیارلە فەرمانبەرانی ئەندامیان ناکەن مووچەی چەندەو چۆنە؟ چۆن بژێوی ژیانی خۆیوخێزانی پێ دابیندەکات؟ رێکخراوەکانی ژنان و مندالان بۆ داکۆکی لەژن و مندال ناکەن؟.

چۆن رازی دەبن ژنێکی ماڵەوە دەرماڵەی مانگانەی دوو دیناروو شەش سەد فلس‌و دەرماڵەی منداڵێکی چاو گەش مانگانەی دوو دینارو شەش سەد فلس بێت، لێیان دەپرسم ئەو دوو دینارو شەش سەد فلسە چ خواست‌و پێویستیەکی ژن‌و منداڵ تەواودەکات؟

٢. خێزانێك ئەگەر دووسەر خێزانیش بن ڕۆژانە بە دەدینار خەرجی ڕۆژانە دەر ناچێت، جگە لەپۆشاك‌و کرێی خانووو هاتوچۆیان بۆ فەرمانگەو بازاڕ کە مانگانە تەنها خەرجی ڕۆژانەکەیان دەگاتە ٣٠٠دینار فەرمانبەرێك مووچەکەی ١٧٥دینار بێت ١٢٥دینارەکەی ترو کرێی خانوو هاتوچۆ پۆشاکی سالانە بەچی دابین بکات؟.

لەئەنجامی ڕۆچوون‌و وردبوونەوە بە مووچەی فەرمانبەراندا ئەم خالانەم لاگەلالە بوو:

١. بەڕای من ئەگەر دەرماڵەی ژن‌و منداڵ چارەسەرێکی گونجاوی بۆنەکرێت، باشتر وایە لەسەر لیستی مووچە هەڵبگیرێت‌و نەمێنێت، چونکە ئەو دەرماڵەیە بەو شێوەیە هیچ گۆڕانکارییەك لەمووچەی فەرمانبەردا ناکات.

٢. مووچەو سەرمووچەو بەرزەمووچە بەڕێژەیەکی گونجاو دابنرێت کە فەرمانبەر بتوانێت لە٥٠٪ژیانی پێ دابین بکات، سەرە مووچە یەك دینارو سێسەد فلس بێت چ ئەرکێکی فەرمانبەر سوك دەکات، ئەگەر وایە نەبوونی باشترە کە سالانە کۆمەڵێ فەرمانبەری بۆ دەردەکرێت‌و دەخرێتە دۆسیەکەوەو کە زیادیش دەکرێت بەڕێژەیەکی گونجاوی وا زیاد بکرێت کە فەرمانبەر کەڵکی لێ وەربگرێت، بەرامبەر بەو ئەرك‌و ماندوبونەی.

٣. فەرمانبەر نییە ئەگەر تەنها خۆیبێت ٥٠٠دینارو ئەگەر خێزاندار بێت بەهەزار دینا کەمترو لەژیانێکی مەمرەو مەژیە مانگانە دەربچێت.

٤. دەرماڵەی پلە(منصب) کە بۆ بەڕێوەبەرە گشتییەکان‌و بەڕێوەبەری فەرمانگەکانی ٧٠٠و٥٠٠دینار خەرجدەکرێت لەچاو ئەو ئەرك‌و کارو بەرپرسیارێتییاندا کەمە، چونکە بڕبڕەی پشتی ڕاپەڕاندنی هەموو داموو دەزگاکانی حکومەتەکەن..

٥. دەرماڵەکانی تری ئابوری ناسان‌و مەترسی‌و تەکنیکی‌و پۆستەو فەرمانبەران‌و کۆمپیوتەرو سندوق‌و پیشەکان بەڕێژەیەك دانراون لە ١٥٪ بۆ

٣٠٪، ئەم ڕێژەیە بەلای منەوە کەمەو پێویستە لەپێش چاو بگیرێت و ڕێژەکانیان زیاد بکرێت، بەتایبەتی یەکەی ژمێریاری.

٦. ڕێکخراوی ژنان و منداڵان و پیشەیەکان، هەوڵی جدی بۆ نادەن بۆ زیادکردنی دەرماڵەی ژنان و منداڵان و پیشەکان.

٧. ئەگەر بەراوردی مووچەی فەرمانبەرێکی حکومەت لەگەڵ مووچەی ئەوکەسانەی لەحیزب و ڕێکخراوو کۆمپانیا و ڕێکخراوە بیانییەکاندا کار دەکەن، جیاوازی بکرێت مووچەیان ئاسمان و زەوییە، بۆنموونە دەپرسین ١٠٠دینار لەکوێ و ١٠٠دۆلار لەکوێ؟

-لەکۆتایی پوختەی سەرنج و تێبینیەکانمدا، داوا لەبەرپرسانی حکومەتی هەرێم دەکەم، کەچاوێك بەم پێشنیازانەدا بخشێنن و هەوڵێك بۆچارەسەرێکی گونجاو بەپێی دەرامەتی حکومەتی هەرێمی کوردستان بدۆزنەوەو، ئەوەش لەپیش چاو بگیرێت کە بریاری ٩٨٦مەرج نییە هەر بەوشێوەیە بەردەوام بێت.

١. کار بۆ ئەوە بکرێت لەهەموو دامودەزگاکانی حکومەتدا ئەوەندە فەرمانبەروکارگوزار دابنرێت کە فەرانگەکە پێویستێتی بۆکارکردن، زیادەکان بەچارەسەرێکی گونجاو دووربخرێنەوە، بۆئەوەی بێئیشەکان نەبنە هۆی پشت ساردکردنەوەی ئیشکەرەکان

٢. مووچەی فەرمانبەر زیاد بکرێت، ئەوکەسانەی دەرچووی کولیەو پەیمانگان لە٣٠٠بۆ٢٥٠دینارو پلەکانی خوارترو بەڕێژەی کەمتر دابمەزرێن و ئەوانەشی کە ئێستا دامەزراون بەڕێژەیەك گۆڕانکاری لەمووچەکانیاندا بکرێت.

٣. سەرەمووچەی ساڵانە بکرێتە ١٠دینارو بەرزە مووچە بکرێتە ٣٠دینار.

٤. دەرماڵەی ژن بکرێتە١٠٠بۆ١٥٠دینارو دەرماڵەی منداڵ٥٠بۆ١٠٠دینارو بەڕێژەیەکی گونجاو بۆ منداڵی زۆرتر لەیەك منداڵ زیاد بکرێت.

٥. دەرماڵەی پلەی بەڕێوەبەری گشتی بکرێتە ١٥٠٠دینارو دەرماڵەی پلەی بەڕێوەبەر بکرێتە ٧٠٠دینار.

٦. دەرماڵەکانی تری پیشەییەکان بەڕێژەیەك زیاد بکرێت کە بگونجێت لەگەڵ ئەرك و کارەکانیاندا، بەتایبەتی دەرماڵەی یەکەی ژمێریاری و کارگێڕی و خۆیەتیش دەرماڵەیان بۆ دابنرێت وەك دەرماڵەی هونەری، چونکە ئیدارە هونەرەو هونەریش حەق وایە دەرماڵەی هەبێت.

٧. دەرماڵەی خواردن و میوانداری بۆ بەڕێوەبەرە گشتیەکان و بەڕێوەبەری فەرمانگەکان بە٥٠٠بۆ٢٥٠دینار دابنرێت.

٨. یاسای ڕاژەی شارستانی ژمارە٢٤ی ساڵی ١٩٦٠لەبەر ئەوەی زەمەنێکی زۆری بەسەردا ڕۆیشتووە و لەئاستی گۆڕانکارییەکانی ئەمڕۆی کوردستاندانییە، پشتگوێ بخرێت و کاری لەسەر نەکرێت و یاسایەکی تری گونجاو دابڕێژرێت.

ئەم راوبۆچوون وسەرنج وپێشنیازانە بەمەبەستی لێکۆڵینەوە دەخەمە پێش چاو، ئومێد دەکەم ئەوکەسانەی شارەزاییان لەم بوارەدا هەیە راوسەرنجیان بنووسن و ببێتە بابەتێکی لێکۆڵینەوەی وا کە بەشێوەیەکی گونجاو چارەسەری کێشەکە بکرێت.

*ئەم وتارە لە ژمارە (٢٦٦٩)ی ٢٠٠٢/١١/٢٨ی رۆژنامەی کوردستانی نوێدا بلاوکراوەتەوە.

## ( ڕۆتین دیاردەیەکی کوشندەیە پێویستی بەچارەسەرە )

ئەمڕۆ سەردەمی زانستو تەکنەلۆژیاو کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێتە...لەولاتانی پێشکەوتوی وەکو ئەوروپاو زۆر لەولاتانی رۆژهەلاتیشدا کاری ئیداری‌و دارایی‌و خزمەتگوزارییەکانی حکومەتو هاولاتیان لەدامو دەزگاکانی حکومەتەکاندا ئەوەندە ئاسان کراوە ئەگەر هاولاتییەك یان دەزگایەکی حکومەتی لەرۆژێکا چەندکاری لەچەند دەزگایەك هەبێت بەبێ کێشەو سەرئێشەو هەر هەمووی زۆر بەزوویی جێبەجێ دەکرێن. کار ئاسانییەکە گەیشتوەتە رادەیەك لەزۆر ولاتدا تەنها بەبەکارهێنانی کارتێ یان پلاكو دوگمەیەك یەکسەر کارەکە مەیسەر دەبێت.

ئێستا لەکوردستاندا حکومەتی هەرێمی کوردستان ئەرکی کارەکانی دەزگا حکومیەکانو هاولاتیانی کەوتۆتە ئەستۆ، بەداخەوە، لەزۆربەی دامو دەزگاکاندا دیاردەی رۆتین بۆتە دیاردەیەکی کوشندە، بەهۆی نەشارەزایی‌و هەستنەکردن بەئەرکی نەتەوەیی‌و نیشتمانی‌و ئیجتیهادی کەسی‌و کەسانی مەسلەکی، دیارەکە وازەق بۆتەوە، خەلکی دلسۆزو بەخەمی نیگەران کردووە. نووسراوێك یان داواکارییەکی هاولاتیەك ئەوەندە پەراوێزی(باشە،راتان،لاریمان نیە پەسەندە)و ئیمزای یەك لەسەر یەکی لەسەر دەکرێت هەست بەمۆتەکەیەکی قورسو ترسناك دەکەیت، ئەگەر بەزوویی بەپیریەوە نەچین، دەبێتە هۆی دواکەوتنو گەشەنەکردنو پێش نەکەوتنی حکومەتەکەمانو دەم کردنەوەو گلەیی هاولاتیان لەحکومەتەکەمان.

لەڕوانگەی ئەرکی نەتەوەیی‌و نیشتمانییەوە بەپێویستی دەزانم قسەی لەسەربکەمو شارەزایانو پسپۆرانی بواری ئیداری‌و دارایی بەپێی پسپۆرییان قسەی لەسەر بکەن. بەرپرسانو پەیوەندیدارانی ئەمڕۆی حکومەتی هەرێم(وەك چۆن سەرۆکی حکومەت، بەپەرۆشەوە باسی دیاردەکە دەکاتو لەکۆبوونەوەی ئەنجومەنی وەزیرانی رۆژی١/٢٨یەکەم بەرنامەی کۆبوونەوەکە تەرخان بوو بۆ

لێکۆڵینەوەی دیاردەکە) ئەوانیش بەبایەخەوە بڕواننە راو سەرنج و بۆچوونەکان. بەپەرۆشەوە هەوڵ بۆ چارەسەرێکی گونجا وی بدەن.

من دیاردەکە لەچەند خاڵێکدا چڕدەکەمەوە...

١. ئەرك و دەسەلاتە ئیداری و داراییەکان...

٢. بڕیارەکانی ئەنجومەن و فەرمانەوەزاریەکان

٣. دەرماڵە جۆراوجۆرەکان.

٤. کاری دەزگا و فەرمانگەکانی حکومەت.

٥. دەسەلاتەکانی سەرەوە دەست وەردان لەکاری دەزگاکانی خوارەوەی حکومەت.

٦. دانانی کەسانی شارەزاو شایستە بۆ بەڕێوەبردنی دەزگا گرنگەکان.

**روونکردنەوەی خاڵەکانی دیاردەکە :**

ئەرك و دەسەلاتە ئیداری و داراییەکان.. بۆئەوەی رۆتین نەبێتە نەخۆشییەکی کوشندە، لەحکومەتەکەماندا پێویستە کارو دەسەلاتەکان بەسەر دامەزراوەکاندا بەشێوەیەکی گونجاو بەپێی کاری دەزگا کە دابەش بکرێت، لەئەنجومەنی وەزیرانەوە بۆ وەزارەتەکان و گشت دەزگاکان. بەم رێگایە دەتوانرێت رۆتین کەم بکرێتەوە، هەرچەندە لەهەندێ وەزارەت و دام و دەزگادا، کەم تازۆرێك کراوە، بەلام ئەوە بەس نییە دەبێت فەرمان و بڕیارەکان سەرتاسەری بێت.

١. بڕیارو فەرمانەکان...سالانە بەپێی بەرەو پێش چوونی حکومەتی هەرێم و زۆربوونی کارو ئەرکەکان...سالانە چەندین بڕیارو فەرمان لەئەنجومەنی وەزیران و وەزارەتەکانەوە دەردەچێت، دیارە هەموو بڕیارو فەرمانێك هۆکاری تایبەتی و گشتی هەیە. پێویستە ئەو بڕیارانە سالانە بەبێ نوێکردنەوە کاریان پێبکرێت تابڕیارو فەرمانێکی تر بۆ راگرتن یان هەلوەشاندنەوەی دەردەچێت. کەئێستە لەزۆر وەزارەت و لەدەزگاکانی سەر بەوەزارەتی دارایی و ئابووری داوای تازەکردنەوەی سالانەیان بۆ دەکرێت، بەلای منەوە ئەم دیاردەیە یەکێکە لەرۆتینەکان پێویستە بڕیارێکی گونجاوی بۆ بدرێت، کار لەسەر تازەکردنەوەیان رانەوەستێت یان پێویست بەتازەکردنەوەیان نەکات.

٢. دەرماڵــە جۆراوجۆرەکــانو شــێوەی خــەرج کردنیــان...لەســەرجەمی دەزگاکــانی حکومەتــدا، چــەندین جــۆری دەرماڵــە بــۆ فەرمانبــەران دانــراوە، دەرماڵەکان بوونەتـە بەشێك لەمووچەی مانگانـەی فەرمانبـەران، لەسەر لیسـتی مووچــە دەبســترێت... ســاڵانە ئــەو دەرماڵانــە دەبێــت فــەرمانو فــۆرمی تازەکردنەوەیان بۆ دەربکرێت لەبەر ئەم رۆتینە سەیرو سەمەرە، کەم دەزگا هەیە بتوانێت مانگی یەکی ساڵکە دەرماڵـەی فەرمانبەرانی بـۆ خـەرج بکرێت...بەڕای مـن مـادام دەرماڵـە بۆتـە بەشێك لەمووچـەی فەرمانبـەر، چـۆن مووچەپێویسـتی بەفەرمانی نوێکردنەوە نییە دەرماڵەش پێویستی بەتازەکردنـەوە نەبێت، دەبێت لەم دیاردەیە دەرباز بینو رۆتینێکی زیادەیە.

٣. کـاری دەزگـاو فەرمانگـەکانی حکومـەتو شـێوەی ئەنجامـدانی کـاری فەرمانگـەو هاوڵاتیـان... هـەر دەزگایـەك لـە حکومـەتی هەرێمـدا دامـەزراوەو دادەمەزرێت، کارو ئەرکەکەی لەپێش چاو گیراوەوبوودجەی پێویستی مانگانـەو ساڵانەی بـۆ تـەرخان کـراوە...بودجەکـە سـاڵانە بـەپێی دەفتـەرێکی رێکخـراوی وەزارەتی دارایی و ئابووری دوای لێکۆڵینەوەو وردبونەوە لەکارو ئەرکی دەزگاکە بەکەمکردنـەوەی یـان زیـادکردنی پەسـەند دەکرێـتو بـەپێی ئـەو بودجەیـە کـارو چالاکیەکانی جێبەجێدەکات. دەزگاکـە بەرپرسە لەشێوەی خـەرجکردنوپاکتاو کردنی لەوەزارەتی دارایو ئابووریو دیوانی چاودێری گشتی...دەبێت مانگانـە لەوبودجەیـە پێشـینەی بـەردەوامی مانگانـەو مووچـەی مانگانـەی فەرمانبـەرانو پێشینە جۆراوجۆرەکان خـەرج بکـات، بۆراکێشـانی پێشـینەکان، مانگانـە دەبێت لەڕێگای بەڕێوەبەرێتی گشتی دیوانەوە داوا لەوەزارەت بکرێت، بۆ تـەمویلکردنو خــەرجکردنی و وەزارەتــیش داوا لــەوەزارەتی دارایــی و ئــابووری بکــات بــۆ تــەمویلکردنو خــەرجکردنی کێشــەکە لەوەدایــە لەهــەردوو وەزاتەکــە چــەندین پــەراوێزی (راتــان باشــە پەســەندە، رازی نــین) لەســەر نووســراوەکە دەنوســرێتو چەندین ئیمزای لەسەر دەکرێت...لەهەر بەشو ئەوشـوێنانەی پـەراوێزو ئیمزای لەسەر دەکەن رۆژو دوان دەخایەنێت. بەڕای من ئەم دیاردەیە یەکێکە لـەرۆتینی خـراپو بـۆ چارەسـەرکردنی مـن وای بـەباش دەزانم. بەڕێوەبەرێتییـە گشـتییەکە راسـتەوخۆو بەنووسراوی بەڕێوەبەرێتییەکـەو ئیمـزای بەڕێوەبەرەکـەی نووسـراو بۆ بەڕێوەبەرێتی گشتیی دارایی لەوەزارەتی دارایی و ئابووری، بـۆ پێشـینەکانو

دابینکردنی پێداویستیەکان و داواکاریەکانی هاوڵاتیان لەڕووی ئیداری و داراییەوە بکات وبەسەر ئەو ڕۆتینەدا زاڵ ببین.

٤. کێشەی دەسەڵاتەکانی سەرەوەی حکومەت و دەستوەردان لەکارو دەسەڵاتەکانی دەزگاکانی خوارەوەی...ئەم کێشەیە دیاردەیەکی زەقەو چۆتە خاڵی ڕۆتینەوە، هەیبەتی دەزگاکانی خوارەوە کەم بۆتەوەو هاوڵاتیان ئەژماردنی بۆ ناکەن...زۆر جار وەزیرێك دەبێتە بەڕێوەبەرێکی ناحیەیان بەڕێوەبەرێکی گشتی و ئەوە فەرامۆش دەکات کە دەسەڵاتی وەزیر چییە؟ وەزیر لەچ پلەیەکدایە: بۆنموونە: لەشاری سلێمانیدا، کە ئێستا بۆتە پایتەختیجکومەتی هەرێم دوو دەسەڵات کارە خزمەتگوزاری و ئیداری و داراییەکان دەبەن بەڕێوە، پارێزگای سلێمانی و سەرۆکایەتی ئەنجومەنی شارەوانی بەپێی پەیکەری ئیداری دەبێت پارێزگا بەرپرسی یەکەی ئیداری پارێزگاکە بێت، هەمو داخوازی و داواکارییەك لەڕێگای قائیمقامەکانەوە بۆ پارێزگا بەرز بکرێتەوەو، پارێزگاش بەپێی جۆری داواکارییەکە داواکارییەکە ئاڕاستەی دەسەڵاتی سەرووپارێزگا بکات.

سەرۆکایەتی ئەنجومەنی شارەوانی، بەپێی پێکهاتەو هۆکاری دامەزراندنی هەرچی داهاتی دام و دەزگاکانی سنووری شارەوانی سلێمانیە دەبێتە بودجەی شارەوانی بەو بودجەیەش دەبێت کارە خزمەتگوزاریەکانی شارەکە جێبەجێ بکرێن... بەڕای من پێویستە ئەم دوو دەسەڵاتە دوو دەسەڵاتی جیاواز نەبن، بەڵکە زۆر لەیەکەوە نزیك بن و هاوکاری و پەیوەندی توندوتۆڵ لەنێوانیاندا هەبێت، یان تەواوکەری یەکتری بن و بەبەرنامەیەکی داڕێژراوی هاوبەش کارەکان ئەنجام بدرێت. شێوەی کارکردن وادەخوازێت کە لەهەموو کۆبوونەوەکانی ئەنجومەندا پارێزگارو قائیمقامی مەرکەز بەشداربن...بۆ ئاگاداربوون لەبەرنامەی یەکتری بۆ شارەکە، بەڵام بەداخەوە ئێستا وا هەست دەکرێت کەپارێزگا لەشارەکەدا نییە، چونکە هەموو دەسەڵاتەکانی لێ زەوتکراوە. لەکاتێکدا.لەهیچ حکومەتێکی دەوروبەرمان دیاردەی وابەرچاو ناکەوێت...ئەم دیاردەیەش خاڵێکە لەخاڵەکانی ڕۆتین و پێویستی بەچارەسەری گونجاوە.

*ئەم وتارە لەژمارە٢٦٧٧ی٢٠٠٢/٢/٦ی کوردستانی نوێدا بلاوکراوەتەوە.

# بڕیاری ژمارە( ٥٣ )ی سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی وەزیران وچەند سەرنجێك

لەژمارە(٢٦٦٩)ی رۆژی ٢٠٠٢/١/٢٨ی رۆژنامەی کوردستانی نوێی ئازیزدا، بابەتێکم لەژێر ناونیشانی(مووچەی فەرمانبەران و چەند سەرنجێك)دا بڵاوکرەوە. بابەتەکەم لەچەند خاڵێکی وردەکاریدا کۆکرابۆوەو هەر خاڵە پەیوەندی بەلایەنێکی مووچەی فەرمانبەرانەوە هەبوو، بەدوای نووسینەکەمدا کاك خالید محەمەد لەژمارە(٢٦٧٧)ی رۆژی ٢٠٠٢/٢/٦و خاتوو منیرە عەبدول لەژمارە(٢٦٨٧)ی٢٠٠٢/٢/١٨، هەریەکەیان بابەتێکیان لەکوردستانی نوێدا بڵاوکردەوە، کە هەریەکەیان بەبۆچوون و شارەزاییان پشتگیریان لە نووسینەکەی من کردبوو.

رۆژی ٢٠٠٢/٢/١٣لەسەر بڕیاری بەڕێز دکتۆر بەرهەم سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران، کۆبوونەوەیەکی فراوان بۆ هەموو بەرپرسانی دەزگاکانی حکومەتی هەرێم، لەهۆڵی شەهید(شازاد صائب) سازکرا...

کۆبوونەوەکە تایبەت بوو بۆ بنەبڕکردنی دیاردەی رۆتین لەدام و دەزگاکانی حکومەتی هەرێمدا، وەکو بەشداریێکی کۆبوونەوەکە هاوبەشی رادەربڕین و لێکۆڵینەوەم کرد.لەراو بۆ چوونەکانمدا سەبارەت بەدیاردەی رۆتین و بەرنامە بۆ چارەسەرکردنی سەرنجی بەشداربووان و بەرپرسانم بۆ کەمیی مووچەو دەرماڵەکانی فەرمانبەران و یاسای راژەی شارستانی ژمارە(٢٤)ی ساڵی ١٩٦٠ی فەرمانبەران و راکێشا، تیشکم خستە سەر چەند لایەنێکی مووچەو پەیوەندی بەدیاردەی رۆتین و رێگا چارەی بنەبڕکردنی. زۆربەی بەشداران و بەرپرسان پشتگیری و دەستخۆشیان لەڕاوبۆچوونەکانم کرد.

لەوکاتەوە سەرجەمی فەرمانبەران و هاووڵاتیان چاوەڕوانن کە: یەکەم:دیاردەی رۆتین لەدام و دەزگاکانی حکومەتدا بنەبڕبکرێت، بەداخەوە ئەم دیاردەیە نەك بنەبڕ نەکراوە. بەڵکو زیادی کردووەو باوەڕ ناکەم وەزارەتێك یان دەزگایەکی حکومەت هەبێت دیاردەکەی کەم کردبێتەوەو بەبۆچوونی من بەپێچەوانەوە زیادی کردووە. دووەم:گۆڕانکاری لەمووچەی فەرمانبەران

بەزیادکردنی مووچەو دەرماڵەکان و سەرەمووچەی ساڵانەو بەرزە مووچەیاندا.
دوای کۆبوونەوەکە سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران، بۆ ئەم وەزارەت و ئەو وەزارەت مووچــەو دەرماڵـــەی زیـــادکردو دوابڕیـــاری ژمـــارە(٥٣)ی ڕۆژی٢٣/١١/٢٠٠٢بوو کەتایبەت بەدەرماڵەی (ژن ومنداڵ)ی فەرمانبەران. وێڕای دەستخۆشیم لەسەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران بۆ بڕیارەکانی پێشوویی و ئەم بڕیارەشـــی، پیرۆزبـــایی لـــەخێزانی ئـــەو فەرمانبەرانـــە دەکـــەم کەبڕیارەکـــە دەیانگرێتـــەوە، بەئومێـــدی ئـــەوە ســـەرۆك و بەرپرســـانی حکومەتەکـــەمان زیـــاتر خەمخۆری فەرمانبەران و کارمەندانی دەزگاکانی حکومەت بن و، بڕیاری باشترو گونجـاوتر بـۆ چـاککردنی ژیـان و گوزەرانیـان دەربکـەن و، بەبەردەوامی بڕیـار بـــەدوای بڕیـــاردا مژدەبەخشـــی فەرمانبـــەران و خێزانـــەکانیان بکرێـــت.
دەمـــەوێت(ئەگـــەر لـــێم نـــەگرن و لـــێم وەربگـــرن)، چـــەند ســـەرنجێکی تـــر لەســـەر ناوەڕۆکی بڕیارەکە بخەمە پێش چاو، چونکە دڵنیام ئەم جۆرە بڕیارو هەنگاوانە بۆ خۆشگوزەرانیی فەرمانبەران و خێزانەکانیان، فەرمانبەران کاراترو پەرۆشتر دەکات بۆ ڕاپەڕاندنی کارو ئەرکەکانیان لەدەزگاکانی حکومەتداو دڵسۆزانەتر بەدەنگ و پیری هاووڵاتیانەوە دەچن و دیاردەی ڕۆتین ڕۆژ بەرۆژ بەرەو نەمان دەبات.

**سەرنجەکانم لەچەند خاڵێکدا چڕ دەکەمەوە:-**

١. دەرماڵـەی(ژن ومنـداڵ)...ئـەم دەرماڵانـە(مـافێکی دەسـتەبەر کـراوی) ژنـۆ منـداڵی فەرمانبەرانـە(حـق مكتسـب للموظـف). ئـەم دەرماڵانـە بەپلـەوو پایـەو مووچەی فەرمانبەرەکەوە نابەسترێتەوە. فەرمانبـەرێکی ئاسایی فەرمانگەیەکی حکومـەت بێـت...بەپێی سیستەمێك ئەم مافە دراوەتـە ژن و منداڵەکانیان، بۆیە ژن ومنـداڵی فەرمانبـەرێك لەفەرمانبـەرێکی تـر لـەوەرگرتنی دەرماڵەیانـدا لەیـەك جیاناکرێنـەوە...،ژن و منـداڵی وەزیرێـك یـا پلـەدارێکی تـری لێ بێبـەری ناکرێـت، بەڕای من ئەو جیاکردنەوەیە لەبڕیارەکەدا لەجێی خۆیدا نییە.

٢. لەڕوانگەی خاڵی یەکەمەوە بڕگەی(أ-ب)ی سێیەم خاڵی بڕیارەکە ژن و منـداڵی ئەو فەرمانبەرانـەی مووچەکانیان لەهـەزار دیناردایەو ئەو ژن و مێـردەی بەمووچـەکانی هـەردووکیان لـە(١٥٠٠) دینـار دایەبڕیارەکـە نایانگرێتـەوەو ژن و منداڵیان لێ بێبەشکراوەو دەبێت پابەندی بڕگەی(ج)ی سێیەم خاڵی بڕیارەکە بن. بەڕای من ئەم جیاکردنەوەیە پابەندی هیچ بنەماو سیستەمێکی ئیداری و دارایی

نییەو روون نییە لەچییەوە وەرگیراوەو پشت بە چ سیستەمو بنەمایەك بەستراوە. بۆیە نەدەبوو ئەو جیاوازییە بکرایە، بمانەوێت و نەمانەوێت لاسەنگیەك لەبڕیارەکەدا بەرچاو دەکەوێت، من پێشنیاردەکەم خاڵی سێیەم بڕیارەکە بەبڕگەکانی(أ-ب-ج)ەوە لەبڕیارەکە لاببرێت و ژن و منداڵی هەموو فەرمانبەرانی حکومەت بەبێ جیاوازی پلەی وەزیفی و مووچەیان، دەرماڵەکانیان بۆ خەرج بکرێت، چونکە بڕگەی(ج) لەخاڵی سێیەم دەیسەلمێنێت کە ئەو دەرماڵانە مافێکی دەستەبەر کراوی ژن و منداڵی فەرمانبەرانە، بۆیە بەکەمیە کەشیەوە هەرماوەتەوەو نەبڕدراوە، ئەگەر نا بۆ ئەوەی بڕیارەکە بێ کەمو کوڕی بێت، ئەو دەرماڵانەی لەبڕگەی(ج)ی خاڵی سێیەمدا دیاری کراوە کە وەکو جاران بۆیان خەرج بکرێت لاببرێت، چونکە ئەگەر ڕەوایە دەرماڵە بیانگرێتەوە، ناڕەواشە زیاد کردنەکە نەیانگرێتەوە لێی بێبەری بکرێن.

٣. دەرماڵەکەو جەژنانە...دەرچوونی بڕیارەکە، کەوتۆتە سەروبەری چەژنی رەمەزانەوە کاتەکەی وا کەوتۆتەوە بۆنی چەژنانەی لێدەکرێت. بەڕای من خاڵی نۆیەمی بڕیارەکە کە ٢٠٠٢/١١/١ی دەستنیشانکردووە بۆ جێبەجێکردنی بخرێتە٢٠٠٢/٦/١، بۆ ئەوەی فەرمانبەران بەسەریەکەوە (٦)مانگ ئەو دەرماڵانە وەربگرن و بەم هەنگاوەش دەبێتە جەژنانەیەکی زۆر باشی حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ هەموو خێزانی ئەو فەرمانبەرانەی بڕیارەکە دەیانگرێتەوە.

٤. دەرماڵەی ژن..لەبڕیارەکەدا لەبارودۆخێکی وەکو ئێستای کوردستان و لەسەر مێینەو ژنان دەنووسرێت و قسەدەکرێت بەمەبەستی داکۆکی لەمافی ژنان و بەرگری لەمافەکانیان..وەکو دەوترێت ژن نیوەی کۆمەڵەو دایکی نیوەکەی تریەتی..ئەو دەرماڵەیە نەدەبوو لە(١٠٠)دینار کەمتر بێت، چونکە لەم رۆژگارەدا نەك(٢٥)دینار، بەڵکو سەد دینارەکەش کەمترین خزمەتی پێناکرێت، بۆیە ژنان مافی خۆیانە دەنگیان بەرزبکەنەوە، رووبکەنە رەگەزی نێرینەو پیاوو پێیان بڵێن: تاکەی مافەکانمان پێشێل دەکەن و رێز لەداخوازییەکانمان ناگرن و دەمانچەوسێننەوە، ئەی ئادەمیزادی پیاو. بۆیە من داوا دەکەم دەرماڵەی ژنیش بکرێتە(١٠٠)دینار.

٥. دەرماڵەی منداڵ...لەخاڵی دووەمی بڕیارەکەدا دەرماڵەی منداڵ بەچەند بڕگەیەك دیاری کراوە کە لەمنداڵی یەکەمەوە بە(٢٥)دینار دەست پێدەکات، بەرای من(٢٥)دینارەکە دەرماڵەیەکی گونجاوەو لەجێی خۆیەتی، بەلام

داشـكاندنى بـەو شـێوەيە تـا(٥)دينـار بـەڕاى مـن گونجـاو نييـە.ئـەم جـۆرە كەمكردنەوەيە بۆ وڵاتێكە كەبتوانێت تەحديدى نەسلى تيادا بكرێت، بەڵام بۆ كۆمەڵگايـەكى وەكـو ئێمـەى كـوردەوارى لـەبار نييـە، چونكە تـاكو ئێستا لـەهيچ بوارێكى كۆمەڵايەتيدا بنەمايەك نييە بتوانرێت تەحديدى نەسلى لەسەر بكرێت، بۆيـە وا بـاش بـوو ئـەو دەرماڵەيـە لەمنـداڵى يەكەمـەوە تـا منـداڵى پێنجـەم بـە(٢٥)دينـار دابنرايـەو لەمنداڵى شەشـەمەوە بكرايەتـە(٣٠-٥٠)دينـار چونكە ئـەمڕۆ گـوزەران ئەوەنـدە قـورس بـووە، بـەو زيـاد كردنەشـەوە كـەم كـەس هەيـە بتوانێت وەكو پێويست بژێوى خۆىو خێزانى مسۆگەر بكاتو دەرەقەتى بژێوى ژيان بێت.

٦. ياساى ڕاژەى شارستانى ژمارە(٢٤)ساڵى ١٩٦٠و گۆڕينى كە حەق وايە چاوێك بـەڕاژەى شارستانىدا بخشێنرێتەوەو ئەم ياسايە لاببرێتو ياسايەكى گونجـاو لەشـوێنى دابنرێـت، كـە لەگـەڵ بـارودۆخى ئێسـتاى كوردسـتاندا بگونجێتو ڕەچاوى ئەم خاڵانەش بكرێت.

١. زيادكردنى مووچەى فەرمانبەران.
٢. زيادكردنى سەرەمووچەو بەرزەمووچە.
٣. زيادكردنى دەرماڵەى پلە(منصب)ەكان.
٤. زيادكردنى دەرماڵەكانى ترى فەرمانبەران.

لەكۆتاييـدا دەڵـێم گومـانى تێـدا نييـە هـەمووومان دەزانـين كـە دەرامـەتو دەسـەڵاتى دارايـى حكومەتەكـەمان، ئـەو دەرامەتـە بـەهێزو بـەتواناو بەردەوامـە نييە، كە بەئاسانى بتوانێت وەكو پێويسـت هەموو داواكارىو داخوازييـەكانى فەرمانبـەران هاووڵاتيـان بـۆ باشكردنى بـژێوى ژيانيـان دەسـتەبەربكرێت، بـەڵام فەرمانبـەرانى حكومەتەكـەشمان بـارى ژيانيـان ئەوەنـدە خراپـە، بەزەحمـەت دەتـوانن بـژێوى ڕۆژانـەى خۆيـانو خێزانيـان دابـين بكـەن. بۆيـە هەرهـەموويان چاويان لەهـەنگاوەكانى حكومـەتەو حكومـەتيش چەندى بـۆ دەكرێت هـەنگاوى گونجـاوى يـەك لـەدواى يـەك بنێـتو بـۆ خۆشـگوزەرانيان كـارێكى باشـەو دەبـا ئەوەندەى دەكرێت بۆيان بكرێت.

*ئەم وتارە لە ژمارە(٢٩٣٥)ى١١/١٢/٢٠٠٢ى كوردستانى نوێدا بڵاوكراوەتەوە.

# مامۆستا ڕەئووف ئـالانیو چەند بیرەوەریەك

*لەشەسـتەكاندا خوێنـدكاربووم. بەپەرۆشـەوە ڕۆژنامـەوگۆڤارە كوردیـەكانم دەخوێنـدەوە، ئەوكاتـە ئـالانی مامۆسـتابوو. بـەهۆی نووسـینەكانیەوە بـەناو دەمنناسی. حەزم دەكرد لەنزیكیشەوە بیناسم.

*لــەهاوینی ۹۷۱(كــوری زانیــاری كــورد)بــە مەبەســتی(پێكــەوەنانی كتێبخانەیەكی فۆلكلۆری كوردی) چەند لیژنەیـەكی گـەڕۆكی لەخوێنـدكارەكانی بەشی كوردی كۆلێژی ئادابی بەغداو مامۆستا شارەزاكانی زمانوئەدەبی كوردی دروستكرد بۆ پارێزگاكانی(سلێمانیو هەولێرو دهۆك).

*یەكێك لەخوێندكارەكان منو یەكێك لەمامۆستاكان ئالانی بوو.
لیژنەكانی پارێزگای سلێمانی مامۆستای هەمیشە زیندو مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ سەرپەرشتی ئەكردن.

*ڕۆژی ۱۹۷۱/٦/۲۷ بــۆ پەیوەنــدیكردن بەلیژنەكــەوە عەســرەكەی چــووم بۆ(مزگەوتی قازی). كە ئەوكاتە مامۆستا خاڵ ژووری تایبەتی خۆی لەومزگەوتە هەبوو، بۆ چاوپێكەوتنی ڕۆشنبیرانو نووسەران.
چــوومە ژوورەوە، مامۆســتا خاڵوچــەند بــەڕێزێكیتر دانیشــتبوون. دوای بـەخێرهاتن. مامۆسـتا خـاڵ ڕوویكـردە یـەكێك لەدانیشـتووەكان فـەرمووی مـەلا ڕەئوف ئەوە شێخ محەمەدە یەكترئەناسن.؟؟
ئەگەر یەك ناناسـن یـەك بناسنو هـەردووكتان لیژنـەی(شـاربازێڕو پێنجوێنو قـەرەداخن). ئـالانی هەسـتاومنیش هەسـتام لـەبردەمی مامۆسـتا خـاڵو ئـەو بەڕێزانەدا یەكترمان ناسی.
ئامۆژگاریو ڕێنمایی مامۆستا خال ئەوشتانەی بۆلیژنـەكان ئامادەكرابوو، ئـالانی وەریگـرتنو خواحافیزیمـان كـردو ڕۆیشـتین. چـووینە مـاڵی ئـالانی

لەحەوشەکەوە بانگی خێزانەکەی کرد، کە ناوی(ڕووناك)بوو، وتی ڕووناك خزمێکی خۆشەویست ومیوانێکی زۆر ئازیزم هێناوەتەوە. بۆ شێو شێوێکی دەروێشانەمان بۆ سازبکە. ئەوشەوە بەرنامەی کارو چۆنیەتی دەست بەکاربوونمان دارشت. ڕۆژی٧/١ بەرەو چوارتا بەرێکەوتین.

لەماوەی(٤٥) ڕۆژدا ناوچەکانی(شارباژێروپێنجوێن وقەرەداخ)گەڕاین. لەماوەی ئەو گەڕانەماندا دەیان قسەو وتەی بەنرخی ئالانیم لەدەفتەرێکدا تۆمار کردبوو، بەداخەوە ئەو دەفتەرەم جەندرمەکانی بەعس بەردەستیان نەکەوت، بەڵام لە(٣١/ئاب)دا لەکیسم درا. چەند یادگارییەکی نووکتە ئامێزی ئەو ماوەیەم لەیادماوەو بۆتانی ئەگێڕمەوە.)

١. ڕۆژی لە(بیورێوە)دەچووین بۆ(باسنێ) کەرێکمان بۆ هەڵگرتنی جانتاکانمان بەکرێ گرتبوو. منو ئالانی و خاوەن کەر بەپێ ئەڕۆیشتین لەپڕ ئالانی باڵی گرتمو وتی ڕاوەستن باقسەیەکی خۆشتان بۆیکەم. وتمان فەرموو. وتی ئەزانن ئێستا ئێمە لەچی ئەچین؟ وتمان لەچی؟ وتی لەسەیدخەلیلی دەلاك و دەڵێی دەچین بۆ خەتەنەکردنی منداڵان. خاوەن کەرەکە دایە قاقای پێکەنین.

٢. چەند ڕۆژێ بوو لەگوندەکانی دەوری ماوەت دەگەڕاین لەهەرماڵێکی ئەو گوندانە میوان دەبووین بە یەلکەوڕۆنی تەختە میوانداریان ئەکردین. گەرمابوو. تەواو لەوخواردنە وەرس بوو بووین. ڕۆژێ لە(کێلێوە) دەچووین بۆ(باناڵێ) مابوومان بگەینە دێیەکە، ئالانی وتی شێخ محەمەد بەرنامەیەکم بەخەیاڵدا هاتووە، بۆ دەربازبوون لەوهێلکەوڕۆنە بزانین سەرئەگرێت. وتم بابزانم. لەباناڵێ چووینە ماڵی مەلا، مەلا لەماڵ نەبوو. مەلا ژن جێی بۆ ڕاخستین و بەخێرهاتنی کردین. چووە دەرەوە، ئالانی بانگی کرد،ماموستا ژن زەحمەت نەبێ. هاتە ژوورەوە. ئالانی وتی تۆ لە ئێمەت نەپرسی(کێن و چین و بۆچی ئەگەڕێن و بۆ میوانی مەلاین؟). مەلاژن هەرکەسن میوانن و میوانیش لەسەر سەرو لەبان چاوانە. ئالانی وتی حەز ئەکەم بماناسیت. ئەم پیاوە شێخ محمدی شێخ عبدالکریمی شێخ کاکە حەمەی سۆڵەیە. منیش ڕەئوفی مەلا ئەحمەدی شاناخسێم، هەر ناوی شێخ عبدالکریمی هێنا مەلاژن پەلاماری دامو دووسێ جارشانی ماچ کردم. وتی یاخوا بەخێربێت خێرو بەرەکەتتان بۆ هێناوین. چووە دەرەوەو ناردی بەدوای مەلادا. قیرەقیری مریشك لەدەرەوە دڵمانی

خۆشکرد. نیوەڕۆ لەجیاتی یەلکەوڕۆن مریشکیان بۆ هێنایین. ئالانی بەچپە پێی وتم پیلانەکەم سەریگرت.

٣. چوویینە سوڵە.(کەریم عبداللە) کە ناسرابوو بە (کەلەی عەبەچەتوون) دانیشتوی قوشقایەی بازیان بوو. یەکێکبوو لە دەنگ خۆشە بەناوبانگەکان، ناردمانە شوێنی. بۆ ئەوەی دەنگی تۆماربکەین.(کەلە) چەندێ دەنگی خۆشبوو ئەوەندەش زۆرخۆربوو. ئەوشەوە تا سەعات(١٢)ی شەو سێجار بەئارەزووی خۆی نانی خوارد. ئالانی بە (کەلە)ی وت(خاڵەکەریم) بۆ دووشت خۆزگە بەتۆ ئەخوازم. بۆ ئەودەنگە خۆش و زوڵاڵەت کە لێی تێرنابم و بۆ ئەو خواردنەت کە ئاواتە خوازم لەهەفتەیەکدا بمتوانیایە یەك ژەم وەکو تۆنان بخۆم.

ئالانی لەو ئەرکەی پێمان سپێررا بوو، زۆر بەدڵسۆزی کاری ئەکرد. ئامادەبوو، بۆ تۆمارکردنی لاواندنەوەی مانگە دۆشێ، بەیانی زوو هەڵ ئەستا و بەخۆی و تەسجیلەکەوە بەدیاریەوە بوەستێت بۆ ئەوەی لاواندنەوەی مانگە دۆشەکە تۆمار بکات.

*لە ئاشبەتاڵی ١٩٧٥ تازە گەڕابوومەوە هات بۆلام. باوەشی پیاکردم. بەقوڵپی گریانەوە. وتی مەرگی خۆم بەئاوات ئەخواست و ئەم کارەساتەی گەلەکەمم نەبینایە. چەند خەمێکی گەورەیە. ڕەنج و ماندوویەتی ئەو هەمووساڵەمان چوو. خەریکە مێشکم ئەتەقێ. تفی لەهەموو ویژدانی مرۆڤایەتی ئەکرد. وتی سەیرکە بزانە داگیرکەران چەند دوژمنی یەکبن بۆ لەناوبردنی ئێمە چەند ڕێك ویەککگرتوون. بەداخەوە بۆ سەرکردایەتی کورد کە چارەنووسی گەلەکەمانیان دایە دەست داگیرکەران.

*ساڵی ٩٨٠ لەکۆتەوە گەڕابوومەوە سلێمانی...لە یەك نزیکبوونەوە ئێمە هەوڵمان ئەدا زۆرترین مامۆستا لە ریزەکانی رێکخستن کۆبکەینەوە، بەباشم زانی لەگەڵ ئالانیدا قسە بکەم. بەونیازەی بۆ رێکخستن(ی.م.ك) کەڵکی زۆری لێ وەرئەگرین. کەقسەم لەگەڵدا کرد، زۆر بە پەرۆشەوە مناقەشەی لەگەڵدا کردم و گلەیی لێکردم بۆ زووتر قسەم لەگەڵدا نەکردووە، داواکەمی قبوڵکرد، وتی دەمێکە تامەزرۆم کەسێکی وەك تۆ کارێکی واپیرۆزم لەگەڵدا باس بکات. ئیتر بۆ

ڕیزەکانی یەکێتی مامۆستایان کوردستان ڕێکم خست. تا ساڵی ١٩٩٠و گرتنم پەیوەندی نەپچڕابو بەدڵسۆزی کاری ئەکرد.

*ئەوەنـدەی بـەپێی نـزیکیم لەئالانیـەوە، دەردە دڵیـەکانیم دەزانـی ئاواتـەکانی خوازیاری بوو زیاتر ئەمانە بوون:

١. تێکدانی سنووری دروستکراوی کوردستان.

٢. دروستبوونی کیانێ بۆ کوردو ڕزگار بوون لەداگیر کەران.

٣. دروستبوونی زمانێکی یەکگرتووی کوردی

٤. کۆکردنـەوەی هـەموو زاراوەکـانی شـێوەکانی زمانەکـەمان لەیـەك فەرهەنگدا بۆ کەڵك وەرگرتن لەڕێنووسی کوردیدا.

زۆرجـار کـە نووسـینێك یـان ڕسـتەیەکی یـان زاراوەیـەکی ناڕێـكو ناڕەوانیدەبینیو، لە هەربڵاوکراوەیەکدا، ڕقی هەڵ ئەساو توورەئەبوو. ئەیووت کە ئەم خەڵکە بەخەمی ڕێنووسو ڕێزمانی کوردیەوە نین، ئەیوت زمانکەمان زۆر دەوڵەمەندە، ئەگەر هەلمان بۆ بڕەخسێتو زاراوەی هەمووشێوەکان کۆبکەینـەوە یەك وشەی بێگانە لەزمانەکەماندا نامێنێ...

هـەموو ئەوشتانەی لـەماوەی گەڕانمانـدا بـۆ(کـۆڕی زانیـاری کـورد) بەخـەتی ئالانی لەدەفتەرێکی(٤٠٠) سـەد لاپەڕەیـدا بەشێوەیەکی ڕێكو بەپێی بابەتـەکان نووسرانەوە، پێشکەشی مامۆستا خاڵمان کردوئەو دەفتەرەیان لـەکۆڕی زانیاریـە یان لە کتێبخانەی مامۆستا خاڵدایە.

ئالانی چیرۆکی دەنووسیی باسـی چیرۆکی(تەلیسـمی سنووری) بۆ ئـەکردمو زۆر دڵـی بـە چـیرۆکەکانی کتێبـی قۆشمـە خۆشـبوو. بـەڵام وتـی لەنووسـینی چیرۆکدا سەرکەوتوو نـەبووم. بۆیـە خۆمدایـە وەرگێـڕان زۆر مانـدووی ئـەکردم. ئەمانـەی هـەمووکردبووە کـاری لاوەکـیو ئـەوەی زۆر خـۆی پێـوە مانـدوودەکرد، زمانـەوانی بـوو. هـەموو توانـاو کـاتێکی تـەرخان کردبـوو، بـۆ سـاغکردنەوەی ڕێزمانی کـوردی ئامـادە بـوو، بەدوای وشـەیەکی ڕێزمانیـدا دەیـان شەو نخـونی بکاتو چەندین شـوێن بگـەڕێت، تاساغی بکاتـەوە. بەڕاسـتی ئـالانی پسـپۆڕێکی هەڵکەوتووی بەدەسەڵاتو بەتاقەتو وردو دڵسۆزی زمانەکەی بوو.

*دوای راپەڕینو بەربوونی ئێمە لەزیندان. هات بۆلام هەستم کرد زۆر تەندرووستی باشەو دڵخۆشەو گەشبینە. وتی هەر هاتنی ساڵی ١٩٧٥ بۆ ماڵتان هەر هاتنی ئەمڕۆ. گۆڕانێکی گەورەیە. وەرچەرخانێکی چاوەڕوان نەکراوبوو. کاك شێخ چەند خۆشە ئێستا کە بەسەر شەقامەکانی ناوشاردا دەرۆم جەندرمە لچ ئەستوورەکان رێمان پێناگرن.

بەشێکی ئاواتەکانمان هاتۆتەدی. خۆزگا نەئەمردم سنوورەکەشی تێکوپێك ئەدرا. خەمێکی هەبوو ئەویش بەهۆی نەفامیو ناهۆشیاری خەڵکەوە، کە دەس لەسامانی نەتەوەیی ناپارێزنو بەخەمیەوەنیین. دەیووت ئومێد ئەکەم زوو فریای بکەوین دەسەڵاتی ئیداریو سیاسی بەتەواوی بەسەر کوردستاندا بگرین.

زۆر شتی لەبەرنامەدا بوو. وتی ئیتر دێمەوە بۆلات قسەی تر ئەکەین. ئیتر ئەوەندەی یەکمان ئەبینی قسەی خۆیو دەردە دڵی خۆی هەڵ ئەڕشت. بەداخەوە مەرگ مۆڵەتی نەدا هەموو ئاواتەکانی ببینێت.

(٤٥) رۆژ گرانی بەردەوام بێ ماندووبوون:

ئالانی ئەوەندە پەرۆشی ئەوکارەبوو. ئامادەبوو رۆژ بخاتە سەر شەو شەوبخاتە سەر رۆژ بۆ فێرۆنەدانی کاتو حەزی نەدەکرد یەك کاتژمێر بەبێ کار بەسەربەرێت. لەرۆیشتن ماندو نە ئەبوو لەم دێوبۆ ئەودێ. ئامادەبوو بەدیار. حکایەتخوانو دەنگخۆش شمشاڵ ژەنو پیاوێکی ریش سپیو پیرە ژنێکی دنیادیدەوە شەونخوونی بکاتو بەدیاریانەوە دابنیشێت.

دێتەوە یادم. لە(مرانێ) لەئێوەرەوە تابەیانی بەدیار(عەبدولرەحمان) یکەوە نەخەوتو وەنەوزیدا بۆ تۆمارکردنی داستانی(مەموزین). لەشاناخسێ بەدیار ژنێکی پیرەوە لەبەیانیەوە تا ئێوارە دانیشت. هەر لەشاناخسێ لە(مووچەی کاولانە) بەیانی زوو بەخۆیو تەسجیلەکەیەوە بەدیار ژنێکی مانگا دۆشەوە دانیشت تامانگاکەی دۆشی. لەو(٤٥) رۆژوشەوەدا ئەم شوێنانە گەڕاین بۆ ئەو ئەرکەی خرابووە ئەستۆمان.

١. چوارتا
٢. واژە
٣. گاپیلۆن

٤. ولاخ لو
٥. قامیش
٦. دری
٧. مالومه
٨. کەناروێ
٩. ماوەت
١٠. ئاوەکورتێ
١١. شاناخسێ
١٢. مەروێ
١٣. گوێزلێ
١٤. کرگاشێ
١٥. بارێ
١٦. مڕانه
١٧. باسنێ
١٨. ڕەشەکانی
١٩. زییه
٢٠. نۆڕك
٢١. شێخ هەڵمارێن
٢٢. قزڵجه
٢٣. ساڵیاوا
٢٤. بێورێ
٢٥. پێنجوێن
٢٦. چویسه
٢٧. دارۆخان
٢٨. نزاره
٢٩. سەید سادق
٣٠. قەرەداخ
٣١. سۆڵەی دەربەند

٣٢. دێلێژە

٣٣. قازانقایە

٣٤. خاوێ

٣٥. تەنگیسەر

٣٦. جافەران

٣٧. سەوسێنان

٣٨. دۆلانی سەرو

٣٩. دۆلانی خوارو.

٤٠. ئەزمەك

زۆر گوندیتر کەبیرم نەماون لەگەڕانی ئەم گوندانەدا ئامێروناوی کارپێکردنی ئەم پیشانەمان ئەپرسی و تۆمارمان دەکردن. ئاش و ئاشەوان، دواشاو کەر، جووتوگا، جۆلاوجۆلایی، سەپان و سەپانی، بنێشتکردن، جەراحی، مێووژودۆشاوباسوق وقەزوانکردن.

# کتێبی ڕەشەبای ژەهرو ئەنفال

بەرگی یەکەمی کتێبی(ڕەشەبای ژەهروئەنفال) لەدووتوێی بەرگێکی قەشەنگی قەبارە گەورەی (ئەی فۆر) بەزنجیرەی(١١٤٥)ی بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیریو ژمارەی سپاردنی(٢٥١) کەوتە بەر دیدی خوێنەرانو کتێبخانەی کوردییەوە، ژمارەی لاپەڕەکانی(٧٦٥) لاپەڕەیە. بەتیراژی(٧٠٠) دانەیە.

کتێبەکە لەنووسینو کۆکردنەوەو ئامادەکردنی نووسەری خەمخۆری گەلەکەمان(عەبدوڵلا کەریم مەحموود)ە. بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ بڵاوکردنەوە، لەوەزارەتی ڕۆشنبیری ئەرکی لەچاپدانو بڵاوکردنەوەی گرتۆتە ئەستۆ.

بەرگی پێشەوەو پاشەوەی کتێبەکە. بەنەخشەسازیی هونەرمەندی بەتوانا سەنگەر عەبدوڵلا کەریم کراوە هەردوو دیوی بەرگەکە بەناخی مەرگەساتەکانی ڕەشە کوژی ئەنفالەکانو کیمیابارانی کوردستاندا شۆڕ بۆ تەوە، دەقاودەق گوزارشت لەو تاوانانە دەکات، کە دەرحەق بەگەلەکەمان کراوە...

نووسەر هەرچەند وەکو پێویست کتێبەکەی دابەشنەکردووە، بەڵام کە خوێنەر دەکەوێتە خوێندنەوەی بۆی دەردەکەوێت کە کتێبەکە لەسێ بەشی سەرەکیدا یەو هەر بەشەش..بەشێوەیەك کارەساتی قورسی ئەنفالەکان دەگێڕێتەوە...

بەشی یەکەمی کتێبەکە...سەرەتای دەستپێکردنێتیو بەشە کوردییەکەیەتیو لەنووسینی نووسەرە. ژمارەی لاپەڕەکانی بەشەکە(٣٥١) لاپەڕەیە. بەنووسینو وێنەو لیستەکانەوە

نووسەر لەنووسینەکەیدا، ڕێچکەشکێنی کردووە بەشێوازێکی نوێو بێ نووسینی هیچ پێشەکییەك..یەکسەر خوێنەر ڕووبەڕووی خوێندنەوەی کتێبەکە دەکات. (یەکەم لاپەڕەی بە ناونیشانی سەدام، بەعس، ئەنفال، کیمیابارانی

هەڵەبجە) دەست پێدەکات. لەم بەشەدا دەیان ناونیشانی لەم جۆرە سەرنج ڕاکێشە وێنەی مەرگەساتیو بەنووسینێکی سەرنج ڕاکێش کە گوزارشت لەوێنەکان دەکاتو لیستی ناوی ئەنفالکراوەکانو کیمیاباران کراوەکانو سەرژمێرییەکانی پاکتاوی ڕەگەزی بەرچاو دەکەوێت.

نووسەر نووسینەکەی بەزمانێکی ڕۆژنامەوانیو کوردییەکی پەتیو ڕەوانی چیرۆك ئاسا نووسیوە..لە هەربابەتێکی کتێبەکەدا چێژێکی تایبەت بەخوێنەر دەبەخشێت، خوێنەر دەخاتە بیرکردنەوە کتوپڕرادەوەستێتو بیر لەکارەدڕندەکانی ڕژێمی داگیرکەر دەکاتەوە کە چ مەرگەساتێكو چ ڕەفتارێکی دڕندانەی، لە تراژیدیای ڕۆژانی ئەنفالەکانو کیمیابارانی نیشتمانە کەمانو گەلەکەماندا نواندووە. تۆمارکردنو نووسینەوەی بەم شێوەی کارەساتەکانی گەلەکەمانو گێڕانەوەیەکی ژیرو زیرەکانە، بە بۆنەی ئەوکەسانەی کارەساتەکانیان بینیوەو تیابەشدار بوون، سەربەرزیو سەروەری ئەوکەسانە دەهێڵێتەوە، کە جوامێرانەو بێ سڵکردنەوە بەرەنگاری سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزی، ئەنفال، کیمیاباران، سووتماککردنی کوردستان نەبەردانە ڕووبەڕووی دوژمنە ڕەگەز پەرستەکان بوونەتەوە، بەسیاسەتیاندا تەقیونەتەوە.

سەر شۆڕشیش بۆ ئەوکەسانە، لەمێژوویدا تۆمار دەکات، کە نامەردانە بوونە داردەستی دووژمنو چاو ساغییان بۆ کردنو، ناجوامێرانە بەشدارییان لەتراژیدیای خاپوورکردنی شارو شارۆچکەو گوندەکانی کوردستاندا کرد.

ئەمجۆرە کتێبە..مێژووییەکی زۆرگرنگە، ئەو نەوانەی بەچاوی خۆییان مەرگەساتی گەلەکەیان نەبینیوە، بەخوێندنەوەی شارەزاوئاشنایان دەکات. بەسیاسەتە دڕندانەکانی دوژمنانی گەلەکەمان بۆیان دەردەکەوێت..کە ئەم حکومەتی ئێستای کوردستانو ئەم ئازادییەی لەکوردستاندا فەراهەمە بەرهەمی ڕەنجو خوێنی ئەوکارەساتانەیەو پاراستنو بەرگریکردن لە ئەزموونەکە، دەبێتە ئەرکی سەرشانی هەمووان بۆ ئەوەی جارێکیتر گەلەکەمانو نیشتمانەکەمان دووچاری مەرگەساتی وا نەبێتەوە.

بەشی دووەمی کتێبەکە..بەشێکی ئینگلیزییە..ئەم بەشە ئەو کتێبەیە کە نووسەر لەکاتی خۆیدا نووسیویەتیی بە ناونیشانی(چارەنووسێکی نادیار)و لەساڵی ١٩٩٣کۆمیتەی بەرگریکردن لەمافی قوربانیانی ئەنفالەکان چاپی

کردووه، خاتوو هێڤی عیزەت لەمیدیکۆ وەری گێڕاوەتە سەر زمانی ئینگلیزیو لەئیتاڵیا چاپی کردووەو ژمارەی لاپەڕەکانی(٤٠) لاپەڕەیە.؟

بەشی سێیەمی کتێبەکە. بەشی بەڵگەنامەکانە. بەڵگەنامەکانیش بوونەتە چەند بەشێك، بەشی بەڵگەنامەعەرەبیوکوردییەکانی کەلەلایەن رژێمەوە، سەبارەت بەئەنفالەکانو کیمیابارانکردنو سووتماککردنی کوردستان دەرکراوەو دەست نووسەر کەوتوون، کە لەناویاندا چەند بەڵگەنامەیەکی بەزمانی ئینگلیزی تیادایەو ژمارەی لاپەڕەی بەڵگەنامەکان ١٨٥ لاپەڕەیە...هەموو بەڵگە نامەکان دەلیلن کە ئەنفال.. بەرنامەیەکی داڕێژراوی رژێم بووە. بۆ لەناوبردنی کورد. زۆربەی بەڵگەنامەکان تائێستا بلاونەکراونەتەوە بەشێکی تر بەڵگەنامەکان ئەو بەڵگەنامانەن کە بڵاوکراوەکانی شۆڕشی نوێی گەلەکەماندا، لەکارەساتی ئەنفال لەکاتی خۆیدا بڵاوکراونەتەوە(٦٩)لاپەڕەیە. بەشێکی تری بەڵگەنامەکان نەخشەی گوندە سووتماککراوەکانە (٣٢)نەخشەیە بەپێی ناوچە ئەنفالکراوەکان. بەشێکی تری بەڵگەنامەکان بریتین لەونامانەی لەنێوان پارتیزانەکانو سەرکردایەتیو رێکخراوی شاردا، لە دوای ئەنفال نووسراون. بە جفرەی پارتیزانەکانو ئەو نووسینانەی شەهیدی (فەرماندە حەمەرەش) لەدەفتەرێکی بچووکی بەرباخەڵیدا تۆماری کردوون، ژمارەی لاپەڕەکانی ئەم بەڵگەنامە(١٢٨) لاپەڕەیە..کە هەر نامەیەك لەنامەکانو هەر لاپەڕەیەك لەلاپەڕەکانی ئەم بەڵگەنامانە..گەواهی کۆڵنەدانو نەفەس درێژیو دڵسۆزیو لەخۆبردوویی و پەرۆشی سەرکردەکانو پارتیزانەکان. دەسەلمێنن بۆ بەرپەرچدانەوەی سیاسەتی ئەنفالچییە کانو دوژمنانی گەلەکەمان، نووسەر دوا لاپەڕەی کتێبەکەی بە(دواروانین) کۆتایی هێناوەو بۆ نووسینی ئەم کتێبە نووسەرکەڵکی لە(٢٥)سەرچاوەی جیاجیا وەرگرتووە.

دەمەوێت لەکۆتاییدا ئەوەبڵێم..دەستخۆشی لەنووسەر دەکەم ئەم شارای نووسینی لەسەر ئەنفالەکان نووسیوە. ئومێد دەکەم خەرمانی کارەساتەکانی ئەنفال رۆژانە شارای تری بخرێتە سەرو چونکە ئەنفال. زامێکی ئەوەندە قوڵەو مەرگەساتێکی ئەوەندە قورسوگرانە..هەرگیزاو هەرگیز نابێت لەبیربکرێتو فەرامۆش بکرێت کیمیاباران.. رەفتارێکی ئەوەندە دڕندانە بووە کەدەرحەق بەشاروناوچەوگوندەکان کراوە دەبێت بەساڵورۆژو سات لەبیرمان نەچێتەوە

سووتماککردنی کوردستان و خاپوورکردنی پێنج هەزار گوندو شارۆچکەی کوردستان، بەسەدان ساڵیتر قەرەبوو ناکرێتەوەو داخی لەناخی خەڵکی کوردستاندا دەرناچێت

ئومێد دەکەم کە نووسەران..عەبدوڵڵا ئاسا خۆیان بۆ مێژووی پڕ کارەساتی گەلەکەیان تەرخان بکەن و دێ بەدێ و ناوچەبەناوچە بنووسرێتەوە..

هیوادارم بەرگی دووەمی کتێبەکە لەداهاتوویەکی نزیک ئامادەبکرێت و چاپبکرێت...

# کاتی ئەوە هاتووە وتاری سیاسی کوردی بەیەکگرتوویی بانگەشە بۆ مافە ڕەواکانی گەلەکەمان بکات..

گەلەکـــەمان، لەمێـــژوویی سیاسیداـــ زۆر هـــەلی ڕەخســـاوی لەکیسچـــووە.. لەکیسچـــوونی ئـــەو هەلانـــە گـــەورەترین زیـــانی بـــە بزووتنـــەوەی ڕزگـــای‌خوازی گەلەکەمان گەیاندو...

لەناوچـوونی حکومـەتی مـەلیك مـەحمودو کۆمـاری مـەهابادو کارەسـاتی شۆڕشـی ئـەیلولی حـەفتاو پێـنج.....دەبێـت ببنـە دەرس‌و هـەموو حـزب‌و لایەنەکان‌و سەرکردەکانی ئەمڕۆی حزبەکانی ناو گۆڕەپانی کوردستان، حیسابی وردی بـۆ بکـەن‌و بـۆ ئـەم بارودۆخـەی ئێسـتا هاتووەتـە پێشـەوە، لـە گۆڕانکارییەکانی عیراق‌و ناوچەکەدا بەوردی‌و زیرەکانە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، چونکە ئەمەی ئێستا هەلێکی زۆر گرنگ‌و چارەنووس سازە. بایـەخی زۆری بۆ دواڕۆژی گەلەکـەمان‌و مەسـەلەکەی هەیـە. ماوەیەکـە.. چـەند حزبێکـی کوردستانی، بەپەرۆشەوە لەهـەوڵ‌و تەقـەلای بەردەوامـدان..بۆ ڕێکخستنەوەی لایەنە ناجۆرو ناکۆکـەکانی ناو کوردستان‌و دەیانەوێت، بەوپـەڕی دڵسۆزییەوە کـار بـۆ ئـەوە بکرێـت کـە بـۆ مەسـەلەی ڕەوای گەلەکـەمان(یـەك وتـاری سیاسـی کوردی) هەبێت، بەو بەرنامـەی یـەك وتارییـەوە..مامەڵـە لەگـەڵ گۆڕانکارییـەکانی ناوخۆو دەوروبەرو جیهاندا بکرێت.

مایـەی خۆشـحاڵییەو بانگەشـەیەکی زۆر دڵخۆشـکەرو گرنگـە.. ئـەرکی نەتەوەی‌و نیشتمانی هەموو حزبە کوردستانیەکان بەهەند وەریبگرن‌و بەدەنگی هـەوڵی دڵسۆزانەی ئـەو حزبانـەوە بچن‌و پـرۆژەی ئێسـتاو دواڕۆژ بـۆ مەسـەلەی ڕەوای گەلەکەمان دابنرێت، ئەو پرۆژەیە ببێتە بنەماو بناغەی کارکردنی گشتی حزبـەکان، بـەدەر لـە بەرنامـەی تەسـکی حزبایـەتی‌و یـەك لایـەنی... ئـەمڕۆ لەکوردســتاندا بمانــەوێ‌و نەمانــەوێ بــەحوکمی ئــەم بارودۆخــەی ئێســتا لەکوردستاندا، بانگەشە بـۆ ئـازادی‌و دیمـوکراتی‌وفرە حزبـی دەکرێـت، لـەدێر

زەمانــەوە گەلەكــەمان، چــەندین شــێوەو شــێوازی خــەباتی سیاســی بــۆ دەســەبەركردنی مافــە رەواكــانی تــاقی كردۆتــەوە.. دەیــان حــزب و رێكخــراوی جۆراوجــۆرو بــە بەرنامــەی جیــاوازەوە، پەیــدابوون و رێبــازی تێكۆشــان و ململانێیەكانیان گرتۆتەبـەر، هـەر حیـزب و رێكخـراوە.. بمانـەوێ و نەمانـەوێ، ئـەمڕۆ لەكوردستاندا، لـەدوای راپەرینـەوە هەڵبـژاردنی پەرلـەمان و دروستیوونی حكومـەتی هـەرێمی كوردسـتان.. بانگەشـە بـۆ ئازادی، دیمـوكراتی، مـافی مـرۆڤ فرەحزبی دەكرێت.

بۆیە دەتوانین بەراشكاوی بڵێین....دروستبوونی ئەو هەموو حزب و لایەنانەی ئێستا دوای راپەرین، بەرنامەی هەر حزبە بۆ خزمەتكردنی گەلەكەمان و مەسەلە رەواكەیـەتی، هـەموو حـزب و لایەنـەكان دەبێت ئـەوە باش لـەپێش چاوبگرن كـە ئـەمڕۆ لەسـاو سـایەی حكومـەتی هـەرێمی كوردسـتاندا، كـار دەكـەن و پـارێزراون بۆیە نابێت ئەوە لەیاد بكەن كە یەكەم دەستكەوتی گەلەكەمان و یەكـەم بەرهـەمی خــوێنی شــەهیدان و بزوتنــەوەی رزگــاریخوازی گەلەكــەمان و، راپەرینەكــەی دروســتبوونی حكومــەتی هــەرێمی كوردســتانە..بۆیــە ئــەركی نەتــەوەیی و نیشـتمانییە لـەم بارودۆخـەی ئێسـتادا، بـە هـەموو توانایـەك هـەوڵ بـدرێت پارێزگاری لە حكومەتەكەو دەستكەوتەكانی بكرێت.

خـۆ ئەگـەر هــەوڵ و كۆششــی هەمەلایەنــەی هــەموو حـزب و لایەنــەكان و جــەماوەری دڵســۆزی گەلەكــەمان نــەبێت و، هاوكــاری نەكــەن بــۆ پاراســتنی حكومـەت...هـەرگیز حكومـەت...لەتەنگـەژەی پلانـی دوژمنایـەتیكردن دەربـاز نابێـت و ناپارێزرێـت. بۆیـە دەیڵێمـەوە ئـەركی نەتـەوەیی و نیشـتمانی ئـەمڕۆی هەموو رۆڵەیەكی ئەم كوردستانەو، هەموو حزب و لایەنە كوردستانیەكان كە وەك گلێنـەی چـاویان بـەرگری لـە حكومــەت و دەسـتكەوتەكانی بكـەن، لەلایــەك و لەلایەكیترەوە پشتگیری دڵسۆزانەی یەك و تاری سیاسی كوردی بكەن و بوێرانە هەنگاوی بۆ بنێن.

چونكە كاتی ئەوە هـاتووە كورد خـاوەنی یـەك وتـاری سیاسـی كـوردی و یـەك بەرنامەی نەتەوەی داڕێژراوبێت و، بێ سڵەمینەوە بانگەشەی بۆ بكرێت.

دەبا، لەسۆنگەی حكومەتێكی یەككگرتووی كوردیدا، هەنگاوی بوێرانە بۆ یەك وتاری سیاسی كوردی بنێین.....

# (کوردانه بۆتگریایین کوردانەش پێت پێدەکەنین)

لەو کاتەوەی(پەکەکە) وەك بزوتنەوەیەکی کوردایەتی لەکوردستانی تورکیا بانگەشەی خەباتی کردووە، لە ڕێکخستنی نهێنی ناو شارەکانەوە، بەرەو پێکهێنانی هێزی چەکداری پێشمەرگە هەنگاویان ناوە، ئۆجەلان بوە دەمڕاستی سەرکردایەتییەکەیان و، لەبیقاعەوەخۆیکردە سەرۆکی پەکەکەوسەرۆکی نەتەوەیی، بە تەلەفۆن سەرپەرشتی سەرکردایەتی سەرکردەکان وفەرماندە عەسکەریەکانی دەکرد، پلان و نەخشەی پێشمەرگانەی بە تەلەفۆن پێڕادەگەیاندن، ئەم بزوتنەوەیەوسەرۆکەکەی لەبەرئەوەی قالبوی ئەزمونی شۆڕشگێڕی نەبون، بەپێی هەلومەرجی بابەتی وخۆیەتی، قۆناغەکانی خەباتی نەتەوەیی ونیشتمانی نەڕەخسابون، بەرنامەکەیان بەدەربوو، لە شێوازی خەباتی ناوچەکە بۆدەستەبەر کردنی مافەکانی گەلی کورد، لەکوردستانی تورکیا: دروشمی قەبەوزەق وبریقەدار بەدەر لەتوانایان بەرز دەکردەوە، بێ دووربینی و حسابکردن بۆ سەرسەختی دوژمن، ئەمە لەلایەك لەلایەکی ترەوە، هێشتا نەیانتوانیبوولوتکە شاخێك، دۆڵە شیوێك لەکوردستانی تورکیا ڕزگار بکەن، لەخۆبایبوانە خەتی ڕاست وچەپیان، بەسەر هەموو لایەنە کوردستانیەکانی پارچەکانیتری کوردستاندا دەهێنا، خەباتیان ڕەتدەکردنەوە، تەنها خۆیان بەتاکە سواری مەیدانی خەباتی کوردایەتی دەزانی هەرخۆیان دادەنا کە بتوانن مافەکانی گەلی کورد بۆهەموو پارچەکانی‌کوردستان مسۆگەر بکەن. بۆیە بەرز کردنەوەی دروشمە قەبەو زەقەکانیان دوژمنەکانیان وریاکردەوە، لەبەرامبەر بزوتنەوەی کوردایەتی ورووژاندیانن، هەر ئەمە وایکرد کە نەخشەو پیلانی هەمە چەشنە دابرێژرێت بۆ پەرت کردن و، لەناوبردنی پەکەکەو دەمکوتکردنی سەرۆکەکەیان، وەلایەنە کوردستانیەکانیش، بەڕەفتاروهەڵوێست و لەبانگەشەی کوێخایانەیان ئیستێك بکەن و پەرۆشی بۆپشتگیری پەکەکە کەم بکەنەوە. تەنانەت ڕابگرن، بۆیە دوژمنانی‌گەلی کورد نەخشەو پلانیان بۆلەناوبردنی پەکەکە بە چەند هەنگاوێك داڕشت.

یەکەم: پێناسە کردنی پەکەکە بە پارتێکی تیرۆرست. لەئاستی وڵاتانی دنیاو ناوچەکەدا.

دووەم: دەرپەڕاندنی سەرکردایەتی پەکەکەو سەرۆکەکەی لە سوریاو سەهلی بیقاع.

سێیەم: بەرنامەی ڕێگرتن لەوەرگرتنی ئۆجەلان وئەندامانی سەرکردایەتی پەکەکە، بە پەنا بەر لەهەموو ئەو دەوڵەتانەی دەیانەوێت ڕووی تێبکەن.

چوارەم: جێبەجێکردنی نەخشەی دەستگیر کردن و تەسلیم کردنی ئۆجەلان بەدەسەڵاتدارانی تورکیا. نەخشەکە بەبەرنامە جێبەجێکراو، ئۆجەلان کەوتە تۆڕیی دەستگیرکردنەوە، کاتێکمان زانی ئۆجەلان بە چاو بەستراوەیی و کەلەپچە کراوی لە کەناڵەکانی تەلەفزیۆنەکانەوە نیشاندرا، بەڵێ ڕاگەیاندنێکی چاوەڕواننەکراو بوو، کارەساتێکی قورس لەناکاوی نەتەوەیبوو، تا ئەو کاتەی بە چاو بەستراوەیی و کەلەپچە کراوی لەژێر دەستی جەندرمەکانی دوژمنەکانتا ڕاکێشرابوویت و، جەندرمەکان دوژمنانە، بەسەر سەرتەوە دەستیان بەیەکدا دەداو، تەراتێنی سەرکەوتنیان بەپێکەنینەوە دەکرد، بەڵێ ئۆجەلان ئائەوکاتە هەموو کورد کوردانە بە خەمی کوردانەوە بۆتدەگریایین، زەلیلیت زەلیلی کوردی نیشان دەداین، بێ کەسی نەتەوەکەمانی دەسەلماند، بۆیە بەدڵ وبەخەمی قورسی کوردانەوە لەهەموو ماڵ و کوچەو کۆڵانێك و دوکانێکدا بۆتدەگریایین.

گەلی کورد چاوەڕوانی ئەوە بوون، پڵنگ ئاسا کەلەپچە بپسێنێت و نەفرەت لەژیان بکەیت، بەڕووی دوژمنەکانتا بتەقیتەوە، ژوورەکانی ئەشکەنجەو ئەشکەنجەدەران بهێنیتە زەلزەلەو بێتاقەتیانبکەیت، تەشقەڵە بەدادگاوداد وەران بکەیت و، لەبەرامبەر هەڵوێست و قسەکانتا بۆداکۆکی کردن لەمافی ڕەوای گەلەکەت شەرمەزاریان بکەیت، بۆیە هەموو کورد داینابوو سەربەرزانە بە شانازییەوە ڕازی نابێت لەبەرامبەر دوژمن مل کەچ بکەیت و، وازلە وتەو دروشم و بەڵێنەکانت بهێنیت، خۆت بەشانازییەوە پەتی سێدارە دەکەیتە ملت و، دەبیتە قارەمانی هەتا هەتای گەلی کوردو مرۆڤایەتی، وە یان چاوەڕوان بووین، دادگاو داد وەران وەرز بکەیت و سزای هەتا هەتاییت لەسەر دادەنرێت و، دەبیتە ماندێلای کورد، کوردانە تف لەدوژمن و سەرشۆڕی بکەیت، سەرکردایەتی پارتەکەت و پێشمەرگەکانت هاندەدەیت سوربن لەسەر خەبات و کۆڵنەدان، بەڵام

یازوخ بۆ مانەوەی ژیانت وازت. لە خوێنی ئەو هەزاران هەزار شەهیدەی لەپێناوی دروشمی بریقەدار بەشەهیدکردنتدان ئەو گیانبازانەی لەپێناوی تۆو پەکەکەو بیرو باوەڕی کوردایەتیدا، خۆیان دەسووتاندو گیانو جەستەی خۆیان دەکردە مەشخەڵان لەپێش چاونەگرت، بەداخەوە ئەو ئۆجەلانەی بەناو سەرۆکی پەکەکەو، نەتەوەیی بوویت قارەمانی بەر پەتی سێدارەو ماندیلای زیندانی نەبوویت. ئەو ئۆجەلانەی لەبیقاعەوە فەرمانت دەردەکرد بۆ چالاکی پێشمەرگانەو هەر فەرماندەو پێشمەرگەیەك سەرپێچی لە فەرمانەکانتان بکردایە بەسزای کوشتنولەناوبردن بڕیاردەدرا، خۆت سزاکەت جێبەجێدەکرد، بەڵێ بۆمانەوەی ژیانت خەباتو ڕەنجومانـدوبونی هەزاران ڕۆڵەی تێکۆشەری گەلەکەت خستە ژێر پێوەو، ئینکاریتکردلە بیقاعو ئاشبەتاڵی شۆڕشو تێکو پێکدانی پەکەکەو پەرتوکەرتکردنی پێشمەرگەکانو لێك هەڵوەشانت ڕاگەیاند، لە کۆشکی حەوانەوەوە، بڕیاردەرکردن بۆ خۆبەدەستەوە دانو، شۆڕ کردنەوەی لولەی چەکەکان، بەداخەوە کار لەوەشدا نەوەستا، تەنها ئاشبەتاڵی پارتەکەت ڕاگەیەنیت، بەڵکە بە ڕێنمایو ڕاسپاردەی مامۆستاکانی کۆشکی ئیمرالی هانی چەکدارەکانی دەداو، فەرمانیان پێ دەدا ببنە سوارەی حەمیدی پەلاماری هەرێمی کوردستانی ڕزگار کراووهێزەکانی(ی.ن.ك) بدەن، کە هەموو دونیا دەیزانێت ئەم هەرێمە ڕزگار کراوە، بەری ڕەنجی ماندووبونی خەباتی چەندین ساڵەی گەلی ڕەشو ڕووتی کوردستانە بەرهەمی خوێنی هەزاران هەزار شەهیدە، ئەنجامی سیاسەتی ڕاگواستنو سوتماککردنی کوردستانوئەنفالکردنوکیمیا بارانکردنوبەکۆمەڵ کوشتنو، لە سێدارەدانی هەزاران ڕۆڵەی بەجەرگی گەلەکەمانە، سەیرە کەسێك خۆی بەسەرۆكو سەرکردەو شۆڕشگێڕ بناسێنێتو لەداواکردنی سەربەخۆیی کوردستانو ڕزگارکردنی چوار پارچەی کوردستان. ئاڵاوا زوو تەسلیم بە ئیرادەی دوژمنەکەی ببێتو، بەڵێ ئەمە هەر لە ئۆجەلان چاوەڕواندەکرا.. بۆیە ئێستا فەرماندە عەسکەرییەکانی، چەکدارە سەر لێشێواوەکانی لە مەخمورو کەرکوکەوە پەلاماری گەرمیانو قەرەداخو هێزی پێشمەرگە دەدەن.. بۆیە کە بینیمان لە١٥/٩/٢٠٠٠دا، سەلمانتان بونەتە سوارەی حەمیدییەوئیمرالییت کردۆتەکۆشکی ئەڵقە لەگوێیوپەلاماری هێزی پێشمەرگەو حکومەتی هەرێمی کوردستاندەدیت، بۆیە چۆن کوردانە

بۆتگریـــایین هـــەرواش ئێســـتا کوردانـــە پێـــت پێدەکـــەنین و گاڵتـــە بەهەڵوێست و قسەو کتێبەکانت دەکەین، پیرۆزت بێت کۆشکی خیانەتی ئیمرالی بۆ قەیـــد کردنـــی ســـوارەی حەمیدییـــە دژی کـــوردو بزووتنـــەوەی شۆڕشـــگێڕی کوردستان و کوردستانی ئازاد بووی ئەمرۆی هەرێمی کوردستانی عێراق...

## لەبەر ڕۆشنایی کۆبونەوەی ٥/١٤ دا
## بەیەکخستنەوەی ئیداراتی هەرێم، کورد سەنگی گەورەتری دەبێت

دوای ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١و ڕزگارکردنی زۆربەی ناوچەکانی کوردستانو پاککردنەوەی لەدامو دەزگاکانی ڕژێمی دیکتاتۆری، بارودۆخێکی نوێی بۆ گەلەکەمان هێنایە پێشەوە. هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستانو دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان خەونێکی دێرینی گەلەکەمان بوو، گۆڕانێکی بنەڕەتی بوو لەبزوتنەوەی کوردایەتیو مێژووی گەلی کورددا. پەرلەمانو حکومەتی هەرێمی کوردستان لەناو چاوی دۆستو دوژمندا دەسەلاتی بەڕێوەبردنی خەڵکی کوردستانی گرتە ئەستۆ، دەسەلاتەکە بەشێوەیەك بوو دوژمنەکانمانی قارسونیگەران کردو دۆستەکانمانی دڵخۆشو شاد کرد، بۆیە دوژمنەکانمان خۆیان بۆ پیلانگێڕان کۆکردەوەو دەیان نەخشەی جۆراوجۆریان بۆ تێکدانی پەرلەمانو حکومەتی هەرێم داڕشت. بەداخەوە لەژێر کاریگەری پیلانەکانی دوژمنانی گەلەکەماندا خەڵکی کوردستان ڕووبەڕووی شەڕێکی خۆکوژو ناهەموار بۆوە، ئەو شەڕە جگە لەوەی هەوڵەکانی پەرلەمانو حکومەتی هەرێمی کوردستانی تاڕادەیەك پەکخستو ڕاوەستان، خواستو ئاواتی جەماوەری گەلەکەشمانی بەنائومێدی گەیاندو مەرگەساتی شەڕی خۆکوژی کەلێنێکی گەورەی خستە ناو ڕیزەکانی حزبو لایەنە کوردستانییەکانەوە. شوێنەواری ئەو مەرگەساتە بووە هۆی دابەشبونی حکومەتی هەرێمی کوردستانو ڕاوەستانی پەرلەمانی کوردستان..

دوای هەوڵێکی زۆرو بەردەوامی دۆستەکانی گەلی کورد لەدەرەوەی وڵاتو تەقەلای دڵسۆزانەی لەناوەوەی وڵات، هەوری ڕەشی شەڕو نەهامەتی ڕەوییەوەو سامالی ئاشتیو ئاشتبوونەوەو ئارامی باڵی بەسەر کوردستاندا کێشا. لەژێر سێبەری ئاشتیدا سەرتاسەری کوردستان لەهەموو ڕوویەکەوە بوژایەوە. گۆڕانی بەرچاو بەسەر کۆمەلانی خەڵکی کوردستاندا هاتو کەڵکی زۆرباش لەبڕیاری

٩٨٦ی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیەکگرتووەکانی نەوت بەرامبەر بەخۆراك وەرگیرا. بۆ خزمەتگوزاری و ئاوەدانکردنەوەی هەموو گوندو شارو شارۆچکەیەکی کوردستان. خزمەتگوزاریەکە بەشێوەیەکە هەموو شاروشارۆچکەکان سیمای ئاوەدانکردنەوە پێشکەوتنی پێوەدیارە.

هەر بەهەوڵی دڵسۆزان لەئەنجامی کۆبوونەوە بەردەوامەکانی سەرکردایەتی (ی.ن.ك و پ.د.ك) هەنگاوی زۆر باش نراوە بۆ ئاسایی کردنەوەو بەرەوەپێشچوونی پرۆسەی ئاشتی، یەکێك لەو هەنگاوە گرنگ و پیرۆزانە یەکخستنەوەی پەرلەمانی کوردستان و دەست بەکاربوونەوەی بوو. بەگەڕخستنەوەی پەرلەمان رۆڵی کاریگەری هەبوو بۆ ئەم بارودۆخەی ئێستای کوردستان. ئەم یەکریزی و یەکگرتنەی ئەمڕۆ لەپەرلەماندا بەدی دەکرێت، کاریگەری بەرچاوی لەڕەوتی نیشتمانی و نەتەوەیی میللەتەکەماندا دەبێت، بڕیارەکانی پەرلەمان دڵخۆشکەرن و بەبڕیاری خەڵکی کوردستان دادەنرێن، بە گەڕخستنەوەی پەرلەمان گرنگیەکەی لەوەدا بوو، پێش پرۆسەی ئازادی عێراق بوو، زۆر گرنگ و مێژوویی دەبوو، ئەگەر هەردوو ئیدارەی حکومەتی هەرێمی کوردستانیش، لەگەڵ پەرلەماندا یەکبخرانایەتەوەو کێشەی دوو حکومەتی کۆتایی پێ بهاتایە. بەهەر حاڵ لەبەر هەر هۆیەك بێت ئەو ئاواتانەی خەڵکی کوردستان لەکاتی خۆیدا نەهێنرایەجێ..!

ئەو کێشەو گرفت و ناکۆکیانەی لەناو ریزەکانی گەلەکەماندا هەیەو چارەسەرنەکراوە با ئەمڕۆ چارەسەری بکەین، هەر لەم روانگەیەوە ئەوەی ئەمڕۆ بۆمان دەکرێت بانەخرێتە بەیانی و هی بەیانی نەخرێتە دووبەیانی.

لەکۆبوونەوەی رۆژی١٤/٥/٢٠٠٣ی هەردوو مەکتەبی سیاسی (ی.ن.ك)و(پ.د.ك)دا بەشێك لەبەرنامەی کۆبوونەوەکەیان تایبەت بوو بەیەکخستنەوەو یەکگرتنەوەی حکومەتی هەرێمی کوردستان، کە ئەویش بەیەکخستنەوەی هەردوو ئیدارەی هەولێرو سلێمانی بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان و، یەکهەڵوێستی گەلی کوردستان بەرانبەر بەئایندەی حکومەتی مەرکەزی عێراق. ئەم بڕیارە بڕیارێکی زۆر زۆر گرنگ و پڕبایەخە بۆ چارەنووسی گەلەکەمان، وەکو لەپێشەوە وتمان دەبوو ئەم بڕیارەو ئەم هەنگاوە زۆر پێشتر لەپرۆسەی ئازادکردنی عێراق و یان لەگەل

بەگەڕخستنەوەی پەرلەماندا بوایە. ئێستاش ئەم بڕیارە پەرۆشیو کاری بەپەلەی دەوێ، نەکرێتە بەرنامەی کۆبوونەوەکانی هەردوولاو هەمووجار باس بکرێتو بهێڵرێتەوە بۆ کۆبوونەوەیەکیتر، وەکو مەسەلەی گەڕانەوەی ئاوارەکانو زۆر مەسەلەو کێشەی تری لێنەکرێتو بەنیوەناچڵی کاری بۆ بکرێت، بەڵکە لەم بارودۆخەی ئێستادا ئەوە دەخوازرێت هەردوای ٥/١٤و بەبێ ئەوەی بهێڵرێتەوە بۆ کۆبوونەوەیەکیتر، یەکسەر دەست بەکاری یەکخستنەوەی هەردوو ئیدارەکە بکرێتو، لەگەڵ یەکخستنەوەی هەردوو ئیدارەکەدا پرۆژەیەکی گونجاوی حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ ئیدارەی هەرێمی کوردستان دابڕێژرێتو پێشکەشی پەرلەمانی کوردستان بکرێتو، ئەوانیش بڕیاری لەسەربدەنو ئەو پرۆژەیە پێشکەشی هاوپەیمانانو ئەو لایەنانە بکرێت کە خەریکی دامەزراندنی حکومەتی مەرکەزی عێراقن. سەرجەمی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان چاوەڕوانن ئەو ئاواتەیان بێتەدیو هەردوو حکومەتەکە یەکبخرێنەوەو، کورد شوێنو سەنگی خۆی هەبێت لە گۆڕانکاریەکانی عێراقداو، مافە ڕەواکانی باشتر بەرجەستەبکرێتو ڕەنجو قوربانی ساڵەهای ساڵمان بەرهەمی باشی بۆ گەلەکەمانو نیشتمانەکەمان هەبێت.

کوردستانی نوێ ژمارە/٣٠٦٩ ١٦/٥/٢٠٠٣

# با شارێی سەلماندنی مافەکانمان بگرینە بەر

لــە ژمــارە(٣٢٦٤) ی رۆژی ٢٠٠٤/١/٧ ی رۆژنامــەی کوردســتانی نوێــدا کاك(نەوشیروان مستەفا) وتارێکی گرنگی لە ژێر ناونیشانی(کوردو قانونی بەڕێوەبردنی دەوڵــەتی عــیراق لــە مــاوەی گواســتنەوەدا) بڵاوکــردەوە.. لــە ٢٠٠٣/٤/٩ وە تا ئێستا وتاری وا لەلایەن هیچ سەرکردەیەکی سیاسی کوردەوە نەنووسراوەو بڵاونەکراوەتەوە. وتارەکە هەڵدەگرێت بڕگە بڕگەو رستە رستەو خاڵ بە خاڵ ورد بکرێتەوەو، لەسەری بنووسرێت و شی بکرێتەوە..لەبەر بەهێزی وتارەکەو لەبەر بیرو بۆچوونەکانی ناوەرۆکی وتارەکە، بە پێویستم زانی کە لەگەڵ بۆچوون و راسپاردەکانی کاك نەوشیرواندا، تیشك بخەمە سەر هەندێ لە راو بۆچــوونەکانی، بەمەبەســتی ئــەوەی ئــەم وتــارە بکرێتــە بەرنامــەی کــاری ئێستامان و، بە چڕوپڕی کاری لەسەر بکەین.. لە روانگەی ئەم وتارەوە، ئەمڕۆ کــورد لــە هــەموو رۆژێکــی پــێش ئێســتا زیــاتر پێویســتی بــە یــەك دەنگــی، یــەکگرتوویی، یــەك بەرنامــەو یــەك پــرۆژەی نەتــەوەیی چــڕوپڕی هەمــە لایــەنەی کوردانەیە.

بارودۆخەکە دەخوازێت نابێت بێخەمو پشتێنکراوە دانیشین و چاوەڕوانی ئەمریکاو هاوپەیمانان و مەجلسی حوکم بین.. بەڵکو دەبێت بوێرانە هەموو توانا و هێزێکی سیاسی، جەماوەری، دبلۆماسی، پێشمەرگایەتی بخەینەگەڕ، بە رێگای رێپێوان و خۆپیشاندانی جەماوەری، راپرس و کۆکردنەوەی ئیمزای سەرجەم کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان، نووسینی یاداشتی داخوازییەکانی خەڵکی کوردستان، مانگرتن و گوشار خستنە سەر هێزە ئەمریکی و هاوپەیمانەکان و هێزە سیاسییە عیراقیەکان، پەلە لە دانانی بەرنامەی کارەکانماندا بکەین، کەمتەرخەمی نەکەین و کاری ئەمڕۆمان نەخەینە سبەینێ، راسپاردەی کاك نەوشیروان لە وتارەکەیدا کە دەڵێت(کاتی گوڵبارانی کاربەدەستانی ئەمریکی و(موجامەلە)ی هێزە سیاسییەکانی عیراق بەسەرچوو، کاتی پێ داگرتنە لەسەر چەسپاندنی مافە نەتەوەییەکانی کورد).

لە رووخانی رژێمەوە هەموو حزبە سیاسییەکانی کوردستان بەشانو باڵی هاوپەیمانانو ئەمریکادا هەڵئەدەن، هەر کەسو وەفدێکیان هاتبێتە کوردستان بە گوڵباران پێشوازیو بەڕێ کراون.. نزیکبوونەوەی لەڕادەبەدەر لەگەڵ لایەنە سیاسییەکانی عیراقدا کراوە، زیاد لە توانا و هێزی جەماوەریو عەسکەرییان رێزیان لێگیراوە.

تا ئێستا سەربازێك یان کاربەدەستێکی ئەمریکیو هاوپەیمانان لە کوردستاندا لە لایەن کوردەوە خوێن لە پەنجەیەکیان نەهاتووە، بە ڵکو بە ئارەزووی خۆیان لەمسەرتاسەری کوردستان تەراتێنیان کردووەو سووڕاونەتەوە.. شوێنەکانی هێزی پێشمەرگەو گەنجینەکانی چەكو تەقەمەنیو باشترین شوێنی عەسکەریو حەوانەوەیان پێشکەش کراوە.. لایەنە سیاسییەکانی عیراق، لەو کاتەوەی مەجلیسی حوکم دامەزراوە، رۆژانە لە هاتوچۆی کوردستانداندو خوانیان بۆ دەڕازێتەوەو خزمەت دەکرێن، ئەو حزبانەی لە بەغدای پایتەخت بارەگایان داناوە، رۆژانە هەر حزبە بە سیاسەتی حزبی خۆی موجامەلەی لایەنە سیاسیە عیراقییەکان دەکەن، کورد بەشداری مەجلیسی حوکمو وەزارەتی عیراقی کرد، پێش رووخانی رژێمو تەنانەت دوای رووخانیشی حزبو لایەنە سیاسییەکان لە کۆنگرەکانی بەرهەڵستکارانی عیراقدا، لە کوردستانو لە دەرەوەی وڵاتو خوارووی عیراق، کە باسی مەسەلەی مافەکانی گەلی کورد دەکرا دەستیان بۆ دەمیان نەدەبردو پاڵپشتیان دەکرد، پرۆژەی فیدرالییەت هیچ لایەنێك بەرگری نەدەکرد، بەڵام دوای ئەوەی لە مەجلیسی حوکمو وەزارەتەکانی عیراقدا خۆیان بینییەوەو هەندێ لە وڵاتانی دەوروبەرو دنیا پشتگیریان نیشاندا.. کەوتنە کاری دیزە بەدەرخۆنەی مەسەلەی کوردو ئەو هەموو رێزو حورمەتەی لە کوردستاندا لێیان گیرا لە بیریان چۆوە، راستەوراست گەڕانەوە بۆ نەرێتەکەی خۆیان بەو واتایەی کە عەرەب دەڵێت (عادت الحلیمە الی عادتە القدیمە) وەیان کورد وتەنی گەڕانەوە سەر دارو باینجانی خۆیان، فیدرالییەتیان لا بووە مەتەڵو ئاڵای کوردستانو حکومەتی هەرێمی کوردستانو پەرلەمانی کوردستانیان لێبووە دێوەزمەو سواری عەقڵو سەریان بوو، لە کاتێکدا لە بەغداو شارەکانی ناوەڕاستی عیراقو خوارووی عیراق لە بەردەمی شاڵاوی کۆنە بەعسیو گروپە تیرۆریستەکاندان، سەیر ئەوەیە

بەم حاڵەشیانەوە دژی کوردو مافە ڕەواکانی ڕادەوەستن.. کە باسی فیدرالی دەکرێت، چەندین پرسیار قوتدەبنەوە لە جۆرو شێوەی فیدرالییەتەکەو وەکو هەر هەموویان زۆر بێ ئاگابن لە فیدرالییەتی وڵاتانی دنیاو خۆیان گێل دەکەن هەروەکو کاك نەوشیروان دەڵێت(بۆتە مەتەڵو بۆیان هەڵنایەت).

ئەمریکییەکانو هاوپەیمانان لە کەرکووكو دوزو حەویجەو مەندەلیو جەلەولاو دیالە، لە لایەن پاشماوەکانی بەعسو تیرۆریستانەوە ڕۆژانە پەلامار دەدرێنو حەوانەوەیان لێتێك دەدەن، لە جیاتی ئەوەی بگەڕێن بە دوای ئەو کەسانەو ئەوانەی هاوکارییان دەکاتو بیان گرنو سەرکوتیان بکەن.. شەڕ بە کوردو هێزە سیاسییەکانی کورد دەفرۆشن.. پەلاماری بنکەو بارەگاکانی حزبەکانو ڕێکخراوەکان دەدەن، چەکیان دەکەنو دەیان پشکنن.. ڕۆژێ لە سەر هەڵکردنی ئاڵای کوردستان فشار دەخەنە سەر خەڵکی شارەکانو ڕۆژێ لەسەر ئەوەی کە پاشماوەکانی بەعس تەقە لە بارەگاکانیان دەکەن گوشار دەخەنە سەر حزبەکانو بیانوویان پێدەگرن، ڕۆژێ لەسەر داوای کۆنە بەعسیو عەرەبە شۆفێنیەکان کوردی حەویجەو ئاوارە گەڕاوەکانی کەرکووك دەردەکەن، ڕۆژێ لەسەر قسەی پارێزگاری دیالە شەڕ بە کوردی مەندەلیو جەلەولاو خانەقینو شارەبانو سەعدیە دەفرۆشن..

ڕۆژێ نوێنەری هاوپەیمانان لە بەردەمی سەرکردایەتی سیاسی کورد بێ پەردە باسی ئیدارەی پارێزگاکان دەدرکێنێ، تازەبەتازەو دوای ئەو هەموو قوربانیو ڕەنجو ماندوو بوونە کوردستان دەگێڕنەوە بۆ سەردەمی حوکمی مەلەکی، بەبێ ئەوەی ڕەچاوی مافە نەتەوەییو سیاسییەکانی کورد بکرێت، دیارە هەر لەبەر ئەم هۆیانە کە کاك نەوشیروان دەڵێت(کاتی گوڵباران بەسەر چوو کاتی پێ داگرتنە لەسەر چەسپاندنی مافە نەتەوەییەکانی کورد). ئەم قسەیەی کاك نەوشیروان ئەوە دەگەیێنێت کە زۆر بەباشی نیازی مەجلیسی حوکمو ئەمریکییەکانی بە وردی خوێندۆتەوە، بۆیە ڕاشکاوانە دەڵێت(کاتی گوڵباران بەسەرچوو). واتە دەبێت کورد لە ئێستا بەدواوە هەڵوێست وەربگرێت، هەروەکو دەڵێت لە(هاژەو هوژەی هەندێ دەوڵەتانی دراوسێ مەترسی ئەوتۆی نییە تەرازووی هێزی سیاسی لە عیراقدا بە قازانجی کوردە) ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە کورد نەترسێ لەسەر مافە نەتەوەییەکانی بە ئارەزووی خۆی پێداگرێتو

سڵ لە هیچ نەکاتەوە.. بە پێی ئەم راسپاردەیەی کاک نەوشیروان، دەبێت کورد لەمڕۆ بەدواوە نابێت تەنها داوای فیدرالی بکات بەڵکو دەبێت داوای سەربەخۆیی و دەوڵەتی کوردی بکات.. لە بەر ئەوەی کوردیش میللەتەو خاکی نیشتمانی دیاریکراوو خاوەنی کلتوری خۆیەتی و خاوەن زمانو فەرهەنگی خۆیەتی، خاوەنی ئاڵای کوردستانە، ژمارەی کورد لە کوردستانو عیراق لە(٦) شەش ملیۆن زیاترە، سامانی سروشتی وەکو نەوتو جۆرەها کانزای هەیەو وڵاتێکە بەرهەمی کشتوکاڵی و پیشەسازیو گەشتو گوزاری زیاد لەخۆی هەیە..

کاتێ کاک نەوشیروان دەڵێت(ڕێگەی تر بگرینەبەر لە جۆری مقاوەمەتی سلبی عصیانی مەدەنی و بەم ڕێگایە سوڵتەی ئیئتیلافو مەجلیسی حوکم تێبگەیەنرێن) کە کورد مافی چارەنووسی دەوێت، بە بڕیارو دەستووری سەرپێیی و کاڵو کرچ بۆ خەڵکی کوردستان رازی نابێت.. کورد مافی خۆیەتی وەکو میللەتێ لەم رۆژهەڵاتی ناوەڕاستەدا دەوڵەتی سەربەخۆی هەبێت، سنووری جوگرافی وڵاتەکەی جیابکرێتەوە، ئاڵای کوردستان بە جیاو بەبێ بەرزکردنەوەی ئاڵای تر هەڵباکات. ئەو شارو شارۆچکانەی کە تا ئێستا نەخراونەتە سەر کوردستان بخرێنەوە سەر کوردستان، سامانی وڵاتەکەی خۆی خاوەنی بێت، سوپاو هێزی پۆلیسی پارێزگاری خۆی هەبێت، سنووری وڵاتەکەی لەلایەن وڵاتانی دەورو بەرەوە پارێزراو بێت وەکو هەموو وڵاتەکانی ناوچەکە.

کاک نەوشیروان کە دەڵێت(مقاوەمەی سلبی و عصیان هەبێ) بەوەی هەر کاتێ پێویستی کردو کار گەیشتە ئەوەی زیان بە مافە نەتەوەییەکانمان دەگەیەنرێ(گروپی کوردی لە مەجلیسی حوکمو وەزیرەکان لە وەزارەتەکان رابگیرێت تا ئەوەی لێی دەربچنو لێی بکشێنەوەو لە گەڵ سوڵتەی ئیئتیلافو وەزارەتی ئیئتیلاف نابنو لە پرۆسەی گوێزانەوەی دەسەلاتدا لە سوڵتەی ئیئتیلافەوە بۆ حوکمی عیراق بەشداری نەکات). ئەم راسپاردەیەی کاک نەوشیروان ئەوەندە بەهێزو وردەکارانەیە هەر کوردێ رۆژێ ئەلف وبێی سیاسەت فێربووبێ، قسەکە بەهەند وەردەگرێتو لای خۆیەوە بە پەرۆشەوە کاری بۆ دەکات.. زۆر راستە مەجلیسی حوکمو سوڵتەیەکی ئیئتیلاف بە کلتوری بەعسیانە مامەڵە لەگەڵ کوردو مافەکانیدا بکەن، ئیتر چی پێویست دەکات

گروپی کوردی تیا دانیشێتو له وەزارەتەکەیدا کار بکات، سوڵتەیەکی ئیئتیلاف گوێ بۆ داخوازییەکانی کورد نەگرێتو، به پێچەوانەوه به داخوازییەکانمان قارس بێت ئیتر کورد بۆ بەشداری له پرۆسەی هەڵبژاردن، گواستنەوەی دەسەڵات له سوڵتەی ئیئتیلافەوه بۆ حکومەتی عیراق بکات، که هیچ بەرژەوەندییەکی کوردو خەڵکی کوردستانی تیادا نەبێت، کاتێ کاك نەوشیروان له شوێنێکی تری نووسینەکەیدا دەڵێت(کورد خۆیان ئازادن له هەڵبژاردنی جۆری بەرێوەبردنی ناوچەکەیاندا)، مەبەست ئەوەیە.. کورد مافی خۆیەتی داوای مافی چارەنووسو دەوڵەتی کوردی بکات.. ئەو گروپی کوردییەی که له مەجلیسی حومکدان بکێشنەوەو گروپەکەیان فراوان بکەن به نوێنەری حزبەکانو خەڵکی تری نیشتمانپەروەر، هەردوو حکومەتی هەرێم یەکبخەنەوه حکومەتێکی یەکگرتووی کوردی پێکبهێننو پەرلەمانی کوردستان بکەوێتە کاری جیدیو بڕیاری گونجاو سەبارەت به جۆری حکومەتی هەرێمو ئالای کوردستان دەربکەن، راپرسییەکی فراوان له هەموو کوردستانو ناو شارەکانی عیراقدا بکرێتو، ئیمزایان لێوەربگیرێت، یاداشتی چڕوپڕی مافه نەتەوەییەکان پێشکەشی هاوپەیمانانو مەجلیسی حوکمو ئەنجومەنی نەتەوه یەکگرتووەکانو وڵاتانی ئەوروپاو جامعەی عەرەبی بکرێت.. هەموو کوردەکانی بەغداو شارەکانی خواروو و ناوەڕاستی عیراق کۆبکرێنەوەو، به ڕێپێوانێ بچنه بەردەم مەجلیسی حوکمو بارەگاکانی ئەمریکاو هاوپەیمانان داوای مافه نەتەوەییەکانی کورد بکرێت.

کاك نەوشیروان که دەڵێت(گەلی کوردو هەموو هێزه سیاسییەکانی خۆیان ئامادە بکەن بۆ بەرگرتنی هەموو جۆره گێروگرفتێکی ئابووری، بازرگانی، دارایی و هەموو جۆره کێشەیەکی سیاسی که تووشی ناوچەکەیان ئەبێ). ئەم راسپاردەیەی کاك نەوشیروان ئەوه دەگەیەنێت که مافه نەتەوەییەکانی گەلەکەمان کەوتۆته مەترسییەوه پێی دەچێت ئەمریکاو هاوپەیمانانو هێزه سیاسییەکانی عیراق له بەڵێنو پەیمانەکانیان پاشگەز بووبنەوەو، دەیانەوێت وا له کورد بکەن ئاواتو خواستەکانی زینده بەچاڵ بکەن، بۆیه به ڕاشکاوی راسپاردە دەکات که خۆمان کۆبکەینەوەو ئامادە باش بین بۆ هەموو جۆره کێشەیەکی سیاسی که ڕووبەڕووی ناوچەکەمان دەبێتەوەو، خۆمان بۆ

تەنگەشەی ئابووری‌و دارایی‌و بازرگانی ئامادە بکەین‌و، بە شێوەیەك کە لەم بارودۆخە رەخساوەی ئەمڕۆی عێراق‌و ناوچەکەدا مافە نەتەوەییەکانمان لە کیس نەدرێت‌و ئارامی‌و ئاسوودەیی بۆ نەوەکانی داهاتوو مسۆگەر بکەین‌و، سەرکردایەتی سیاسی کورد نابێ هیچ بڕوبیانوویەك بۆ دواخستنی مافەکانی قبوڵ بکات‌و، بەڵکو ئەبێ سوور بێ لەسەر چەسپاندنیان‌و هەموو رێگایەك بگیرێتە بەر، رێگا نەدرێت نە ئەمریکا‌و نەهاوپەیمانان نە مەجلیسی حوکم بە ئارەزووی خۆیان یاری بە چارەنووسی کورد بکەن‌و، بە بڕیاری نادروست‌و ناتەواو رازی نەبێت هەر گروپ‌و لایەنێك دژمان وەستا ئێمەش دژی رابوەستین..

کاك نەوشیروان کاتێ ئەمە رادەگەیەنێت دڵنیام بەرچاوی تەواو ڕوونەو ئاگاداری نهێنییەکانە بۆیە دەڵێت(کە ئاسۆی کوردستان ڕووناکەو رەوتی گۆڕان لە عێراق‌و ناوچەکەدا بە قازانجی کوردە).

لە کۆتاییدا داوای لێبوردن لە کاك نەوشیروان دەکەم ئەگەر لە لێکدانەوەی راو بۆچوونەکانی تێپەرم کردبێ یان زیاد لە پێویست پێم داگرتبێ‌و، وەکو لە پێشەوە وتم کە بەلای منەوە ئەم وتارە ئەوە هەڵدەگرێت ڕستە ڕستەو بڕگە بڕگە ورد بکرێتەوەو لەسەری بنووسرێت‌و هەمەلایەنە شی بکرێتەوەو، بکرێتە بەرنامەیەکی داڕێژراوو کاری لەسەر بکرێت‌و هەنگاوی کوردانەی لەسەر هەڵبگرێت، زۆر جێی خۆی دەبوو ئەگەر من لە یەکەم دێڕی نووسینەکەوە دەستم بە شی کردنەوەی وتارەکە بکردایەو بە چەند ئەڵقەیەك بڵاوم بکردایەتەوە، بەڵام لەبەر گرنگی وتارەکە وازم لە سەرەتای وتارەکە هێناوە.. رێنماییەکی گرنگە کە دەڵێت(شاڕێی سەلماندنی مافەکانمان بگرینە بەرو واز لە موجامەلەو پێشوازی کردن بهێنین) کاری جیدی بۆ ئێستاو پاشە ڕۆژی گەلەکەمان بکەین‌و کارێکی وا بکەین نەوەکانی داهاتوومان بە ئارامی‌و ئاسوودەیی بژین‌و دووچاری چەوساندنەوەو سەرکوتکردن نەبنەوە).

کاك نەوشیروان کە دەڵێت(ئەگەر ئەم هەلە لەم قۆناغەی ژیانی سیاسی عێراقدا لە دەس بداو، هەڵی بگرێ بۆ کۆتایی ساڵی(٢٠٠٥) کێ ئەڵێ ئەوسا هەل‌ومەرجی عێراق بە جۆرێ ناگۆڕێ دەوری کوردی تێدا بچووك بێتەوە) ئەم بۆچوونەی کاك نەوشیروان زۆر گرنگەو دەبێ هەموو لایەنە سیاسییەکان‌و کورد بەگشتی ئەم هەلە رەخساوە لە دەست خۆی نەداو لەم بارو دۆخەی ئێستای

عیراقدا کە وەکو کاك نەوشیروان دەڵێ(عیراق وەکو دەوڵەت وەکو حکومەت وەکو دەسەڵاتی سیاسی و جەنگی و پۆلیسی و دامو دەزگای بەڕێوەبەرایەتی هەرەسی هێنا، کورد لە هەڕەشەیەکی گەورەو راستەقینە کە دەوڵەتی کۆنی عیراق بوو رزگاری بوو).

ئەمە بەو واتایە کە دەسەڵاتی، حکومەتی، دەوڵەتی، ئەمڕۆ لە عیراقدا نەماوە کورد لێی بترسێ و، تا لەم سەردەمی گۆڕانکارییەدا مافەکانمان دەستەبەر نەکەین، دوای دروستبوونەوەی دەسەڵات و حکومەت و دەوڵەتی عیراق زۆر بەگران بۆمان دەسەبەر دەکرێت، وەکو کاك نەوشیروان دەڵێت(ئەگەر دوا بخرێت بۆ ساڵی(٢٠٠٥) کێ دەڵێت گۆڕانکارییەکانی ناوچەکەو عیراق و دنیا لە بەرژەوەندی کورد دەبێت) بۆیە پێویستە کە هەر لەمڕۆدا وەکو کاك نەوشیروان دەڵێت(بۆ ئەوەی نەوەکانی داهاتوو لە جیاوازی رەگەزی بپارێزێ و پاشەڕۆژێکی ئارام و ئاسوودەیان بۆ دابین بکات ئەبێ یەکەم پارێزگاری قەوارەی فیدرالی هەرێمی کوردستان بکا و هەوڵ بدا دەسەڵات و سامان لە نێوانی حکومەتی هەرێم و حکومەتی ناوەندا بە جۆرێکی عادلانە دابەش بکاو سنووری جوگرافی ناوچەکەی دیاری بکا) ئەمە نەکرێت ئەی چاوەڕوانی کەی و چی بکەین؟ وەکو کاك نەوشیروان دەڵێ (دەبێ لە پارلەمانی ناوەندو لە کابینەی حکومەتی ناوەند لە بودجەی ناوەندی عیراق بەشی کورد بە روونی و بە ئاشکراو بەبڕیارو بە شێوەیەکی عادلانەو بەپێی داواو داخوازییەکانی خەڵکی کوردستانەوە دابنرێن، بەکورتی و بەکوردی ئەرکی گەورەمان لە ئەستۆدایەو پێداگرتن و هەڵوێست وەرگرتن و خۆسازدانی باشی دەوێت لە هەموو روویەکەوە).

## چاوپێکەوتن بۆ گۆڤاری سروە

**پ١/جەنابی شێخ محەمەد تکایە لە پێش دابڕێك لە رابووردووو پێشینەی خۆتمان بۆ بدوێ.**

وەلام/ساڵی ١٩٤٦ لە گوندی سۆڵەی دەربەندی ناوچەی قەرەداخ لە بناری شاخی داریکەلی و قەڵای(بەخشی)چاومکردۆتەوە. لەبنەماڵەیەکی ئایینیم. شێخ عەبدولکەریمی باوکم شێخی تەریقەتی قادری بووە. لە حوجرەوە دەستم بە خوێندن کردووە، قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی ئامادەییم لە سلێمانی و، کۆلێژی ئادابم لە زانکۆی بەغدا تەواو کردووە.

له (١٩٥٨)ەوە تێکەڵاوی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلەکەم بووم، لە شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٧٤ پێشمەرگە بووم.

دوای نسکۆ لە ساڵی١٩٧٥دا بە مامۆستای زمانی کوردی رەوانەی قەزای حەی لە پارێزگای واسط(کوت) کراوم و ساڵی ١٩٨٠گەڕاومەتەوە سلێمانی.

*له١٩٦٣ لە لایەن ئەمنی سلێمانییەوە فەرمانی گرتنم دەرچووە، بەردەست نەکەوتووم ساڵی١٩٧٤ کاتێ پێشمەرگە بووم-لەگەڵ شەهید(لەیلا قاسم)و هاوڕێکانیدا بە غایبی حوکمی ئیعدام دراوم.

*لە١٩٧٦ەوە لەڕیزەکانی(ی.ن.ك)دا کار دەکەمو لەساڵی١٩٩٠، لەلایەن ئەمنی سلێمانیەوە گیرام.. لە مەحکەمەی سەورە بەحوکمی ئەبەدی حوکم درام. دوای راپەڕین بە لێبوردنی گشتیو گۆڕینەوە ئازاد کرام.

*(٢٣)ساڵ مامۆستاییم کردووەو ئێستا بەڕێوەبەری گشتیی چاپ‌وبڵاوکردنەوەم لە وەزارەتی رۆشنبیری.

*لە مێردمنداڵیمەوە، خولیای خوێندنەوەو نووسینی شیعرو بابەتی ئەدەبی بووم-..بەرهەمو نووسینەکانم لە گۆڤارو رۆژنامەکاندا بڵاوکردۆتەوە. کۆمەڵێ(شیعر)م بەناوی(دابڕان) تایپو نەخشەسازی کراوە بۆ چاپکردن، بە ئومێدم لە چەند مانگی داهاتوودا بکەوێتە کتێبخانەی کوردی. بیرەوەرییەکانم بە ناونیشانی(کەشکۆڵی بیرەوەرییەکانم) خەریکی نووسینەوەیانم. بەنیازم ئەگەر بوارم بۆ هەڵکەوت چاپی بکەم.

*ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کوردو یەکێتی رۆژنامەنووسانی کوردستانم، سەرنووسەری گۆڤاری پەنجەرەی کۆمەڵەی زیندانییە سیاسیەکانی کوردستانو سەرپەرشتیاری گۆڤاری هەزارمێردم.

**پ٢/جەنابی شێخ تکایە بفەرموون ئەرکی بەڕێوەبەرایەتی گشتیی چاپو بڵاوکردنەوە لە وەزارەتی رۆشنبیریدا چییە؟**

وەڵام/ئەرکمان زۆرە..دەزگایەکی فراوانینو بەشمان زۆرە. بەڵام کارو ئەرکی سەرەکیمان تایبەتە بە چاپکردنی کتێبو کۆمەککردنی نووسەرانو رۆشنبیران بۆ چاپکردنی بەرهەمەکانیان.

**پ٣/تكایە كورتەیەك لەكارو چالاكیەكانی بەڕێوەبەرایەتی گشتیی چاپوبڵاوكردنەوەمان لە كاتی راپەڕین بەولاوەو دامەزراندنی ئەو دەزگایە بۆ بەیان بفەرموون.**

وەڵام/ بەڕێوەبەرێتییەكەمان سێ ساڵونیوە دامەزراوە لە ساڵی(٢٠٠٢)(٤٣) كتێبمان چاپو كۆمەككردووەو سەرجەمی چاپكراوەكانمان لەو ساڵانەدا(١٦٤)چاپكراوی جۆراو جۆرە. (گۆڤاری هەزار مێرد)كە گۆڤارێكی وەرزی تایبەت بە مێژووو شوێنەوار لە رێگای ئەم بەڕێوەبەرێتییەوە چاپ دەكرێتوبڵاودەكرێتەوە كە بە رای من یەكێكە لە گۆڤارە دانسقەو گرنگەكانی هەرێمی كوردستان لە بواری شوێنەوارو مێژوودا.

مۆڵەتی چەندین خاوەن پیشەكانی(كتێبخانەوچاپخانەونووسینگەی كۆمپیوتەرو ئۆفسێتوفۆتۆكۆپی) دراوەتە خاوەن پیشەكان. ساڵانە زیاتر لە(٥٠٠) ژمارەی سپاردن دەدرێتە ئەو كتێبانەی لە سنووری هەرێمدا چاپ دەكرین.

**پ٤/تكایە بفەرموون چاپ كراوەكانی ئەو بەڕێوەبەرایەتییەچ بابەتێك دەگرنەوە؟**

وەڵام/ئەو كتێبانەی لە بەڕێوەبەرێتییەكەمان ساڵانە چاپ دەكرین..بابەتی(فەرهەنگی-مێژوویی-زانستی-ئەدەبی-شانۆیی و فەلسەفی و لێكۆڵینەوە)ن، جگە لەبابەتی ئەدەبی منداڵان. كە ساڵانە لای كەمەوە١٠تا١٢كتێب لە ئەدەبی منداڵان چاپ دەكرێت.

**پ٥/تكایە بفەرموون ئەو بەڕێوەبەرایەتییە تاچ رادەیەك ئەهەمیەت بە چاپوبڵاوكردنەوەو پێدانی فەرهەنگو ئەدەبی كوردی دەدا؟**

وەڵام/ گرنگی زۆرمان بەم دوولایەنە داوە. جگە لەو كتێبانەی ئەمساڵ چاپكراون ئێستا(٣٠)كتێبی جۆراوجۆرو(٣١)كتێبی منداڵان لە شیعروچیرۆك ئامادەیە بۆ چاپكردن، كە لەناویاندا(٣)فەرهەنگی كوردی-ئینگلیزی منداڵنیان تیادایەو ئەمساڵ دوو فەرهەنگ یەك بەناوی(فەرهەنگی یاد)كە فەرهەنگێكی ئینگلیزی كوردی عەرەبییە هاوكاری كراوەو ئێستا لەبازاردایە. دووەم

بەناوی(فەرهەنگی فوئاد)لە تەواو بووندایەو ئەم فەرهەنگەش ئینگلیزی کوردیەو بەم زوانە دەکەوێتە بەردەستی خوێنەران.

**پ٦/تکایە بفەرموون ئەو ناوەندە بۆ چاپی بەرهەمو ئەدەبی منداڵان وەك چیرۆكوشیعروومرگێران تا ئێستا چ هەنگاوێکی هەڵیناوەتەوە ئایا ئێوە لەو بابەتەو لە کاری خۆتان رازین؟**

وەڵام/لە دامەزراندنی بەڕێوە بەریتییەکەمانەوە، هەوڵمان داوە بایەخێکی تەواو بە ئەدەبی منداڵان بدرێت..بۆ ئەمساڵ(٨)کتێبی منداڵان چاپکراوە بۆ سەلماندنی قسەکانم وەکو لە پێشەوە وتم ئێستا(٦١)کتێبی منداڵان لە شیعروچیرۆكوفەرهەنگ ئامادەن بۆ چاپکردنو ژمارەیەکی تریشمان لە بەرنامەدایە بۆ تایپ کردنو ژمارەیەکی زۆریشمان لە زمانە بیانییەکانەوە داناوە بۆ وەرگێڕانیان بۆ سەر زمانی کوردی. بەنیازین لە ساڵی داهاتوودا..ژمارەیەکی بەرچاو لە ئەدەبی منداڵان پێشکەشی منداڵانی کورد بکەین..

**پ٧/تکایە بفەرموون دەزگای ئێوە تا چ رادەیەك گرنگی بە تەرجەمە واتە وەرگێڕان دەداو وەرگێڕانەکان پتر لەچ بابەتێكو لە کام زمانەوەن؟**

وەڵام/بایەخێکی زۆر باشمان بە بواری وەرگێڕان داوە. ئەو کتێبانەی وەردەگێردرێن زوربەیان لە زمانەکانی(فارسی،عەرەبی،ئینگلیزی)وەن..ئێمە لەبەرگرنگی وەرگێڕان ساڵی ٢٠٠١ بەپێی پرۆژەیەکی ئامادەکراو داواوپێشنیارمان کرد کە بەڕێوەبەرێتییەك لە ناو ئەم بەڕێوەبەرێتییەی ئێمەدا دابمەزرێت بەناوی بەڕێوەبەرێتیی خانەی وەرگێڕان. داواو پێشنیارەکەمان قبوڵکراو ئەو بەڕێوەبەرێتییە دامەزراوە. لە راستیدا زانیاریم لەسەر کاروبەرهەمەکانیان بەتەواوی نییەو نازانم لەماوەی ساڵونێوێکدا چییان کردووە. چونکە میلاکی لەسەر بەڕێوەبەرێتییەکەمان نەماوە.

**پ٨/بەسەرنجدان بەو راستیە کە ئەدەبو زمانی فارسی زۆر لە کوردی نزیکەو ئەو دوو زمانە هاوڕیشەنو هەروەها زۆر شتی بە کەڵك بەفارسی نووسراونو تەرجەمە کراون دەزگای ئێوە چ هەنگاوێکی بۆ تەرجەمە لە فارسی بەکوردییەوە هەڵێناوە؟**

**پ٩/ئایا ئێوە با تەوجوە بە پرسیاری سەرەوەو هاوسێ بوونی ئێران و حکومەتی هەرێم هاوکاری فەرهەنگی لەگەڵ وەزارەتی ئیرشادی ئیسلامیو ناوەندە فەرهەنگیەکانی ئێران بەتایبەت( ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگو ئەدەبی کوردی ) تان تا چ رادەیەك بە پێویست دەزانن؟**

وەڵام/ئاشکرایە پەیوەندییەکی پتەوی سیاسیو بازرگانی لە نێوانی کۆماری ئیسلامیو حکومەتی هەرێمی کوردستاندا هەیە ئاواتە خوازی ئەوەین بە هاوشانی ئەو دوو پەیوەندییە پەیوەندیو هاوکاری ئەدەبیو رۆشنبیریو فەرهەنگیو رۆژنامەگەریش هەبێت لەگەڵ وەزارەتی ئیرشادی ئیسلامیو ناوەندە فەرهەنگیو ئەدەبیەکاندا..بە تایبەتی لەگەڵ ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگوئەدەبی کوردی. کە ئێستا لە زوربەی شارەکانی ئێراندا دامەزراوە.

نامەوێت بیشارمەوە..ئێمە لای خۆمانەوە..لە زۆربۆنەدا لەگەل دەزگا بەرپرسەکانی کۆماری ئیسلامیدا باسمان کردووەو وەکو داواش داوامان لێکردوون. هەموو جارێکیش داواکەیان بەلاوە پەسەندبووە.بەڵام تا ئێستا هیچ هەنگاوێك لەو لایەنەوە لەلایەن کۆماری ئیسلامیەوە نەنراوە..بۆ نموونە..ساڵانە پێشانگای کتێب لە ئێران دەکرێتەوە..ئێمە پێمان خۆشەو بەکارێکی زۆر گرنگی دەزانین..لە هەرێمی کوردستاندا، بەشداری ئەو پێشانگای ساڵانەیە بکرێت بە چاپکراوەکانمانەوە..مادام نیاز چاکی لەنێواندا هەیە..ئومێد دەکەم ئەو پەیوەندییەش پتەو بکرێتو بایەخی تەواوی پێبدرێتو ئاواتەکەمان بێتەدی.

**پ١٠/ئایا بەرێوەبەرایەتی گشتیی چاپوبڵاوکردنەوە یارمەتی نووسەرانو شاعیرانو وتووێژەرانو قەڵەم بەدەستان بۆ چاپوبڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانیان دەدا؟ چ جۆرە یارمەتییەك؟**

وەڵام/بێگومان..ئەو کتێبانەی لە وەزارەتو بەرێوەبەرێتییەکەمان چاپ دەکرێن..بەرهەمی نووسەرانو رۆشنبیرانە..بە چاپکردنی بەرهەمەکانیانو کۆمەککردنیان یارمەتی دەدرێنو ساڵ بە ساڵیش ئەو کۆمەککردنو یارمەتی دانە لە زیاد بووندایە.

**پ١١/ئایا ئەو بەڕێوەبەرایەتییە کتێبو بەرهەمی کوردەکانی دەرەوەی وڵاتیش چاپ دەکا؟**

وەڵام/بەدڵنیاییەوە.هەر نووسەرو رۆشنبیرێکی کورد لە هەرشوێنێکی کوردستانو یان لەهەر وڵاتێکەوە، بەرهەم پێشکەشی بەڕێوەبەرێتییەکەمان بکات..بەو پەڕی شانازییەوە بۆی چاپ دەکەینو یارمەتی دەدەین..کوا رۆشنبیرانو نووسەرانی کوردی دەرەوەی کوردستان ئەو ئەرکەیان بکێشایەو بە بەرهەمەکانیان کتێبخانەی کوردیان دەوڵەمەند بکردایەو خوێنەری کوردیشیان دڵخۆش بکردایە. بۆ نموونە..ئەم بەڕێزانە کتێبیان ناردووەو کتێبەکانیان چاپکراوە: خەبات عەبدوڵلا کتێبی(بنەماتیورییەکانی جوگرافیای عەسکەریی کوردستانی باشوور).د. عەبدوڵلا غەفور کتێبی(جوگرافیای ئابووری نەفت لە کوردستاندا بۆ چاپکراوەو(٣)کتێبی تری لە بەرنامەدایە بۆ چاپکردن.د.حسێن محمد عزیز دوو کتێبی لە بەرنامەدایە بۆ چاپکردن یەکەم(پەیماننامەیەکی رەشورۆژێکی سوور)و دووەم(یاقووتو زمرووتی کوردی) هەروەهاد. خەسرەو شاڵی کتێبی(دوای ئەم زانیارییانە لێبوردنی چی؟-کوردستان یان کلۆڵی نەتەوەیەك)ی وەرگێڕوەتە سەر زمانی کوردیو لەبەرنامەی چاپکردندایە. ئەم بەڕێزانە هەموو لە دەرەوەی کوردستانن لە کوردستانی ئێران مامۆستا سدیق بۆرەکەیی دوو کتێبمان لە ساڵی ٢٠٠٠دا بۆ چاپکردووە، یەکێکیان بەناوی ئاوییەرو ئەویتریان بەناوی(کاکەییەکانو رێو رچەکەیان). چەند کتێبێکی منداڵانی مامۆستا(مستەفا ئیلخانی زادە)و موژدەو راسان محەمەد حەمە باقی لە بەرنامەی چاپکردندانو کتێبی تەریقەتی نەقشبەندی سەید تاهیر هاشمیمان لە فارسییەوە وەرگێڕاوەو لە بەرنامەی چاپکردندایە.

**پ١٢/ئایا بەڕێوەبەرایەتییەکە بۆ کاری چاپو بڵاوکردنەوەی ریسالەو تەحقیقی بە کەڵكو سودمەندی خوێندکارانی زانکۆ یارمەتی دەدا هەروەها بۆ پرۆژەکانی فەرهەنگیو ئەدەبی چۆن؟**

وەڵام/بێگومان هەر نامەیەکی ماجیسترو دکتۆرای لە هەر خاوەن بڕوانامەیەکی ئەو دوو پلیەوە داوامان لێبکەن..بە دەر لە رێنماییەکانمان نامەکانیان بۆ چاپدەکەینو کۆمەکیان دەکەین..نامەی ماجیستێری مامۆستا(رەئوف عوسمان)مان چاپکردووەو هەر پرۆژەیەکی فەرهەنگیو

ئـەدەبیش روومـان تێبکـات بـەپێی توانـاو دەسـەڵاتی ئابووریمـان بـەو پـەڕی خۆشـحاڵیەوە بـە پیریانــەوە دەچـین و یارمــەتیان دەدەیــن..ئێمــە بەرنامــەمان دەوڵەمەند کردنی کتێبخانەی کوردیە بە بەرهەمی چاك و بەسوود.

لـە کۆتاییـدا زۆر سوپاسـی مامۆسـتا(مسـتەفای ئیلخـانی زادە)دەکـەم هـەڵی رەخسـاندم..لـە ڕێگـای چـەند پرسـیارێکەوە باسـی کـارو چـالاکی و بەرنامـەی دەزگاکــــەمان بــــۆ گۆڤارەکــــەو خوێنــــەرانی بکــــەم و ئاشــــنایان بکــــەم بەکاروچالاکییەکانمان.

*ئەم چاوپێکەوتنە مامۆستا مەستەفای ئیلخانیزادەی خەڵکی بۆکان لەسەردانێکیدا بۆ دائیرەکـەمان بـۆ گۆڤـاری(سـروە) کـە لەکوردسـتانی ئێـران دەردەچـێت کـردی ئاگـادارنیم لەبڵاوکردنەوەو نەکردنەوەی

٢٠٠٢/١١/١٩

# دەبا بە پەرۆشەوە کار بۆیەك وتاریو یەك هەڵوێستیویەك بەرنامەی سیاسی گەلەکەمان بکەین...

گەلەکەمان لە مێژووی سیاسیدا، زۆر هەلی گونجاوی بۆ دەسەبەرکردنی مافە رەواکانی بۆ رەخساوەو لەکیس چووە...لە دەستدانی ئەو هەلانە، گەورەترین زیانی بەبزافی رزگاریخوازی گەلەکەمانو مەسەلە رەواکەی گەیاندووە..

تەمەنی کورتی هەردوو حکومەتی مەلیك مەحموودو کۆماری مەهاباد کارەساتی لەناو چوونی رەنجو ماندوو بوونی گەلەکەمان لە شۆڕشی ئەیلوولدا...بوونە مەرگە ساتی نەتەوەیەكو دەبێت هەرگیزاوهەرگیز لەبیر نەچنەوە، دەرسو پەندی شۆڕشگێڕانەی لێوەربگیرێتو هەموو حزبولایەنە کوردستانییەکان بەهەند وەریبگرن..

ئەم بارودۆخەی ئەمڕۆ هاتۆتە پێشەوە،کە خۆی لە گۆڕنکارییەکی ناو خۆیی و ناوچەیی و جیهانیدا، بەرجەستە دەکات..ئەرکی هەموو لایەکە..بە دڵسۆزانو رۆشنبیرانی جەماوەری گەلەکەشمانەوە..هەمەلایەنە هەوڵ بدەین کەڵك لە گۆڕانکاییەکان وەربگیرێتو کورد پەروەرانەو زۆر زیرەکانە مامەڵەو هەڵسو کەوت لە گەڵ سەرجەمی رووداو و پێشهاتەکاندا بکرێت..ئەگەرنا..ئەوە کۆماری مەهابادو حکومەتی مەلیك مەحموود..دیارە ئەم هەلەی ئەمڕۆ بۆ مەسەلەی رەوای گەلەکەمان رەخساوە..هەلێکی زۆر گرنگو چارە نووس سازە. بایەخی بۆ ئێستا و دوارۆژی گەلەکەمان هەیە.

خۆشبەختانە ماوەیەکە.. چەندحزبێکی کوردستانی، لە ئاستی پەرۆشیان بۆ مەسەلەی گەلەکەیان..کەوتوونەتە کاری جیدی بۆ دروستکردنەوەی بەرەیەکی کوردستانی فراوانو بانگەشەی ئاشتبوونەوەی نێوانی حزبو لایەنە ناکۆكو ناجۆرەکانو یەکخستنەوەی ناو ماڵی کورد دەکەن.. ئەو هەوڵەی لە١٤/٥/٢٠٠٢ وەدەستی پێکردووە مژدەیەکی زۆر دڵخۆشکەرە.. دیارە کۆششو ماندوو بوون لەو پێناوەدا، ئەرکێکی نەتەوەیی و نیشتیمانییە.. کار بۆ یەك وتاری سیاسی

کـوردی‌و یـەك هەڵوێسـتی‌و یـەك بەرنامـەی سیاسـی بـۆ مەسـەلەی ڕەوای گەلەکـەمان.. کـارێکی هێنـدە پیرۆزە.. بیر کردنەوەیـەکی ئەوەنـدە دڵسـۆزانەو کوردانەیـە..کـەدەبێت هـەموو ڕۆشـنبیران‌و نووسـەران‌و خـەمخۆرانی جـەماوەری گەلەکـەمان‌و، هـەموو ئـەو حـزب‌و لایـەنانی ئـەمڕۆ لـە سـەر گۆڕەپـانی خـاکی کوردسـتان، کـارو چـالاکی دەکـەن، بـەناوی کـورد و مەسـەلەیەکەوە.. پشـتگیری ڕاسـتەوخۆ وبوێرانـەی ئـەو هەوڵـە بکـەن‌و کـار بـۆ بـە ئـەنجام گەیانـدنی بکرێت..چونکە بە دەنگەوە چوون و پشتگیریکردنی ئەو بانگەشەیە..ناسنامەی نەتـەوەیی‌و نیشـتیمان پـەروەری سـاغ دەکاتـەوە..بانگەوازی پرۆژەکە بە هەنـد وەربگیرێـت‌و کـاری جیـدی بـۆ داڕشـتنی بەرنامەکـەی بکرێـت‌و، بکرێتـە بنـەما‌و بناغەی کارە ستراتیژی‌و هەنووکەییەکانی هەموو حزب‌و لایەنەکان.

بمانـەوێ‌و نـە مانـەوێ.. ئـەمڕۆ لەکوردسـتاندا، دوای ڕاپـەڕین‌و هەڵبـژاردنی پەرلەمان‌و دروستبوونی حکومەتی هەرێمی کوردوستان..بە بەردەوامی بانگەشە بـۆ(ئـازادی، دیموکراسـی، مـافی مـرۆڤ، فرەحزبـی) دەکرێـت. بۆیـە دەبێـت بـە ڕاشکاوی بڵێین، سەر هەڵدان و دروستبوونی ئەم هەموو حـزب‌و لایەنانـەی دوای ڕاپەڕین..بانگەوازیان بۆ ئاشکراکردنی بەرنامەیان، لەناو جەماوەری گەلەکەماندا هەڵبەتە، بۆ خزمەتکردنی مەسەلەی ڕەوای گەلەکەیانە... ئەو ئازادییەی ئەمڕۆ لە ساو سایەی حکومـەتی هـەریمی کوردستان بەرکەماڵەو کوردستان‌و خەڵکی کوردسـتان پـارێزراوە..دەبێـت بـاش دەرك بـەوەبکرێت، کـە حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان، بەرهـەمی خـوێنی شـەهیدان و شۆڕشـی گـەلی کوردسـتان و بزووتنـەوەی پێشـکەوتن خـوازی و ڕاپـەڕینی سـەر تـا سـەری جـەماوەری گەلەکەمانە..بۆیە ئەرکی نەتەوەیی و نیشتمانییە کە هەموو حزب‌و لایەنەکان..بە دەر لە بۆ چـوونی تەسـکی حزبایـەتی، بەپەرۆشـەوە بە هـەموو تواناییەکییانـەوە، هەوڵبـدەن پاریزگـاری لـە حکومـەتی هـەریم و دەسـتکەوتەکانی بکـەن...دیـارە ئەگـەر هـەوڵی هەمە لایەنـەی هـەموو حـزب و لایەنـەکان ودڵسـۆزانی گەلەکـەمان یەکبخرێت دەتوانرێـت تیرۆریسـتان ئەوانـەی پشـتوپەنای تیرۆریسـتانی دنیان‌و بەشـداری هـەموو نەخشـەو ڕەفتـارێکی نامرۆڤانـەیان دەکـەن ریسـوابکرێن‌و لەناوببرێن...بۆیە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەهاوکاری هاوپەیمانەکانی، لە

بەرنامەیدایە، ئەمرۆیان سبەی گورزی سەربازی و ئاسمانی و مووشەکی لە عێراق بوەشێنن. وەکو ئەفغانستان تەفروتوونایان بکەن..

رژێمی عێراق..لەباروداخێکی قەستەسەریدا، کەرووبەرووی بۆتەوە، لەجیاتی ئەوەی پەنا بۆ گەلانی عێراق بە گشتیو گەلی کورد بەتایبەتی بەرێت..ژانو ئازارەکانیان کەمبکاتەوە، رەفتارە نامرۆڤانەو دوژمنکارانەکەی، بەکارو رەفتاری باش بەلای خۆیدا رایانبکێشێتەوە، بە پێچەوانەوە، زۆر بە خەستیو رق ئەستورانە، دژایەتی گەلی عێراقو گەلی کوردو مافە رەواکانی دەکات..گومانی نییە هەر پەلاماردانێکی سەربازی بۆ سەر عێراق لە لایەن وڵاتانی دنیاوە، بەدوایدا راپەرینوگۆرانکاری رووبەرووی رژێمی عێراق دەبێتەوە.. ئەگەر گەلانی عێراقو گەلی کورد، زیرەکانەو زوو بەزوو فریا نەکەون.. ئەوە بەدڵنیاییەوە، دەبێ بڵێین رق و قینی دوژمنکارانەی بۆ جارێکیتر دووپاتدەکاتەوە، لە پەلەقاژێی مەرگیدا، مەرگەساتیتری هەڵەبجەو ئەنفالو بە کۆمەڵکوشتنو کۆرەو دروستدەکاتەوە.

بۆیە کوردو سەرکردایەتی بزووتنەوەی ئەمرۆی کورد لە کوردستان ئەرکی گەورەو زۆر قورسیان لە ئەستۆدایە.. کە دوور بینانەو سیاسیانەو زیرەکانە، بیربکەنەوەو هەموو بیرکردنەوەیەکی تەسکی حزبایەتی لەم باروداخەی ئێستادا وەلابخەنو یەکدەنگو یەکبەرنامەو پلانو نەخشەی گونجاو بە کەڵك دابرێژن، بۆ بەرپەرچدانەوەی، هەر شاڵاوو پەلامارێکی دوژمنانەی دوژمنانو داگیر کەران، هەوڵدان بۆ دووبارە نەبوونەوەی مەرگەساتەکان. بێگومان یەکگرتوویی و یەکریزی گەلەکەمان، هەرەشەو گوشاری دوژمنان پووچەڵدەکاتەوە، بۆیە جێی خۆیەتی هەر وڵاتێ لە وڵاتانی دنیا، بیانەوێت بێنە کوردستانو یارمەتی گەلەکەمان بدەن بۆ پارێزگاری لە ئازادیو ئارامی کوردستان، دەبێت بە شانازییەوە پێشوازی لێبکەینو، بە پەرۆشەوە بە پیرییەوە بچین. کەهەڤاڵی بەرێز مام جەلال لە چەند بۆنەیەکدا ئاشکرایکردووە دەڵێت:(گەلی کورد پێشوازی لە هێزەکانی ئەمەریکا دەکات لە کوردستان بۆ بەرگریکردن لەو ئازادییەی ئێستا هەیەتی وبۆ بەرگرتن لە لێدانی ناوچەکە بە چەکی ترسناك)

دیارە بەرێز مام جەلال ئەم پێشوازییە بە خۆرایی راناگەیەنێتو هەڵبەت مەترسی گەورە لە دوژمنان چاوەروانەکرێت.

له بارو دۆخێکی وەك ئەمڕۆی ناوچەکەو عێراق و کوردستاندا، کە بەرنامەو نەخشەی گۆڕانکاری بە دەستەوەیەو ئەگەری پەلاماری سەربازیی و وەشاندنی گورزی لە ناوبردن بۆ سەر عێراق لە ئارادایە.دەبێت، کوردو سەرکردایەتی ئەمڕۆی بزووتنەوەی کورد بە هەموو حزب و باڵە سیاسیەکانەوە، هەوڵی سیاسیانە، دبلۆماسیانە، لۆجستیانەو پێشمەرگانەیان زۆر زیرەکانە یەکخەن و هەنگاو بنێن و بەوردی ودووربینانە چاودێری رۆژانەی پێشهاتەکان بکەن. پلان و نەخشەی گونجاو دابڕێژن، پێشنبینی ئەوە بکەن کە داگیر کەران و دوژمنانی کورد، بەچ چاوو جۆرە مەبەست و پیلانێکەوە چاویان لە ئاووخاکی کوردستان و ئازادیی و ئارامی خەڵکی کوردستان بڕیوە. بە نیازن بە چ شێوەیەك ئازادیی و ئارامیمان لێتێکبدەن و گەل و نیشتمانەکەمان، خەڵتانی خوێن و دووچاری سەرگەردانی و ماڵوێرانی بکەنەوە. چۆن دەیانەوێت ئەوەی چەندین ساڵە بە خوێن و قوربانی بە دەستمانهێناوە لەژێر پێمانی دەربهێنن و کوردستان بخەنەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان..

بۆیە کورد مافی رەوای خۆیەتی، هەر هەلێکی رەخساو لەم بارودۆخەی ئێستادا، بۆگەلەکەمان و نیشتمانەکەمان، بێتە پێشەوەو بیانەوێت پارێزگاری لە بوون و مانەوەو ئازادیی و ئارامیمان بکەن بەرێگای هاتنە وڵاتەکەمانەوە. دەبێت ئەو هەلە لە دەست نەدەین و بە پیرییەوە بچین..لێرەشدا دەبێت ئەوە بڵێین ئەوە دەوڵەت و لایەنانەی ئەو بە پیریەوە چوونە، بەکاری خراپ و خۆفرۆشی و وابەستەیی دەزانن بۆ گەلی کوردو تاوانبارمان دەکەن..ئەو دەوڵەتانە با بە خۆیاندا بچنەوە باش

سەیری خۆیان و پەیوەندییەکانیان بکەن لەگەڵ وڵاتانی دنیا، بۆ بەرژەوەندی خۆیان وبزانن تا چەند پابەندو وابەستەن..کورد بۆی هەیە بپرسێت لە هەموو دەوڵەتە ئیقلیمیی و عەرەبییەکان. کامیان مەلۆتکەی ئازیزی بەخێوکراوی ئەمریکانین؟ کامیام ئەمریکا لەناو گیان و هەناویاندا دەستبازی ناکات؟ کامیان بودجەی مانگانەوسالانەوچەك وتەقەمەنی لە ئەمریکا وەرناگرێت؟ کامیان پەیرەوی سیاسەتی ئەمریکا ناکات و سیاسەتی ئەمریکا بەرێوەینابات؟..کاتێ ئەو دەوڵەتانە بۆخۆیان ئەوە بە رەوا دەزانن، ئەی بۆ کورد بۆ تاوان و خۆفرۆشییە؟ بۆ پارێزگاری لە بوون و مانەوەی قەوارەی نەتەوەیی و ئاووخاکی

نیشتمانی‌و، بۆ پارێزگاری لە حکومەتی هەرێمی کوردستان‌وئازادی‌وئارامی کە پاش چەندین ساڵ بەدەستی هێناوە لەلایەک‌و بۆ دوورخستنەوەی مەترسییەکانی هاوکاری وڵاتانی دنیا بکات کەبیانەوێت بێنە کوردستان‌و لەدەست زوڵم‌و زۆری سەدام رزگارمان کەن لەلایەکی ترەوە..

# یەکخستنەوەی ئیدارەوئیرادەی گەلەکەمان

# زامنی پاراستنی مافەکانمانە

بەیەکخستنەوەو بەگەڕخستنەوەی پەرلەمانی کوردستان لە٤/١٠/٢٠٠٢دا هەموو جەماوەری دڵسۆزی گەلەکەمانی دڵخۆش کرد. دۆستەکانمان دەست خۆشیان لێکردین و دوژمنەکانمان نیگەران بوون.

وا بۆ نۆمانگ دەچێت پەرلەمانی کوردستان ئەرك و کارەکانی بەڕێوە دەبات. جەماوەری گەلەکەمان چاوەڕوان بوون، لەگەڵ یەکگرتنەوەی پەرلەماندا، هەردوو حوکمەتەکەی سلێمانی و هەولێریش یەك بخرێنەوە...بەڵام بەداخەوە، ئەو پەرۆشییەی بۆ پەرلەمان کرا بۆ یەکخستنەوەی حکومەت نەکرا،١٤/٥/٢٠٠٣ لەکۆبونەوەیەکی هەردوو مەکتەبەی سیاسی(ی.ن.ك)و(پ.د.ك) بڕیاری یەکخستنەوەی هەردوو ئیدارەکە درا..بەدوای ئەو بڕیارەدا لەژمارە(٣٠٦٩)ڕۆژنامەی کوردستانی نوێدا، وتارێکم بەناونیشانی(بڕیاری یەکخستنەوەی هەردوو حکومەتی هەرێم ئاواتی خەڵکی کوردستانە) بڵاو کردەوە.. وا خۆش بەختانە لەڕۆژی١٢/٦/٢٠٠٣لە کۆبونەوەی باڵای سەرکردایەتی هاوبەشی(ی.ن.ك)و(پ.د.ك) بەسەرۆکایەتی بەڕێزان مام جەلال و کاك مەسعود بارزانی ئەنجامدرا. بڕیاری یەکخستنەوەی هەردوو ئیدارەکەی حکومەتی هەرێم درا، کە لەماوەی دوو هەفتەدا ئاواتی گەلەکەمان بهێنرێتە دی..سەبارەت بەو هەنگاوە گرنگ و پڕبایەخە.. بەڕێز کاك(دکتۆر بەرهەم ئەحمەد سالح)سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان، وتارێکی بەناونیشانی(ئەرکێکی گرنگی ئەم قۆناغەمانی) لەژمارە(٣٠٩٠)ی ڕۆژی١٢/٦/یکوردستانی نوێدا بڵاوکردەوە، لەوتارەکەدا..لە ناونیشانەکەیەوە، سەرنج ڕاکێشە، وەلەناوەڕۆکیدا چەند ڕاستیەکی خستۆتە پێش چاو، کە هەر هەمووی لەبەرژەوەندی مەسەلەی ڕەوای گەلەکەماندایە، کە دەڵێت: (قۆناغی لەمەودواش پێویستی بە ئامادەباشی و خۆکۆکردنەوەیە) ئەم ڕستەیە..خۆی لەخۆیدا گەلاڵەی بەرنامەیەکە

بۆ قۆناغی داهاتوو، كە دەڵێت(یەكخستنەوەی نێو ماڵی كوردی كە بەهەنگاوێكی گرنگی یەكخستنەوەی ئیدارەی پەرلەمان دەستی پێكرد).

دیارە، وەكو هەموومان دەیزانین، كۆبونەوەكانی پەرلەمان بەیەكگرتوویی لەماوەی ئەم چەند مانگەی پێشوودا، توانی ئیرادەو خواستی گەلەكەمان بەیەك دەنگی قسەی لەسەر بكرێت و پرۆژەی سیستەمی فیدراڵی، بچەسپێنرێت...خۆ ئەگەر بەدوای یەكگرتنەوەی پەرلەماندا، هەردوو حكومەتەكەی هەرێم یەك بخرانایەتەوەدڵنیام كە ئێستا كورد كارەكانی زۆر لەپێشترو چارەنووس سازتر دەبوو. بۆیە كاك دكتۆر بەرهەم دەڵێت(ئێستا چاوەڕوانی ڕاست و ڕەوای خەڵك لەهەمولایەكمان ئەوەیە حكومەتەكەمان یەك بخەینەوە چونكە دەكرێ لەچوارچێوەی یەك ئیدارەو یەك ئیرادەی سیاسیدا هەم كەموكوڕیەكان چارەسەر بن و پێكەوە گرفتە ئابوریەكانی ئێستا چارەسەر بكەین و هەمیشە ڕەوشی سیاسی كوردستان بخەینە سەر ڕێبازی ئاسایی خۆی...)

ئەم بۆچوونە بەم ڕوونییە، ئەوە دەسەلمێنێ كە كورد، تەنها و تەنها بەیەكگرتوویی ئیداری و ئیرادەی سیاسی دەتوانێت بەمافە نەتەوەیی و نیشتمانیەكانی شاد بێت، دووبەرەكی،ناكۆكی زیانی گەورەو قورس بەخواست و ئاواتمان دەگەیەنێت.

بەو نەفەسە نەتەوەیی و نیشتمانییەوە، دەتوانرێت هەڵبژاردنەوەی پەرلەمان بكرێت و پەرلەمانێكی نوێ، بۆ قۆناغی نوێ لەنوێنەری هەموو چین و توێژەكانی كۆمەڵانی خەڵكی كوردستان هەڵبژێرن..بۆیە دەڵێت(ئەگەر فریای پەرلەمانەكەمان نەكەوین زووبەزوو هەڵبژاردن نەكەینەوە..ئەوائەم پەرلەمانەش وەكو زۆر لەپەرلەمانەكانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەكارتۆنی ناوزەد دەكرێت..) لێرەوە دەبێت بزانرێت كە یەكگرتن، ژیانی دیموكراتی، ئازادی خەڵكی، پاراستنی مافی هاوڵاتیان و بەرەو پێشچوون و گەشەكردنی ژیانی سیاسی و ئیداری و ئابوری وفەرهەنگی بەندە بەسیستەمی یەك بوون و یەك ئیرادەی میللەتەوە..بۆیە دەڵێت(دروشمی حكومەتی یەكگرتوو لە قۆناغی نزاو ئاوات بۆ خواستنەوە بگوازرێنەوە بۆ قۆناغی بەزووی جێبەجێكردن..) واتە سەردەمی ئەوە ڕۆیشت بدروشمی زەق و بریقە دار جەماوەرو كۆمەڵانی خەڵكی كوردستان دڵخۆش بكەین..جەماوەر كارو ڕەفتاری راست و دروستی دەوێت، كە خزمەتی

بەرژەوەندییەکانی بکات. خزمەتگوزاری، بژێوی ژیان، ئاوەدانکردنەوەی وڵاتو سیستەمی ئازادیو دیموکراتیو پەرلەمانی دەوێت ڕاستی دەوێت، پاراستنی ژیانو سامانی دەوێت، دەیەوێت لەوڵاتی خۆیدا ئازادو سەربەرز بێت، دەیەوێت بەئازادی بڕواتە دەرەوەو دنیای شارستانی وڵاتانی ئەوروپا ببینێت... وڵاتەکەی پڕبکرێت لەهەموو جۆرە کاڵایەکی هەرزانو چی ویستو دەستی بۆچی برد بتوانێت بەئاسانی بیکرێت..ژیانی خۆیو خێزانی مسۆگەربێت، وەکو مرۆڤ بژی...(بۆئەوەی پەیامی بزوتنەوە سیاسیەکەمان بپارێزین کە داوای سیستمێکی فیدراڵی دەکەینو دەمانەوێ بەشە کوردستانییەکەی لەچوارچێوەی یەك هەرێمدا بێت دەبێ بزانین دووکەرت بوونی ئیدارە، یەکێك لەسلێمانیو ئەویتر لەهەولێر، ڕەوای ئەو تیزەمان بنکۆڵ دەکات کە کوردستان یەك هەرێم بێت، لەچوارچێوەی ئەو دەوڵەتە فیدراڵییەی داوای دەکەین. بەپێچەوانەوە داشی ئەوانە سوار دەکات کە دەخوازن یاسای پارێزگاکانمان بەناوی جۆرێك لەفیدراڵیەوە پێ بفرۆشنەوە).

قسەکردنێك بەم ڕاشکاوییە..بمانەوێ نەمانەوێ، بۆبەرژەوەندی گەلەکەمانەو، لەخزمەتی مەسەلە ڕەواکەیایەتی.. بەپێی قسەکانی کاك دکتۆر بەرهەم، چەند دەکرێت هەموتواناو ئیرادەمان بخەینە گەڕ بۆ یەکخستنەوەی ماڵی کورد، بەیەك دەستو یەك بۆچوونو یەك بەرنامەو یەکپرۆژەی نەتەوەییو بەیەك سیستەمی سیاسی نیشتمانیو زۆر بەپەلە هەنگاو هەڵبگرین، پێش ڕووداو گۆڕانکارییەکان بکەوین. پێش ئەوەی هاوپەیمانان داوامان لێ بکەن با ئێمە پرۆژەی کاملو تێرو تەسەلی خۆمانیان لەڕووی ئیداریو داراییو سیاسیەوە ئامادە بکەینو پێشکەشیان بکەین، با لەبەر بیرو بۆچوونی تەسکی حزبایەتی کارێك نەکەین دۆستەکانمان بەچاوی خراپ سەیرمان بکەنو دوژمنەکانیشمان زەفەرمان پێ بەرن.

دەبا هەر هەموو حزبو لایەنەکانو بەتایبەتی(ی.ن.ك)و(پ.د.ك) بەو پەڕی پەرۆشییەوە، پرۆژەی یەکگرتنەوەو یەکخستنەوەی هەردوو ئیدارەی حکومەتی هەرێم جێبەجێ بکەن.

بەرنامە بۆ هەڵبژاردنێکی ئازاد دابڕێژرێتو پەرلەمانێکی کوردستانی وا هەڵبژێردرێت کەنموونەبێت لەعێراقو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. دکتۆر زۆر وورد

بینانەو بەئاگایانە لە بارودۆخەکە، کە دەڵێت( داشی ئەوانە سوار دەکات کە دەخوازن یاسای پارێزگاکانمان...پێبفرۆشنەوە) ئەمە ئەوە دەگەیەنێت ئەگەر فریای سیستەمی فیدراڵی لەڕووی سیاسیو ئیداریو جوگرافی لەکوردستاندا نەکەوین کە ئەمڕۆ لەسیاسەتی ئەمریکاو هاوپەیمانانداییە کە سنووری فیدراڵی کوردستان فراوان بکرێتو هەموو پارێزگاکانی موسڵو کەرکوکو شارەکانی خانەقینومەندەلیو هەولێرو دهۆكوسلێمانی بگرێتەوە، کە بەڕای من دوورنییە کە لە سیاسەتیاندا نەبێت زۆر شوێنی تریش لەعێراق بخەنە سەر سنووری فیدراڵی کوردستان.

دیارە ئەو فراوانییەی فیدراڵی کوردستان بایەخی مێژوویيو سیاسی نەتەوەیی،ئیداریو جوگرافیو ئابووری خۆی هەیە.بۆ جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتەش وەکو کاك دکتۆر بەرهەم ئیشارەی بۆ کردووە، کە دەبێ کورد ئیدارەو ئیرادەی یەکخات بۆئەوەی یاسایی پارێزگاکانمان بەفیدارڵی پێنەفرۆشنەوە، دەبێت فریای خۆمان بکەوینو ئەم هەلەی بۆ گەلەکەمانو مەسەلە چارەنووس سازەکەی ڕەخساوە لەدەست نەدرێت.

دیارە لەدەست دانی هەڵەیەکی گەورەی مێژووییە هەرگیزاوهەرگیز گەلەکەمان لێمان قبوڵ ناکەن، ئەگەر لەدەست بچێت نەوەی نەوەمان نەفرەتمان لێ دەکات..بۆیە ئەرکی نیشتمانیو نەتەوەیی هەموو حیزبو لایەنەکانەو جەماوەری گەلەکەمانە، کە داکۆکی لە مافەکانی نەتەوەیو نیشتمانییەکانمان بکەنو بەوپەڕی پەرۆشییەوە، کار بۆ ئەوە بکەن کە هەڵبژاردنێکی سەرتاسەری بۆ پەرلەمانی کوردستان بکرێتەوەو پەرلەمانەکە لەمەترسی پەرلەمانی کارتۆنی دەرباز بکرێتو، پرۆژەیەکی تێروتەسەلی نەتەوەییو لەڕووی ئیدارییو سیاسیو جوگرافیو ئابووریو سەربازیو پەروەردەییوڕووناکبیرییەوە ئامادە بکرێت، پێشکەش هاوپەیمانان بکرێت بەم ڕێگایە دەتوانرێت، مافە ڕەواکانی گەلەکەمان دەستەبەر بکەینو ڕەنجو قوربانی ساڵەهای ساڵمان بەهەدەر نەچێت کوردستانەکەمان ببێتە ئەو وڵاتەی لەناوچەکەدا، تایبەتمەندیو پێگەی نەتەوەیی خۆی هەبێت..

*ئەم وتارە لەژمارە(٣١٠١)ی ٢٠٠٣/٦/٢٥ی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێدا بڵاوکراوەتەوە.

# کوردیش مافی خۆیەتی..

لە مێژووی دوورو نزیکی بزاڤی رزگاریخوازی گەلی کورددا، چەندین هەلی رەخساو هاتۆتە پێش.. ئەگەر لەکاتی خۆیدا بقۆزرایەتەوە، بۆ بەرژەوەندی مەسەلە رەواکەی و سوودی لێوەربگیرایە..سالانێکبوو نیشتمان و گەلەکەمان، لە ژێر دەستەیی وچاو چنۆکی داگیرکەران رزگاریبووبوو، نامەوێ یەکە یەکەی هەلە رەخساوە لەدەستچووەکان دەور بکەمەوە..بەلام بە پێویستی دەزانم ئەوە بلێم، لە مێژووی گەلانی جیهاندا، ئەوە دەبینرێت، کە هەریەکەیان، لە بۆنەو قۆناغێکی گۆڕانکاری ئەم دنیایەدا بە مافەکانی خۆیان گەیشتوون و لە چەوساندنەوەو ژێر دەستەیی سەرفرازیانبووە..گەلی کورد، لەو پێشهاتانەی بۆی رەخساوەو بەپیریانەوە نەچووە، خەسارەتمەند بووە، بێگومان هەلێك دێتە کایەوە لە سەردەمانێکی مێژوویی ئەم ناوچەیەو دنیادا، پێشوازی لێکردن و بەپیرەوە چوونی لەکات و شوێنی خۆیدا، بۆ بەرژەوەندی نەتەوەیی و نیشتمانی، جێگای خۆی دەگرێت..بە پێچەوانەوە بەهەر هۆیەکی دوو دڵی و لەپێش چاو گرتنی هەندێ ئیعتیباراتی دەوروبەر، ئەوە لەسەدا سەد زیان بەرەوتی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلەکەمان دەگەیەنێت و، دیارە هەرچی تێپەڕی ناگەڕێتەوە..ئەگەر بۆ مێژووی نزیکمان لایەك بکەینەوە، قۆزتنەوەی مەرگەساتەکانی رەشە کوژی ئەنفال و گەیاندنی بە دەزگا و ولاتانی دنیا..قۆناغی راپەڕین و دەرپەڕاندنی دام ودەزگا داگیر کەرو سەرکوتکەرەکانی رژێمی بەغدا لە کوردستان، تراژیدیای کۆڕەوی ملوێنێ خەڵکی کورد، لە ترسی شالاوی دڕندانەی بەعس و سوپا خوێن رێژەکەی، بە پیرەوە هاتنی گەلان و ولاتانی دنیا بە مەرگەساتەکەوە، هێور بوونەوەی خەڵکی کوردستان و زەمینە خۆشکردن بۆ پرۆسەی هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان، دامەزراندن و سەقامگیربوونی حکومەتی هەرێمی کوردستان، مانەوەو بەردەوامبوونی دەسەلاتی کوردی لە کوردستاندا، ئەوجم و جۆڵ و هەوڵە چڕوپڕە سیاسی و دبلۆماسیەی سەرکردایەتی کورد، لەم سالانەدا پێوەی خەریکەو زیرەکانە مامەڵەی لە گەڵدا دەکات، لە ئاستی ولاتانی ئیقلیمی و

عەرەبی و ئەوروپی و دنیا..کاریگەرییەکی راستەوخۆی لەسەر بزووتنەوەی کوردایەتی و مەسەلەی کورد کردووە لەم سەردەمەدا. بە ئاقارێکی گەیاندووە کە ناتوانێت بە ئاسانی و بە خواست و ئارەزووی داگیرکەران مەسەلەی کورد کپ و خامۆش و سەرکوتبکرێتەوە..لەم بارودۆخەی ئێستای دنیاشدا، کە مەسەلەی تیرۆرو تیرۆریستان و توندوتیژیان، وا بەچڕی سەری هەڵداوە و زەقبۆتەوە و بۆتە دیاردەیەکی قێزەونی ئەوتۆ، کە هەموو گەلانی پێشکەوتوو خوازو ولاتانی دنیا، نەفرەت لەبیروبۆچوون و رەفتاریان دەکەن، لە عێراق و کوردستانی ئێمەشدا پاشماوەی تیرۆریستان، بە هۆی بواری گونجاوەوە هەلیان بۆ رەخساوە قوتببنەوە و بێ شەرمانەو بە ئاشکراو راشکاوانە، هەرەشە لە هەموو سەربەستییەکانی مرۆڤی کورد دەکەن دەیانەوێت ببنە کۆسپی رەوتی پێشکەوتن و مەدەنیەتی کوردو لەناوبردنی کەلەپوورو کلتوورو مێژووو شوێنەواری کوردو ناوچەکەمانیان پڕ کردووە لە مەترسی و نائارامی، رژێمی عێراقیش لە جموجۆڵ و هەڵسوکەوتی تیرۆستان بێ ئاگانییە، بەڵکە بۆتە پشت و پەنا و هاوئاهەنگیانەو رۆڵی سەرەکی دەبینێت، لەدانانی بەرنامەی پیلان و رەفتاری تیرۆریستانەیاندا، پشتگیری تەواویانە لە گەشە کردن و پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەیان لە ناوچەکەدا. بە بەرنامە دەیەوێت، ئەوەی لە سەردەمی دەسەڵاتی خۆی لە کوردستاندا، بۆی جێبەجێ نەکراوە و پێی رانەگەیشتووە، ئێستا لە رێگای ئەم گروپە ئەڵقە لە گوێی و دوژمن بەمرۆڤ و مرۆڤایەتیە، بەرامبەر بە خەڵکی کوردو خاکی کوردستان بەئەنجامی بگەیەنێت و، لەلایەکی ترەوە رژێمی بەغدا بەردەوامەلە سیاسەتی پاکتاوی رەگەزی و دەرپەڕاندنی دانیشتوانی و گواستنەوەی خەڵکی عەرەب و نیشتەجێ کردنیان لە شوێن زێدی باو باپیرانیان، لە لایەکی ترەوە بە بەرنامە لە رێگای تیرۆریستانی ناو کوردستانەوە، کوردستان مینرێژ بکەنەوە و هەرەشە لە سەربەخۆیی و کوردو ئازادی و ئارامی نیشتمانەکەی دەکەن.

هەموو کەناڵەکانی دنیا رۆژانە ئەوە دەسەلمێنن، کە رژێمی عیراق پشتیوانێکی گەورەی تیرۆریستانی ئەلقاعیدەو ئوسامەبن لادنن و ئەو هەرەشە چرووپرەی لە ئارادایە کە گورزێکی چاوەڕوانکراوی قورس لە عێراق بوەشێنرێت، بەهۆی ئەوەوەی بە بەڵگە دەرکەوتووە ئەم رژێمە پشتو پەنای

تیرۆریستانی دنیان و بەشداری هەموو نەخشەو رەفتارێکی نامرۆڤانەیان دەکەن..بۆیە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەهاوکاری هاوپەیمانەکانی، لە بەرنامەیدایە، ئەمڕۆ یان سبەی گورزی سەربازی و ئاسمانی و مووشەکی لە عێراق بوەشێنن. وەکو ئەفغانستان تەفروتوونایان بکەن..رژێمی عیراق..لەبارو دۆخێکی قەستەسەریدا، کە روو بەرووی بۆتەوە، لە جیاتی ئەوەی پەنا بۆ گەلانی عیراق بەگشتی و گەلی کورد بەتایبەتی بەرێت..ژان و ئازەرەکانیان کەمبکاتەوە، رەفتارە مرۆڤانەو دوژمنکارانەکەی، بەکارو رەفتاری باش بە لای خۆیدا راینبکێشێتەوە، بە پێچوانەوە، زۆر بەخەستی و رق ئەستوورانە، دژایەتی گەلی عێراق و گەلی کوردو مافە رەواکانی دەکات...گومانی نییە هەر پەلاماردانێکی سەربازی بۆ سەر عێراق لەلایەن ولاتانی دنیاوە، بە دوایدا راپەڕین و گۆڕانکاری رووبەڕووی رژێمی عێراق دەبێتەوە. ئەگەر گەلانی عیراق و گەلی کورد، زیرەکانەو زووبەزوو فریا نەکەون..ئەوە بەدڵنیاییەوە، دەبێ بڵێین رق و قینی دوژمنکارانەی بۆ جارێکیتر دووپاتدەکاتەوە، لە پەلەقاژێی مەرگیدا، مەرگەساتیتری هەڵبجەو ئەنفال و بە کۆمەڵکوشتن و کوڕەو دروستدەکاتەوە.

بۆیە کوردو سەرکردایەتی بزووتنەوەی ئەمڕۆی کورد لە کوردستان ئەرکی گەورەو زۆر قورسیان لە ئەستۆدایە کە دووربینانەو سیاسیانەو زیرەکانە، بیربکەنەوەو هەموو بیرکردنەوەیەکی تەسکی حزبایەتی لەم بارودۆخەی ێستادا وەلا بخەن و یەکدەنگ و یەکیەرنامەو پلان و نەخشەی گونجاو وبەکەڵك دابڕێژن، بۆ بەرپەرچدانەوەی، هەر شالاوو پەلامارێکی دوژمنانەی دوژمنان و داگیرکەران، هەوڵدان بۆ دووبارە نەبوونەوەی مەرگەساتەکان. بێگومان یەکگرتوویی و یەکڕیزی گەلەکەمان، هەڕەشەو گوشاری دوژمنان پووچەڵدەکاتەوە، بۆیە جێی خۆیەتی هەر ولاتێ لە ولاتانی دنیا، بیانەوێت بێنە کوردستان و یارمەتی گەلەکەمان بدەن بۆ پارێزگاری لە ئازادی و ئارامی کوردستان، دەبێت بە شانازییەوە پێشوازی لێبکەین و بەپەرۆشەوە بە پیرییەوە بچین. کە هەڤاڵی بەڕێز مام جەلال لە چەند بۆنەیەکدا ئاشکرای کردووە دەڵێت: (گەلی کورد پێشوازی لە هێزەکانی ئەمریکا دەکات لە کوردستان بۆ بەرگریکردن لەو ئازادییەی ئێستا هەیەتی و بۆ بەرگرتن لە لێدانی ناوچەکە بە چەکی ترسناك) دیارە بەڕێز مام جەلال ئەم پێشوازییە بە خۆڕایی راناگەیەنێت و هەڵبەت مەترسی گەورە لە

دوژمنان چاوەڕوان دەکرێت. لە بارودۆخێکی وەك ئەمڕۆی ناوچەکەو عێراقو کوردستاندا، کە بەرنامەو نەخشەی گۆڕانکاری بەدەستەوەیەو ئەگەری پەلاماری سەربازیو وەشاندنی گورزی لەناوبردن بۆ سەر عێراق لە ئارادایە. دەبێت، کوردو سەرکردایەتی ئەمڕۆی بزووتنەوەی کورد بەهەمووحزبو باڵە سیاسیەکانەوە، هەوڵی سیاسیانە، دبلۆماسیانە، لۆجستیانەو پێشمەرگانەیان زۆر زیرەکانە یەکخەنو هەنگاوبنێنو بەوردیو دوور بینانە چاودێری رۆژانەی پێشهاتەکان بکەن. پلانو نەخشەی گونجاو دابڕێژن، پێشبینی ئەوەبکەن کە داگیر کەرانو دوژمنانی کورد، بەچ چاوو جۆرە مەبەستو پیلانێکەوە چاویان لە ئاو و خاکی کوردستانو ئارامی خەڵکی کوردستان بڕیوە. بە نیازن بەچ شێوەیەك ئازادیو ئارامیمان لێتێکبدەنو گەلو نیشتمانەکەمان، خەڵتانی خوێنو دووچاری سەرگەردانیومالوێرانی بکەنەوە. چۆن دەیانەوێت ئەوەی چەندین ساڵە بە خوێنو قوربانی بەدەستمان هێناوە لەژێرپێمانی دەربهێننو کوردستان بخەنەوە ژێر دەسەلاتی خۆیان..

بۆیە کورد مافی رەوای خۆیەتی، هەر هەلێکی رەخساو لەم بارودۆخەی ئێستادا، بۆ گەلەکەمانو نیشتمانەکەمان، بێتە پێشەوەو بیانەوێت پارێزگاری لە بوونو مانەوەو ئازادیو ئارامیمان بکەن بە رێگای هاتنە ولاتەکەمانەوە. دەبێت ئەو هەلە لەدەست نەدەینو بەپیرییەوە بچین..لێرەشدا دەبێت ئەوە بلێین ئەو دەولەتو لایەنانەی ئەو بە پیرەوە چوونە، بە کاری خراپو خۆفرۆشیو وابەستەیی دەزانن بۆ گەلی کوردو تاوانبارمان دەکەن ئەو دەولەتانە با بە خۆیاندا بچنەوە، باش سەیری خۆیانو پەیوەندییەکانیان بکەن لەگەڵ ولاتانی دنیا، بۆ بەرژەوەندی خۆیانو بزانن تاچەند پابەندو وابەستەن..کورد بۆی هەیە بپرسێت لە هەموو دەولەتە ئیقلیمیو عەرەبییەکان کامیان مەلۆتکەی ئازیزی بەخێو کراوی ئەمریکا نین؟ کامیان ئەمریکا لەناو گیانو هەناویاندا دەستبازی ناکات؟ کامیان بودجەی مانگانەو ساڵانەو چەكو تەقەمەنی لە ئەمریکا وەرناگرێت؟ کامیان پەیڕەوی سیاسەتی ئەمریکا ناکاتو سیاسەتی ئەمریکا بەرێوەی نابات؟..کاتێ ئەو دەولەتانە بۆخۆیان ئەوە بەرەوا دەزانن، ئەی بۆ کورد بۆتاوانو خۆفرۆشییە؟ بۆ پارێزگاری لەبوونو مانەوەی قەوارەی نەتەوەییو ئاوو خاکی نیشتمانیو، بۆ پارێزگاری لەحکومەتی هەرێمی کوردستانو

ئازادیوئـارامی، کـه پـاش چـەندین سـاڵ بەدەسـتی هێنـاوه لەلایـەكو بـۆ دوورخستنەوەی گەلەکەمان لەتراژیدیای ئەنفالو کیمیا بارانو کۆڕەو لەلایەکی ترەوە. پێشوازی لە ئەمریکاو یان هەر دەوڵەتێکی تربکات ئەم پێشوازییە بۆ ئەو دەوڵەتانـه بـۆ ڕەوایـەو بـەمافی خۆیـانی دەزانـن بارەگـاو بنکـەی سـەربازیو ئاسمـانیو مووشـەکی لـە ئـەمریکی لـە وڵاتەکانیانـدا هـەبێت، بـەڵام بـۆ کـورد خیانەتکاریو بەکرێگیراوییە..لە کۆتاییدا دەڵێم دوژمنـان بیانـەوێ و نەیانـەوێ کوردیش مافی ڕەوای خۆیەتی بۆ پارێزگاری لەخۆی پێشوازی لە ئەمریکاو هەر دەوڵەتێکی تر کە دۆستایەتی گەلەکەمانی پێ ڕەوا بێت بکاتو بە شانازییەوە بە پیرییەوە بچێت.

*ئـەم وتـارە لـەژمارە(٣١) سـاڵی دووەمـی١٦/تشـرینی یەکـەمی/٢٠٠٢ ڕۆژنامـەی(هـەواڵ)دا بڵاوکراوەتەوە.

# کورد بۆچی بترسێت؟

بەدرێژایی مێژووی کوردو بزوتنەوە رزگاریخوازییەکەی، لەبەردەم هێرشی دوژمنانەدابووە، لە هەموو روویەکی ژیانەوە بەدڕندەترین شێوە چەوسێنراوەتەوە، بەهەمووجۆرە چەکێك پەلاماریانداوە، کارەساتی زۆریان بەسەرهێناوە، مەرگەساتەکانی بەدەگمەن باسکراون، بەپێچەوانەوە دیزە بەدەرخۆنە کراون، کەسێ، وڵاتێ پاڵپشتی نەکردوەو لەسەری هەڵینەداوەتێ.. بەڕاشکاوی دەڵێن ئاوات و ئامانجەکانی لە بەردەمی چەقۆی تیژی دوژمنانیدا بووە. خاکی نیشتمانەکەی پارچە پارچەو گەلەکەیان دابڕو دابەشکردووە، بە هەموو شێوازێك هەوڵیانداوە مێژووکلتوورو ناسنامەی نەتەوەیی و فەرهەنگ و زمانی بشێوێنن و خەڵکەکەی چەواشە بکەن و لەخشتەی بەرن و لەنەتەوەکەیان و بزووتنەوەکەی دووریان بخەنەوە..ئەگەر بەرا گوزەری چەند مەرگەساتێکی گەلەکەمان باس بکەین..بیکەینە مشتێ لە نموونەی خەروارێك، بەمەش دەزانرێت لەگەڵ ئەوەشدا کە مێژوویەکی خوێناوی بە باڵای بڕاوە، چەند خۆراگرو دوژمن بەزێنبووە، شۆڕشەکانی شێخ سەعیدی پیران و شێخ عەبدوڵڵای نەهری و کوشتنی دەهەزار کورد لە دۆڵی زیلان و لەسێدارەدانیان و بەدیل گرتنی شێخی نەمر بەبریندارییو ئازاردان و دوورخستنەوەی، لەسێدارەدانی محەمەد قودسیی و هاوڕێکانی لەناوبردنی کۆماری مەهاباد و لەسێدارەدانی قازی وهاوڕێکانی و لەناوبردنی شۆڕش و راگواستنی هەزاران لە خەڵکی کوردستان بۆ خواروی ناوەڕاستی عیراق و دابڕینیان لەخاك و زێدی خۆیان.

لەشۆڕشی نوێخوازی گەلی کورددا، شیهاب و هاوڕێکانی و سەیدا ساڵح یوسفی بەنامەردانە لەناوبران، ئەنفالی کوردو لەناوبردنی ١٨٠ هەزار کوردی ئەنفالکراوو کیمیابارانی هەڵەبجەو کوشتنی ٥٠٠٠هەزار خەڵکی ئەو شارەو سوتماککردنی کوردستان و روخاندنی ٥٠٠٠ هەزار گوندو شاری کوردستان، ئابلۆقەدانی شارەکان و بەندکردنیان لەخاك و وڵاتی خۆیداو قەدەغەکردنی جموجۆڵی..بۆ ئەو هەموو کارەسات و نەهامەتیانەی بەسەر گەلی کوردیاندا

تیرۆریستان، لە هەورامان ولاتانی ئەوروپا بۆ هەر هەڕەشەو پلانێك بۆ سەر کوردستان و، ئەزموونی حوکمڕانی هەڵوێستی دۆستانەو توندیان هەیە..ئەمریکا وبەریتانیا بەراشکاوی رایدەگەیەنن کە پاڵپشتی گەلی کوردن و، بە گورگان خواردووی نادەن..ئەمریکا وبەریتانیا وهاوپەیمانەکانیان ئەم هەموو خەرجییە بۆ ئازاد کردنی عێراق خەرج بکەن و، ئەو هەموو هێزە ئاسمانی و زەمین بهێنن و ئەو هەموو قوربانییە بدەن لە پێناوی ئازاد کردنی عێراق وە رووخاندنی دیکتاتۆریەت، رێگا دەدەن دەوڵەتێکی تر چاو ببڕێتە عێراق و کوردستان. ئەو ئازادییەی بۆی فەراهەم دەکرێت، دووچاری نەهامەتی دەردی سەریبکاتەوە،

بە پێی چ یاساو بڕیارێك بە چ مافێك دەوڵەتێك دەتوانێت و، بۆی هەبێت خاكوسامان و ئازادی ولاتێکی تر داگیروزەوت بکات..ئەگەر وابکرێت کەواتە دەوڵەتە هاوپەیمانەکان چییان بۆ گەلانی عێراق و گەلی کورد کرد؟. ئەی شەڕی کەنداو لەسەر داگیرکردنی کوێت هەڵنەگیرسا؟ بە دوایدا راپەڕین دروست نەبوو، لەوکاتەوە کوردستان ناپارێزرێت..؟ بۆیە بەبۆچوونی من و بەپێی باری گۆڕانکاری و بەرنامەی هاوپەیمانان و ئۆپۆزسیۆنی عێراق و، رای ولاتانی ئەوروپا و دنیا و پێشبینیەکان، کورد لە مەترسی لەناوبردن رزگاری بووە. چونکە سەرباری هەموو ئەوانەی پێشەوە، مەسەلەی کورد لەمەسەلەی ئیقلیمی و ناوچەییش تێپەڕی کردووەو، بۆتە مەسەلەیەکی گەورەو زۆر زەقی نێو دەوڵەتی و، پاشەرۆژێکی زۆر رووناکترو پرشنگدارتری لە بەردەمدایە، لەم ئەزموونی حوکمڕانییەی ئێستای زۆر باشترو فراوانترو بەتواناترو بەدەسەلاتدارترو کاراتر دەبێت.

(٣٠٤٥)ی کوردستانی نوێدا بلاوکراوەتەوە لەڕۆژی ٢١/٤/٢٠٠٣لا٨

# وەڵام بۆ چاودێرێك

لەلاپەڕە ٩ی ژمارە(١٦)ی ڕۆژنامەی هەواڵدا، چاودێرێك كە (حەسەن جاف)ی ڕاوێژكاری وەزارەتی ڕۆشنبیرییە، بابەتێكی بەناونیشانی(تەلیسمی ئەو نهێنییە چی پێ) بڵاوكردۆتەوە..لەبەر ئەوەی، نووسینەكەی ڕاستەوخۆ لەسەر من وبەڕێوەبەرێتی گشتیی چاپ وبڵاوكردنەوەیەو، پەیوەندی بەوەزارەت و ئەنجوومەنی وەزارەتەوەیە. بۆیە دەمەوێت وەڵامی خاڵ بەخاڵی نووسینەكەی بدەمەوە، پێش ئەوەی بێمەسەر نووسینەكە بەپێویستی دەزانم، چەند ڕاستیەك بخەمە پێش چاو..

١. بەڕێوەبەرێتی گشتیی چاپ و بڵاوكردنەوە ماوەی دووساڵ و نیوە دامەزراوەو، لەم ماوەیەدا..(١٢١) كتێبی جۆراوجۆرو (٨)هەشت ژمارەی گۆڤاری هەزار مێردی چاپ كردووە.

٢. (حەسەن عەباس بەهرام) لە ٢٠٠١/١/١٦بەڕاوێژكاری وەزارەتی ڕۆشنبیری و سەرنووسەری ڕۆژنامەی هەرێمی كوردستان بەشی عەرەبی دامەزراوە. واتە ناوبراو ساڵێك و دوومانگە لەم وەزاوەتەیە. دیارە دوای ئەوەی كە هەولێری بەجێهێشتووە

٣. لەساڵی(٢٠٠٠)دا كتێبێكی بەناوی (گۆڕستانی لم)..پێشكەشی وەزارەت كرد، بۆچاپكردن. كتێبەكەدرایە شارەزا، ڕای شارەزا بەپەسەندی نەزانی كەوەزارەت چاپی بكات..كتێبەكەی بۆ گێڕدرایەوە.

ئینجا دێمە سەر خاڵەكانی نووسینەكەی..

١. حەسەن جاف و هەموو ئەوچاودێرانەی سەر بەڕێوەبەرێتی گشتی چاپ وبڵاوكردنەوە ئازادن، بەرەهایی لەسەر هەر كتێبێك دەكرێت بنووسن.

هەروەكو(هێرش قادر) لە ڕۆژنامەی تایمدا لەسەر كتێبی(ئیسلام وبنەمای دەسەڵاتی)نووسیبوو. وەیان هەر وەكو (محەمەد موكری) لەسەر كتێبی (ژنێك ودووپیاو). لەوەرگێڕانی شێركۆبێكەس نووسیبوو لە گۆڤاری ئاییندەو

وەرگێڕیش هەر لە ئایندەدا وەڵامی دایەوە..ئەم نەریتە. نەریتێکی باوەو کەس لاری لێی نییەو بەڵکە. کارێکی زانستی زۆر بەسوودە.

٢. سەبارەت بەخاڵی(٢) (چاودێر) بەچ حەقێك ماف بەخۆی دەدات تفەنگ بەتاریکییەوە بنێت. وەزارەت تاوانبار بکات، لەسەردەمی بەڕێزان مامۆستا جەمال‌و مامۆستا شێخ محەمەد شاکەلی‌و ئێستاش لەسەردەمی بەڕێز کاك فەتاح زاخۆیی بۆ چاپکردنی هەر کتێبێك..بەڕێوەبەری گشتیی بەڕاوێژ لەگەڵ بەڕێزیانداو دوای هەڵسەنگاندنی هەمەلایەنەی کتێبەکان. بڕیاری چاپکردن‌وهاوکاری کتێب دراوە..

٣. سەبارەت بەخاڵی(٣) وەکو لە خاڵی یەکەمدا، ئاماژەمان بۆکردووە چاودێری ناوبراو یان هەرچاودێرێکی تر، وەکو خۆی کەخاوەنی قەڵەمی بەبڕشت‌و شاسواری مەیدانی زانست‌و ئایین‌و زمانی کوردی‌و عەرەبین. بالەسەری بنووسن.

سەبارەت بەو شارەزایەی ئەو کتێبەی دراوەتێ بۆ خوێندنەوەو هەڵسەنگاندن. دەست‌و چاویشی ببەستنەوە ئەوەندەی چاودێری نووسەر شارەزاو خوێندەواروڕۆشنبیرە... لەبەرامبەری هەڵسەنگاندنی ئەوکتێبە قوروشێکی وەرنەگرتووە، تائێستا(تاوان)و(تاوانباری) بۆ کاری وا دا نەنراوە. تاوان‌و تاوانباری دەخرێتە پاڵ ئەکەسانەی کە خیانەت لە خاك‌ونیشتمان بکەن یان نووسینێکیان لەکاتی ڕژێمدا لەسەر قادسیەی سەدام بۆ پاداشت‌و مەنسەب ببێت، تۆبڵێی ئەو چاودێرە بەڕێزە.. ئاگاداری ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەوسەردەمە نەبێت...؟

٤. سەبارەت بەخاڵی(٤)ونووسینەکەی ڕۆژنامەی تایم‌و سپاردنی کتێبەکە بەکەسێکی تر لەلایەن بەڕێز وەزیری ڕۆشنبیریەوە، بۆ پیاچوونەوەو بەراوردکردنی.. ئەوکەسەی کەبەڕێز وەزیری ڕۆشنبیری ئەو کارەی پێ سپاردبوو.(حەسەن جاف) خۆی بوو، وەکو ڕاوێژکاری وەزارەتی ڕۆشنبیری...دوای خوێندنەوەو بەراوردکردنی لە ڕاپۆرتێکدا ئەو دووخاڵەی تۆمار کردبوو. پێشکەشی وەزیری کردبوو. لەکۆبوونەوەیەکی ئەنجوومەنی وەزارەتدا لە٢٠٠٢/١/١٢ باس لەو مەسەلەیەکرا... من وتم ئامادەم کە پارەی ئەو کتێبە بدەم بەڵام بەمەرجێ لەبەرامبەری ئەوەش کە ئێمە(٤٢)کتێبی ترمان‌و چوار

ژمـــارەی گۆڤـــاری هــەزارمێردمان چـــاپ کـــردووە پاداشـــت بکـــرێن..لـــە کۆبوونەوەکەدا...لەسەر بڕیاری بەڕێز وەزیر کۆتایی بەوکێشەیە هێنرا....

٥. سـەبارەت بـەخاڵی(٥) لـەو کـۆڕە تلەفزیۆنـەی کـە باسـی کتێبەکـە کراوە...سمیناری تەلەفزیۆنی لەسەر هەر مەسەلەیەك بکرێتو باسی هەرلایەنێك بکرێت... ئەگەر لایەنی پەیوەندیدار ئاگاداربکرێتو ئامادەبێت لەشوێنی خۆیدا، وەڵامی پێویست دەداتەوە. ئێمە بۆئەوسمینارە بانگ نەکراوینو قسە لەسەر کتێبەکەکراوە.. ئیتر ئێمە وەڵامی چیوچۆن بدەینەوە.. بەپێی ئەو سمینارە ئێمە دەبێت کەڵك وەرگرین لەلایەنی خراپو لایەنی باشیش باشتر بکرێت..نازانم چ داخو رقە دڵێکە کە بەوشێوەیە دەڵێت سەرو پوتلاکیکوترایەوە. ئەمە قسەی قەڵەم بە برشتو نووسەرە. بۆ نووسین.

٦. خـاڵی(٦) دەڵێـت سـەرەڕای هـەموو ئەمانـە هـیچ ئیجرائـاتێکی لەلایـەن وەزارەتەوە بەرامبەر بەو کتێبەو وەرگێرو شارەزاکەی نەکرا. یان هیچ نەبێ کەس نازانێ کراوە یان نا؟.

خوێنەری بەڕێز..ئەگەر تەنها سەرنجی ئەم خاڵە بدەین دەزانین ئەم چاودێرە حەیاتە چەند لە داڕشتنونووسیندا کۆڵەوارە.

کـە وەزیـر(حەسـن جـاف)ی وەکـو راوێـژکاری وەزارەت بـۆ پیاچـوونەوەو بەراوردکردنی کتێبەکـەی پـێ سپاردو، رای خـۆی نووسیویو لـە ئەنجوومـەنی وەزارەتـا قسـەی لەسـەرکراو، بـەڕێز وەزیـر لەکۆبوونەوەکـەدا کێشـەکەی یەکلاکردەوە ئەگەر ئەمە ئیجرائات نەبێ ئەی ئیجرائات چییە؟

٧. خـاڵی(٧)لام سـەیرە ئـەم چـاودێرە، وابـەداخو رقـەوە لەبەرامبـەری بەڕێوەبەری گشتی چاپو بڵاوکردنەوە قسەدەکاتو، دەبێت بەڕێوەبەری گشتی چی بەرامبەر بەوچاودێرە کردبێ؟

(حەسـەن جـاف) راوێـژکاری وەزارەتـە. لـە ٢٠٠١/١/١٦وە لـەوەزارەتی رۆشـنبیری وەکـو راوێـژکار دامـەزراوە. چـۆن رێگـا بـەخۆی دەدات لەسـاڵانی (١٩٩٩و٢٠٠٠)دانـا بـە بەڕێوەبـەری گشـتی چـاپو بڵاوکردنـەوە بڵێـت،(بـە هـەوەسو ئـارەزووی خـۆی کتێـب چـاپ دەکـات)..حەسـەن جـاف لـەو رۆژەوەی دامەزراوە دوو رۆژ هاتۆتە بەڕێوەبەرێتیەکەمان لە٢/٣ کەبەمەبەستی کۆبوونەوە لەگەڵ بەرێز وەزیرو بریکاردا هاتبوون. بۆ قسەکردن لەسەر مەسەلەی کاری

چاپکردن، جارێکی تر لەکۆتایی مانگی(٢) بەسەر پێوە هاتوو دانەنیشت. ناوبراو لەبەر ئەوەی راوێژکاری وەزارەتە، واتێگەیشتووە دەبێت چاودێربێت بەسەر بەڕێوەبەرە گشتیەکانەوەو کەس بەبێ ئەمرو فەرمانی ئەو پەنجە بەئاودا نەکاتو یەك دێڕ نەنووسێتو چاپ نەکات!!

دەڵێت (هەندێ کتێب بۆ شارەزاش نانێرن کەسیش نازانێت بنەمای هەڵبژاردن وچاپکردن چۆنە ئەگەر هەشبی کەس پەیڕەوی ناکا)... لام سەیرە پیاو خۆی بەرۆشنبیرو خاوەن قەڵەمو راوێژکاری وەزارەتێ بزانێت بەو نامەنطقە بنووسێتو قسەبکات... حەزدەکەم ئەوەبزانرێت کە زۆر نووسەرورۆشنبیر پێویست ناکات کتێبەکەیان بدرێتە شارەزاو، هیچ کتێبێك بەبێ خوێندنەوەی شارەزاو راوبۆچوونەکانیان نەلەچاپ دەدرێنو نەرەت دەکرێنەوە وەك لەپێشەوە وتم. حەسەن جاف لەساڵی(٢٠٠٠)دا رۆمانێکی بەناونیشانی(گۆڕستانی لم) پێشکەشی وەزارەت کرد بۆچاپکردن. درا یە ئیمەو ئێمەش دامانە خەبیر رای خەبیر لەسەر رۆمانە کە ئیجابی نەبوو. رای خەبیرم بەداخراوی نارد بۆ بەڕێز وەزیر. دوای چەند رۆژێ وەزیر داوای کرد کە حەزدەکات خەبیرەکە ببینێتو، خەبیرەکەی بینیودوایی شێخ محەمەد شاکەلی فەرمانیدا کە کتێبەکەی بۆ بگێڕدرێتەوە، هەر کتێبەکەی خۆی بەڵگەی ئەوەیە کە هەموو کتێبێك دەدرێتە شارەزاوهەڵدەسەنگێنرێت لەبەر ئەوەی کتێبەکەی پەسەند نەکرا چاپ نەکراو قسەی لێم دابڕیو کەوتە قسە لەملاولەولا.

حەز دەکەم بزانێت تائێستا چەندین کتێب لەبەر ئەوەی کە شارەزا پەسەندی نەکردووە چاپ نەکراوەو دراوەتەوە بەخاوەنەکەی وەك کتێبەکەی خۆی.

ئەڵێیت (کەس نازانێ بنەمای هەڵبژاردنو چاپکردن چۆنە، ئەگەر هەشبێت، پەیڕەوی ناکا)

بنەمای چاپکردنو کۆمەککردن هەیەو لەسەر ئەورێنماییانەی لەساڵی(٢٠٠٠)ەوە دەرچوون کارەکانی چاپوکۆمەك کراوە، ئەمساڵیش بەهەمان شێوە رێنماییەکان نوێ کراونەتەوەو چەند خاڵو بەندی لێ زیادکراوەو لەسەر ئەورێنماییانە کاردەکرێت.

دەڵێیت(ئەوپسپۆڕو شارەزایانە کێن کە بەڕێوە بەرێتی ناوبراو پشتیان پێ دەبەستێتو کتێبیان بۆ دەنێرێ بۆ هەڵسەنگاندنی ئەگەر هەبن..چونکە باوەڕ

ناکەم هەبن و ئەوانە خۆیان بڕیاردەدەن).. دیارە حەسەن جاف دەیەوێت لەڕێگای ئەم نووسینەیەوە سەرە دوای خەبیری کتێبەکەی خۆی بۆ دەربکەوێت. بەڵام سەیرە کەسێك بەناو راوێژکاری وەزارەت بێت و کرابێتە سەر نووسەری( رۆژنامەی هەرێمی کوردستان) بەشی عەرەبی و بەحیساب چەندین ساڵ لەبواری رۆشنبیری ورۆژنامەگەریدا، کاری کردووە لەوە خۆی گێل کات کە لە هەموو بوارێکی چاپ و چاپکردندا..یەك دەزگا نییەو ناکرێت شارەزاکانی ئاشکرابن و ناسراوبن. ئیتر چۆن و بەچ حەقێ و دەیەوێ وەزارەتی رۆشنبیری لیستی ناوی خەبیرەکانی پێشکەش بکات. من دڵنیاتان دەکەم..ئەگەر رۆژنامە لەهەواڵ ورۆژنامەکانیشدا بنووسێت دەبێت هەر بەوگومانەوە سەربنێیتەوە بۆ زانینی شارەزاکانی بەڕێوەبەرێتی گشتی چاپ وبڵاوکردنەوە.

تۆبڵێی چاودێری بەڕێز.!.داوای ئەوەنەکات شارەزاو وەرگێڕو بەڕێوەبەری گشتی لەزیندانی حکومەتی هەرێمدا توندبکرێن یان بەسێدارەدابکرێن..باشە وەرگێڕ..لەسەر قادسیەی سەدامی نووسی؟ بەشان و باڵی رژێمدا هەڵیداوە؟ شارەزا خیانەتی ئەخلاقی و نەتەوەیی و نیشتمانی کردووە؟ بەڕێوەبەری گشتیی...پار لە هەولێر هاتۆتەوە و بەعسی بووەو دژی گەل و نیشتمانەکەی خیانەتی کردووە؟ نووسینی لەسەر قادسیە نووسیوە؟!.

هەر لە هەمان خاڵدا دەڵێت(کەس نازانێت باوکی ژیارو شارەزاکەی ئەوکتێبە کێیە؟ و لەسەر کام بنەماو بناغە خراوەتە ژێرچاپ و هەزار دانەشی لێ چاپکراوەو ئەو هەموو پارەیەشی تیادا خەرجکراوە؟)

کاکی چاودێر دەبێت ئەوە بزانێت

١. ناوی وەرگێڕ هەر کەس بێت و بەهەر ناوێکەوە بێت. لەمەسەلەی کتێبەکە ناگۆڕێت، تەنها بۆ کەسانێك نەبێت لەسەر وەرگێڕانی کتێبەکە بیەوێت تۆڵەی لێ بکاتەوە، وەکو چۆن لەگەڵ(علی عبدالرزاق)کراوە لەکاتی خۆیدا لەمیصر.

بەپێی هەموو یاسایەکی چاپکردن لەکوردستان و دنیادا، شارەزا بۆ هەڵسەنگاندنی هەرکتێبێك کارێکی(نهێنی)یەو نابێ و ناکرێت کە هەموو کەس بیزانێت و یان چاودێری لێ ئاگاداربکرێت. چونکە دەرکەوتنی شارەزا بۆ

هەڵسەنگاندن لایەنی خراپی هەیە. دەبێتە هۆی کێشەو سەریەشە بۆ شارەزا. لەگەڵ کەسانی وەکو چاودێردا...

٢. ئێمە لەسەر بناغەی رای شارەزاو لەبەرگرنگی کتێبەکە کتێبەکەمان بەوتیراژە چاپکردووە، ئەگەر ئەو کتێبە وەرگێڕانەکەی واخراپ نەبوایە دڵنیام ئەگەر دوو هەزاریشمان لێ چاپبکردایە یەك دانەی لەبازاڕدا نەدەمایەوەو، ئێستاش زۆر کەمی لەبازاڕدا ماوە. ئەو پارەیەی لەوکتێبەدا خەرج کراوە، هەر وەکو ئەوپارانە وایە کە زۆر کەس مانگانە پارە وردەگرن و یەك کاروئەرکێ ناگرنە ئەستۆو هیچ ئیشێك ناکەن پارەی کرێی خانوو لەحکومەت وەردەگرن و خانووش ناگرن. لەکۆتاییدا دەڵێت(دوا قسەمان پرسیارێکە سەرەرای ئەونووسینەو لێدوانە.....وەزارەت بۆچی بێدەنگەو هیچ ناڵێ؟ دەبی نهێنی ئەم مەسەلەیە چی بێ؟)

منیش لەوەلامیدا دەڵێم...دەتەوێت وەزارەت چی بکات؟

وەرگێڕو خەبیرو بەڕێوەبەری گشتی بەداردا بکات؟ بۆچی و لەپای چی؟. لەبەرامبەری ئەوەی لەماوەی سێ ساڵدا، بەڕێوە بەری گشتی چاپ وبلاوکردنەوە(١٣٢) کتێبی چاپ کردووە، لەکۆتاییدا دەڵێم..حەقوایە لەراوێژکاری وەزارەت بپچرێتەوەو سزای ئیداری بدرێت لەبەر ئەوەی نهێنی کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی وەزارەتی بردۆتە دەرەوە لەبەر ئەوەی لەکۆبوونەوەکە وەزیر رایگەیاند نهێنی کۆبوونەوە نەبرێتە دەرەوە.

# کەرکوك بە چەپکە گوڵی سەرکەوتنەوە پێشوازی لە ڕۆڵەکانی کرد

لەو ڕۆژەوەی بەعسی فاشی بەغدا جڵەوی دەسەڵاتی لە عیراقدا گرتۆتە دەست، بە سیاسەتێکی شۆفێنانە و بە بەرنامەیەکی داڕێژراوی هەمە لایەنە، کەوتە ( تەعریب و تەرحیل و تەبعیس ) کردنی شارو شارۆچکە و گوندەکانی ناوچە کوردییەکانی کوردستان.. شاری کەرکوك و دەور و بەری یەکەم ناوچە بوون، کە بە بەرنامەیەکی چڕ و پڕی داڕێژراو بە هەموو توانایەوە، کەوتە وێزەی خەڵکەکەی بە دەرکردن و بە عەرەبکردن و بە بەعسی کردن. سەرەتا لە شەریکەی نەوتەوە دەستی بە گواستنەوەی فەرمانبەر و کرێکارە کوردەکان کرد. لە ماوەی چەند ساڵێکدا فەرمانبەرێك، کرێکارێکی کوردی لەو شەریکەیەدا نەهێشتو، بە دوایدا هەموو گوندە کوردنشینەکانی دەور و بەری شەریکەی نەوتی ڕاگواست و لە جێگایان عەشایەری عەرەبی نیشتەجێ کرد.

ئەم سیاسەتە شۆفێنیانەیە.. ساڵ بە ساڵ زیادی کرد، بە تایبەتی دوای پیلانی ڕێکەوتننامەی جەزائیر، بۆ لە ناو بردنی شۆڕشی گەلی کورد و دەست پێکردنەوەی شۆڕشی نوێی گەلەکەمان.. ڕژێم بە هۆی کۆمەڵێ چەشەی چەور و قەبەوە بۆ ئەو کەسانەی ڕازی دەبوون بێنە کوردستان کەوتە تەعریبکردنی شاری کەرکوك و دەور و بەر. بە هەزاران ماڵە عەرەبی گواستەوە بۆ ناو کەرکوك و بە سەدان فەرمانبەری عەرەبی لە دام و دەزگاکانی حکومەتەوە گواستەوە بۆ دام و دەزگاکانی ناو کەرکوك و دەور و بەر.. لە گەڵ هێنانی ئەو ماڵ و فەرمانبەرە عەرەبانە کەوتە گواستنەوەی سەدان فەرمانبەری کورد و تورکمان بۆ شارە جیاجیاکانی عیراق، سەرباری ئەو گواستنەوە و دەرکردن و هێنانە. گەڕەکە کوردییەکانی ئازادی و ئیمام قاسم و شۆریجە و ڕەحیم ئاوا و ئیسکان و تەپەی لە ڕێگای دام و دەزگا سەرکوتکەرەکانییەوە خستبووە ژێر گوشارەوە.. بە گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەیی و کردنیان بە بەعسی.. وە ئەو گەڕەکانەی لە هەموو کارێکی خزمەت گوزاری بێبەری کردبوو. بە دەیان خانووی گەڕەکەکانی

بە سەریەکدا ڕوخان و، هەموو جۆرە کڕین و فرۆشتن و خانو کردنێکیان لە خەڵکەکەی قەدەغە کردبوو. بە سەدان گەنجی شارەکەی دەکردە سەربازو فیدائی و جەیشی شەعبی و بەکوشتی دەدان. بە دەیانی بەبیانووی جۆراو جۆرەوە دەگرت و، لە بەندیخانەکانی توونـد دەکردن و، زۆریشیانی بێ سەرو شوێن دەکردن.. پرۆسەی خوێندن و فێرکردنی لە کوردیەوە گۆڕی بۆ عەرەبی و خوێندکاری کوردی لە زمانی زکماکی بێبەشکردن، ناوی کوردی هەموو قوتابخانەو ئەو شوێنانەی کە بەکوردی نووسرابوون گۆڕیان بۆ ناوی عەرەبی.

لە ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ دا، بۆ یەکەمجار شاری کەرکوك ڕزگار کرا، بەڵام بە شاڵاوێکی دڕندانەی عەسکەری و ئاسمانی خەڵکی ڕاپەڕیوی دامرکاندوەو، بەسەدان لە ڕۆڵەکانی شەهید کران و بێ سەرو شوێن کران.. بەداخەوە کەرکوك تاجی گوڵینەی لەسەر خرایە خوارەوە و ڕژێم بەسیاسەتێکی زۆر توندترو دڕندانە تر، کەوتە وێزەی کوردی شارەکەو ئەوەی لە فەرهەنگی مرۆڤایەتیدا ناکرێت و قەدەغەیە، ئەو بەرامبەریان کردی و، ڕۆژانە دەیان ماڵی بەسەڵتە خێزانی لەسەر ماڵ و حاڵی خۆیان دەردەکرد..

ڕۆژی ٢٠٠٣/٤/١٠ بەهەڵمەتی هێزی پێشمەرگەو هاوکاری و زەبری کوشندەی هاوپەیمانان، بۆ دواجار کەرکوك و هەموو شارو شارۆچکەکانی دەورو بەری ڕزگار کران و، خەڵکی کەرکوك بەچەپکە گوڵی سەرکەوتنەوە پێشوازی لەڕۆڵەکانی کردو، تاجەگوڵینەی هەتاهەتای نایەسەر و نەفرەتیان لە بەعس و سەدام و دام و دەزگا سەرکوتکەرو دڕندەکەی کرد. وێنەی دکتاتۆر پەتکراو خرایە ژێرپێی ڕقی ئەستوری داخ لەدڵی جەماوەری کەرکوك و کەرکوکیەکانەوە.. کوردە بەندکراوەکانی ئیمام قاسم و ئازادی و شۆریجەو دبس و تەپەو ڕەحیم ئاواوئیسکان و لەیلان و قادرکەرەم پیرۆزبێت ڕۆژی جەژنی ئازادیتان.. پیرۆزتان بێت تاجەگوڵینەی ڕزگاریتان.. ئیتر مەترسن باوەش بەگڕی نەوتی بابە گوڕگوڕدا بکەنەوەو بە مەشخەڵانی کوردستان ڕۆشنتریبکەنەوە.. مەترسن، ئیتر پیاوانی سەدامی دکتاتۆر ناتوانێت چاوتان لێ زەق بکاتەوەو هەڕەشەی مەرگ و زیندە بەچاڵکردنتان لێ بکات. وا ڕۆڵە ئاوارە و دەرکراوەکانتان کۆمەڵ کۆمەڵ پێتان شاد دەبنەوە.. گەڕەك و ماڵەکانتان دەواری ڕەشی بەعسی دکتاتۆرییان بەسەرەوە نامێنێت ... ئاوی ڕۆخانە لەمەودوا بە

لێڵی ناڕوات لە بان قەڵاوە ئیتر ساڵانە ئاگری نەورۆزی سەرکەوتن و ڕزگاری پرشنگ دەداتەوە و تێکلاوی گڕەکانی بابە گوڕگوڕ دەبێت. قوتابخانەکان ناوی ڕەسەنی کوردی دەنرێنەوە و خوێندکارەکانتان بە زمانی زکماکی خۆیان دەخوێنن.. گەڕەکە ڕووخاوەکان دروست دەکرێنەوە. خانوو و ماڵە زەوتکراوەکانتان دەدرێنەوە. شارەکەتان لە جیاتی شاری ڕق و دوو بەرەکی دەبێتە شاری برایەتی کورد و تورکمان و کلد و ئاشوور و عەرەبە کۆنەکانی شارەکەتان ئەو عەرەبانەی بە سیاسەتی تەعریبکردن هێنراونەتە شارەکەتان دەبێت بەسەر شۆڕی بەرەو شوێنی هێنراویان بگەڕێنەوە و نەفرەت لە خۆیان و ڕەفتاریان بکەن.

ڕۆژی شەممە لەلاپەڕە(٦)ی ژمارە٣٠٤٩ کوردستانی نوێدا بڵاوکراوەتەوە ڕۆژی ٢٠٠٣/٤/٢٦

# دوای رووخانی سەدام چی بە گەلانی عیراق دەڵێن؟

سوپای هاوپەیمانان لە هەموو لایەکەوە جەربەزانە ئابلوقەی رژێمی دیکتاتۆری بەغدادیان داوە، لە یەکەم رۆژی شەڕەوە ئەفسەرە خوێنڕێژەکانی سوپای دیکتاتۆر، کە چەندین ساڵە بە ئاگر و ئاسن و کیمیاباران کردن و رەشەکوژی لە خەڵکی عیراق دەکوژن و، کورد لە ناو خاکی کوردستاندا لە ناو دەبەن، گوند و شاری کوردستان وێران دەکەن، بە هەموو هێز و توانایانەوە لە خزمەتی سەدامی دیکتاتۆردان و، فەرمانەکانی جێبەجێ دەکەن، وا ئەمڕۆ لە خۆشبەختی گەلی عیراق، خاوەن تەڵەیان لێ پەیدا بووەو، شێرە مرۆڤ کوژەکانی سەدام لە بەرامبەر سوپای ئازادی عیراقدا ترسنۆکانە چەکەکانیان فڕێدەدەن و خۆیان بە دەستەوە دەدەن. ئەو سوپا زەبەلاح و دڕندەیەی کە بۆ خەڵکی عیراق پاڵەوان و نۆتە هەڵگربوون، ئەمڕۆ لە هەموو قوژبنێکەوە سەریان لێشێواوە و بە تەواوی ورەیان رووخاو، دەڵێی بەفری بەهارن و بە هیچ جۆرێك خۆیان پێناگیرێت. نازانن لە چ پەنا و پاسارێکدا خۆیان حەشار بدەن و، لە شاڵاوی مەرگ قوتار بن، ئەوە بە بەرچاوی هەموو دنیاوە، سوپای ئازادیی عیراق لەناو هەموو عیراقدا بڵاوبوونەتەوە، شار بە شار دەست دەخەنە بینەقاقای بەعسییە فاشییەکان و سەدامی دیکتاتۆر، ئەو سەدامەی رۆژانە هەڕەشەی دەکرد و بەردەوامیش هەڕەشە دەکات، کە سوپاکەی و بەهیمەتی جەنەراڵەکانی سوپای هاوپەیمانانو، ئەمریکا و بەریتانیا تەمێ دەکات و تەفر و تونایان دەکات. ئەو سەدامەی خۆی شاردۆتەوە، ئەو فڕۆکە و تانك و زرێپۆش و تۆپانەی چەندین ساڵە خەڵکی عیراقی پێ بۆردومان و کیمیاباران دەکەن، ماڵ و حاڵی خەڵکی رەش و رووتی عیراقی پێ وێران دەکەن و بە گازی ژەهراوی شار وگوندی کوردستانیان پێ قڕدەکرد، ئەو ئەفسەرە سوپەرمانانەی سەدام کە بە کلاشینکۆفەکانی شانیان و بە دەمانچەکانی قەدیان بە کۆمەڵ خەڵکیان پێ گوللە باران دەکرد. ئەو سوپایەی بێ بەزەییانە گەمارۆی شارو گوندی کوردستانیان دەداو، تالانیان دەکردو دەیانسووتان و بەسەر یەکدا خاپووریان دەکردن، ئەو

ڕەفیق حیزبی و پیاوانەی دەزگاکانی ئەمن و ئیستخبارات و دەزگا نازییەکانی دیکتاتۆر بەدرەفتارانەو فاشی ئاسا پەلاماری نامووس و شەرەف و سامانی خەڵکی بێدەسەڵات و رەش و رووتی عێراقیان دەدا.. ئا ئەوانە کوان لە کوێن؟ دیارنین نابینرێن. بۆ ئێستا بەرگری لە ڕژێمەکەیان و سەدامی دیکتاتۆریان ناکەن؟ کوان وا بەغدا لە هەموو لایەکەوە لەلایەن سوپای ئازادی عێراقەوە، ئابلۆقە دراوە، شارەکانی ئوم قەسرو فاوو زوبێرو بەسرەو ناسریەو کەربەلاو نەجەف لە ئازادبووندایەو، رژێم هیچ دەسەڵاتێکی بەسەریاندا نەماوە. فڕۆکەیەکی عێراقی بە ئاسمانی عێراقەوە نابینرێت. زرێپۆش و تانك و تۆپەکانی سوپای دیکتاتۆر لە هیچ شوێنێکەوە سەرو سۆراخیان نییە، رۆژانە سەدان سەرباز خۆیان دەدەن بە دەستەوەو، ریزەکانی سوپای دیکتاتۆر جێدێڵن، محەمەد سەعید سەحافی وەزیری راگەیاندنی رژێم تووشی هیستریا بووەو ئابڕوی راگەیاندنی بردووە.

سەیرە لە بارو دۆخێکی وادا کە ئێستا رژێمی عێراق و دەسەڵاتی سەدامی دیکتاتۆر لە گیانەڵای مەرگدایەو، لە سەدا سەد ئەمڕۆ بۆ سبەی لە ناو دەچێت، بەداخەوە چەندین وڵات لە ناوچەکەو جیهاندا لە جیاتی ئەوەی پشتگیری هاوپەیمانان بکەن، بۆ نەمانی دیکتاتۆریی لەسەر گەلی عێراق بکەنەوە، تەپڵی دڕاو بۆ سەدامی دیکتاتۆرو رژێمی بەعس دەکوتنو، بە ئاشکراو ژێر بە ژێر هاوکاری بۆمانەوەی رژێم دەکەنو، هاوپەیمانان و سوپای ئازادی عێراق تاوانبار دەکەن. دەبینین رۆژانە لەڕێگای کەناڵەکانی راگەیاندنیانەوە، لە ڕێگای کۆبوونەوەکانیانەوە، لە رێگای خۆپیشاندانەکانیانەوە پشتگیری دیکتاتۆر دەکەنو، داوای مانەوەی دەکەن و دژی هاوپەیمانان هاوار هاوار دەکەنو، سوپای ئازادی عێراق تاوان باردەکەن و بە شان و باڵی دیکتاتۆردا هەڵ دەدەن.. بەلای منەوە ئەو دەوڵەتانە سیٚ جۆرن، یەکەمیان لەو جۆرە دوڵەتانەن کە بەدرێژایی تەمەنی دیکتاتۆر دەمیان لە خێرو بێری ئەم وڵاتەدا بووەو، بە ئاشکراو بە نهێنی بە ئارەزوی خۆیانو، بە ڕەزامەندی دیکتاتۆر لە سامانی عێراقیان راکێشاوە. هەرگیز بە خەمی عێراق و خەڵکی عێراقەوە نەبوون. ئێستا کەدەبینن بە نەمانی دیکتاتۆریی ئەو پاروە چەورەیان لە کیس دەچێتو، بە کورتی و بەکوردی شینی هەریسەکەیان دەکەن، ئەوانە حەقیانە، چونکە ئەو

دەوڵەتانە هیچ کاتێك لە خەمی عێراق و گەلی عێراقدا نەبوون و نین، گرنگ لای ئەوان مانەوەی رژێم و پاروی چەوریانە، بۆیە بەپەرۆشەوە پشتگیری لە دیکتاتۆر دەکەن و شین وشەپۆڕ بۆ نەمانی دەکەن. جۆری دووەمی ئەو دەوڵەتانە، وای پێدەچێت کە بەدرێژایی تەمەنی دیکتاتۆری عێراق لە گوێی گادا نووستبن، بێئاگابن لە کردارو رەفتارەکانی بەعس و سەدامی دیکتاتۆر، نازانن گەلی عێراقیان بەچ دەردێك بردووە، تەنانەت بێئاگان لە کیمیابارانکردنی خەڵکی هەڵەبجەو خنکاندنی(٥٠٠٠) خەڵکی ئەو شارە، بێئاگان لە تاوانی ئەنفالی کوردو سەرنگونکردنی(١٨٠) هەزار مرۆڤی کورد، بێئاگان لە خاپوورکردنی (٥٠٠٠) گوندو شاری کوردستان، بێئاگان لە سەدان گۆری بە کۆمەڵ و، زیندە بەچاڵکردنی سەدان گەنجی کوردو عەرەب و تورکمان، بێئاگان لە بەزۆر بەبەعسیکردن و بە عەرەبکردن و بە زۆر راگواستن، بێئاگان لە کپکردن و خنکاندنی دەنگی ئازادی. بێئاگان لەوەی هەموو گەلی عێراق بە عەرەب و کوردو ئاشوری و تورکمانەوە سەرجەم داوادەکەن، هاوار دەکەن لە دەست دیکتاتۆری رزگاریان بێت. بەلام سەیرە لە بارو دۆخێکی وادا، ئەو وڵاتانە بۆ ئێستا بە ئاگاهاتوون و راستبوونەتەوەو هاوار هاواریان لێپەیدا بووە و، فرمێسکی خوێناوی بۆ رژێمی بەعس و سەدامی دیکتاتۆر دەرێژن؟

جۆری سێیەمیان " ئەو وڵاتانەن کە بەئەنقەست خۆیان گێلکردووە ئاگاداری هەموو کردارو رەفتارەکانی بەعس و سەدامن، زۆرباش دەزانن سەدام ورژێمەکەی چییان بە گەلانی عێراق و وڵاتانی دەوروبەری کردووە، بۆ پشتگیری دەکەن و دژی گەلانی عێراق و ئاواتەکانی راوەستاون؟ پرسیارێکە مەگەر تەنها خۆیان لە دوارۆژدا وەلامی بدەنەوە. هەر سێ جۆرە دەوڵەتەکان، زۆرباش دەزانن سەدام ورژێمەکەی بەرامبەر بە گەلانی عێراق و وڵاتانی دەوروبەر تاوانبارەو، گورەترین مەترسییە بۆ سەر گەلی عێراق و سەر کوتکردنی ئازادیان بۆ سەر وڵاتانی دەرەوەو ئارامی جیهانی شارستانی، دڵنیاشن لەوەی کە هاوپەیمانان لەناوی دەبەن و، بەم زوانە دەیکەنە پەندی زەمانە، ئێمەش زۆرباش لێمان روون و ئاشکرایە کە دیکتاتۆری بەغدا چەند رۆژێکی کەمی ماوەو بەم نزیکانە کۆتایی دێت، خۆری ئازادی لە ئاسۆی عێراقەوە هەڵدێت.. کاتێك رژێم رووخاو لاپەڕەی ڕەشی تاوانەکانی هەڵدرایەوە بۆ هەموو دنیا ئاشکرا کرا، ئەو کاتە ئەو دەوڵەتانە

چی بە گەلانی عێراق و وڵاتانی هاوپەیمانان دەڵێن؟ دەبێت چ پاساوێك بۆ هەڵوێستیان بهێننەوە؟ کاتێك بینیان تاوانبارترین ودیکتاتۆرترین رژێم لەدنیادا رژێمی سەدام بووە؟

لە ژمارە ( ٣٠٢٦ ) ی کوردستانی نوێ و لە لاپەڕە (٦ ) و لە ڕۆژی ٣٠ / ٣/ ٢٠٠٣بڵاوکراوەتەوە

# سەبارەت بە چارەنووسی ئەنفالکراوەکان

گەلی کورد زیاتر لە ١٨٠ هەزار کەسی لێئەنفالکراوە.. لەساڵی ١٩٨٨وە تائێستا سۆراغێکیان نییە. رۆژانە ساڵانە باسی ئەنفال دەکرێت تادیکتاتۆریەتی سەدام مابوو، کەس زاتی نەدەکرد، باسی ئەنفال بکاتو زانیاری بدرکێنێ..وا سەدامو دەسەڵاتە دیکتاتۆرەکەی بەسەریەکدا رووخێنرا. ئیتر کاتی ئەوەیە گەلەکەمان..بەهەموو شێوەیەك کار بۆ ئەوەبکات، چارەنووسی ئەنفالکراوەکان ئەو(٨٠٠)بارزانییە دەربخریت، بۆیە بەپێویستی دەزانم. لایەنە سیاسییەکانو حکومەتی هەرێمی کوردستان بەم رێگایانە جەخت بۆ دۆزینەوەی قوڵاغی ئەنفالکراوەکانی بکەن:

١. داوا لەهاوپەیمانان بکرێت، ئەو ئەفسەرانەی بەدیل گیراون یان خۆیان تەسلیم کردووە لەجەیشی عێراقو سەرانی رژێمی بەعس..لێکۆڵینەوەی وردیان لە گەڵدا بکرێت بۆ وەرگرتنی زانیاری لەسەر ئەنفالکراوەکانو گوشار بخرێتە سەریان چ زانیارییەکیان لەسەر دەزانن بیدرکێنن.

٢. داوا لە هاوپەیمانان بکرێت ئەو بەڵگەنامانەی کە لەدامو دەزگاکانی بەعسدا دەستیان کەوتووە، بەوردی لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێت بۆ ئەوەی بزانرێت چ زانیارییەکیان لەسەر ئەنفال تیادا تۆمارکراوە.

٣. دوا لە هاوپەیمانان بکرێت ئەو زینداناو بەندیخانانەی کە دەدۆزرێنەوە..پشکنینی وردیان تیادا بکرێت بۆ قوڵاغی ئەنفال.

٤. داوا لەهاوپەیمانان بکرێت ئەو شوێنو جێگایانەی کە گومان لەسەریانە. ئەنفالکراوەکانیان تیادا شاردۆتەوە.. بپشکێنرێنو لێکۆڵینەوەی وردیان لەسەر بکرێت بۆ شوێنەواری ئەنفال.

٥. لەرێگای حکومەتی هەرێمەوە یان داوا لە هاوپەیمانان بکرێت، برێ پارە تەرخان بکرێت بۆ هەرکەسێك لەعێراق یان دەرەوەی عێراق زانیاری لەسەر ئەنفالو ئەنفالکراوەکان بداتە هاوپەیمانان یان حکومەتی هەرێم.

٦. حكومەتی هەرێم لەڕێگەی هاوپەیمانان، یان حكومەتی تازەی عێراقەوە، داوابكات بەتایبەتی ئەو دەوڵەتانەی دۆستایەتی و پەیوەندی گەرمیان لەگەڵ ڕژێمەكەی سەدامدا هەبووە، چ زانیارییەك لەسەر ئەنفال دەزانن..بیدەنە حكومەتی تازەی عێراق، یان هاوپەیمانان یان حكومەتی هەرێمی كوردستان.

٧. داوا لەهاوپەیمانان بكرێت، ئەو كاربەدەستانەی ڕژێمی بەعسی فاشی كە بەسیفەتی سەفیرو دیبلۆمات لە وڵاتانی دنیادا كاریان كردووە، كۆبكرێنەوەو لێكۆڵینەوەی وردیان لەگەڵدا بكرێت، سەبارەت بەتاوانی ئەنفال، چونكە گومانی نییە تیایاندا هەیە كە هاوبەشی كارەساتی ئەنفالە.

كورد لەگەڵ هەموو سەركەوتنێكدا، دەبێت زامی قوڵی ئەنفالی لا گەورەتر بێت زیاترو زیاتر بەدوایدا وێڵ بێت و، سۆراخی ئەو هەزاران ئەنفالكراوانە بكات و، هیچ هۆیەك نەكرێتە بیانووی لەبیرچوونەوەو پشتگوێخستنی، ئەگەر كورد دوای كارەساتەكانی خۆی نەكەوێت باوەڕ ناكەم كەسێك یان وڵاتێك هەبێت بەخەمی كوردو مەرگەساتەكانیانەوە بێت. باشترین ڕۆژە كە بۆ گەلەكەمان ڕەخساوە بۆ دۆزینەوەی قۆڵاغی ئەنفالكراوەكان.

كوردستانی نوێ ژمارە ٣٠٦٥ ٢٠٠٣/٥/١٤

# شەهیدەکان چاوەڕوانی گەڕانەوەن بۆ کوردستان

دوای پیلانی جەزائیر بۆ لەناوبردنی شۆڕشی کورد لەساڵی ١٩٧٥داو، هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش، ڕژێمی فاشی بەغدا، بەمەبەستی سەرکوتکردن وتۆقاندنی خەڵکی کوردستان، هەر تێکۆشەرێکی گەلەکەمان، دەکەوتە بەر شاڵاوی دوژمنانەی، ئەوانەی حوکمی لەسێدارەدان و گوللە بارانکردنیان بەسەردا دەدرا..کاتێ بڕیارە نامەردانەکەیان جێبەجێدەکرد. خاڵێکی بڕیارەکە (نەدانەوەی تەرمی ئەو شەهیدانە بوو بەکەس و کاریان)..دەزگا جاسووسی و مرۆڤ کوژەکانی، ئەو گۆڕستانانەی بەدەیان ڕۆڵەی جەربەزەی گەلەکەمانی تیازیندەبەچاڵکراوەو، لەئەرشیفی ڕژێمی دیکتاتۆردان.. ئێستا کە کوردستان و عێراق بەتەواوی لەدەست ڕژێمی دیکتاتۆری بەعس ڕزگاری بووە، کەسوکاری شەهیدەکان هەر هەموو لە شایلۆغانی سەرکەوتنی عێراقدان، دەستی ئۆخەی بەسەر دڵیاندا دەهێنن، کە دکتاتۆرەکەی ڕۆڵەکانیانی شەلاڵی خوێن کرد، بەیەکجاری لەناوبراو تەخت و دەسەلاتی تێکوپێکدرا، تۆڵەی ڕۆڵەکانیان لێکرایەوە، ئەو شەهیدانەی لەپێناوی ئەم ڕۆژەدا جەربەزانە تێکۆشان و خەباتیان کردو لە بەرامبەری دەستڕێژی گوللەی خوێنڕێژەکانی دیکتاتۆردا، مەردانە ڕاوەستاون سەربەرزانە گیانیان شەلاڵی خوێن بوو، پەتی ئەستووری لەسێدارەدانیان شەرمەزار کردو، بە دروشمی باوەڕیان تفی خۆڕاگری و نەفرەتی گەلەکەیان لە دوژمنان کرد..

چاوەڕوانن تەرمەکانیان لەو شوێنانەوە بۆ کوردستان بگوێزرێتەوە. کەسوکاریشیان ئاواتەخوازی ئەم ڕۆژە بوون..بێگومان کەسوکاری ئەو شەهیدانە توانای ئەوەیان نییە، تەرمی ڕۆڵە کەڵەمێردەکانیان بگوێزنەوە کارێکی وا ئەرکی(کۆمەڵەی زیندانە سیاسییەکانی کوردستان و دەزگای شەهیدانی گەلی کوردستان و حزب ولایەنە سیاسییەکان و حکومەتی هەرێمی کوردستانە)..کە بەبەرنامەیەکی داڕێژراو لەمەراسیمێکی شایستەدا تەرمی ئەو شەهیدانەی گەلەکەمان لەو شوێنانەوە بۆ گۆڕستانی شەهیدانی شارەکانی کوردستان

بگوێزنەوە..دیارە بەکارێکی وا کەسوکاری شەهیدان و خەڵکی کوردستان دڵخۆش دەبن، هەست بەئاسودەییەکی باشتر دەکەن.

دەبا بەزوویی و بەپەرۆشەوە کاری بۆ بکرێت و، بودجەییەکی بۆ تەرخان بکرێت، لیژنەیەکی سەرپەرشتی و جێبەجێکردنی پێکبهێنرێت و ئەو گۆڕستان و شوێنە بدۆزرێتەوە و بزانرێت چ شەهیدێکیان لێیەو خەڵکی چ شارێکی کوردستان و شەهیدی کام لایەن و حزبەو کەی و لەکوێ شەهید کراوە؟ رۆژی هەڵدانەوە و گواستنەوە و ناشتنەوەی دیاری بکرێت، بەڕای من ئەگەر بکرێت مەراسیمەکە گشتی بێت بۆ شەهیدی هەموولایەن و حزبە سیاسییەکانی کوردستان، نەك بەجیاجیا هەر حزب و لایەنێك مەراسیم رێکبخات.

باشتریش وایە هەردوو ئیدارەی حکومەتی هەرێمی کوردستان پەرلەمانی کوردستان بۆ ئەم مەراسیمە شکۆدارە، بڕیارێکی هاوبەشی دیاریکراو دەربکات. بەمە شەهیدەکان زیاتر ئاسوودە دەبن و لەڕووی جیهانیشەوە دەنگ و سەنگی خۆی دەبێت..چاوەڕوانی هەوڵی هەمەلایەنەی هەموو دڵسۆزانین.

ئەم بابەتە لە دواستوونی ژمارە(٣٠٧٣) ٢٠٠٣/٥/٢٤ی کوردستانی نوێدا بڵاوکراوەتەوە.
کە کەوتە رۆژی هێنانەوەی تەرمی(٥)شەهیدی هاوڕێمان.

# لە پێناو ناسنامە برایەتییەکەی کەرکوکدا

لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا، هێڵێك بەناو کوردستاندا کێشراوە، کە لە تەلەعفەرەوە دەست پێدەکاتو لە مەندەلی کۆتایی دێت، لەم هێڵەدا سەدان شارۆچکەو گەڕەكو گوندو ناوچەو شاخ‌وگردۆڵکە ناوەکانیان لە کوردییەوە گۆڕدراون بۆ تورکی. دیارە سیاسەتی ئەو کاتەی عوسمانیەکان سیاسەتی پاوانکردنو فراوانکردنی دەسەڵاتیان بووەو، لەبەرنامەیاندا بووە، کە سیماو کلتورو فەرهەنگ‌وزمانی گەلانی ژێر دەسەڵاتیان بەسیاسەتی(تەتریك)بگۆڕن بەتورکی، دوای لەناوچوونی ئیمپراتۆریەتەکەو دروستبوونی حکومەتی عیراقی، دەبوو لەگەڵ دامەزراندنی حکومەتەکەدا، هەرچی کارو فەرمانو بەرنامەیەکی ئەو ئیمپراتۆریەتە بوو، هەڵوەشێنرایەتەوەو شوێنەواری سیاسەتی تەتریکیان بە تەواوی لەناو ببردایە، بەڵام بەداخەوە ئەو حکومەتە کاری بۆ هەڵوەشاندنەوەی بڕیارەکانو رەشکردنەوەی شوێنەوارەکانی تەتریك نەکرد.

ئاشکرایە لەدێر زەمانەوە، کوردو تورکمانو کلدوئاشووریو عەرەب لە کەرکوکدا ژیاونو دەژین.

تاشۆڕشی چواردەی تەمموز، هیچ کێشەو ناکۆکیەك لەنێوان دانیشتوانی کەرکوکدا نەبوو، جێی داخ بوو، لەساڵی ١٩٥٩دا، بەپیلانی دوژمنانی کوردو تورکمان ئاژاوەیەکی ناڕەواو بێ بنەما لەشاری کەرکوکدا نرایەوەو، ئەنجامەکەی بوو بەهۆی کوژرانی چەند کەسێكو زیان گەیاندن بە ژمارەیەکی تر. دوژمنەکانی هەردوولا دەیانویست ئەو ناکۆکیو دووبەرەکییە گەورە بکەنو کوردو تورك بەتەواوی بەگژیەکدا بکەن، بەڵام بەهۆشیاریو دڵسۆزی هەردوولا، ئەو پیلانە هەر زوو کۆنترۆڵکراو، قەڵەمی دەست‌وقاچی پیلانگێڕان شکێنرا. ئاشکرایە کەرێژەی دانیشتوانی کەرکوكو ناوچەکانی بەپێی سەرژمێری دیاری کراوە، سەرژمێری ساڵی(١٩٥٧)سەرژمێرییەکی بێ فرتو فێڵو دوور بووە لەهەموو بنەمایەکی نەخشە بۆ کێشراوو دەستێوەردان، گەلی کورد لەدەستپێکردنی شۆڕشی کوردستانەوە، حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق، بە سیاسەتی

تەعریبکردنی کەرکوك بەبەرنامەو بەپەرۆشەوە کاریان بۆ کردو نەخشەی ناکۆکی دووبەرەکیان بۆ دانیشتوانی شارەکە دارشت...بەدرێژایی شۆرشی کوردو تاراپەرینی ساڵی ١٩٩١ خاڵێکی سەرەکی لە داخوازیەکانی شۆرشی کورد لە هەموو گفتوگۆو دانووستانێکدا پێی لەسەر کەرکوك‌و کوردستانێتیی داگیراوەو زۆرجار تێکچونەوەی رێکەوتن‌و وتوێژەکانی مەسەلەی کەرکوك بووە.

کوردو تورکمان دەبێت ئەوە باش بهێننەوە یادی خۆیان، لەو رۆژەوەی بەعسی فاشی‌و سەدامی دکتاتۆر جڵەوی دەسەڵاتیان لە عێراقدا گرتۆتە دەست، بەوپەری توانای سەربازی‌و ئیداری‌و سیاسی‌و ئابووری هەوڵیانداوە، کەرکوك تەعریب بکەن‌و بەبەرنامە خەڵکی کوردو تورکمان لەشارەکە دوور بخەنەوەو، ژمارەی دانیشتوانیان بەتەواوی کەم بکەنەوەو ژمارەی عەرەب بە شێوەیەك زیاد بکەن، کە بەتەواوی زاڵ بێت بەسەر ژمارەی نەتەوەکانی تردا، بۆیە دەبینرێت بەهەزاران فەرمانبەرو کرێکارو ماڵە عەرەب لەهەموو ناوچەکانی عێراقەوە بەتۆماری ناسنامەی شارستانیەوە گوێزراونەتەوە بۆ کەرکوك‌و، دەوروبەری‌و هەموو توانا ئیداری‌و ئابوورییەکانی بۆ خراوەتە کارو، بەدەیان پرۆژەی جۆراوجۆریان بۆ جێبەجێکراوە، بۆ خۆشکردنی گوزەرانی ژیانیان(٣٥)ساڵە گەلانی عیراق‌و بەتایبەتی گەلی کورد، بەدەست سیاسەتی رەگەزپەرستانەی بەعسەوە دەتلێنەوەو، خەڵکی کەرکوك‌و دەوروبەری تا دەستپێکردنی پرۆسەی ئازادی عێراق لەلایەن هاوپەیمانانەوە، بەخراپترین شێوە رەفتاریان لەگەڵدا دەکرا جا بۆ ئەوەی پارێزگای کەرکوك لەسیاسەتی تەعریب‌و پاوانکردن‌و ناکۆکی‌و ململانێی ناڕەوا بەدوور بێت، خەڵکە بەندکراوو سەرکوتکراوەکەی بە تەبایی‌و ئازادی‌وبرایەتی بژین گەرای ژەهراوی دوژمنانی تیادا نەچێنرێت‌و گوێ بۆ بیروبۆچوونی شۆڤێنانەو لاف‌و گەزافی نادروست‌و ناڕەواو نامەسئولانە نەگرێت‌و دانیشتوانەکەی لەسایەی ئازادیدا، بەرەهایی بژین، چەند خاڵێك دەخەمە پێش چاوی حکومەتی هەرێمی کوردستان‌و هەموو حزب‌و لایەنە سیاسیی‌و دڵسۆزوکوردپەروەرەکان‌و حکومەتی داهاتووی عێراق‌و نوێنەرانی هاوپەیمانان لەعێراقدا، بۆ ئەوەی بکرێتە بنەمای پێکەوە ژیانی شاری کەرکوك‌و دەوروبەری‌و دەستی پیلان گێران ببردرێت.

١. ئـەرکی هەنوکـەیی هـەموو حـزب و لایەنـە کوردسـتانیەکانە، کەبەیـەك بەرنامە کار بۆ کـەرکوك و کوردستانێتی کـەرکوك بکـەن، بـەدەر لەبیرکردنـەوەی تەسکی حزبایەتی کوردانە کار بکرێت.

٢. ئـــەرکی هەموولایەنـــەکان بـــە کەناڵـــەکانی راگەیاندنەکانیانـــەوە بەبەرنامەیـەکی چڕوپڕ، هۆشیاری نەتـەوەیی و نیشتمانی لـەناو کەرکوکیەکانـدا بڵاوبکەنەوە، بەشێوەیەك کە بەرژەوەندی نەتـەوەیی و نیشتمانی بخرێتـە سـەروو هـەموو بەرژەوەندییـەکانی تـرەوە، هـانی هـەموو کـوردە کەرکوکیـەکان بـدرێت، کوردبـوونی خـۆی بـە شـارەکەیەوە گرێبـدات و بەئـەرکی نیشـتمانی و نەتـەوەیی بزانێت، کە دەست لەهەموو بەرژەوەندی و سامان و مۆڵك و خـانوو وەزیفەیـەکی هەڵبگرێت لەپێناوی گەڕانەوە و نیشتەجێبوونەوەی لە کەرکوکدا.

٣. پێویسـتە هەموولایـەك کـار بـۆ ئـەوە بکـەن کـە سـەرژمێری سـاڵی ١٩٥٧ بکرێتـە بنـەمای رێـژەی دانیشـتوان لـەرووی ناسـنامەی نەتـەوەیی خـەڵکی کەرکوکەوە، کە بەڕای من سـەر ژمێرییـەکی بـێ فـرت و فێڵ و دووربـووە لەدەست تێوەردان و سیاسەتی رەگەزپەرستانە.

٤. هـەر ماڵـە کـوردو تورکمانێـك، یـان هـەر فەرمانبـەرێکی کـوردو تورکمـان لەســـەر سیاســـەتی تـــەعریب لەســـنوری پارێزگـــای کـــەرکوك دەرکـــراون دوورخراونەتـەوە، بـۆ سـنووری پارێزگاکـانی کوردسـتان و عێـراق بـەبڕیارێك بگەڕێنرێتەوە بۆ سنوری پارێزگای کەرکوك..حکومەتی هـەرێم و لایەنـە سیاسـیە کوردسـتانیەکان بودجەیـەکی بـاش بـۆ هانـدانیان تـەرخان بکـەن، هـەوڵ بـدرێت خانوو وەزیفەکانیان لەدام و دەزگا حکومیەکان و شەریکەی نەوتدا بدرێتەوە، هەر خانوو زەوی و کێڵگەو دوکان سامانێکیان زەوتکراوە بۆیان بگەڕێتەوە.

٥. هــەر ماڵــە عــەرەبێك و فەرمانبــەرێکی عــەرەب لەســاڵی حەفتاکانــەوە تاسـاڵی(١٩٧٧) هێنراونەتـە پارێزگـای کـەرکوك لـەهۆی هاتنیـان بکۆڵرێتـەوە، ئەگـەر دەرکـەوت لەچوارچێوەی سیاسـەتی تەعریبـەوە هێنـراون، کارئاسـانی بـۆ گەڕانەوەیان بکرێت بۆ شوێن و پارێزگاکانی لێوەی هاتوون، هەر فەرمانبەرو ماڵە کـوردو تورکمـانێکی پارێزگـای کـەرکوك گوێزراونەتـەوە بـۆ دەرەوەی پارێزگاکـەو دوورخراونەتەوە لەهۆی دورخستنەوەیان بکۆڵرێتەوە، ئەگـەر هۆیەکە سیاسـەتی

تەعریب بوو، بەپێی بەرنامەیەکی گونجاو بگەڕێنرێنەوە بۆ سنوری پارێزگای کەرکوكوئەو شوێنانەی لێی بوون.

٦. ئەو ماڵە عەرەبو فەرمانبەرە عەرەبانەی لەدوای ساڵی(١٩٧٧)ەوە لەپارێزگاکانی ناوەڕاستو خوارووی عێراقەوە هێنراونەتە سنوری پارێزگای کەرکوكو، خانویان لە گوندو گەڕەکەکان پێدراوەو پرۆژەی جۆراو جۆریان بۆ کراوەو، لەسەر بەرنامەی سیاسەتی تەعریب لەهەموو بوارەکانەوە زیاد لەپێویست یارمەتیو هاوکاری کراونو، لەسەر موڵكو ماڵو خاکی کوردستان دەوڵەمەند بوون. بەبێ مەرجو بەبێ راوەستانو بەبەرنامەیەکی داڕێژراوی هەمە لایەنەو، بەهاوکاری حکومەتو هەموو لایەنە سیاسییەکان بگەڕێنرێنەوە بۆ ئەو شوێنانەی لێوەی هاتوونو خانووی زەویو پرۆژەکانیان بدرێتە ئەوخەڵکە دەرکراوانەی کە دەگەڕێنەوە بۆ سنوری پارێزگای کەرکوك. بەم بەرنامەیە دەکرێت مافی ناسنامەی نەتەوەیی لە پارێزگای کەرکوکدا بگەڕێنرێتەوە بۆ دۆخی جارانی کە هیچ لایەك هەست بەچەوساندنەوەی نەتەوەییو زوڵم لێکردن نەکەنو هەر هەموو بەتەباییو برایەتی بەیەکەوە بژین.

کوردستانی نوێ ژمارە (٣٠٥٧) ٢٠٠٣/٥/٥

# پشتیوانانی دژبە ئیسلام بۆ رقیان
# لە مردووەکا نمان گرتووە..؟؟!

کوردستان خوێنو ئاگری سالآنی پێش راپەڕین، بەسیاسەتێکی دوژمن کارانەی رەگەز پەرستانە. شارۆچکەو گوندەکانی بەسەریەکدا خاپوورو وێرانکران. خەڵکە ستەم دیدەکەی بەر شالآوی ئەنفالو کیمیا بارانو رەشە کوژی کەوتن. بە زەبری زنجیرەی دەبابەو لوولەی چەکی سوپای داگیرکەر راگوێزران بۆ ئۆردوگا زۆرە ملییەکان..کار بەوانەشەوە نەوەستا. سەراپای گۆڕستانەکانی باوو باپیرانیان یەك بەسەریەکدا تەقاندەوە. رێگاکانو پاڵو شاخەکانیان..بە مین مین رێژکرد. گەلەکەمیان لە بازنەی شارو ئۆردوگاکاندا ئابڵوقەدا. بەرنامەی مەرگی بە کۆمەڵ داڕێژرا..بەرنامەی کۆکردنەوەو بچووککردنەوەی شارەکان دانرا..بە نیازبوون شارێکی زیندووی وەکو سلێمانی وەکو خۆی نەهێڵنەوەو بیکەنە شاری یەکەمی گەشتوگوزاری بۆ پیاوانو سەردانی رژێم..ئەنفالی١٨٢ هەزار ئینسانی کورد. بەکار هێنانی چەکی کیمیاوی بۆ مەرگی بەکۆمەڵی مرۆڤی کورد، تێکدانی بەرنامەی پەروەردەوفێرکردن، لە خشتەبردنی خەڵکی ساویلکەی کورد بۆ دژایەتی گەلەکەی،...تێکدانی باری کۆمەڵایەتیو روناکبیریو فەرهەنگی کورد. ئەو ئەوبەرنامانەن کە لەمێژووی گەلەکەماندا دەبێت بەسەدان کتێبی لەسەر بنوسرێت. ساڵ بەساڵ..نەوەکانی لێی وشیاریبکرێتەوە بۆ ئەو رەفتارە دڕندانەیە کە دژی ئینسانی کورد کراوە هەرگیزو هەرگیز لەیاد نەکرێتو لەبیرمان نەچێتەوە، دەبێت چۆن هێرۆشیماو ناگازاکی، لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، جێگایکرایەوە، هەڵەبشیماو ئەنفالیش لە مێژووی گەلاندا تۆماربکرێنو ئەوانەی ئەو سیاسەتەیان بە ئەنجام گەیاند، دادگایی بکرێنوبەسزای دژی گەلانیان بگەیەنن..

ئای..!!خەڵکینە لاتان سەیرنەبێت، مێژوو دووبارەوچەندبارە دەبێتەوە..دیارە دەسەڵاتی داگیرکەران لە کوردستاندا پەیوەست بووە. پیلانو نەخشەی دوژمن

کارانەیان، هەر بەردەوامەو کە خۆیان دەستیان بە کوردو خاکی کوردستان ناگات، بەڕێگای جاشە ریش بۆ گەنەکانی دژ بە ئیسلام..پیادە دەکەن..جاشە تیرۆریستو ئینسان کوژو ئەڵقە لە گوێکانی کە بەهۆی بارو دۆخی ناهەمواری کوردستانەوە، لە چەند شوێنێك قوت کراونەتەوە بەفیتی دوژمنانو بەفەرمانیان، دەیانەوێت..ئاو وهەوای ئەم خاکە پیس بکەن، بە هەمان سیاسەتی خاپوورکاری کوردستاندا بچنەوە. بۆ ئەم مەبەستەش ڕێگایان پێدراوە لە ناوچەیەکی کوردستانی پڕ خێرو بەرهەمی وەکو ناوچەی هەورامان خڕببنەوەو مۆڵگاو تەویلەی جۆراو جۆر دروست بکەنو خەڵکەکەی بە دڕندانەترین شێوە، سەرکوتو سەرشێت بکەنو لەباخ ودێبەریان بێ بەری بکەن، بیانگرن، بیانکوژن، راینگوێزنو دەربەدەریان بکەن..بەوەشەوە نەوەستن بۆ چێبەجێکردنی فەرمانی داگیرکەران، بکەونە تێکدانی گۆڕستانی باووباپیرانولەڕێگای کەسانی مێرد مندالی نەفامو ساویلکەو هەڵخەڵتاوەوە، مردووەکانمان لە گۆڕ دەربهێننو مینیان لێ ببەستنو بیان تەقێننەوە.. ڕێگاوبانەکان، یاڵوشاخو دێبەرەکان مین ڕێژبکەن..مەڕومالاَتی خەڵکی ناوچەکەی پێ قەلاَچۆدەکەنو راگوزەرانی پێ دەکوژنو بێ دەستو قاچ دەکەن، ئەمانە ئەگەر جاشی خائنی دژ بەم کوردستانە نەبن بەچ حەقێ گۆڕو گۆڕیچەی باووباپیران هەڵدەدەنەوەو دەریان دەهێننوکەس نازانێت بۆ چ دوژمنێکی داگیرکەری دەبن، تا پوولو پارەی پێ وەربگرن..ئەمانە..هەرداگیر کەرو سەرۆکی تیرۆریستێ ناردوونی، بیانەوێت نەیانەوێت نامۆن بە ئاوو هەواو خاکی کوردستان..دەبێت کوردستانیان لێبکرێتە ئاگرو ڕیشو ڕەفتارو مێشکی پووتیان بسووتێندرێت، دەبێت پێیان بسەلمێنرێت کە ئەمانە نەوەی ئەم خاکە نینو ئەم کوردستانە لێیان بێ بەرییە.

ئای..!! خەڵکینە..بەئاگابن..باش وردبنەوەو سەرنج بدەن ئا ئەمانەی کە بەناوی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە ریشیان بەرداوەتەوە، چۆن هەڕەشە لە خەڵکی کوردی موسڵمانو گۆڕستانی باوو باپیرانمان دەکەن..چاویان بڕیوەتە ئێسكو پروسکیانو دەیانەوێت بە پوولوپارەی جاشێتی ئەسپێ پیسەکانی ریشیانی پێ بتەکێنن..

*ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ (٢٨١٨) ٢٠٠٢/٧/٢٧

# (( خانەقین سەردانت دەکەین.. ))

خانەقین.. ئەزانیت لەکەیەوە کۆت‌و بەندی داگیر کردنت لە مل کراوە؟ منداڵە چاو گەشەکانت لە وشەو زمانی زکماکی باوو باپیرانی بێ بەش کراوە؟ کێڵگەو بەراوەکانت بە دەواری ڕەشی تەعریب ڕەشپۆش کراوە؟ مێردەزمەی داگیر کردن لەسەر سنگی گوندەکانت چۆکی داداوەو بە ئارەزووی خۆیان تەراتێن دەکەن.. خانەقین دێین دەمانەوێت ئاوی لێڵی ئەڵوەندت بە تیشکی زێڕینی وشەی کوردی‌و زانست‌و ئەدەب ڕووناك بکەینەوە.

کاتی ئازاد کردنت سەردانمان کردیت.. ئەو کاتە دیاری دەستمان چەپکە گوڵی شادی سەرکەوتنمان بۆ هێنان.. ئێوەش بەوپەڕی دڵخۆشییەوە پێشوازیتان لێ کردین.. وا ئەمجارە سەردانت دەکەینەوە.. هەگبەمان پڕە.. دەستمان خاڵی نییە. چۆن کورد ئەڵێ دیاری شوان شەنگە یان هەڵەکۆك‌و دیاری ئێمەش کتێبە.. واکتێب‌و خۆمان دەکەین بە شەقام‌و کۆڵانەکانتا.. وەکو وتم دیارییەکەمان گوڵ‌و شیرینی‌و کەل‌و پەلی ئاوەدانکردنەوە نییە.. دیارییەکەمان چەند هەگبە کتێبە.. هێناومانە بۆ دانیشتوانەکەت.. حەز دەکەین هیچی نەگێڕینەوەو هەر هەمووی وەکو پێشمەرگەی جاران دوو دوو سێ سێ لە ماڵەکاندا دایمەزرێنین : منداڵەکان‌و مێرد منداڵەکان لە دەوریان کۆببنەوەو لێیان ورد ببنەوەو بیان خوێننەوە.. دێین‌و دەمانەوێت لەم ڕێگایەوە لە دەرگای هەموو ماڵێکتان بدەین.. دەبێت دەرگاشمان بە خۆشییەوە بۆ والاکەن و بە گەرمی پێشوازیمان لێبکەن.

چەند ڕۆژێ لاتان میوان دەبین.. لەو ڕۆژانەدا کتێبخانەی گشتییەکەت بە کتێب‌و چاپکراوی کوردی پۆشتەو ڕۆشن دەکەینەوە.. خانەقین: لە پۆستەری پێشانگاکەمان باش ورد بەرەوە.. ببینە بە ئالای کوردستان هەموو شەقام‌و کۆڵانەکانت تیشك ڕێژ دەکەین.. ئای خانەقین ئەوە ئێوەو وشەی کوردی، ئەوە ئێوەو ئازادی، ئەوە ئێوەو کتێب، ئەمانەوێ لەم پێشانگایەوە تارمای تەعریب بە شەرمەزارییەوە بڕەوێننەوەو خوو بدەنەوە زمانی زکماکی باوو باپیرانتان، زمانی

شیرینی کوردی، مەیەڵن ئاوی ئەڵوەندەکەتان بە هەدەر بچێت‌و بە فیڕۆ بدرێت..
دێبەرو کێڵگەو باخەکانتانی پێ ئاوبدەنەوە. خوێندنگاکان ناوەکانیان بگۆڕن
خوێندکارەکان با بە زمانی کوردی بخوێنن‌و سەردانی کتێبخانەی گشتییەکەت
بکەن‌و کتێبی کوردی وەربگرن‌و بیخوێننەوە.. خانەقین میوانتانین، دیاریمان بۆ
هێناون، دیارییەکەمان بە نرخەو کتێبە...

# ئالای کوردستان بۆ کراوەتە کێشە؟

گەلی کورد میللەتێکی دابەشکراوی وڵات داگیر کراوە، لە دوای لەناوبردنی حکومەتی مەلیك مەحموودەوە، بێ پشوو خەبات بۆ سەندنی مافەکانی دەکات. هەزاران هەزار قوربانی داوە. وڵاتەکەی بە درێژترین سیاسەتی پاکتاوی رەگەزی، خاپوورو وێران کراوە، لە هەموو مافێکی نەتەوەیی بێ بەشکراوە. هەر رژێمێك لە عیراقدا دامەزراوە، بە خراپترین شێوە مامەڵەی لە گەڵ کوردو مەسەلەی کورددا کردووە، خۆی لەگەڵ شۆڕشەکانیدا تاقی کردۆتەوە..کورد مافی خۆیەتی بە مافە رەواکانی بگات بەمافی چارەنووسیشەوە.. چۆن میللەتانی عەرەبو فارسو تورکو گەلانی تر هەقیانە دەوڵەتو ئالاو سکەی پارەیان هەبێت، سنووری وڵاتیان دیاری کراو بێتو نوێنەریان لە ئەنجومەنی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هەبێت، کوردیش هەقی خۆیەتی کە دەوڵەتو ئالاو سکەی پارەو نوێنەری لە ئەنجومەنی نەتەوەکان هەبێت وڵاتەکەی کە کوردستانە، سنووری جوگرافی تەواوی وڵاتەکەی جیابکرێتەوەو دیاری بکرێت.. سامانی نەتەوەیی نەدزرێتو تەخشانو پەخشان نەکرێت، زوڵمی لێ نەکرێتو نەچەوسێنرێتەوەو قەرەبووی وێرانکردنی وڵاتەکەیو کیمیا بارانو ئەنفالو گۆری بە کۆمەڵو سیاسەتی پاکتاوی رەگەزی بدرێتەوە.. رژێمەکانی عیراق لەبەر ئەوەی بڕوایان بە کوردو مەسەلەکەی نەبووە هەمیشە لە سەنگەری لەناوبردنیدا بوون.

دەوڵەتی عیراق لە دوای ئازاد کردنیەوە، لە یەکترازاوە هیچ مەرجێکی دەوڵەتی تیادا نەماوە، بۆتە وڵاتێکی داگیرکراو لە لایەن هاوپەیمانانەوە، ئەمیرکاو هاوپەیمانان سەرپەرشتی بەڕێوەبردنی دەکەن.. ئاسایشو ئارامی لە شارەکانیدا نەماوە.. هەر گروپو لایەنو حزبە خۆی بە نوێنەری خەڵکی عیراقو خۆی بە خاوەنی عیراق دەزانێت، تەنها ناوچەیەك ئەمڕۆ لە عیراقدا ئارامی تیادا بێت کاروئەرکی هاو وڵاتیان لە ڕووی ئیداریو بەڕێوەبردنەوە بە بێ کێشەو گرفت بەڕێوە بچێت وەکو کاری حکومەتی تەنها ناوچەکانی سنووری حکومەتی

هەرێمی کوردستانە بە هەردوو ئیدارەکەیەوە، لە عیراقدا هەر کوردستانە پەرلەمانێکی هەڵبژێردراوی هەبێت دوانزە ساڵە ناوچەکانی کوردستان، بە دەسەڵاتێکی کوردی، بەبێ دەسەڵاتی مەرکەزی بەغدا بەڕێوە دەچێت....

دەبوو پەرلەمانی کوردستان و حکومەتی هەرێمی کوردستان لە دەمەزراندنیانەوە، ئاڵای کوردستانیان لەسەر تەلاری پەرلەمان و هەموو دامودەزگاکانی حکومەتی هەرێم بەرز بکردایەتەوە.. تا ئازاد کردنی عیراق ئەوە نەکراوە بە بۆچوونی من کارێکی باشمان نەکردووە، خۆ ئەگەر لە سەرەتای دامەزراندنی پەرلەمان و حکومەتی هەرێمەوە، ئەوە بکرایە دڵنیام ئێستا، ناڕەزایی و هەوڵدان بۆ بەرز نەکردنەوەی و داگرتنی پێدانەدەگیرا.. خەڵکی کوردستان، کە لە کەرکووک و شارەکانی دەورو بەری لە خانەقین و دەوروبەری لە موصڵ و دەوروبەری ئازاد کران، لەبەر تینوێتییان بۆ ئازادی گەڕانەوەیان بۆ ژێر سایەی حکومەتی هەرێم، پەلاماری وێنەو پەیکەری سەدام و هەموو دەزگایەکی دکتاتۆریان داو بە خۆشی و ئازادییەوە بەبێ هیچ راسپاردەو رێنمایی کردنیان، ئاڵای کوردستانیان لە سەربانی ماڵ و سەرشەقام و گۆڕەپانەکانی ناو شاری کەرکووک و شوێنەکانی‌تر هەڵکرد.. ئەو خەڵکە مافی خۆیەتی شانازی بە ئاڵاو بوونی نەتەوەییەوە بکات، ئاڵا لە سەر ماڵ و ناو گەڕەکەکانیاندا هەڵبکەن.. چونکە ئاڵا نیشانەی جیاکردنەوەیە.. جیاکردنەوەکە ولاتێ لە ولاتێ نەتەوەیەك لە نەتەوەیەك، یان گروپێ لە گروپێ، تیپێ لە تیپێ، حزبێ لە حزبێ ... دەبینرێت حزبێك ئاڵای حزبەکەی بەرز دەکاتەوە، تیپێکی وەرزشی ئاڵای تیپیکەی بەرز دەکاتەوە، بۆ ئەوەی لە تیپە وەرزشییەکانی‌تر جیا بکرێتەوە، ولاتێ ئاڵاکەی بۆ ئەوەیە لە ولاتێکی تر جیابکرێتەوە واتە رەمزە.. لەسەردەمی رژێمی گۆڕبەگۆڕدا، سەرانی رژێم و کاربەدەستانی، بە پێی سیاسەتی بەعس و سەرۆکی دکتاتۆرییان رازی نەدەبوون، کورد لە کەرکووک و ناوچەی کەرکووکدا بمێنێت.. سیاسەتی تەعریب و تەرحیل و تەبعیسیان پیادەکرد، سەرباری ئەوەش رایان دەگەیاند کورد بۆی نییە باسی کەرکووك بکات، تەنها بۆی هەیە کە بە کەرکووکدا تێپەڕی سەیری کەرکووك بکات. وەکو نەیان دەهێشت کورد لە کەرکووکدا بمێنێتەوە، رازیش نەبوون تورکمانەکانیش لە کەرکووکدا بمێننەوە،

بە هەزاران خێزانی تورکمان ڕاگوێزران و بۆ شارەکانی خوارووی عیراق ڕەوانە کران.

لە دوای ئازادکردنی عیراق هەر کەسانێك، گروپێك، حزبێك، لایەنێك هاواریان لێ هەڵسێت لەبەر ئەوەی کورد لە کەرکووکدا ئالای کوردستانی بەرز کردۆتەوە، بە ڕای من ئەو لایەن و حزبانە کەوتوونەتە بەربەرەکانی بەهەمان بۆچوونی شۆڤینیانەی سەردەمی بەعس و سەدام بیردەکەنەوە، دوژمنانە بە دەسیسەی کۆنە بەعسییەکان و لایەنە ڕەگەز پەرست و شۆڤینەکان، هەڵس و کەوت دەکەن.. خەڵکی کوردستان سەرسامە لە برا تورکمانەکان، لە عەرەبەکانی دانیشتووی کەرکووك، چۆن ماف بە خۆیان دەدەن کە لە سەر خاك و ئاوی کوردستان دەژین، وا بە ڕاشکاوانە بەربەرەکانی کوردو ئالای کوردستان بکەن؟ نازانن.. لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.. هەر ولایەتە ئالای خۆی هەیە؟ لە دروستبوونی حکومەتی عیراقەوە ئالای عیراق لە کوردستاندا هەڵدەکرێت و کوردیش قبوڵی کردووەو هیچ کێشەیەکیشی نەخوڵقاندوە، ئێستاش لەو ڕۆژەوەی ئالای کوردستان لەسەر دام و دەزگاکانی حکومەتی هەرێم لە شارەکانی ژێر دەسەلاتی حکومەتی هەرێمی کوردستان هەڵکراوە، لە گەڵیا ئالای عیراقیش هەڵکراوە، خەڵکی کوردستان، بەرگرییان لە هەڵکردنی ئالای عیراق نەکردووە.. دیارە ئەمە دوو لایەنی هەیە : لایەنی یەکەم کورد لاری نییە لە برایەتی کوردو عەرەب لایەنی دووەم ئەوەیە کە کورد گەلێکی ساریلکەو دڵسافە قبووڵی هەموو شتێك دەکات ...

خەڵکینە.. ئەوان سڵ لە هەڵکردنی ئالایەك بکەنەوە، ئەگەر کورد لەم بارو دۆخە ڕەخساوەی عیراق و ناوچەکەو جیهاندا، داوای سەربەخۆیی و دەوڵەتی کوردی بکات دەبێ چی بکەن؟.. ئایا ئەوان نازانن سەردەمی بەعس و شۆفۆنییەت و خۆسەپاندن و مل هوڕی و پیادەکردنی سیاسەتی ڕەگەز پەرستانە بەسەر چوو، سەردەمی زوڵم و چەوساندنەوەی میللەتێك لەلایەن میللەتێکی ترەوە نەماوە. چۆن هەموو خەڵکی عیراق نەفرەتیان لە سەدام و ڕژێمەکەی کرد، هەر ئاوهاش کورد نەفرەت لە داگیرکەران و سیاسەتی داگیر کردنەوەی کوردستان و پاکتاوی نەژادی دەکات و، بە هەموو ڕێگایەك بەرپەرچی دەداتەوە ڕوو بەرووی هەموو ئەو گروپە سیاسی و مەزهەبی و نەتەوەییە ڕەگەز پەرستانە

دەوەستێتەوە کە دەیانەوێت بە کلتوری بەعس و بەعسێتی دژایەتی خواستی گەلەکەمان و چارەنووسی بکەن...

گەلی کورد لە پێناوی چارەنووسیداو لە پێناوی بەدیهێنانی ئەم رۆژەدا بە ئەندازەی کەمینە نەتەوەکانی عیراق قوربانی داوە، بە درێژایی مێژووی عەرەبی عیراق و تورکمانی عیراق خەباتی کردووە، بە پڕاو پڕی زێی دیجلەو فورات خوێنی رژاوە، ئیتر چۆن رازی دەبێت لاقرتی بە چارەنووس و ئالای بکرێت؟ کورد دەبێت سڵ لەو بۆچوون و سیاسەتە دوژمنانەیەی ئەو گروپ و لایەنانە نەکاتەوە، کە بە کلتوری بەعس رەفتار دەکەن، لە هەموو شوێنێکی کوردستان ئالای کوردستان هەڵبکات، داوای مافی چارەنووسی بکات، ئەمریکییەکان و هاوپەیمانان و وڵاتانی ئەوروپا و دنیا وا لێبکات گوێ بۆ داواو داخوازییەکانی بگرن، ئەگەر، بڕیارێکی لە جۆری دابڕینی کەرکووك لە کوردستان درا، خەڵکی کوردستان بە رێگای رێپێوانی هێمنانەو مانگرتن و خۆپیشاندان و کۆکردنەوەی ئیمزاو پێشکەش کردنی یاداشتنامە، بەگژ هەر بڕیارێکی نادروستدا بچێتەوە کە کار لەسەر خواست و ئاواتەکانی گەلەکەمان دەکات.

کەرکووك، بەپێی مێژوو، بەپێی ژمارەی دانیشتوان، بەپێی مەوقعی جوگرافی، شارێکە کوردستانییە ناکرێت کورد وازی لێبهێنێت، کوردستانییەکەی بسڕدرێتەوە لە کوردستان دابڕدرێت. ئەمریکاو هاوپەیمانان بە نیازی هەر چین لە کەرکووکدا بۆ بەرژەوەندی خۆیان، ئەوە بەرنامەی خۆیانەو کارمان پێی نییە، بەڵام دەرکردنی کەرکووك لە بازنەی جوگرافی کوردستان، کارێکی ناڕەوایەو کورد رازی نابێت ... ئەمڕۆ ئەرکی هەموو حزبە کوردستانییەکانە، پێ لەسەر کوردستانییەتی کەرکووك داگرن و ئەگەر سیاسەتێ، بەرنامەیەك هەبوو دژی ئەوە، بە رێگای کاری سیاسی، دبلۆماسی، دیموکراتی، جەماوەری، بەڵگەیی مێژوویی وتا کاری شۆڕشگێڕانەو پێشمەرگانە داکۆکی لەسەر بکرێت، بێ دەنگی، رازی بوون بە هەموو بڕیارێك، لە پاشەڕۆژدا زیانی گەورە بە گەلەکەمان دەگەیەنێت. بۆ نموونە ئێستا مەسەلەی دانانی دەستوور بۆ عیراق لە ئارادایە.. مەسەلەی هەڵبژاردنی ئالایەك بۆ کەرکووك گفتوگۆی لەسەرە کورد ئەگەر لە دانانی دەستووردا، بە بەرنامە نەچێتە پێشەوە،

رەچاوی ناوچەی کوردستان و دەسەڵاتی دوانزە ساڵەی حکومەتی هەرێم و پەرلەمانی کوردستان نەکات، لە رووی ئیداری و دارایی و سیاسی و جوگرافییەوە ئەوە بە دڵنیایی،دەستوورێك دادەنرێت کە گەلەکەمان دووچاری نەهامەتی دەکاتەوە، بۆیە دەبێت لە دەستووردا ناوچەی کوردستان بە جیا حسابی بۆ بکرێت.. لە کوردستاندا لەسەر ئەو دەستوورە دەنگ بدرێت بۆ کوردستان دادەنرێت، گەلی کوردی لەم بارودۆخەی ئێستاکە هەلێکی بۆ رەخساوە لە عیراق و ناوچەکەدا، پێویستی بە یەك دەنگی، یەکگرتن،یەك پرۆژەی نەتەوەیی هەیە پێشکەشی ئەمریکاو هەموو وڵاتانی دنیا و ئەنجوومەنی نەتەوە یەکگرتووەکانی بکات. ئەگەر هەندێ لایەن رازی نەبن کورد ئاڵای کوردستان لە شارێکی وەکو کەرکووك و شوێنە رزگار کراوەکانی تری کوردستاندا هەڵبکات..! کوردیش ماف خۆیەتی ئاڵای عیراق کە ئەمڕۆ لە گەڵ ئاڵای کوردستاندا بەرز کراوەتەوە، دابگرێت، کورد لەم بارودۆخەی ئێستای عیراقدا بۆ بترسێت، لە چی بترسێت.. سەدام و دکتاتۆریەتی بە سوپا دڕنداکەیەوە، بە دەزگا سەرکوتکەرەکانیەوە نەماوە. تا پەلاماری کوردستان و گەلی کورد بدات، هیچ دەوڵەتێکی ئیقلیمی ناتوانێت وەکو پێش ئازادکردنی عیراق پەلاماری کوردستان بدات، ئەمریکاش سوپای بۆ ئەوە نەهێناوەتە کوردستان پەلاماری کورد بدات. ئەمڕۆ کوردلە عیراقدا لە هەموو ئەو حزب و لایەنە نەتەوەیی و مەزهەبییانە بە هێزترە، کە بە کلتووری بەعس دژایەتی ئاوات و خواستی گەلەکەمان بکەن ... ئەو لایەن و حزبانە ئێستا دەسەڵاتیان نییە بەم شێوە دژایەتی گەلەکەمان دەکەن ئەگەر دەسەڵاتیان بکەوێتە دەست لەو باوەڕەدام لە سەدام و حزبەکەی بۆ کورد باشتر نابن. بۆیە گەلی کورد چەند پێویستە هەوڵی تەبایی لە گەڵ گەلانی عیراقدا بدات دوو چەندان سوور بێت لەسەر ماف و خواستەکانی، پێ لەسەر هەموو داواکارییەکانی داگرێت.. چونکە ئەگەر لەم بارو دۆخەی ئێستای عیراقدا، کورد، نەتوانێت مافە ڕەواکانی مسۆگەر بکات، کە عیراق دامەزرایەوە، زۆر زەحمەت دەبێت بۆ سەندن و مسۆگەرکردنی مافەکانی.

گەلانی عیراق دوای ڕووخانی سەدامی دکتاتۆر، سەدان کێشەی جۆراوجۆر ڕووبەڕووی بۆتەوە ... تا ئێستا هیچ کێشەیەك لە کێشەکان چارەسەری بنەڕەتی نەکراوەو، رۆژانەش کێشەی تر قوت دەبێتەوە، لام سەیرە..

کەسانێك یان لایەن و حزبێك لە جیاتی ئەوەی بەرنامە بۆ چارەسەری کێشەکان دابڕێژن کێشە لەسەر هەڵکردنی ئاڵای کوردستان دروست دەکەن و دەیخەنە ناو کێشە سەرەکی و گرنگەکانەوە ... گۆڕانکارییەکانی عیراق و ناوچەکەو دنیا، بە شێوەیەکە کە لە داهاتوویەکی نزیکدا چاوەڕوانی گۆڕانکاری زۆر دەکرێت، کە زۆر لەو حزب و لایەنانە سەرسام دەکات و ناشتوانن لە بەرامبەری راوەستن، بۆیە باشتر وایە ئەو حزب و لایەنانە، وردترو دوور بینانەتر بیر بکەنەوە، واز لە هەڵچوون و توند ڕەوی و بیری شۆڤینانە بهێنن و خۆیان لە گەڵ واقعی ئەمڕۆی عیراق و ناوچەکەدا بگونجێنن، دڵنیاشیان دەکەم، پێیان خۆش و پێیان ناخۆش بێت، کوردو مەسەلەی کورد، لەم گۆڕانکارییانەدا دوسیەی زۆر لە پێش مەسەلەکانی عیراقەوەیەو هۆشمەندییان ئەوەیە کە خۆیان بۆ گۆڕانکارییەکان ئامادە بکەن و بە عەقڵی سەردەمانە خۆیان رابهێنن و رەفتار بکەن.

کەرکوکی نویٚ ژمارە(٤) تشرینی دووەم ٢٠٠٣

# چاودێری بازاڕ و کەمکردنەوەی نرخی پێداویستییەکانی ڕۆژانە پێویستە

ماوەی چەند مانگێکە دراوی دۆلار و دیناری سویسری و چاپ و تمەن لە بەرزی و نزمییەکی بەردەوامدان، بازاڕ دیاردەی شەیتانبازاڕی بە ئاشکرا پێوە دیارە.. لە گەڵ دابەزینی دراوەکاندا، نرخی پێداویستییەکانی ڕۆژانەی ژیان، لە چاو دابەزینی دراوەکاندا، بە کەمی دابەزیوە. بۆیە لە گەڵ وەرگرتنی مووچەی مانگانەدا، هاو وڵاتیان سەرجەم هاواریان لێ هەڵدەستێت، بێ رامان قسە دەکەن و ڕووی پرسیار دەکەنە بەرپرسەکانی حکومەتی هەرێم، ئۆباڵەکەی دەخەنە ئەستۆی حکومەت.. هاووڵاتیان دیارە لە ڕوانگەی ئەوەوە ئۆباڵەکەی دەخەنە ئەستۆی حکومەت، ( چونکە حکومەت بە بەرپرس دەزانن بۆ خۆشگوزەرانی ژیانی هاووڵاتیان )، پێیان وایە لە ڕووبەڕوو بوونەوەی بارو دۆخێکی ئاوهادا دەبێت حکومەت تووشی زیان بێت نەك هاووڵاتیان.

بەلای منەوە.. ئەم بارەی ئێستا لە کوردستاندا، هاتۆتە پێشەوە چەند هۆکاری دەرەکی و ناوەکی هەیە و هەر یەکەیان بە پێی کاریگەرییان ڕاستەوخۆ کاریکردۆتە سەر بازاڕ و بازرگانی نرخی شمەکەکان لە بازاڕدا. ئەمە لەلایەك و لە لایەکی ترەوە، لە بارو دۆخێکی وادا چەندێ حکومەت و دام و دەزگا بەرپرسەکانی بەرپرسن، ئەوەندەش هاووڵاتیان بەرپرسن و دەبێت هاووڵاتیان وەکو ئەرکی نەتەوەیی و نیشتمانی، ڕۆڵی خۆیان لە خزمەتی چین و توێژە هەژارەکاندا ببینن. بە بێ ئەوەی بە بڕیار و فەرمانی حکومەت نرخی پێداویستی ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵانی خەڵك کەم بکەنەوە، من ناتوانم بڵێم نرخ کەم نەکراوەتەوە، کەم کراوەتەوە، بەڵام لە بارتەقای دابەزینی دراودا نییە.. بۆ نموونە کیلۆی گۆشت جاران بە (٣٥ – ٤٠) دینار بوو ئێستا بۆتە (١٥) دینار بەڵام ( ٤٠ ) دینارەکەی ئەوکاتە وەکو (١٥) دینارەکەی ئێستا کاریگەری لەسەر خەڵك نەبوو.

بۆیە بە پێویستی دەزانم سەبارەت بەو دیاردەیە، چەند خاڵێك بخەمە پێش چاوی دام و دەزگا بەرپرسەکانی حکومەتی هەرێم، بە مەبەستی چارەسەر کردنی کێشەو دانانی ڕێگا چارەیەکی گونجاو بۆی، چونکە کێشەکە بە شێوەیەکە کە بۆتە باسی ڕۆژانەی خەڵك لە هەموو کۆڕ و دانیشتنێکدا..

بۆ ئەوەی پێداویستی ڕۆژانەی هاووڵاتیان، لە چەند جۆرێکدا چڕ بکەینەوە و ئەوانەی قورساییان خستۆتە سەر ژیانیان لەم بوارانەدان : —

١. ئەو کەل و پەل و شمەکانەی بازرگانەکان لە دەرەوەی وڵاتەوە دەیهێننە ناو کوردستانەوە، سەرجەمیان بە دۆلار و تمەن دەکڕدرێن و دەهێنرێن و لە بازاڕەکاندا زۆربەیان بە دیناری سویسری بە هاووڵاتیان دەفرۆشرێنەوە.

٢. ئەو کەل و پەل و شمەکانەی، کە لە ناوخۆدا بەرهەم دەهێنرێن و دێنە بازاڕەکانەوە، وەکو بەرهەمە پیشەسازییەکان، ئاژەڵییەکان، کشتوکاڵی و دانەوێڵەکان.

٣. پێداویستی ڕۆژانە و مانگانەی وەکو کرێی خانوو، دووکان، ئوتومبیل و پاسەکانی هاتوچۆی ناو شار و نێوانی شارەکان و کرێی ئاو و کارەبا و تەلەفۆن و پارەی ڕەسمی ئەو فەرمانگانەی ڕەسم وەردەگرن، کرێی عیادەی دکتۆر و فەحصی تاقیگەی پزیشکی و داو و دەرمان و خواردن و خواردنەوە لە گازینۆو چێشتخانەویانەوباڕەکان و سەیرانگاکان.

سەبارەت بە خاڵی یەکەم.. بازرگانەکان جاران بیانووی ئەوەیان هەبوو کە گومرگ دەکرێن و

گومرگەکانیشیان زۆر بوون. خۆ ئێستا گومرگ هەڵگیراوە.. بۆیە ئەرکی نەتەوەیی و نیشتمانی سەرجەم بازرگانەکانە نرخی شمەك و کەل و پەلەکانیان بۆ بازاڕ کەم بکەنەوە و بۆ ئەوەی دووکاندارەکانی بازاڕیش بە هەمان شێوە نرخ بۆ هاووڵاتیان کەم بکەنەوە. ئەگەر بازرگانەکان و دووکاندارەکان، لای خۆیانەوە ئەو ئەرکە جێبەجێ نەکەن، ئەوە ئەرکی دام و دەزگا بەرپرسەکانی حکومەتی هەرێم کە بۆ هەموو کەل و پەل و شمەکەکان نرخی گونجاو بۆ بەرژەوەندی هاووڵاتیان لە سەر هەموو شمەکەکان دانێن.

دەربارەی خاڵی دوو.. بە هەمان شێوە ئەرکی خاوەن بەرهەمەکانە کە نرخ کەم بکەنەوە و ڕەچاوی بار و دۆخەکە بکەن. ئەگەر نا پێویستە بە زوویی دام و

دەزگا بەرپرسەکانی حکومەت نرخی گونجاو بۆ سوودی خەڵکەکە دانێن. بۆ نموونە کیلۆیەك گۆشت ئێستا بە (٢٠) دینارە و کیلۆیەك گۆشتی مریشك بە (٨) دینار و کیلۆیەك ماست بە (٣ – ٤ ) دینار و پەنیر بە ( ٧ – ٨ ) دینار و دوو چەپك سەوزە بە دینارێك و کیلۆیەك ساوەر بە (٤) دینار و .... هتد بۆ ئێستا هەر هەموویان گرانن. پێویستە بەزوویی ئەو پێداویستییانە نرخی گونجاویان بۆ دابنرێت و هەفتانەش پیایاندا بچنەوە و بیکەنە ئەمر کە دووکاندارەکان نرخەکان لەسەر پێداویستیەکان بنووسن.

سەبارەت بە خاڵی سێیەم.. ئەگەر خاوەن ئەو شتانە لای خۆیانەوە.. نرخەکان کەم نەکەنەوە، پێویستە کە دام و دەزگا بەرپرسەکانی حکومەت بە بڕیارێك نرخی کرێی هەر هەموو ئەو شتانە کەم بکاتەوە و چارەسەرێکی گونجاو دابنێت کە باری سەرشانی هاووڵاتیان سووك بکات. بۆ نموونە کرێچییەك خانوویەکی بە ( ٤٠٠ – ٥٠٠ ) دینار گرتووە , مووچەی ئێستای ناگاتە ئەو بڕە پارەیەی کە بیداتە خاوەن خانووەکە و بۆیە دەبینین چەندین کێشە لە نێوان کرێچی و خاوەن موڵکدا پەیدا بووە.

لە وتارێکی وادا ناکرێت هەموو وردە کارییەکانی پێویستییەکان ورد بکەینەوە و بیان نووسین ئەم جۆرە وتارانە بە مەبەستی ئەوەیە کە لایەنە بەرپرسەکانی حکومی و ئەهلی سەرنجیان بۆ ئەوە ڕابکێشرێت کە دیاردەی کێشەی بەرزو نزمی دراوەکان و بەرزی نرخی کەل و پەل و پێداویستیەکان باری ژیانی هاووڵاتیان قورس دەکات , چاو خشاندنەوەی بە پەلە بەو دیاردەیەدا ئەرکی سەرشانیانە و نابێت کەمتەرخەمی تیادا بکرێت..

ئاڵای ئازادی ژمارە ٥١٩ ٢٠٠٣/٦/١٦

# ئاڵای کوردستان هەژا نمی

ئەو سەردەمەی شێخی نەمر لە داریکەلی بوو , من منداڵ بووم , ڕۆژانە تفەنگچییەکانی سەردانی باوکمیان دەکرد , ڕۆژێ لە باوکمم پرسی , ئەم تفەنگ بەشانانە چین و بۆ ڕۆژانە هاتوچۆ دەکەن؟ باوکم وتی ئەوانە سوارەی مەلیک مەحمودن.. کە مەلیکی کوردستانە ! ووتم ئەی بۆ لە داریکەلی دانیشتووەو ناچێتە سلێمانی؟ وتی لەترسی حکومەت.. چونکە دژی حکومەتە.. , دەیەوێت کورد بکاتە دەوڵەت کە بووینە دەوڵەت سکەو ئاڵاو سوپای خۆمانمان دەبێت.. بە زمانی خۆمان دەخوێنین.. وتم ( ئاڵا) چییە؟ وتی هەموو میللەتێك کە دەوڵەتی هەبوو ئاڵای تایبەتی خۆی هەیە.. ئێمەش کە بووینە دەوڵەت دەبێت ئەو ئاڵایەمان هەبێت.

ساڵ هات و ڕۆیشت..بە تەواوی فامم کردەوە.. بەهۆی خوێندنەوە , تێکڵاوی مەلا و مامۆستا و قوتابخانەو خوێندکاران و سیاسی و کورد پەروەران بووم. ڕۆژانە.. لە گەڵیاندا باسی ئاڵامان دەکرد.. ئیتر ئاڵای کوردستان بوو بە بەشێك لە کاری ڕۆژانەمان و.. لە ناو دەفتەری خوێندندا لە گەڵ هاوڕێ خوێنکارەکانمدا , نەخشەمان دەکێشا.. کار گەیشتە ئەوەی ئێمە لە ( دڵ و بەرنامەو لە ناو دەفتەرەکانماندا) , (ئاڵای کوردستانم ) هەڵکردبوو.

کاتێ گوشاری داگیرکەرودوژمنانی گەلەکەمان , بۆ سەر بزووتنەوەی کوردایەتی دەستی پێکرد , لە ترسی سیخوڕەکانی ڕژێم , زۆر بە نهێنی ئاڵاکەمان لە دەفتەرەکانماندا , وێنە دەکێشا.

لەو ڕۆژگارەوە , گەلەکەمان وا بۆ نیو سەدە دەچێت بەبێ وەستان و بە بێ کۆڵدان , خەبات دەکات لە پێناوی مافە ڕەواکانیدا. ڕێگا نەما نەی گرێتە بەر , تاوان و کارەسات نەما بەرامبەری نەکرێت.. ڕژێم دوای ڕژێم بەهەموو جۆرە چەکێك و سیاسەتێك پەلاماریاندا. بۆ ئەوەی کورد لە ناو ببرێت و خاك و سامانی بە تەواوی داگیری بکەن , لە هەموو مافێکی ژیان بێبەری بکەن. دوای چەندین ساڵ تێکۆشان و ململانێ، دوای هەزاران قوربانی وماڵوێرانی، لە ساڵی

( ١٩٩١ ) ەوە بە یەکگرتوویی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و جەماوەری ڕاپەڕیوی گەلەکەمان زوربەی زۆری کوردستان ئازاد کرا.. وا (١١) ساڵی ڕەبەقە کورد، دەسەڵاتی کوردستان بە ڕێوە دەبات.. ئەم یانزە ساڵە لە بەر پیلان گێڕی دوژمنان نەتوانرا، ئەوەی هەموو ڕۆڵەیەکی کورد، بە ئاواتێوە بووە و چەندین ساڵ خەباتی لە پێناودا کردووە، ئاشکرای بکات، ئەوەش ( ئاڵای کوردستان )ە.. وا ئەمساڵ لە پرۆسەی ئازادکردنی عیراقدا، ڕژێمی دکتاتۆریەت بە سزای تاوانەکانی گەیەنرا و ئەو شار و شارۆچکە و شوێنانەی کوردستانیش کە لە ژێر دەسەڵاتی ڕژێمی فاشیدا مابوونەوە و کە زوربەیان تەعریب کرابوون ئازادکران..لە ئازاد بوونی ئەو ناوچانەدا، زۆر کورد، فرمێسکی شادی بە چاوەکانیاندا هاتەخوارەوە, خۆم یەکێك بووم لەو کەسانەی کە چوومە خانەقین و کەرکووکی ڕزگار کراو, لە خۆشیاندا ئاو بە چاوەکانمدا هاتە خوارەوە، هەرچەند سەرم دەهێنا و سەرم دەبرد، لەو باوەڕەدا نەبووم بەعس ڕووخابێ و عیراق ئازاد بووبێ، ئەو ناوچانەش لە ژێر دەسەڵاتی ڕژێمی دکتاتۆر ڕزگاری بووبێ , وەکو خەو ببینم وابوو.

لەم ڕۆژانەدا.. لە ڕێگای ڕۆیشتنەوەم بۆماڵەوە , لە بەردەمی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیراندا، دوو ئاڵا بەرز کرابۆوە، یەکێکیان ( ئاڵای کوردستان ) بوو، کە ئەو ئاڵایەم بینی بە بەرزی دەشەکایەوە و ڕۆژەکەی ناوی وەکو ڕۆژ پرشنگی دەدا، بە دەست خۆم نەبووهەژاندمی، فرمێسکی شادی و خۆشی هۆنە هۆن بە چاوەکانما هاتنە خوارەوە، هەر دەڕۆیشتم و لە دڵەوە ئۆخەیم دەکرد لە بەرخۆمەوە دەموت . ئەو ئاواتەی کە لە منداڵیمەوە، بە هیوای بووم، وا ئەمڕۆ هاتۆتە دی، ئەو ئاواتەی لە دڵ و بەرنامە و دەفتەرەکانماندا وێنەمان دەکێشا، بە پێش چاوی دۆست و دوژمنەوە، لە بەردەمی( سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا ) لە هەموو کوردستانیشدا بە بەرزایی باڵای ئاواتەکانمان دەشەکێتەوە.. دیارە چۆن ئازادبوونی کەرکووك و خانەقین و مەندەلی و دبس و شەنگار، خەو نەبوون، هەڵکردن و شەکانەوەی ئاڵای کوردستانیش خەو نییە و ڕاستە و بە دوایا دڵنیام، یەکە یەکەی ئاواتەکانی خەڵکی کوردستان دێنە دی. بێگومان دۆستەکانمان دڵخۆشدەبن و دوژمنەکانیشمان سەرشۆڕ و ڕیسوا دەبن.. شەکاوە بێت ئاڵای کوردستان.دەبا

له ژێرسایەی ئاڵاکەماندا خەڵکی کوردستان بە یە کگرتوویی بژی , خەڵکینە , کوردینە , داوا بکەن , با لە سەر بانی هەموو بارەگایەکی حزب و لایەنەکان , لە گەڵ ئالای حزبەکەیاندا ئاڵاکە هەڵکەن , با لەسەر هەموو دام و دەزگایەکی حکومەتی هەرێم هەڵبکرێت , ئەو ئاڵایەی قازی لە کۆماری مەهابادی جوانە مەرگدا هەڵیکردو زوو داگیرا , با لە کوردستانی ئازادکراو لە دەروازەی هەموو شارو شارۆچکەیەکی کوردستان هەڵبکرێت. من کە دیم کەرکووك و خانەقین ڕزگار کرا هەستم بە بەختەوەریکرد , ئێستا ڕۆژانە کە بەبەردەمی ئاڵاکەدا و لە بەردەمی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا , دێم و دەچم ئاڵاکە دەبینم دەشەکێتەوە دەستی ئۆخەیی و سەرفرازی بەسەر دڵما دەهێنم ئەوەندەیتر بەختەوەر تر دەبم.

# کەرکووك و پێشانگای کتێب

کەرکووك شارە داگیرو تەعریبکراوەکە.. شارە بەند کراوو شێوێنراوەکە، شارە دێرین و خاوەنی زێڕی ڕەش.. سالأنێکە.. بە سیاسەتی چەپەڵی دکتاتۆری بەغدا، پاکتاوی نەژادیت تیا دەکرێت.. (٣٥) ساڵە کراویتە بەندیخانەو خەڵکەکەتت تیادا زیندانی دەکرێت ,(٣٥) ساڵە هەموو سیمایەکی جوانی و شارستانی و کلتوری و فەرهەنگیت دەشێوێنرێت ,(٣٥) ساڵە دانیشتوانەکەت چەواشەو سەرکوێرو لە خشتە دەبرێت, شارە شکۆدارەکە.. دوانزە ساڵە کوردستان ئازاد بووە , بەلأم تۆ چەوساندنەوەی نەتەوایەتی و فەرهەنگیت ئەستوورتر دەکرێت ڕۆڵەکانت لە یەك دادەبڕدرێن و متمانە لە ناو ماڵەکاندا نەهێڵراوە لە سەر هەموو قسەو هەڵس و کەوت و هەڵوێستێ سزای قورس دەدرێن.. هەموو وشەو ناوێکی کوردی قەدەغە کرابوو , قەتابخانەو شەقام و شوێنە گشتی و گەڕەکەکان ناویان گۆڕدرابوو , خوێندنگاکان سەرباری ئەوەی خویندکارەکانی لە زمانی خۆیان بێ بەری کرابوون , بووبوونە بەشێك لە دام و دەزگا سەرکوتکەرەکانی ڕژێم و ڕۆژانە ئەشکەنجەی خەڵکی کوردیان تیادا دەدرا..

وا ئەمڕۆ لە سایەی ئازادیدا , ڕۆڵەکانت و خەڵکە بەئەمەك و دڵسۆزەکانت بێ ترس و سڵەمینەوە.. قسە دەکەن , دخوێننەوە , دەنووسن و بیرو ڕایان دەردەبڕن.. کەرکووك.. چەند بەختەوەرییە , خەڵکە تینوەکەت لە ژێر گوڵی سووری ئازادیدا ئالأی کوردستان لە سەر ماڵەکانیان، لە سەر کوچەو کۆڵان و شەقام و گۆڕەپان و دوکان و کۆگاو بازاڕەکانت هەڵدەکەن..

کەرکووك.. چۆن لە ساڵی ١٩٧٢دا بە (یەکەمین میهرەجانی شیعری کوردی) دانیشتوانەکەت هەژێنرا.. وا ئەمڕۆش وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان بە (یەکەمین پێشانگای کتێبی کوردی).. خوێندەواران و نووسەران و ڕۆشنبیران و تینوەکانی وشەی جوان.. دەبێتە میوانیان و دەیەوێت لە ڕێگای ئەم پێشانگایەوە بچێتە هەموو ماڵە کەرکووکیەکەوەو مندالأنی شارەکەت بە زمانی

خۆیان ئاشنا بکاتەوە.. وا دەبێتە میوانی خانەوادە بێنازو هەژارو بێ تفاقەکەی کتێبخانەی گشتی.. دەیەوێت لە هۆڵەکەیەوە بە پرشنگی ئەدەبو زانستو رووناکبیری هەموو کتێبخانەی ماڵەکان رۆشنکاتەوە.. دەیەوێت گیانی نەمری شێخ رەزا , ئەسیری , خانەقا , جەباری , رۆژبەیانیو بەرزنجیو مەلا حەمدوون زیندوو بکاتەوە , دەیەوێت گۆڤاری شەفەقو باسەرەو گزنگو نێرگز بگەشێنێتەوە.

# کەرکووك و پێشانگای کتێب

کەرکووك شارە داگیرو تەعریبکراوەکە.. شارە بەند کراوو شێوێنراوەکە، شارە دێرین و خاوەنی زێڕی ڕەش.. سالأنێکە.. بە سیاسەتی چەپەڵی دکتاتۆری بەغدا، پاکتاوی نەژادیت تیا دەکرێت.. (٣٥) ساڵە کراویتە بەندیخانەو خەڵکەکەتت تیادا زیندانی دەکرێت ,(٣٥) ساڵە هەموو سیمایەکی جوانی و شارستانی و کلتوری و فەرهەنگیت دەشێوێنرێت ,(٣٥) ساڵە دانیشتوانەکەت چەواشەو سەرکوێرو لە خشتە دەبرێت, شارە شکۆدارەکە.. دوانزە ساڵە کوردستان ئازاد بووە , بەلأم تۆ چەوساندنەوەی نەتەوایەتی و فەرهەنگیت ئەستوورتر دەکرێت رۆڵەکانت لە یەك دادەبڕدرێن و متمانە لە ناو ماڵەکاندا نەهێڵراوە لە سەر هەموو قسەو هەڵس و کەوت و هەڵوێستێ سزای قورس دەدرێن.. هەموو وشەو ناوێکی کوردی قەدەغە کرابوو , قەتابخانەو شەقام و شوێنە گشتی و گەڕەکەکان ناویان گۆڕدرابوو , خوێندنگاکان سەرباری ئەوەی خویندکارەکانی لە زمانی خۆیان بێ بەری کرابوون , بووبوونە بەشێك لە دام و دەزگا سەرکوتکەرەکانی رژێم و رۆژانە ئەشکەنجەی خەڵکی کوردیان تیادا دەدرا..

وا ئەمڕۆ لە سایەی ئازادیدا , رۆڵەکانت و خەڵکە بەئەمەك و دڵسۆزەکانت بێ ترس و سڵەمینەوە.. قسە دەکەن , دخوێننەوە , دەنووسن و بیرو ڕایان دەردەبڕن.. کەرکووك.. چەند بەختەوەرییە , خەڵکە تینوەکەت لە ژێر گوڵی سووری ئازادیدا ئالأی کوردستان لە سەر ماڵەکانیان، لە سەر کوچەو کۆڵان و شەقام و گۆڕەپان و دوکان و کۆگاو بازاڕەکانت هەڵدەکەن..

کەرکووك.. چۆن لە ساڵی ١٩٧٢دا بە (یەکەمین میهرەجانی شیعری کوردی) دانیشتوانەکەت هەژێنرا.. وا ئەمڕۆش وەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان بە (یەکەمین پێشانگای کتێبی کوردی).. خوێندەواران و نووسەران و رۆشنبیران و تینوەکانی وشەی جوان.. دەبێتە میوانیان و دەیەوێت لە رێگای ئەم پێشانگایەوە بچێتە هەموو ماڵە کەرکووکیەکەوەو مندالأنی شارەکەت بە زمانی

خۆیان ئاشنا بکاتەوە.. وا دەبێتە میوانی خانەوادە بێنازو هەژارو بێ تفاقەکەی کتێبخانەی گشتی.. دەیەوێت لە هۆڵەکەیەوە بە پرشنگی ئەدەبو زانستو رووناکبیری هەموو کتێبخانەیماڵەکان رۆشنکاتەوە.. دەیەوێت گیانی نەمری شێخ رەزا , ئەسیری , خانەقا , جەباری , رۆژبەیانیو بەرزنجیو مەلا حەمدوون زیندوو بکاتەوە , دەیەوێت گۆڤاری شەفەقو باسەرەو گزنگو نێرگز بگەشێنێتەوە.

# ئەبێت خەونەبێت..؟

بەدرێژای تەمەنم، چی فرۆکەم دیبێت و هاتبێتە سەرکوردستان بۆ بۆردومانی گوندوناوچەکان بووە. بۆیە لەهەموو فرۆکەیەك دەترسام و بەدوژمنی خۆم و گەل و نیشتمانەکەم دەزانی، مێژووی فرۆکەو هەڵسانی لە سەرئاسمانی کوردستان مێژوویەکی دووردرێژە. لەفرۆکەکانی ئینگلیزەوە کەکاتی خۆی هاتە سەرسلێمانی بۆ دژایەتی شۆڕش بوو.

بەدرێژای مێژووی کورد، ئەوەی بەخوێندنەوە خوێندوومانەتەوە و ئەوەی لەژیانماندا بینیومانە. هەر فرۆکەیەك بەسەر ئاسمانی کوردستاندا سووراوەتەوە بۆمەبەستی لەناوبردن و قەلاچۆکردنی کوردبووە.

یان بۆسەرکوتکردنی کوردبووە. لە شۆڕشی شێخ مەحموودی نەمردا ساڵانی ١٩١٩-١٩٢٢بەداخەوە فرۆکەی ئینگلیز بۆسەرکوتکردنی شۆڕشی کورد دژی شێخ مەحمودی، بۆیەکەم جار قەصفی شاری سلێمانی وناوچەکانی کوردستانی کرد. ئەوکاتە وابوو کورد، هەر فرۆکەیەکی جەنگی بەئاسمانی کوردستاندا سوورابێتەوە بەنیازی سەرکوتکردن و بۆردومانکردنی کوردستان بووە... لە شۆڕشی ئەیلوولدا فرۆکەی میکی روسی چی بەگوندو شاخ ودۆڵ وشارۆچکەی کوردستان نەکرد. کام گوند لە کوردستاندا ریزی صاروخ و بۆمبای گەورەی لە فرۆکەوە بەرنەکەوتووە؟ کام شارۆچەکە ناپالم نەیهەژاندوە؟ کارەساتی بۆردومانی هەڵەبجەو قەلادزێ لەساڵی ١٩٧٤دا بیرناچێتەوە..لەشۆڕشی نوێ خوازی گەلەکەشماندا فرۆکە مەرگ هەڵگرەکان و کوردکوژەکانی کە پێیان دەووت کۆپتەرە کورد کوژەکان، تائێستا سام وترسی لەمێشك و هزری کوردا نەرەویوەتەوە...دوا فرۆکەی مەرگی کورد، ئەو فرۆکانە بوون کە ئاسمان و زەوی هەڵەبجەیان ژەهراوی کرد... هەزاران کوردیان خنکاندن. ئەو فرۆکانە لە شێخ وەسانان و عەسکەرو شاناخسێ وشارباژێر سەوسێنان و ناوچەی بادینان و ناوچەکانیتر هەرگیزاوهەرگیز بیرناچێتەوە، بۆیە کورد فرۆکەبە یەکەم دوژمنی خۆی دەزانێ کەچەکی مەرگی کوردی هەڵگرتووە، بێ بەزەییانە کوردی

پیدەکوژێت و گوندوشاری کوردی پی ویران دەکات..تەنانەت ئەو فرۆکانەی جەنگیش نەبوون کە لەپایتەختی عیراقەوە یان لەکەرکووك و موصلەوە هاتوونەتە سەر ئاسمانی کوردستان. بەمەبەستی دانانی نەخشەوپلانی دوژمنکارانە هاتوون و، هەرگیز بەنیازپاکی نەبینراون، لەوکاتەوەی هێرشی هاوپەیمانان بۆ رووخانی رژێمی دیکتاتۆری بەغدا دەستی پێکردووە...خۆشبەختانە چەند رۆژێکە دەنگ وگرمەی فرۆکە ئاسمانی کوردستانی پڕکردووەو، شەوانەو رۆژانە دێن و دەچن. خۆشی لەوەدایە ئەوفرۆکانە لەجۆری ئەو فرۆکانەی سالانی زوونین. فرۆکەیەك نین بۆ دوژمنایەتی کوردو لەناوبردنی کوردو خاپوورکردنی کوردستان بسووڕێتەوە، بەڵکە فرۆکە گەلێکن لەوفرۆکە خانانەوە هەڵدەستێ کەکاتی خۆی رژێمی بەغدا بۆ فرۆکە کورد کوژەکانی دروست کرد، ئێستا ئەو فرۆکانە لەو فرۆکەخانانەوە هەڵدەستن مەرگی تیرۆریستان و دوژمنانی ئەم گەل و خاکە بۆقەلاچۆکردن و لەناوبردنیان بۆ مێشك پووت و بەکرێگیراوانەی بەعس، کە لەلایەن موخباراتی عیراقیەوە سەربەرشتی دەکرێن. ئەو فرۆکانە هەڵدەستن بۆ لەناوبردن و تێك وپێکدانی بنکەو سوپای داگیرکەری عیراق، بۆ بەرەو پێش چوون بۆ رزگارکردنی کەرکووك و خانەقین و جەلاولا بۆ ئابلوقەدانی سەدامی دکتاتۆرو گرتنی پایتەختی بەغدا، بۆ رزگارکردنی شاربەشاری کوردستان وعیراق، چەند رۆژێکی خۆشە کەدەبینین ئەو فرۆکانە فرۆکەی دوژمنەکانمان نین و فرۆکەی دۆستەکانمانەو هاتوون پارێزگاریمان لێبکەن ولاتەکەمان لە دکتۆریەت پاکبکەنەوە.

بۆیە لەخۆم دەپرسم و خەڵکی کوردیش پرسیار دەکات تۆ بڵێی ئەم شتەو ئەم گۆڕانکاریە خەونەبێت؟ فرۆکەی جەنگی بەسەر کوردستاندا بسووڕێتەوە بۆ کوشتنی کورد نەبێت؟ بۆ پارێزگاری لە کوردهاتبێت بەراستی ئەم رۆژە ئەو رۆژەیە وەکو خەوبیبنیت وایە.

# کێن ئەوانەی کاری تیرۆریستی
# دژی ئازادی کوردستان ئەنجام ئەدەن؟

رژێمی بەعسی فاشی بەغدا (٣٥)ساڵی رەبەقە تۆویی بەدرەوشتی لە ناو گەلانی عیراقدا ئەچێنێت. بەراستوچەپدا خەڵکی عیراق دائەپلۆسێ و تالاوی شەڕو کوشتنی پێ ئەنۆشێ، رژێمی بەغدا جگە لەدەردو مەینەتی هیچ خێروخۆشییەکی بەگەلانی عیراق نەبەخشیوە..کوردستانی ژێر دەسەڵاتی ئەو رژێمە فاشییە بەشی وێرانەیی و خابوورکردن بووە. رێگای نامەردانە نەما بۆ لەناوبردنی گەلی کورد بەکاری نەهێنین. چەکی قەدەغەکراوی کیمیاوی بێ شەرمانە لەدژی گەل و نیشتمانەکەمان بەچەند شێوە بەکارهێنا..

گەرای بەدرەوشتی بەچروپڕی لەناو کوردستاندا بڵاوکردەوە، ئەو کەسە نەفز نزموبێ رەوشتانەی، بێ هۆشانە ئەو گەرایەی رژێم لەناو مێشك و رەووشتیاندا چاندی کردو بەپوول وپارەو پایەی چڵکاوخۆری لەخشتەبران هەڵ خەڵەتان و بەفیکەیەکی پیاوێکی رژێم سەری برای خۆیان ئەبڕی و پێشکەشیان ئەکرد و، پاداشتیان پێ وەرئەگرت و دەیان کاری ناجوامێرانەو بەدرەووشتیان ئەنجام ئەدا.

هەر ئەوکەسانەبوون بەفیتی ئەوان و بەپێش چاوی ئەوانەوە هەشت هەزار مێرد منداڵ و کورو پیاوی بارزانیان بەزیل وئیڤا گواستەوەو رەوانەی کورەی رەشی بەعسیانیان کردن و بەئاو هاتن و بەئاگر رۆیشتن. ئەوکەسانە بوون. بۆ کیمیا بارانی هەڵەبجە بوونە چاوساغ و یارمەتیدەری سوپای داگیرکەرو ئەنفالی(٥) هەزار گوندو ١٨٢هەزار یان کرد ئەوکەسانە بوون بۆ هەڵپەی شڕە خۆری و تالان، دێ بەدێ ناوچە بەناوچە دەکەوتنە پێش سوپا بەدرەوشتەکەی بەعس، کوردستانیان خاپووروویرانکرد. هەر ئەوکەسانە بوون بەشانازییەوە حەوشەو ماڵیان لەکەلوپەلو مریشك و حەیوانی ئەو گوندە خاپوور کراوانە پڕکرد...بەڵێ ئەو نەفس نزمانە بوونە هۆی مەرگەساتی گەلەکەمان.. کاتێ

راپەڕینەکە ئەوانەی کە شەڕواڵی شەرەفیان فڕێ نەدابوو، بەیەك بانگەواز ئاوێتەی خەباتی گەلەکەیان بوون و، شەقییان لەجۆو ئاخۆری هەڵداو ملیان بۆ ئەمری واقیع دانەواند، ئەوانەش کە بەنەخوێنەکەیان لەدەست خۆیاندا نەمابوو، ملیان شکاند کلکیان کرد بەناو گەڵیاناو بەدۆڵا خۆیان گەیاندەوە باوەشی باوکە بدرەوشتەکەیان، زۆرشیان تائێستا لەکوردستاندا ماونەتەوەو بەهۆی دیاردەی ململانێی حزبایەتیەوە، ئەوانە لە کرداری رابووردوویان قوتاربوون...بەلام مەسەلەیەکی کوردی ئەڵێت سەگ لەقەسابخانە نەتۆپێت رەنجی بەخەسار ئەچێت.

ئا ئەو بەدرەوشتانەی دوێنێ چۆن چەند ماڵە پێشمەرگەیەکیان داگیرکردو بووە مۆڵگای بەدرەوشت و تاوانباری، ئەمرۆش هەر ئەوجۆرە کەسانە لەجیاتی ماڵی پێشمەرگە ماڵەکانی خۆیان کردووە بەمۆڵگاو هەمان و دەستەی چڵکاوخۆری جارانیان لەدەورەو بەهەمان سەیارەو چەکەوە بۆ هەرشوێنێ مل ئەشکێنن دزوپیاو خراپەکانی لەگەڵدا کاریان پێکردوون هەر بەدوایانەوەن...بانکەکانی حکومەتی هەرێم لەهەموو شارەکان شوێنی شکاندنەوەو گۆڕینەوەی پارەوپوولیانە، چەندیان کردووە تائێستاش بەردەوام لە دزی وتالانی کوردستاندا هەر بەردەوامن. ئەوانە لەبارودۆخی ئازادی کوردستاندا هەلیان بۆ رەخساوەو پەیوەندییان بەپیاوەکانی رژێمەوە کردۆتەوەو، کلکیان لە کەرکوك و خانەقین وموصل وبەغدا تۆزئەکات، وەکو سەگ خۆیان مەلاس داوەو رۆژانە چییان پی ئەسپێرێت ئەنجامی ئەدەن.. هەر ئەوانەن تەقە لەرێکخراواخیرخوازو دەزگا دەولیەکان ئەکەن و مین و سەیارەی بەمین چێنراو لەناوبازاڕو شوێنە گشتییەکاندا دا ئەنێن و ئەیتەقێننەوە..کەسانیترنییە هەر ئەوانن هەر هەموو لەورێکخراو گروپ وحزبە جیاجیایانە کۆبوونەتەوە، لەسایەی دیموکراتی و ئازادی کوردستاندا کاری شۆڕشیان لە ئەستۆگرتووە، راوبۆچوونی جیاوازیان لەمەڕ حکومەتی کوردستان هەیە هەرگیز کاری مەرانەناکەن، زۆربەیان لەدەزگاکانی ئاسیشدا گیراون ئەگەر سەیری دۆسییەکەیان بکرێت، زۆر بەچاکی دەرئەکەوێت کۆنە جاسووس و ئەڵقە لەگوێیەکانن کەواتە ئەوانەی کاری تیرۆریستی ودزی و تالانی و کوردستان

ئەنجام ئەدەن هەر کاسەلێسەکانی کۆنی رژێمن و ئەمڕۆ گورگ و مەڕیان ئاوێتەی یەککردوە.

دەزگاکانی ئاسایش بەلیستەناوی گومان لێکراوان دەدەنە ویستگەکان و ئەوانیش بەپێی ئەو لیستانە سەرنجی شوناسنامەیان دەدەن لە هاتوچۆیاندا سەبارەت بەبازگەکان چاکتروایە.

بازگەی ویستگەی گومرگ بازگەیەکی جیاوازبێت، تەنها لەسنورەکان هەبێت، چونکە کاری گومرگ زۆر کاردەکاتە سەرکاری پشکنین و ناسینەوەی تاوانباران، واتە بەهۆی گومرگەوە پیاوخراپ دەربازدەبن و بەدەربازبوونیان کاری تیرۆریستی ئەنجام ئەدەن.

# کێشەی پارەو مەترسییەکانی و چارەسەرێکی گونجاو

ماوەیەکە کێشەی دابەزینی(دۆلار)و بەرزبوونەوەی دیناری سویسری و بەدوایاندا یۆرۆ وتمەن و دیناری چاپ سەری هەڵداوە، بۆتەخەم و مایەی بیرکردنەوەی سەرجەمی خەڵکی کوردستان.

دەمەوێت لەم بارەیەوە، راشکاوانە بدوێم و ئەوەی بەپێویستی دەزانم بەنووسین بیخەمەپێش چاو.

١. لەدوای راپەڕینەوە دیناری سویسری پارەی بەکارهێنراوە لەهەموو بازاڕو دام و دەزگاکانی حکومی وحزبی لە کوردستاندا.

٢. دیناری چاپ بەهیچ شێوەیەك لەکوردستان کاری پێنەکراوە، تەنها بۆ ئەو کارو ئاڵ و گۆڕو بازرگانیانە نەبێت، کەلە دەرەوەی سنووری هەرێمی کوردستان بەکارهێنراوە بەتایبەتی لەگەڵ شارەکانی دەرەوەی کوردستان لەعێراقدا.

٣. پارەی تمەنی ئێرانی پارەیەکە بۆ کاری بازرگانی و هاتوچۆ بۆ ئێران کاری پێکراوە.

٤. دۆلار..پارەیەکی بەهێزبووە، بەبراورد لەگەڵ دیناری سویسری لە کاری بازرگانی وڵاتانی دەوروبەرو ناوخۆشدا بەکار هێنراوە.

٥. یۆرۆ.. پارەیەك بووە لە دەرەوە هاتووەو گۆڕدراوەتەوە بە دیناری سویسری و لەهیچ مامەڵەیەکدا بەکار نەهێنراوە.

بەرای من دەبوو هەموو دەسەڵاتە کوردییەکەی کوردستان، هەر زووبیریان لەمەسەلەی پارەو پولەکان بکردایەتەوە...لەبارودۆخی وەکو ئێستادا نەبوایەتە کێشەو گرفتی بۆ خەڵکی کوردستان دروستنەکردایە. ئەوەش بەئاسانی دەتوانرا لەکاتی خۆیدا چارەسەربکرایە. بەوەی...بەبڕیارێکی مەرکەزی هەردوو دەسەڵاتە کوردییەکە، ئەو دراوانەیان..لەکاری دەزگاکانی حکومەت وبازرگانی و مامەڵەی رەسمی کاری پێ بکرایە.دراوی دۆلارویۆرۆ دیناری چاپ و تمەن و لیرەی تورکی هاوشانی دیناری سویسری بەکاربهێنرانایە، من کەس تاوانبار

ناکـەمو پەنجـە بۆکـەس درێژناکـەم. بـەڵام ئەوەنـدە دەڵـێم ئەوکەسـانەی وایـان لەبەرپرسان و خاوەن دەسەڵاتداری کوردستان کرد، بۆ بەوشێوەیە سەیرکردن و مامەڵەکردن بەدیناری سویسری کارێکی باشیان نەکرد چونکە کاتێك کاڵایەك یان دراوێك وەلا دەخرێت و پشتگوێ دەخرێت لەجێگای شتێکیتر بەکار بهێنرێت کە کارنەکاتە سەر بازاڕو دەرامەتی خەڵك و زیان پێگەیاندنی. دیارە ئەو بڕیارەی دایـان بـۆ مامەڵەنـەکردن بـەدیناری سویسـری بیانـەوێت و نەیانـەوێت کـاری راسـتەوخۆی کـردە سـەر دەرامـەتی خـەڵکی کوردسـتان و بـازاڕی بەتـەواوی شـێواندو ئـابوری کوردسـتانی تێکـداوە.. ئۆبـاڵی ئـەو دیاردەیـە هەرهـەموو لەئەستۆی ئەو کەسانەدایە.

# تەنها مەرگی ئازیزانمان بیرەوەرییەکانمان پێدەدرکێنێ

—هاورێم لەهاوینی حەفتاویەك و لەگوندێکی سیوەیلی بناری گمۆدا بۆ یەکەمجار یەکترمان ناسی..ئەو کاتە کادرێکی لێهاتووی ناو جوتیارانی دەڤەرەکە بوویت و خۆشیان دەویستیت. لەهاوینی حەفتاو چوارو لەناوچەی قەرەداغ یەکەمان بینییەوە...لەوێوە بوینە هاورێ...ئەوسەردەمە حەمەڕەشیدی گوستاغ و بەهیمەت و کادرێکی پێشمەرگە ئاساو سیاسیەکی هۆشیارو پیاوێکی کومەڵایەتی ناوچەکە بویت..گوند بەگوندی بناری شارەزوورت بەسەر دەکردەوەو خەڵکە کەیت ڕێکدەخست و ڕێبازی کوردایەتیت فێردەکردن..دەتناسین و دەیان ناسیت، متمانەت پێیان بوو، متمانەیان پێدە کردیت..ئەو ڕۆژانەی بەهۆی بارودۆخی ناوچەکەوە..بنکەو بارەگاکانمان کەوتە بەرزنجەو ئەحمەد ئاواو خورماڵ..لەگەڵ دژواری ناوچەکە تۆخۆت نەدەگرت..قایل نەبووی دانیشیت..بە بەردەوامی لەجەولەی ناوچەکەتابوویت،..ئەوساڵە بەهەموو سەختی و ناخۆشییەکانییەوە، تۆهەمیشە گەشبین و قسەخۆشی کۆڕو کۆبوونەوەکانمان بویت. ساڵی حەفتاو پێنج مەرگەساتی هەرەس و دابڕدابڕیکردین..بەڵام من و تۆ لەیەك دانەبڕاین..بەیەکەوە تاڵاوی نسکۆمان لە ئۆردوگای دووئاوان و سەریاس دەچەشت..ئەو ڕۆژەی بەمەبەستی چارەنوسی شۆڕش بۆ کرماشان و لەوێوە بۆ مەهاباد کەوتینەڕێ..لەمەهاباد بەئارەزووی دڵت گاڵتەجاڕیت بەزۆر سەرکردەو لێپرسراوی ڕوخاوەدەکرد..بەقسەو نوکتە جنێو ئامێزەکانت، پلاری یەك لەدواییەکت تێدەگرتن. ئەوڕۆژە چەند گەشایەتەوە کەشەهید شێرکۆی شێخ عەلی هەواڵ و بەرنامەیی نوێی لەسەردەشت بۆباسکردین. عەسرانێك لەشەقامێکی شاری بانە پیاسەمان دەکرد..لوتمان تەقی بە لوتی چەند ئەفسەرو سەربازێکی عێراقیدا. سەرسام بووین..وتت سەیرکە ئەمانە بەسەرکەوتووی گەیشتوونەتە کوێ و ئێمەش لەکوێین. هاوڕێم..لەئۆردوگای سەریاس، بڕیاری گەڕانەوەمان دا..لەپێشی ماشێنەکەدا، کەبەڕێوەبووین بۆسنوور..وتت..چۆن

ڕەنج بەباو سەرگەردان بووین. دەڵێی بەسەر دڕکە زیدا ڕامدەکێشن..خۆزگە دەکوژرام و ئەم ڕۆژەم نەدەبینی..بیرمە عەسرێکی هاوینی حەفتاوشەش سێ قۆڵی لەگەڵ شەهید مامۆستا جەمال دا بەرەو شارەزوور کەوتینە ڕێ، کلکەی چەناخچیانت هەڵبژارد، لەبالأنتەران دانیشتن، دانیشتنێکی چەند خۆش بوو، کە بەڕاشکاوی تاوتوێی بۆچوونەکانمان دەکرد..مامۆستا بەپێکەنینەوە باوەشی پیاکردی‌و ئەملاوئەولای ماچکردیت. هەشتاکان..هەفتانە لەگەڵ کاك نوری شەوانمان بەیەکەوە بەسەردەبرد، کۆڕەکەت بەقسەو نوکتەی خۆش گەرم دەکرد..ڕۆژانی شومی ئەنفال‌و ڕاگواستن ئۆقرەت نەبوو..زوو زوو لەگەڵ کاك نوری پەیدادەبوون‌و بەرنامەتان دادەناو شوێنێکتان هەڵدەبژارد..بەیانییەك لەکاتی هێرشەکانی ڕژێم بۆ سەر سەرکردایەتی‌و دۆڵی جافایەتی..سێ‌قۆڵی بەرەو دوکان کەوتینەڕێ بۆئەوەی هەواڵێك بزانین، لەوێ تەنها مەلا عابیدمان دەناسی..بینیمانەوە..زۆر شپرزە بوو..لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد..وتت ئەوەی ناوێت..ئێستاهەواڵ چییە؟ ئێمە لەسلێمانییەوە بۆ ئەوە هاتووین..وتی هەواڵ باش نییە..هاوڕێم..تۆ هەردەم پیاوی بەهیمەت‌و خۆ ڕاگری ڕۆژانی سەخت‌و دژوار بویت..پیاوی تەنگانەو خاوەن هەڵوێست‌و هەڵسانەوە بوویت..بۆیە دوای ئەنفال‌و ڕاگواستن، وەکو تێکۆشەرێکی خاوەن ئەزموونی ڕێکخراوی سلێمانی، جگە لەکارەکانی ڕێکخستنی نهێنی کردبویانی بەئەڵقەی پەیوەندی نێوانی ڕێکخراووەمەفرەزە پارتیزانەکانی گەرمیان‌و قەرەداغ، مشووری یەکە یەکەی مەفەرەزەکانت دەخوارد..زۆرجار لەسلێمانییەوە خواردنی گەرمت پێدەگەیاندن‌و لەگەڵت دەخواردن.. هەمووجار باسی دڵسۆزی‌و پیاوەتی کاك صالحی حەمەخانت دەکرد. لەیادمە کاتێ هەواڵی شەهید بوونی مەلا ئەحمەدو هاوڕێکانت پێگەیشتبوو، چۆن کفرتدەکردو بەداخ‌وخەمەوە باسی کارەکەتدەکرد. ئای لەوڕۆژەی کە هەواڵی کاك ئازادی سەگرمەو هاوڕێکانیت زانیبوو..بەیانی خەریکی دوکان کردنەوە بوم پەیدابوویت.. شپرزە بویت لەخەمیاندا بویت هەر زوو مشوری پزیشك‌و دەرمانت بۆ خواردن..بەسەرکەوتنی نەخشەی گوێزانەوەی کاك ئازاد لەگەرمیانەوە بۆ سلێمانی چەند دڵخۆشی کردبویت. بەپێکەنینەوە هاتیت بۆلام..ئەو شەوەی بۆ بەیانی نەشتەرگەری زەرعی گورچیلەت بۆ دەکرا بەتەمای کاك نوری بووی نەهات، وتت کاکە

هێڵێکمـان لەدەربەنـدیخان هەیـە تـەنها پەیوەنـدییان بەمنـەوە هەیـە. با نهێنـی هێڵەکەت لابێت ئەمە دنیایە، با ئەو هێڵەو برادەرەکانی نەپچڕێن. لام سەیردبوو لەو شەووساتە وەختەدا تۆ بەیانی قورسترین نەشتەرگەریت بۆ دەکرا، لەخەمی ڕێکخسـتن‌و کارەکـانی ڕێکخسـتن‌و هەڤاڵـەکانتا بوویـت. هـاوڕێم..ئـەو ڕۆژەی لەلایـەن دەزگـای ئەمنـەوە گـیرام، مەوعیـدمان بـوو لەگـەل کـاک نـوری بچـین بـۆ عەربەت، کە ئێمە حوکم دراین‌و ڕەوانەی بەندیخانـەی ئـەبوغرێب کـراین، هێشتا کـەس مواجەهـە نـەکرابوو..کـاتێکم زانـی بـانگکرام بـۆ مواجەهـە..چـەند کـات‌و سات‌و ڕۆژێکیـی خـۆش‌و مێـژوویی بـوو، کـە چاوم بـەتۆوکاك نـوری‌و کـاك برایم کەوت، یەکە یەکە باوەشتان پیاکردم..کاتێ مواجەهەشمان دەستی پێکرد لەگەڵ ئەو هەموو خەڵکەدا، یەکەم کەس بوویت کە گەیشتیتەلام..وتت نان بێنن دەمێکە نانمان بەیەکەوە نەخواردووە، با نانێك بەیەکەوە بخۆینەوە.. لە ئـەبوغرێب زانیم کە تۆو کاك نوری‌وکاك برایم چەند شپرزە بوون، لـەدەرگای چـەند کەستان داوە بۆ ئـەوەی قوتارمکـەن.یەکـەم مواجەهـە لێتپرسـیم وتـت لـە برادەرەکانـت کامیـان وەزعـی خێزانیـان لـەڕوی ئابوریـەوە خراپـە، ناوەکانیـانم بـدەرێ بـا هاوکارییـان بکەین..هاوڕێ کاتێ هاوپەیمانـەکان بڕیـاری لێـدانی عێراقیـان دا، بەئازاری یـەك گورچـیلەی زەرع کـراوەوە، لەگـەڵ کـاك نـوری زۆربـەی مواجەهـەکان دەهـاتن. بەرنامـەی وردەکاری ڕاپـەڕینتان بـۆ بـاس دەکـردم..دەتـانوت زۆرتـان نـەماوە بـەم زوانە ئازاد دەبن‌و دێنەوە ناومان..هەر لەبیرمە چەند ڕۆژێکـی مابوو کـە لـەعێراق بدرێت، هـەردوکتان هاتن..وتتان ئیتر ئێمـە ڕەنگـە نـەتوانین وەکـو جاران بێین بۆ لات، چـــەند ڕێنمـــای‌و ئامۆژگاریتـــان پێبـــوو..کـــە ڕاپـــەڕین دەســـتیپێکرد نـەدەهاتی..بـەڵام هـەرجار نامەیـەکی دوورو درێـژت بـۆ دەنووسـیم، بـە هـەواڵی خۆش و نوکتە خۆشەکانت پڕت دەکردەوە. لـە هـەموو نامەیەکدا، باسـی ئـازاری خۆشـت دەکـرد.ماوەیـەك بـوو مواجەهـەکان لـە سلێمانیەوە کـەس نـەدەهات..لـە مواجەهەیەکدا کاتێکم زانی تۆبە جزداشەیەك‌و کاك سـەرحەدو تایـەرو مامۆسـتا عومـەر پەیـدا بـوون..هاتنتـان هێـوری کردمـەوە..چونکە بەتـەمای کـەس نـەبووم، کـاتێکیش بـەربووین..چـەند خۆشـبوو، یەکـەم کـەس بـوون لەگـەڵ کـاك نـوری گەیشـتنە نـاو ئوتۆمبیلەکـەو باوەشـتان پیـاکردم..ڕۆژانـی کـۆنگرەی یەکـەم‌و هەڵبـژاردنی پەرلـەمان‌و مەڵبەنـدی شـارەزوورو، ئـەو ڕۆژانـەی لـەمانگی ئابـدا لـە

قاسمە رەش لەژێر بەناو چادرێکدا بەسەر دەبرد، شەومان بەوردکردنەوەی مەسەلەکان دەبردە سەر لەگەڵ هەموو کێشەو گرفتەکاندا خەمی باری تەندروستی تۆ پرسیاری رۆژانەی لا دروست دەکردمو، رۆژانی کۆنگرەی دوو و، نوکتەکانت بیرناچێتەوە. هاوڕێم..سیانزە ساڵ بوو تۆ بەئازاری گورچیلەو یەك گورچیلەی زەرعکراوەوە دەتلایتەوە..چونکە خۆت پیاوێکی بەهیمەتو خۆڕاگرو بەجەرگ بوویت، چۆن ملت بۆ هیچ دانەدەنەواند هەرواش شانت بۆ ئازار دانەدەنەواند. ئێمە دەمانوت ئەگەر بگەیتە ئەوروپا، تەندروستیت باشتردەبێت، نەمزانی ئەوروپاش دەبێتە سلێمانیو چارەسەری تۆی تیانابێت. کاتێ هاتیتەوە وتت تەواو دەبم، چونکە باوەڕناکەم لە بەغداش هیچم بۆبکرێت..رۆیشتیت نەهاتیتەوە تا شەوی ١٩-٢٠/١٠/٢٠٠١ دڵتەزێنترین هەواڵیان دامێ کە ئەویش مەرگی ناوەختی تۆبوو.

# ئەنفال چییەکان تاوانبارن لێبوردنیان نییە

لە شەستەکانەوە تا راپەڕینی ساڵی ١٩٩١، شۆڕشی کورد و هەر گفتوگۆ و رێکەوتنێکی لە گەڵ حکومەتەکانی عیراقدا کردبێت، لە سەر داوای حکومەتەکان شۆڕش لەو کوردانە خۆشبووە، کە چەکیان بۆ حکومەت هەڵدەگرت و لە دام و دەزگا جاسووسی و حکومیەکاندا کاریان دژی شۆڕشی کورد دەکرد و لە پێناوی پوول و پلەی وەزیفیدا قەڵەمەکانیان دەفرۆشت ... ئەو تاوانبارانە کاتێ کە دەبەخشران، کەسێکیان لە گوڵ کاڵتریان پێنەدەوترا.. زۆر جار وا دەکەوتەوە لە رێز گرتن و یارمەتیدان پێش رۆڵە تێکۆشەرەکانیش دەکەوتن. بە حوکمی لێبوردنەکان، زۆربەیان لە دام و دەزگا حزبی حکومییەکاندا، جێیان دەکرایەوە و پێش دەکەوتن. هەیانبوو، لە گەڵ لێبوردنەکەدا دەهاتنەوە ریزی گەل و نەدەچوونەوە بە قەرەی بەعسدا، هەشیان بوو بە عەقڵی بەعسیانەیانەوە دەمانەوە و، کە کاریشی دەکرد، بە رێنمایی و راسپاردەکانی بەعس هەڵس و کەوتیان دەکرد و گەڵێ جار تۆوی دووبەرەکی و ئاژاوە نانەوەیان لەناو ریزەکانی شۆڕش و گەلەکەماندا دەچاند، کاتێکیش گەلەکەمان لە ساڵی ١٩٩١ دا راپەڕی، زوربەی ناوچەکانی کوردستان رزگار کرا.. لەبەر چەند هۆیەکی تایبەتی ئەوکاتە بە مەبەستی سەرکەوتنی راپەڕین و، سەقامگیر بوونی دەسەڵاتی کوردی و، بنە بڕکردنی بەعس و، دەسەڵاتی بۆ یەکجاری لە کوردستاندا، شۆڕش لێبوردنی دەرکرد.. ژمارەیەکی زۆر سوودیان لەو لێبوردنە وەرگرت و هاتنەوە ریزی میللەت.. هەر چەند تیاشیاندا بوو.. کە چاو ساغ و تاوانبار و ئەنفالچی و خاپوورکەری گوند و شارۆچکەکان بوون و، دەبوو ئەو کاتەش، تاوانبارەکان بە پێی پلەی تاوانبارییان جیا بکرانایەتەوە و پرسینەوەیان لە گەڵدا بکرایە و هەموو وەك یەك لێیان خۆش نەبوونایە، بۆیە دوای ماوەیەك کە بەعس هاتەوە سەر قاچی خۆی و زۆربەیان بەرەو باوانەکەیان بوونەوە، روویان کردەوە ئاخوڕەکانی جارانیان و کەوتنەوە جێبەجێ کردنی نەخشە و پیلانەکانی بەعس و دەزگاکانی، چەندین لەو کەسانەی لە وولاتانی دوورەوە بۆ یارمەتی کورد

هاتبوون کوشتیانن، چەندین کاری تیرۆریستانە و تەقینەوەیان لە شارەکاندا ئەنجامدا، هەر ئەوەشبوو هەموو جەماوەری خەڵکی کوردستانیان وا لێکرد بە ڕاشکاوی لۆمەی هەموو حزب و لایەنە کوردستانییەکان بکەن.

وا وتمان ئەو سەردەمە بەعس و سەرۆکە دکتاتۆرەکەی دەسەڵاتی مابوو، حکومەتی فاشی بەغدا، توانای سەربازی و ئابووری و جاسووسی بەهێز بوو.. سامی ترس باڵی بەسەر خەڵکدا کێشابوو، کەسانێ هەبوون بە نیازی پلە و دەستکەوتی پارە پوول، نەیان دەتوانی بە ئاسانی دەست لەو ڕژێمە هەڵبگرن کە گۆشی خیانەت و تاوانی کردبوون.

خۆ ئەمڕۆ بە هۆی هێزی ڕزگار کەری هاوپەیمانان و پرۆسەی ئازادکردنی عیراقەوە، ڕژیمی دکتاتۆری بەغدا داری بەسەر بەردێوە نەماوە، هەموو عێراق ڕزگاری بووە هاوپەیمانان کون بە کون بە دوای سەرانی دکتاتۆردا دەگەڕێن، کونە مشکیان لێبۆتە قەیسەری.. کۆمەڵێك لە وانەی کە لەلایەن ئەمریکاوە لە لیستی تاوانبارانی جەنگدان بەردەست کەوتوون، لە داهاتوودا دەدرێنە دادگا ... ئەو تاوانبارانە.. ئەو تاوانانەی کردوویانە بەرامبەر بە گەلی عێراق بەگشتی و گەلی کورد بە تایبەتی، دەستکێش و چاو ساغ و جێبەجێ کەریان بوون، لە عێراق و لە کوردستاندا..

تاوانی ئەنفال و کیمیاباران و جینۆسایدو ڕاگواستن و خاپوورکردنی گوندو شارۆچکەکانی کوردستان و گوللە بارانکردن و بە کۆمەڵ کوشتنی خەڵکی کوردستان، لە ڕێگای پیاوە خائن و ئەڵقە لە گوێ کوردەکانەوە نەخشە کێشراوەو جێبەجێ کراوە.. ئەوانە پێشڕەوی سوپاتاوانبارەکەی دکتاتۆر بوون. ئەوانە ماڵ و سامانی کوردیان بە تاڵان برد. ئەوانە دەستنیشانی خەڵکی کورد پەروەریان دەکردو گوللەبارانیان دەکردن.. ئەوانە بوون بە سەدان شیعرو وتارو نووسینیان لە ڕۆژنامە پۆخڵ و گۆڤارە جاشنامەکانیاندا بڵاودەکردەوەو وتارو قسەکانی دکتاتۆریان وەردەگێڕایە سەر زمانی کوردی و، چاپیان دەکردن و بڵاویان دەکردنەوە. ئەوانە بوون بە شان و باڵی دکتاتۆردا هەڵیان دەدا و، شاباشی پیاو چاکی و دەست خۆشی ئەنفال و کیمیا بارانیان لە دوژمن دەکرد. ئەوانە بەحەق خۆفرۆش و دۆڕاوو ئەڵقە لە گوێ و دوژمن بە گەل و نیشتمانەکەیان بوون. ئەوانە تا سەدام و دەسەڵاتە دکتاتۆریەکەی لە ئارادا

مابوو، سەدام باوك وبرایان بوو، ئەوانە دژی نەتەوەو خاکی کوردستان بوون، ئەوانە کوردو خەڵکی کوردستانیان خەڵتانی خوێنکرد، ئەوانە دارو بەردی ئەم خاکە نەفرەتیان لێدەکات.. بە خائین و تاوانبارو وێرانکەرو ئەنفالچییان دادەنێ.. ئەوانە باوکەکەیان گۆڕ بە گۆڕ بوو. ئاخوڕەکانیان بێ ئالف ماوەتەوەوە، دکتاتۆر دەسەلاتی نەماوە دەستی ئافەرینی تاوان بدا بەشانیانداو نۆتەی تاوانباری بە شان وملیاندا شۆڕکاتەوە، ئەوانە لەسەر خوێنی کورد، سامانیان کۆکردەوە، کۆشکیان بەرز کردەوە، هەرچی ڕەفتاری ناشیرینە کردیان...

سەیرە.. زۆریش سەیرەو جێگای سەرسوڕمانە، زۆر لەو تاوانبارانە، بێ شەرمانەو ڕووقایمانە پاش ئەو هەموو تاوانەیان پەنایان بۆ کوردستان و بۆ لای حیزب و لایەنە کوردستانیەکان هێناوە ! دەیانەوێت ئەو کوردستانەی بە چاوساغی ئەوان وێرانکرا، تیایا بحەوێنەوەو خەڵکی کوردیش بە چاوی ڕێزەوە سەیریان بکات

سەیرتر لەوەش.. باوەشکردنەوەی حزب و لایەنەکان و کۆمەڵێ خەڵکە بەناوی عەشایەری و خزمایەتی وبەرژەوەندی بازرگانی، بۆ ئەو تاوانبارو ئەنفالچییانەیە، لەوش سەیرتر، ململانێ لە نێوانی لایەنەکاندا پەیدا بووە، بۆ وەرگرتن و پاراستنیان و پێشوازییان لێدەکرێت و خزمەت دەکرێن و ڕێز دەگیرێن و سەر و سامانیان دەپارێزرێت و ماڵ و منداڵیان نایەڵن تیکەی وشك بخەنە دەمیانەوە.. هانی خەڵك دەدەن سەردانیان بکەن و دڵنەواییان بکەن و دڵنیایان بکەن کە هیچیان لێناکرێت. لە هەموو تاوانەکانیان خۆش دەبن.

بێگومانم لەوەی کە هەموو ئەو حزب و لایەنانە و، ئەو کەسانەی کە دالْدەی ئەو تاوانبار و ئەنفالچییانە دەدەن. زۆربەیان لێیان ڕوونە ئەگەر یەك تروسکەی دکتاتۆریەت لە عیراقدا بمایە و یەك دەرگایەك هەبوایە لێوەی دەربچوونایە و بیان زانیایە سەری خۆیان و منداڵیان دەرباز دەبێت. یەك کەسیان سەریان بە کۆشی یەك لایەن و یەك کەسدا نەدەکرد لە کوردستاندا. خەڵکی کوردستان و هەموو خەڵکی تێکۆشەری گەلەکەمان لە ناو هەموو حزب و لایەنەکاندا.. بە وەرگرتن و دالْدەی ئەو تاوانبارانە ناڕازین و داوا دەکەن کە بە زوویی هەر هەموویان بگیرێن و ماڵ و منداڵ و سامانیشیان دەستی بەسەردا بگیرێت،

ئەنفال چییەکان بدرێنە دادگا و سزا بدرێن، تۆڵەی (١٨٢ ) هەزار ئەنفالکراو و (٥٠٠٠ ) کیمیا بارانی هەڵەبجە، (٨٠٠٠) بارزانی، (٦٠٠٠) گەنجی فەیلی، خاپوور کردنی کوردستان، بە کۆمەڵ کوشتنی خەڵکی کوردیان لێبکرێتەوە.. پێویستە حزب و لایەنەکان گوێ لە داواکاری کەس و کاری شەهیدان بگرن، ئەوانیش دەعوا لەسەر ئەو تاوانبارانە تۆمار بکەن..بە هیچ شێوەیەك لێیان نەبوورن و بەسزای تاوانەکانیان بگەیەنن نەك داڵدەیان بدەن. من دڵنیام ئەگەر حزب و لایەنەکانیش لەو ئەنفالچییانە خۆش بن جەماوەری خەڵکی کوردستان، کەس و کاری شەهیدان، خەڵکی گوندە خاپوور کراو، تالان کراوەکان، لێیان نابوورین داوایان ئەوەیە کە بدرێنە هاوپەیمانان و بخرێنە لیستی تاوانبارانەوە، بە وردی لێکۆڵینەوەیان لە گەڵدا بکرێت، هەوڵبدرێت قولاغی ئەنفالکراوەکان و گۆڕە بە کۆمەڵەکانیان پێدەربخرێت.. خۆ ئەگەر حزب و لایەنەکان لە بەر هەر هۆیەك لەو ئەنفالچییانە دەبوورێن گەلی کورد لێیان نابوورێت.

خۆ ئەگەر لایەن و حزبەکان لەوانە خۆش دەبن و داڵدەیان دەدەن.. ئەوە، ئەوە دەگەیەنێت کە لە دروستبوونیانەوە ڕاستگۆ نەبوون لە بەرنامە و ڕەوتی شۆڕشگێڕیاندا، هەر چییان بە جەماوەر وتوە ! بە ڕاستیان نەبووە و هەر ڕۆڵەیەکی ئەم گەلەش لە پێناوی ئەواندا شەهید کراوە ! ئۆباڵیان لە ئەستۆیانە، کیمیا بارانی هەڵەبجە، ئەنفالکردنی خەڵکی کوردستان هەر هەموو دەکەوێتە ئەستۆیان و ئەوەش لای جەماوەر بەر جەستە دەبێت کە ئەو حزب و لایەنانە بەرنامەی نەتەوەیی و نیشتمان پەروەری و شۆڕشگێڕییان نەبووە، لە پێناوی مەسەلەیەکدا خەباتیان نەکردووە کە پێی وترابێت (مەسەلەی کورد). خۆ ئەگەر جەماوەری خەڵکی کوردستانیش لە حزب و لایەنەکان لەم داڵدەدانە چاو پۆشی بکەن، بەر دەرگایان لێنەگرن و نەچنە سەریان. ئەو تاوانبارانە وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەربچن، ئەوە بە ڕای من کوردیش میللەتێك نەبووە کە خاوەنی مەسەلەیەك بوو بێت کە ناوی ( مەسەلەی کورد) بێت، خاوەنی خاکێك نییە ناوی(خاکی کوردستان) بێت. بۆیە داوا لە هەموو خەڵکی کورد پەروەر و نیشتمان پەروەر و دڵسۆزانی گەلەکەمان دەکەم، ئەوانەی لە ناو ریزەکانی ڕێکخستنی لایەنەکاندان و جەماوەری ڕەش و ڕووتی کوردستان و کەس و کاری شەهیدان و خەڵکی گوند و شارۆچکە خاپوورکراوەکان و کەس و کاری

ئەنفالکراوەکان، دەنگ بەرز بکەنەوە و هاوار بکەن و بە هەموو حزب و لایەنەکان بڵێن دالدەی ئەو تاوانبار و ئەنفالچییانە مەدەن و مەیان پارێزن پێیان بڵێن ئەگەر ئێوەش لێیان خۆشبن، ئێمە هەرگیز لێیان خۆشنابین، دەبێت بدرێنە دادگا و سزای تاوانەکانیان وەربگرن، ئەنفال چییەکان لێبوردنیان نییەو دەبێت تۆڵەی ئەدیب و رووناکبیرە شەهیدەکانیان لێبکرێتەوە. دەبێت بە سزای گەل و حوکمی رەوای یاسایی بگەیەنرێن. نابێت و نابێت لە تاوانباران و ئەنفال چییەکان خۆشبین.. چونکە ئەوانە ئەنفالی کورد، کلتوری کورد، زمانی کورد، فەرهەنگی کورد، مالی کورد، داب و نەریتی کوردو بیری نەتەوەیی و نیشتمان پەروەری کوردو رەگەز نامەی کوردیان کرد.. خۆیان کردە عەرەب و بەعسی و دەیان ویست هەموو کوردیش بکەنە عەرەب و بەعسی. خۆیان روویان لە رەوڕەوەی مێژوودا رەش کرد. دەیان ویست مێژووی کوردیش رەش بکەن، ناوی کوردو کوردستان بسڕنەوە، هەموو خەڵکی کورد لە خشتە بەرن و هەڵیان بخلیسکێنن و بەد رەوشتیان بکەن. تێناگەم عەقڵ رادەوەستێت چۆن ئەو ئەنفالچییانە روویان هاتووە روو بکەنە کوردستان..؟ چۆن ئەو حزب و لایەنانە ئەو ئەنفالچییانە پەنا دەدەن؟ پرسیار گەلێکن تەنهاو تەنها دەبێت جەماوەری گەلەکەمان بە دەنگ بەرزکردنەوەیان بە یاداشت نووسینیان بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان، بۆ هەموو ولاتانی ئەوروپا، بۆ هاوپەیمانان،بۆ حوکمی داهاتووی عێراق و بۆ هەموو حزب و لایەنە کوردستانی وئاینییەکان بەرز بکەنەوەو پێیان بڵێن ئەنفالچییەکان تاوانبارن لێبوردنیان نییە، نابێت لە کوردستاندا دالدە بدرێن، دەبێت بدرێنە دادگاو سزای تاوانەکانیان وەربگرن، دەبێت هەموو کورد دەعوایان لە سەر تۆمار بکات لە دادگای نێو دەوڵەتی و بخرێنە لیستی تاوانبارانی سەرانی ڕژێمەوە بە تاوانی ئەنفال و کیمیا باران و بە کۆمەڵ کوشتنی خەڵك دادگایی بکرێن .

ئەم بابەتە لاپەڕە(٥)ی ژمارە(٥١٦)ی رۆژنامەی ئالای ئازادیدا بلاوکراوەتەوە لە رۆژی ٢٠٠٣/٥/٢٦

# دەبێت هەوڵی جیدی بۆ چارەنووسی ئەنفالکراوەکان بدرێت

گەلی کورد زیاتر لە ( ١٨٠ ) هەزارکەسی لێ ئەنفالکراوە.. لە ساڵی (١٩٨٨) وە تا ئێستا قولاغێکیان نییە.. رۆژانە و ساڵانە باسی ئەنفال دەکرێت تا دکتاتۆریەتی سەدام مابوو، کەس زاتی نەدەکرد، باسی ئەنفال بکات و زانیاری بدرکێنێ.. وا سەدام و دەسەڵاتە دکتاتۆرەکەی بەسەر یەکدا رووخێنرا ئیتر کاتی ئەوەیە گەلەکەمان.. بە هەموو شێوەیەك کار بۆ ئەوە بکات، چارەنووسی ئەنفالکراوەکان و ئەو (٨٠٠٠) بارزانیە دەربخرێت.. بۆیە بە پێویستی دەزانم.. لایەنە سیاسیەکان و حکومەتی هەرێمی کوردستان بەم رێگایانە جەخت بۆ دۆزینەوەی قولاغی ئەنفالکراوەکان بکات : -

١. داوا لە هاوپەیمانان بکرێت، ئەو ئەفسەرانەی بە دیل گیراون یان خۆیان تەسلیم کردووە لە جەیشی عیراقی و سەرانی رژێمی بەعس.. لێکۆڵینەوەی وردیان لە گەڵدا بکرێت بۆ وەرگرتنی زانیاری لە سەر ئەنفالکراوەکان و گوشار بخرێتە سەریان چی زانیارییەك لە سەر ئەنفال دەزانن بیدرکێنن.

٢. داوا لە هاوپەیمانان بکرێت ئەو بەڵگەنامانەی کە لە دام و دەزگاکانی بەعسدا دەستیان کەوتووە، بە وردی لێکۆڵینەوەیان لە سەر بکرێت بۆ ئەوەی بزانرێت چ زانیارییەکیان لە سەر ئەنفال تیادا تۆمار کراوە.

٣. داوا لە هاوپەیمانان بکرێت ئەو زیندان و بەندیخانانەی کە دەدۆزرێنەوە.. پشکنینی وردیان تیادا بکرێت بۆ قولاغی ئەنفال.

٤. داوا لە هاوپەیمانان بکرێت ئەو شوێن و جێگایانەی کە گومان لە سەریان هەیە، ئەنفالکراوەکانیان تیادا شاردۆتەوە. بپشکێنرێن و لێکۆڵینەوەی وردیان لە سەر بکرێت بۆ شوێنەواری ئەنفال.

٥. حکومەتی هەرێم وە یان داوا لە هاوپەیمانان بکرێت، برێ پارە تەرخان بکرێت بۆ هەر کەسێك لە عیراق یان دەرەوەی عیراق زانیاری لە سەر ئەنفال و ئەنفالکراوەکان بداتە هاوپایمانان یان حکومەتی هەرێم .

٦. حکومەتی هەرێم لە ڕێگای هاوپەیمانان یان حکومەتی تازەی عیراقەوە داوا لە ولاتانی دەوروبەری عیراق بکات بە تایبەتی ئەو دەوڵەتانەی دۆستایەتی و پەیوەندی گەرمیان لە گەڵ ڕژێمەکەی سەدامدا هەبووە چ زانیارییەك لە سەر ئەنفال دەزانن.. بیدەنە حکومەتی تازەی عیراق یان هاوپەیمانان وە یان حکومەتی هەرێمی کوردستان.

٧. داوا لە هاوپەیمانان بکرێت ئەو کاربەدەستانەی ڕژێمی بەعسی فاشی کە بە سیفەتی سەفیر و دبلۆماس لە ولاتانی دنیادا کاریان کردووە، کۆبکرێنەوە و لێکۆڵینەوەی وردیان لە گەڵدا بکرێت سەبارەت بە تاوانی ئەنفال، چونکە گومانی نییە تیایاندا هەیە کە هاوبەشی کارەساتی ئەنفالی کردووە و زانیارییان لەسەر ئەنفال هەیە.

کورد لە گەڵ هەموو سەرکەوتنێکدا، دەبێت زامی قوڵی ئەنفالی لا گەورەتر بێت زیاتر و زیاتر بە دوایدا وێڵ بێت و سۆراخی ئەو هەزاران هەزار ئەنفالکراوە بکات و هیچ هۆیەك نەکرێتە بیانوی لە بیر چوونەوە و پشت گوێ خستنی و ئەگەر کورد خۆی دوای کارەساتەکانی خۆی نەکەوێت باوەڕ ناکەم کەسێك یان ولاتێك هەبێت بە خەمی کورد و مەرگەساتەکانیەوە بێت. باشترین ڕۆژە کە بۆ گەلەکەمان ڕەخساوە بۆ دۆزینەوەی قولاغی ئەنفالکراوەکان.

لە ژمارە(٣٠٦٥)ی ڕۆژی ٢٠٠٥/٥/١٤ی دواستوونی کوردستانی نوێدا بلاوکراوەتەوە

## خانەقین گوڵاڵەی سووری ئازاد کردنی دەواری ڕەشی تەعریب و تەرحیل و تەبعیسی لەتوپەتکرد..

لە حەفتاکانەوە بەعسی فاشی بەغدا، بە بەرنامەیەکی داڕێژراوی ڕەگەز پارستانەی بەعسیانە.. دەستی کردە سڕینەوەی سیمای جوانی ئەلوەنی شاری خانەقین. بە سیاسەتی ( تەعریب و تەرحیل و تەبعیس ) و بە مەبەستی ئەوەی شارەکە و هەموو ناوچەی خانەقین بە تەواوی عەبای تەعریب بە باڵای بپۆشێ و خاکەکەی لە کوردستان و خەڵکەکەی لە گەلی کورد دابڕێت.. بۆیە زۆرینەی خەڵکی شارەکەی بە چەند بیانوویەکەوە دەرکرد و هەموو خەڵکی گوندەکانی لە گوندەکانیان ڕاگواست، عەرەبی هێنانە شوێن و نیشتەجێی کردن. دەستی بە سەر سامان و ماڵ و موڵکیاندا گرت و لە زیدی خۆیان بێبەریان کردن.. لە ژێر گوشارێکی توندی بەعسیانەدا کەوتنە تەبعیس و تەعریب کردنی ئەو کوردانەی مابوونەوە.. کار گەیشتە ئەوەی لە ٦٤٪ دانیشتوانی شارەکەیان کردە عەرەب. لە کاتێکدا خانەقین نەك گوندەکانی یەك ماڵە عەرەبی تیادا نەبوو. بەڵکە شاری خانەقینیش جگە لەو پۆلیس و فەرمانبەرە عەرەبانە نەبێت کە بە هۆی سیاسی، یان وەزیفی دەگوێزرانەوە بۆ خانەقین یەك ماڵی عەرەبی تیادا نەبوو.

لە ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ دا، هێزی پێشمەرگەی کوردستان و خەڵکی ڕاپەڕیوی ناوچەکە توانیان چەند گوندێکی تەعریب کراو لە تەعریب کردن ڕزگار بکەن و سیمای کوردەوارییان بۆ بگەڕێننەوە. بەڵام شارەکە و زۆربەی زۆری گوندەکان بە تەعریب کراوی مانەوە، تا لە ١٠ / ٤ / ٢٠٠٣ بە هیممەتی هێزی پێشمەرگە و هاوکاری هاوپەیمانان خۆری ئازادی باوەشی بە ملی ئەلوەندا کرد و سەراپای شارەکە و هەموو گوندەکان لە بەعس و تەعریب و تەبعیس پاککرانەوە و گوڵاڵەی سووری ئازادی دەواری ڕەشی تەعریب و تەرحیل و تەبعیسی لەت و پەت کرد.. خەڵکە تەرحیل کراوەکە، بەو پەڕی خۆشی و شادیەوە، گەڕانەوە سەر ماڵ و موڵکی خۆیان.. چەندێ بەختەوەریبوو ئەو

خەڵکە تەرحیلکراوە. کە دەگەیشتەوە بە خانوەکەی بە زەوی و باخەکەی دیواری خانوەکەی و پەرژینی باخەکەی و زەوییەکەی ماچ دەکرد و دەستی ئاوات و ئۆخەی بە سنگیدا دەهێنا و بەرزی دەکردەوە لەبەر خۆیانەوە دەیان وت: دەبێت ئەم گۆڕانکاریە ڕاست بێت خەو نەبێت..؟ ئەوەندە دڵخۆش بوون لە خۆشیا و بە دەم پێکەنینەوە فرمێسکی شادی و شادبوونەوە بە چاویاندا دڵۆپ،دڵۆپ دەهاتە خوارەوە دەیان وت دوای تەمەنێك، وا بە شارەکەمان بە گوندەکەمان بە ماڵەکەمان بە باخ و زەوی و ئەڵوەند شادبووینەوە.. باوك و دایکەکان دەستیان بەسەر منداڵەکانیاندا دەهێنا و پێیان دەوتن منداڵینە.. بزانن ئەم خانوو باخ و کێڵگە و دێبەرانە شوێنی باوك و باپیرانتانە و چەند ساڵە بەعسی فاشی داگیری کردووە و تەعریبی کردووە.. وا ئەمڕۆ پێی شاد بووینەتەوە.. دوور نییە ئێمە لە خۆشیدا نەمرین.. وەسێتتان بۆ دەکەین بەم خاك و شوێنەتانەوە بنووسێن و دەستیان لێ بەرمەدەن.. ئەم دەڤەرە پارچەیەکە لە کوردستان، کوردستانێکی داگیر و تەعریب کراوبوو، وا ئەمڕۆ لە سایەی هەڵمەتی پێشمەرگە و هاوپەیمانەکانمان رزگار کراوە. دەخیلتان دەبین نەیەڵن جارێکی تر پۆستاڵی هیچ داگیرکەرێك گوڵاڵەی سووری بشێلێت و ئاوی ئەڵوەند پیس بکات.

لەژمارە(٣٠٥٢)کوردستانی نوێ و لەرۆژی ٢٠٠٣/٤/٢٩ و لەدوا ستوونی لاپەڕە ١٢ دا بڵاوکراوەتەوە

# سوپاو فڕۆکەکانی هاوپەیمانان مژدە بەخشی ئازادین

لە سەرو بەندی دامەزراندنی حکومەتی عیراقەوە، بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد و خەڵکی کوردستان رووبەڕووی سیاسەتی رەگەزپەرستانە بووەتەوە، بەوپەڕی دڕندانە مامەڵەی لە گەڵدا کراوە، سەرباری چەوساندنەوەی چینایەتی.

چەوساندنەوەی نەتەوایەتی و بێبەریکردنی لە هەموو مافێکی نەتەوەیی، رژێمە یەك لە دوا یەکەکانی عیراق، ئەوەی بەڕێگای دەزگا سەرکوتکەرەکانیان بۆیان جێبەجێ نەکرابێت، بە هۆی سوپاکانیانەوە شاڵاوی دوژمنانەیان بە هەموو جۆرە چەکێك بردۆتە سەر خەڵکی کوردستان و بزووتنەوەکانی.

ئەوەشی بە سوپاکانیان بۆیان ئەنجام نەدرابێت، پەنایان بردۆتە بەر هێزی ئاسمانییان، بە هەموو جۆرەفڕۆکە و چەکێکیان گوند و شاری کوردیان وێرانکردووە، خەڵکەکەیان قەلاچۆ کردووە، لە شۆڕشی شێخی نەمردا، بە داخەوە بۆ یەکەمجار گوند و شاری کوردستان لە لایەن سوپا و فڕۆکەکانی ئینگلیزەوە بۆردومان کران، لەو کاتەوە خەڵکی کوردستان بە بەردەوامی لە ژێر گوشار و پەلاماری سوپا و فڕۆکەکانی رژێمە یەك لە دوای یەکەکانی عیراقدا بووە، تا ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١) و دروستبوونی ناوچەی دژە فڕین، بۆیە هەردەم کورد و خەڵکی کوردستان سوپا و فڕۆکەی بە فاکتەرێکی سەرەکیی لە ناوبردنی کورد و خاپوورکەری کوردستان زانیوە، چونکە ئەوەی لە مێژووی گەلەکەماندا سوپا و هێزی ئاسمانی رژێمەکانی عیراق بە کوردیان کردووە، هەرگیز هیچ سوپا و هێزێکی ئاسمانی هیچ دەوڵەت و وڵاتێك لە دنیادا بە گەل و نیشتمانەکەی و تەنانەت بە دوژمنەکانیشی نەکردووە.. بە درێژایی تەمەنی دەسەڵاتداریی رژێمەکانی عیراق سەدان سەربازگە و رەبیە و چەندین فڕۆکەخانە لە کوردستاندا دروستکراون.هەر هەموویان بە مەبەستی دوژمنانە و قەدەغەکردنی ئازادیی خەڵکی کوردستان و سەرکوتکردن و لەناوبردنیبووە، بۆیە خەڵکی کورد لە سوپا و فڕۆکەکانی ئینگلیزەوە تا ئەمڕۆ بە چاوی ڕق و قینەوە دەڕوانێتە سوپا و فڕۆکە، لەم بارو دۆخەی ئەمڕۆی عیراق و کوردستاندا

کە هاوپەیمانان، بەرنامەی چڕو پڕیان بۆ ئازاد کردنی عێراق و کوردستان داناوە، ڕۆژانە پەیتا پەیتا سوپای هاوپەیمانان، جگە لە عێراقدا لە کوردستانیشدا دادەبەزین و فڕۆکەکانیان بە ڕەهایی بە ئاسمانی کوردستاندا دەسوڕێنەوە.

خەڵکی کورد هەست دەکەن، سوپاو فڕۆکەکانی بەعسی فاشی نییە، بەڵکو سوپایەك و فڕۆکە گەلێکە هاتوون و دێن خەڵکی عێراق و کوردستان لە دیکتاتۆرییەت ڕزگار بکەن : هاتوون بنکەو مۆڵگاکانی تیرۆریستان لە کوردستاندا بەسەر یەکدا بتەپێنن و تەفروتونایان بکەن.

هاتوون سوپای داگیرکەری سەدامی دیکتاتۆر لە شارە داگیرکراوەکان دەرپەڕێنن و شارەکان لە ڕەفتارو ئاکارەکانی بەعس پاکبکەنەوە، وا بەپێش چاومانەوە، هەورامانیان لە تیرۆریستان پاککردەوە. مۆڵگاکانیان بەسەردا تەپاندن، مەرگیان بەبالابڕین هاوئاهەنگیش شەو و ڕۆژ هەڵمەتی شێرانە دەبەنە سەر سەربازگە و مۆڵگاکانی بەعس و کوردستانیان لێکردوونەتە دۆزەخ.

بۆیە خەڵکی کوردستان دڵنیا بووە، ئەم سوپا و فڕۆکانە، سوپا و فڕۆکەکانی سەردەمی ڕژێمی بەعس نین بە چاوی دوژمنانە بڕواننە کوردستان و خەڵکی کورد، بەڵکو بە مەبەستی پاراستن و ئازادکردنی خەڵکی عیراق و کوردستان هاتوون، هاتوون بەخێر بێن و دەیانەوێت بەر لە سوپای عەفلەقی بگرن و پارێزگاریی لە سەر و سامانی خەڵکی ڕەش و ڕووتی عیراق و کوردستان بکەن و لەدەست سیاسەتی ڕەشەکوژی سەر فرازیان بکەن. بۆیە خەڵکەکە لە گەڵ گرمە و ناڵەی فڕۆکەکاندا لە جیاتیی ئەوەی وەکو جاران خۆیان لە ترسا بشارنەوە، ئێستا رادەکەنە سەربانەکان و بەرزاییەکان و بەگەشبینییەوە سەیریان دەکەن، ناحەقیان نییە بپرسن و بڵێن دەبێت.. ئەم گۆڕانکارییە ڕاستبێت و خەو نەبێت..؟ کاتێکیش کە دەبینن تیرۆریستان بە سزای خۆیان گەیشتن بە هەڵمەتێکی چەند ڕۆژە تەفر و توونا بوون، دڵنیاش دەبن لەوەی کە ئەم سوپا و فڕۆکانە مژدە بەخشی ئازادین..

لە ژمارە (٣٠٢٩) ی کوردستانی نوێدا و لە ڕۆژی ٢ /٤ / ٢٠٠٣ و لە لاپەڕە (١٠) بڵاوکراوەتەوە

# شاری سلێمانی لە پێشوازی تەرمی پێنج شەهیددا

دوای کارەساتی ئەنفال‌و کیمیابارانکردنی هەڵەبجەو سیاسەتی خاپور کردنی کوردستان، لەلایەن ڕژێمی فاشی پێشووەوە..ڕێکخستنە نهێنیەکانی ناو شار نەترسانە لەڕێگای ڕێکخراوی سلێمانی‌یەوە، ئەرك‌و چالاکی ڕێکخراوەی شارەکانی سلێمانی‌و کەرکوك‌و هەلێرو بەغداوکەلاروچەمچەماڵ‌و کفری‌و خانەقینیان گرتە ئەستۆ..سەرباری کاری ڕێکخراوەیی سەرپەرشتی مەفرەزە پارتی زانەکان‌و شانە چەکدارەکانی سرك‌و بروسکیان لەلایەن سەرکردایەتییەوە بەرەو ڕووکرایەوە.

دیارە کارو چالاکی لەوبارودۆخە دژوارو پڕ مەترسییەدا، کە سەدام‌و دەسەلاتی دیکتاتۆری خۆی بەزاڵ‌و سەرکەوتوو دەزانی بەسەر شۆڕشی کورداو، کوردستانی کردبووە زیندانێکی گەورەو هەموو خەڵکی کوردستانی تیایدا بەند کردبوو، ئاسان نەبوو، ڕژێم بەونیازەبوو لەڕێگای سەرکوتکردن‌و تۆقاندنەوە، بتوانێت بڵێسەی شۆڕشی کورد دابمرکێنێتەوەو، ووردە ووردە لەناوبەرێت، بەلام..بەزیرەکی نەخشەی سەرکردایەتی(ی.ن.ك)وبەچەلەنگی ڕۆڵە تێکۆشەرەکانی ناو شارو قارەمانی مەفرەزەکانی پێشمەرگە، توانرا سیاسەتی دوژمن تێکوپێك بدرێت..هەڤالانی ڕێکخراوی سلێمانی ڕۆڵی جەربەزانەیان لەهەڵسانەوەو سەرپەرشتی کردندا بینی..لەدوای ساڵی(١٩٨٨)وە..هەڤالانی ڕێکخستنەکان بەهۆی چالاکیانەوە، کەوتنە بەرشالاوی دامودەزگاکانی بەعس، دەیان ڕۆڵەیان لەدەزگاکانی ئەمن‌و ئیستیخبارات توونـدکرد. دواشالاوی دەزگاکانی بەعس لەساڵی(١٩٩٠)دا کۆمەڵێ تێکۆشەری گرتەوە، دوای ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆریان، لەسێ جەلسەی دادگای سەورەدا لە ١٦/١٠/١٩٩٠، پێنج هاوڕێی بەئەمەك‌و چاو نەترس سزای لەسێدارەدانیان بەسەردا درا. کەبریتی بوون لەهاوڕێیان(جەباری حاجی ڕەشید-مامۆستا ئەحمەدی سەناعە-محەمەد ڕەحیم-عەتای حاجی ئەحمەدووەستابەکری دارتاش).

کاتێ ئەو پێنج هاوڕێییە لەسێدارەدران، چەند ڕۆژێ دوای لەسێدارەدانیان، کەسێك بەنهێنی پێی ڕاگەیاندم کە ئەوپێنج هاوڕێیەمان فەرمانی لەسێدارەدانیان جێبەجێکراوەو باسی یەکە یەکەیانی بۆ کردم، کەچۆن بەسەربەرزانە لەبەردەم پەتی سێدارەدا وەستاون و سرودی شۆڕشگێڕیان وتووە. ئەوا دوای(١٣)ساڵ بەسەر شەهید کردنیاندا، ئەو ڕژێمەی کە هەموو هەڵسوکەوت و ڕەفتارێکیان سوربووە بەخوێنی گەلی عێراق بەگشتی و گەلی کورد بەتایبەتی، بەهێزی نەبەزی هاوپەیمانان تەخت وتاراجی بەسەریەکدا روخێنراو، دکتاتۆر دکتاتۆریەت بۆ هەتا هەتایە ریسواکرا. دوای دەست بەسەراگرتنی بەڵگەنامەکانی بەعس، بەڵگەنامەی ئەو پێنج هاوڕێیە دۆزرایەوە شوێنی بەخاك سپاردنیان زانراو ڕۆژی٢٠٠٣/٥/٢٤لە قەرەهەنجیری ڕزگار کراو، پێشوازی لەتەرمەکانیان کراو شاری هەڵمەت و قوربانیش بەشانازییەوە پێشوازی لێکردن، ڕۆژی ٥/٢٥لەڕێو ڕەسمی شایستەدا لەگردی شەهیدانی سەیوان لەناوخاکی ڕزگارکراوی نیشتمانەکەیاندا بەخاك سپێردرانەوە.

واخۆش بەختانە شاری سلێمانی و کەسوکاری ئەو شەهیدە قارەمانانەو هاوڕێییانیان، بەهێنانەوەی تەرمەکانیان کەفوکوڵی دڵیان دامرکایەوە، ئومێد دەکەم کە شەهیدە سەربەرزەکانی تری وەکو(مامۆستا عەزیز مەحموودی) سەرکردەوە(مەلا عەلی شاعیرو پێشمەرگە)و ئەو شەهیدانەی تر کە لەگۆڕستانی موسڵ نێژراون و لەداهاتوویەکی نزیکدا، لەموسڵەوە بگوێزرێنەوە بۆ شاری سلێمانی.دیارە بەئەمەش برینی قوڵی کەسوکاریان تا ڕادەیەك ساڕێژ دەبێت، گۆڕستانەکانی شەهیدان لەکوردستان چاوەڕوانی تەرمی یەکەیەکەی ئەو شەهیدانەن کە بەکۆتایی ژیانیان بونە سونبولی سەرفرازی گەلەکەیان.

*ئەم وتارە لەدوای ستوونی ژمارە ٣٠٨٢ی ٢٠٠٣/٦/٤ی کوردستانی نوێدا بلاوکراوەتەوە.

# ریفراندۆم لە سیاسییەکانەوە دەگاتە جەماوەری خەڵک

بە دەست پێشکەری کۆمەڵێ رووناکبیری سلێمانی، بیرۆکەی ریفراندۆم لە مانگی ٢٠٠٣/٧ وە لە ناو جەماوەری خەڵکی کوردستاندا..هەمە لایەنە کاری بۆ دەکرێت بەردەوامیش، جمو جووڵێکی بەرچاو لێرەو لەوێ بەدی دەکرێت، ئەم جووڵانەوە سیاسیە نەتەوەییە وەکو هەموو جووڵانەوەیەکی تر، بە هەر هۆیەکەوە بێت دژایەتی دەکرێت.. هەیە خۆی بە خاوەنی ریفراندۆم دەزانێ و رازی نابێت کەسانێکی تر باسی ئەو بزووتنەوەیە بکەن و بەلای ئەوانەوە دەبێت تەنها بۆ ئەوان قۆرخ بێت، هەیە چۆن لە هەموو جووڵانەوەیەکی سیاسی کوردا، دروشمی دژایەتی هەڵکردووەو لە رێبازو بەرنامەو کارو سیاسەت و رۆڵی شۆڕشگێڕی و هزری هیچ لایەنێك رازی نییەو پێی وەرناگیرێت و خۆبەخشانە دژیان راوەستاوەو دەوەستێت، هەیە خۆی سەر بەلایەنەێکی سیاسی، رێکخراوەیی نەتەوەیی تیژڕەویان سەر بەحزبێکی چەپەو یانکەسانێکن بە درێژایی تەمەنی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد، نەیوێراوە نە بە وشە نە بە هەنگاو، نە بە رەفتار هاوبەشی لە هیچ حزبێکی سیاسیدا بکات و لە هەموو بزووتنەوەیەکی سیاسی سڵی کردۆتەوەو تووخنیان نەکەوتووە، ئێستا بارو دۆخەکە ئاساییەو هیچ مەترسییەك لە هیچ روو و لایەنێکەوە بەدی ناکەن، قوتبوونەتەوە، دە دە قسە دەکەن و پێشبڕکێ لە هەموو روویەکەوە دەکەن و جگە لە خۆی کەسێکی ترو لایەنێکی‌تر بە شایستە نازانێت قسە لەسەر کوردو مەسەلەکەی بکات.. من بە ڕاشکاوی دەڵێم ریفراندۆم بۆ چارەنووسی گەلی کورد، (ئەرکی نەتەوەیی و نیشتمانی گشت خەڵکی کوردستانە).. لە پێشیانەوە لایەنە سیاسیەکان، سیاسەتمەداران و ئەوانەی تەمەنی خۆیان بۆ خزمەتی نەتەوەکەیان تەرخان کردووەو لە هەموو سەردەمە سەخت و دژوارەکاندا پێشەنگ بوون و بەربەرەکانی دوژمنەکانی کوردیان کردووە، خەباتی بەردەوامیان لە پێناوی مافە رەواکانی گەلەکەیاندا کردووە، هەر لە رێگای ئەوانەشەوە، دەتوانرێت پرۆسەی ریفراندۆم بە باشی و بەسەرکەوتوویی بگەیەنرێتە ناو جەماوەری رەش و رووتی

کوردستان، لام سەیرە.. ئەو جۆرە کەس و لایەنانە، ماف بە خۆیان دەدەن باسی ریفراندۆم بکەن بەلام بە رەوای نازانن ئەوەی ئەندامی حزبێک بووە، تێکۆشەرێکی ناسراوی مەیدانی کوردایەتی و نیشتمان پەروەری بووە، بۆی نییە باسی ریفراندۆم بکات، من لەو کەسانە دەپرسم.. ئەو کەسانەی کە تەمەنیان بۆ خەبات لە پێناوی نەتەوەکەیاندا تەرخان کردووە، خەڵکی ئەم کوردستانە نین..؟ کە خەباتیان کردووە تاوانیان کردووە؟ کە بوونە ئەندام یان لێپرسراو لە حزبێکی کوردستانیدا لە کۆمەڵی کوردەواری بەدەرن؟ هەموو مافێکی سیاسی و کۆمەلایەتی و رووناکبیرو جەماوەرییان دۆڕاندووە؟

ئەگەر ئەمڕۆ بە وردی سەرنجی کۆمەڵگای کوردەواری بدرێت لە ٢٥٪ خەڵکەکە ئەندام و لایەنگرو کادری حزبە کوردستانیەکانن.. ئەوانەی ئەمڕۆ لاف و گەزافی ئەوە لێدەدەن کە ئەو ریژەی خەڵکی کوردستانە نابێت بەشداری پرۆسەی ریفراندۆم بکەن ناگەنە ٢٪ خەڵکی کوردستان، من وای دەبینم.. خەباتی ئەمڕۆو پرۆسەی (ریفراندۆم،بزووتنەوەیەکی سیاسی نەتەوەیی شۆڕشگێڕانەی جەماوەری سەرتاسەرییە) و پێویستی بە هەموو خەڵکی کوردستان، لە ناوەوەی کوردستان و لە دەرەوەی کوردستانە، (ئەم بزووتنەوەیە،تەواوکەری خەباتی سیاسی نەتەوەیی و نیشتمانی و رێکخراوەی و پێشمەرگایەتی خەڵکی کوردستانە). شێوازی خەباتەکە لە خەباتی ژێر زەمینی و پێشمەرگایەتی گۆڕدراوە بۆ خەباتی سیاسی و جەماوەری دیموکراتیانەی سەردەمی گۆڕانکارییەکانی دنیاو ناوچەکە ... بۆیە ئەو کەسانەی کە تا دوێنێ و یان تا ئێستا کادرو ئەندام و لێپرسراوی حزبەکانن، ئەرکی خۆیانە کە ئەمڕۆ بەشداری لە پرۆسەی ریفراندۆمدا بکەن و، دوو لایەنەش کار بکەن، لە لایەك ئەرك و کاری حزبەکەیان و لە لایەکی ترەوە بەشداری جوولانەوەی ریفراندۆم بکەن.. لەبەر ئەوە ئەو کەسانەی ئەوە دەکەنە بیانوو، کە بەشداری پرۆسەی ریفراندۆم ناکەن و یان دەیانەوێت دژی رابوەستن لەبەر ئەوەی گوایە، فلان و فیسار کەس ئەندام و کادرو کەسی دیاری فلان حزب و لایەنەو هەر لەبەر ئەوە ریفراندۆم دەستی ئەو حزب و لایەنەی لە پشتەوەیە.. باشە ئەو کەسانە بۆ ناڕازین کە ئامۆژگاری و رێنمایی ئەو حزبانە لە پشتی پرۆسەی ریفراندۆمەوە بێت، ئەو حزب و لایەن و کەسانە کورد نین و خەڵکی کوردستان نین؟ من

ریفراندۆم وا دەبینم، یەکەمجار ئەرکی حزب و لایەنە سیاسیەکانی کوردستانە، چۆن رووناکبیرێکی دەوێت هەروەها کرێکارێك و جووتیارێك و کاسب کارێك و خوێندکارێك و مامۆستایەك و فەرمانبەرێکی دەوێت.

ئەمرۆ هەموو کەس حەقی ئەوەی هەیە پشتگیریی و داکۆکی لە مافی نەتەوەکەی بکات، جووتیارێك با خوێندەواریش نەبێت بەڵام مرۆڤێکی کوردەو وەکو هەموو هاوولاتییەکی ئەم کوردستانە خاوەنی مافی هاوولاتییە.. ئیمزای کرێکارێك و پرۆفیسۆرێك یان دەنگی جووتیارێك و سیاسەتمەدارێك وەکو یەکن، لە پرۆسەی دەنگ دان و یاداشتنامەو ئیمزا کردندا ! بە بۆچوونی من پرۆسەکە ئێستا کەموکوڕی لەوەدایە کە تەنها لە ناو شارەکانداو لە ناو خوێندەواران و مامۆستایان و رووناکبیراندایەو پەل و پۆی بۆ ناو سەرجەمی جەماوەری خەڵکی کوردستان نەهاویشتووەو نەگەیشتۆتە ناو گوندەکان، بۆیە من لای خۆمەوە داوا لە دەستەی کارگێڕی ریفراندۆم دەکەم کە جووڵانەوەکە لە دەستەکەوە فراوان بکرێت، دەستەکە وا لێبکەن نوێنەری سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵی تێدا بێت لیژنەی پێویستیان لێ پێکبهێنرێت و خۆبەخشانە بکەونە کارو ئەو دیاردەیەی دەوترێت لەبەر ئەوەی فلان کەس سەر بە فلان لایەنە نابێ بەشداری لە پرۆسەکەدا بکات و وەلا بخرێت و گوێی لێنەگیرێت، بەڵکە ئەرکە نەتەوەییەکە وا دەخوازێت.. هەر کەس لە شوێن و بواری کارکردنیدا لە هەر پلەو پایەو دەسەلاتێکدایە کاری بۆ بکات و خەڵك هوشیار بکاتەوەو پرۆسەکەی بۆ روون بکاتەوە.. بە لای منەوە ئەمە ئەرکی نەتەوەیی و نیشتمانی ئەمڕۆی خەڵکی کوردستانە، داواو پێشنیارم بۆ دەستەی کارگێڕی، حەوجووڵیان گەرمترو فراوانتر بکەن، لیژنە لە هەموو دامودەزگا حکومی و ئەهلیەکاندا، لە هەموو ناحیەو قەزاکاندا، لە ناو هەموو قۆناغەکانی خوێندا‌ندا بە زانکۆو پەیمانگاکانیشەوە لە ناو هەموگوزەرو گەڕەك و شوێنە گشتیەکاندا دروست بکرێت، بەکورتی دەبێت شوێنێك، بوارێك نەمێنێتەوە کە پرۆسەی ریفراندۆمی پێ نەگات یان کوردێ نەبێت لە پرۆسەکەدا بەشداری نەکات.

# ریفراندۆم
# تەواوکەری خەباتی شۆڕشگێڕی و پێشمەرگایەتییە

(٨٥) ساڵە کوردستان بە بڕیارێکی نێو دەوڵەتی و بۆ بەرژەوەندی دەوڵەتە زلهێزەکان، بەبێ ڕاپرسی و ڕەزامەندی گەلی کورد لکێنرا بە دەوڵەتی تازە دروستکراوی عیراقەوە.. بەو لکاندنە کوردستان بوو بە وڵاتێکی داگیرکراو، گەلی کوردیش بوو بە گەلێکی ژێر دەستەو لە هەموو مافێکی نەتەوەیی و سیاسی و فەرهەنگی بێبەری کرا، بە خراپترین شێوە چەوسێنراوەتەوە، خاکی کوردستان بە بازنەیەکی دوژمنانەی داگیرکەرانە ئابلۆقەدراو خەڵکەکەی تیادا زیندانی کرا.. هەموو جۆرە جووڵانەوەیەکی، سیاسی و کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری و فەرهەنگییەکی لێ قەدەغەکرا. ڕژێمە یەك لە دوای یەکەکانی حوکمڕانی عیراق بە دزێوترین سیاسەتی شۆفێنانە مامەڵەو ڕەفتاریان لە گەڵ گەلی کورددا کردوە.. کورد بەبێ خواستی خۆی بەسەر چوار دەوڵەتی ناوچەکەدا دابەشکراوە.. هەر دەوڵەتە بە پێی سیاسەتی نەتەوەییان چەوساندویانەتەوە.

گەلی کورد لە پاڵ گوشارو ڕەفتاری دوژمنانەی داگیرکەراندا، بێ سڵکردنەوە بەو پەڕی لەخۆ بوردووییەوە، بە بەردەوامی ڕووبەڕووی دوژمنان و داگیرکەران بۆتەوە، ململانی و بەربەرەکانی جەسوورانەی بە درێژایی ئەو (٨٥) ساڵە لە گەڵ داگیرکەراندا کردووە.. شۆڕشی بەدوای شۆڕشدا بەرپا کردووە.. جووڵانەوەیەکی شۆڕشگێڕی بە بەردەوام لە کوردستاندا بووە.. هەر بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی و ڕاپەڕینێکی جەماوەری لە لایەن داگیرکەرانەوە سەرکوتکرابێ، بەدوایدا بزووتنەوەیەکی تر سەری هەڵداوەو بە نەفەسیکی ترو بە بەرنامەیەکی ترو بە شێوازێکی تر بەگژ دوژمناندا چۆتەوە.. لە بەرپا بوونی هەر شۆڕش و جووڵانەوەیەکی جەماوەریدا، زەبری کوشندە لە دوژمنان دراوەو قوربانی لە ڕادە بەدەریش لە مێژوودا تۆمار کراوە.

وڵاتی کوردستان دەیان جار خاپوورو وێران کراوە، گەلەکەی ئاوارەو پەرتەوازە کراوە.. لە هەڵگیرساندنی هەر شۆڕشێکی کورددا دوژمنان کە نائومێدبوون، لەوەی بتوانن بە زەبری شاڵاوو پەلاماردان شۆڕشەکە خامۆش بکەن، پەنایان بۆ وتوو وێژو دانوستاندن بردووە، ئەمەش بۆ ئەوە نا گوێ لە خواستو داواکارییەکانی گەلی کوردو شۆڕشەکەی بگرن، بۆ ئەوە بووە کە لەو ڕێگایەوە زەفەر بە شۆڕشەکە بهێنن. بۆیە لە گەرمەی گفتوگۆو دانوستاندا، نامەردانە خەنجەری پیلان پیلانگێڕیان لە پاڵ سێبەری وتوو وێژو ڕێکەوتندا، وەشاندووە..

لەبەر ئەوەی داگیرکەران بڕوایان بە کوردو بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی گەلی کوردستان نەبووەو، زەردەخەنەی زارەکییان بە مەبەستی فێڵو چەواشەکردن بووە. بۆیە لە هیچ دانووستانو وتووێژێکدا گوێیان لە خەڵکی کوردستان نەگرتووەو هیچ پرسو رایەکیان پێ نەکردووە، هەمیشە بەوپەڕی سیاسەتی ڕەگەز پەرستانە دژایەتی هەموو جووڵانەوەیەکی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئەدەبیو ڕێکخراوەییو جەماوەری خەڵکی کوردستانیان کردووە، بە درندانەترین شێوە پەلاماریان داوەو لە پاڵیا جەختیان کردووە، بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکە، جۆرەها تۆمەتی بخەنە پاڵو بە خراپ ناوی بزڕێننو لە پێش چاوی گەلانی بخەن، گەلەکەمان بە گەلێکی دواکەوتوو شەڕخوازو دڕندە بە گەلانی دنیا بناسێنن..

لەو کاتەوەی حکومەتی عێراق دروستبووە، هەر ڕژێمێك دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی گرتبێتە دەست، کە باسی عێراقو گەلی عێراقیان کردووە، بێ شەرمانە رایانگەیاندووە عێراق بەشێکە لە نیشتمانی عەرەب گەلی عێراقیش بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب، بەبێ ئەوەی بە بیریاندا هاتبێت، خاکی عێراق بەشێکی زۆری خاکی کوردستانەو ئەو بەشە هەرگیز ناچێتە سەر نیشتمانی عەرەبو گەلی عێراق (٦ تا ٧) ملیۆنی کوردەو گەلی کوردیش نابێتە عەرەب.. دیارە ئەم بۆچوونە شۆفێنانەی حوکمڕانی عیراق وای لە گەلی کورد کردووە، کە هەمیشە لە بیرکردنەوەی ئەوەدا بێت کە ڕژێمەکانی عێراق، ویستوویانە گەلی کوردو ناسنامەی نەتەوەیی بسڕنەوەو لە بودقەی نەتەوەی عەرەبدا بیتوێننەوەو

خاکەکەی بخەنە سەر نیشتمانی عەرەبو سامانەکەی بە ئارەزووی خۆیان دەستی بەسەردا بگرن.

دوای پرۆسەی ئازادکردنی عیراق لە لایەن ئەمریکاو هاوپەیمانانەوە لە ٩/نیسانی/٢٠٠٣ دا. رژێمی دکتاتۆری عیراق رووخێنرا.. لەو کاتەوە ئەو دەوڵەتەی کە پێی دەوترا ( دەوڵەتی عیراق ) و لافو گەزافی (عروبەیەتی) لێدەدا لێك هەڵوەشاوە، عیراق چۆتەوە دۆخی پێش دامەزراندنی دەوڵەتی عیراقی.. ناوچەکانی عیراق لە رووی ئیداریو بەڕێوەبردنەوە، بەسەر چەند ناوچەیەکی فەرمانڕەواییدا دابەشکراوە، وەك دەبینرێت پارێزگاکانی بەسرەو ناسریەو کوتو عەمارە، لە لایەن بەریتانییەکانەوە بەڕێوە دەبرێت، پارێزگاکانی نەجەفو کەربەلاو سەماوە حەوزەی علمی شیعەو بەسەرپەرشتی ئەمریکا بەڕێوە دەچێت، بەغدای پایتەختی جارانو دەورو بەری لە رێگای ئەنجومەنی ئینتیقالیو بە چاودێری ئەمریکییەکان بەڕێوە دەبرێت، لە پارێزگای بەعقوبەوە بۆ خالصو سامەراو تکریتو تا رومادی، بۆتە ناوچەیەکی شەڕو نائارامیو رۆژانە دەیان کاری تیرۆریستانەی تیادا ئەنجام دەدرێت، تا ئێستا ساغ نەبۆتەوە کێ و کەیو چۆن ئەم ناوچەیە ئارامی تێدەکەوێتو بەڕێوەدەبرێت؟

پارێزگای کەرکوك و موسڵ دوو پارێزگان کە هەریەکەیان بەپێی تایبەتمەندییان ئەنجومەنێکی شارستانی شارەکەو بە سەرپەرشتی ئەمریکییەکان بەڕێوە دەبرێن.

ناوچەکانی کوردستانیش لە زاخۆوە بۆ خانەقین، لە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستانو پەرلەمانی کوردستاندایەو بە هاوکارییو یارمەتی ئەمریکییەکان بەڕێوەدەچێت.

ئەگەر سەیری ئێستای چۆنییەتی بەڕێوەبردنی کاروباری ئیدارییو دەسەڵات لە عێراقدابکرێت، زۆر چاك دەردەکەوێت، کە بەغدا پایتەختەکەی جارانو عێراق عێراقەکەی جاران نییە.. کوردستانیش کوردستانەکەی پێش ڕاپەڕینو ڕزگار بوون نییە. خەڵکی کوردستان دوانزە ساڵە لە کوردستاندا بە ئازادی دەژین هیچ پەیوەندیەکی بە دەسەڵاتداری عێراقەوە نەبووەو نەماوە.

لەم بارودۆخەی ئێستای عێراقدا، کەلەو باوەڕەدانیم ئەو دەوڵەتەی کە جاران ناوی دەوڵەتی عیراق بوو دروست بێتەوە. ئەمە لە لایەك.. لە لایەکی ترەوە

دەبینین ئەو کەس و لایەنانەی کە دوای ئازادکردنی عیراق قوتبوونەتوە، دەیانەوێت لە دەسەڵاتی نوێی عیراقدا، بەشدارو کاربەدەست بن، زۆربەیان بە هەمان بیرکردنەوەی عەرەبە بەعسییەکان و شۆڤێنییە عەرەبەکان بیر دەکەنەوەو قسەکانی ئەوان سەبارەت بە کوردو خاکی کوردستان دووبارە دەکەنەوە.

بۆیە کورد، لەم بارو دۆخەی ئێستای عیراقدا، کە هیچ پێگەیەکی ئیداری بەدی ناکرێت.. هاوپەیمانان و ئەمریکییەکان هەر یەکەیان بە پێی بەرنامەو سیاسەتی خۆیان هەڵس و کەوت لە گەڵ ئێستا و داهاتووی عیراقدا دەکەن..

ئەرکی نەتەوەیی و نیشتمانی خەڵکی کوردستانە، کە کار بۆ ئەوە بکات ئەمریکا و هاوپەیمانان و وڵاتانی دنیا بانگ بکات بۆ ئەوەی پرسی پێ بکەن راو بۆچوونی لە داهاتووی کوردستان و گەلی کورد وەربگیرێت مەسەلەی کورد مەسەلەیەکی زیندوو و لە بەرچاوە، ئەمڕۆ دۆسیەی گەیشتن بە مافەکانی کەوتۆتە سەرەوە.. ناکرێت.. کورد بە دروشمێکی پواوەوە بنووسێ. پێ لەسەر یەك داواکاری دابگیرێت.. ئەمڕۆ ئەوە دەخوازێت. کە کورد لە وڵاتی خۆیدا لەسەر خاك و ئاوی خۆی بەسەربەخۆیی بژی. دوور بێت لە سیستەمێکەوە کە سیمای چەوساندنەوە وابەستەیی پێوە بێت. ئەرکی سەرەکی لایەنە سیاسیەکانە، ئەگەر تا ئێستا سڵیان لە هەندێ دروشم و داواکاری کردۆتەوە. لەمڕۆ بە دواوە ئەو سڵە نەکەنەوەو بە راشکاوی داوای مافەکانی گەلی کورد بکرێت.. هەمە لایەنە هەوڵبدرێت لەهەر بڕیارێکدا سەبارەت بە گەلی کورد دەدرێت پرس بەخەڵکی کوردستان بکرێت و لایەنە سیاسیەکانیش زۆر بەپەرۆشەوە پشتگیری لەخەڵکەکە بکەن چونکە خەباتی ڕاپرسی ئەمڕۆ تەواوکەری خەباتی شۆڕشگێڕی و نەتەوەیی و نیشتمانی و پێشمەرگایەتییە، کە چەندین ساڵە حزب و لایەنە سیاسییەکانی کوردستان خەباتی بۆ دەکەن و قوربانی لە پێناودا دەدەن و جەماوەری خەڵکی کوردستانیش هەزاران نەهامەتی و ماڵوێرانی بەسەر هاتووە. بۆیە کورد مافی خۆیەتی ریفراندۆم بۆ مافەکانی بکات و لە رێگای ریفراندۆمەوە مافی چارەنووسی بەدەست بهێنێت ...

# بەبزوتنەوەی ریفراندۆم مافەکانمان دەسەلمێنرێت

لەمانگی(٢٠٠٣/٧)وە بزووتنەوەی ریفراندۆم لەشاری سلێمانیو لەلایەن کۆمەڵێ رۆشنبیرو نووسەرو مامۆستاوە راگەیەنرا..دیارە بیرۆکەی بزووتنەوەکە هەروا لەخۆیەوە سەری هەڵنەداوە، بەڵکە کۆمەڵی هۆکار دوای روخانی سەدامو رژێمە دیکتاتۆرییەکەی هاتە ئاراوە، کەوا دەخوازێت میللەتی کورد پێویستی هەنووکەیی بەبزووتنەوەیەکی ریفراندۆمی سەتاسەری هەبێت.. لەبەرئەوە دەبینرێت زۆر لەو حیزبو لایەنانەی کە لەم بارودۆخەی ئێستای عێراقدا قوتبوونەتەوە، بەنەیاری گەلەکەمان خۆیان نیشان دەدەن، بەشێوەیەکی دیارو ئاشکرا دژی مافە نەتەوەییەکانی گەلەکەمان راوەستاون، دەیانەوێت هاوپەیمانان والێبکەن، کە کورد مافی ئەوەی نییە داوای مافە نەتەوەییەکانی بکات، قوربانییەکانی گەلی کورد لەسووتماتکردنوکیمیابارانو زیندە بەچاڵکردنی خەڵکی کوردستان بەفیڕۆبدەن..لەکاتێکدا لەیەکەم رۆژی پرۆسەی ئازادکردنی عێراقەوە، گەلی کورد بەگشتیو هەموو حیزبە کوردستانییەکان بەتایبەتی هاوکاری ئەمریکاو هاوپەیمانان بوونو رۆڵی بەرچاویان لەگۆڕانکارییەکاندا بینیوە.

کورد کە دەرك بەوە بکات، رەنجو تێکۆشانی ساڵەهای ساڵی بەهەدەر دەدرێت، گوێ بۆ داواو داخوازییە نەتەوەییەکانی ناگیرێت..بەپیلانی ئەو جۆرە حزبە هەڵتۆقیوانەو دەوڵەتانی دەوروبەر لەمافەکانی بێبەری بکرێت، لەبارودۆخێکی واچارەنووسسازی ئەمرۆی عیراقو ناوچەکەدا، مافەکانی نەسەلمێنرێ ئەی کەیوچۆن دەسەلمێنرێت؟ بۆیە ئەرکی نەتەوەییو نیشتمانییە کە گەلی کورد دەستەوستان دانەنیشێت هەڵوێستی مەردانە وەربگرێتو ئەمریکاو هاوپەیمانانو ئەو حیزبو لایەنانە تێبگەیەنرێن کە کورد لەوە دەرچووە بکرێتە پارویەکی چەورو بەئاسانی قوت بدرێت.

هەڵوێستی رووبەروبوونەوەیەکی لەمجۆرە بەئاسانیو بەبێ بەرنامەی داڕێژراو ئەنجام نادرێت. بەحیزبێكودوان سیانو بەکۆمەڵێكو چینێكودوان

جێبەجێناکرێت..بەڵکەکاری یەك دەنگی و یەکگرتوویی و یەکهەڵوێستی هەموو خەڵکی کوردستانی دەوێت، بەهەموو حزب لایەنە سیاسی وچین وتوێژەکانی جەماوەری کوردەوە.. مانگرتن و رێپێوان و یاداشت نووسین و هەوڵی دیبلۆماسی و سیاسی و بەردەوامی دەوێت، دیارە کارێکی وا بزووتنەوەیەکی لەمجۆرە بە پرۆسەی ریفراندۆمی سەرتاسەری نەبێت ئەنجام نادرێت، بیرۆکەی ریفراندرم کە لە سلێمانییەوە سەری هەڵداوە، ماوەیەکە خۆش بەختانە بۆتە بزوتنەوەیەکی سەرتاسەری لە کوردستاندا.

ئەم بزوتنەوەیە پشتگیری سەرجەم خەڵکی کوردی دەوێت، بزوتنەوەکە دەبێت ئەوەندە گەورە بێت کە بەئەمەریکاوهاوپەیمانان و ئەنجومەنی حوکم و ئەو حزب و لایەن و دەوڵەتانەی کە هەوڵ دەدەن مافە نەتەوەییەکانی میللەتی کورد نەسەلمێنرێ. تێیان بگەیەنرێ..کە کورد داوای سەلماندنی مافە نەتەوەییەکانی دەکات، هەر بڕیارێك بەبێ راپرسیی کورد سەبارەت بەکورد دەربکرێت، کورد رەتی دەکاتەوە..کارێك بکرێت لەهەموو خەڵکی کورد بپرسن کە بۆ سەلماندنی مافەکانی چۆن وچی دەوێت؟ خەڵکی کوردستان و گەلی کورد بکرێنە پێگەی هەڵگرتنی هەموو هەنگاوەکانیان، نەك بەئارەزووی ئەو کەس و دەوڵەتانەی کە تا بینەقاقایان نوقمە لە خوێنی کوردا، بڕیاری ناڕەواو دوژمنگکارانە بدرێت..لەرێگای ریفراندۆمەوە دەبێت کارێکی وا بکرێت، کورد بۆ مافەنەتەوەییەکانی چی دەوێت؟ فیدراڵی نەتەوەیی و جوگرافی لەچوارچێوەی عێراقدا دەوێت؟ یان داوای مافی چارەنووسی دەکات، بە دەوڵەتی سەربەخۆی کوردییەوە؟ ئایا کوردو خەڵکی کوردستان رازی دەبن دوای(١٢-١٣)ساڵ حوکمڕانی لە کوردستاندا، هەڵبژاردنی پەرلەمان و دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان و جارێکی تر ببەسترێتەوە بە حکومەتی مەرکەزییەوە؟

لەبەر ئەوە نابێت و ناکرێت و کارێکی ناڕەوایە ئەگەر رای کورد لەدیاریکردنی مافە نەتەوەییەکانیدا لەبەرچاو نەگیرێت..ئەگەر ئەمریکا و هاوپەیمانان رازی نەبن مافەکانی کورد بسەلمێنرێت، پێویستە کورد هەڵوێستی بێدەنگی بگۆڕێت، چاوەڕوانی بەزەیی و دەسەنەیی نەکات.

بزووتنەوەی ریفراندۆم، پەرە پێبدرێت و لەسەرتاسەری کوردستانداو لەهەموو ئەو شارو شارۆچکانەی کوردیان تیادەژی لەعێراقداو ئەو وڵاتانەی کە

کوردیان تیادەژی ئیمزایان پێبکرێت و سازو ئامادە بکرێن بۆ هەموو ئەگەرێك کە بەرەو رووما‌ن ببێتەوە. لەگەڵ کۆکردنەوەی ئیمزاکاندا لیژنەی بالای ریفراندۆم یاداشتننامەی تێرو تەسەل ئاراستەی ئەمریکاو دەوڵەتانی هاوپەیمان و جامیعەی عەرەبی، ولاتانی ئەوروپاو ئەنجومەنی نەتەوەیەکگرتووەکان بکات، داوا بکرێت کە بۆ هەر بڕیارێك دەیانەوێت سەبارەت بە کورد بیدەن پرس بەکوردو خەڵکی کوردستان بکرێت بەپێی وەلامی گەلی کورد چارەنووسی دیاری بکرێت..

ئەگەر وانەکرا، بزووتنەوەی راپرسی بڕیاری مانگرتن و رێپێوان لەهەموو کوردستان بدات، نوێنەرەکانی کورد لەئەنجومەنی حوکم و وەزارەتەکانی عیراقی بکشێنەوە، هیچ هاوکارییەك لەگەڵ هاوپەیمانان‌دا نەکرێت، بۆ دروستبوونەوەی حکومەتی داهاتووی عێراق و گەڕانەوەی دەسەلات لەهاوپەیمانانەوە بۆ عێراقییەکان..

لەم روانگەیەوە داوا لەهەموو خەڵکی کوردستان دەکەین کە کوردانەوکورد پەروەرانە بەدەنگی بەرنامەکانی ریفراندۆمەوە بچن و هاودەنگیی و یەکگرتوویی خۆیان نیشان بدەن...

# ریفراندۆم بۆ..؟

لەوکاتـەوەی کوردسـتان بەعێراقـەوە لکێنـراوە. کوردسـتان بۆتـە وڵاتێکـی داگیرکراو گەلەکەی لەهەموو مافێکی نەتەوەیی وفەرهەنگی وڕۆشنبیری وکلتوری بی بەری کراوە

بەچوار دەوری کوردستاندا بەبازنەیەکی دوژمنانەی زۆر توندوتۆڵ ئابلوقە دراوە. هەمووژیانێکی کۆمەلایەتی و ئابووری و سیاسی و ڕۆشنبیری و ئەدەبی و تەنانەت ژیانی ئاسایی لێ قەدەغەکراوە

رژێم بەدوای رژێمدا دڕندانەترو شۆفێنانەتر مامەڵـەیان لەگەڵ گەلی کوردا کردووە

بەدرێـژایی ئـەو مێـژووە. کـورد لەبـەر بـەرەکانی و ملمـلانـێ و بەگژاچوونەوە...ساتێ نەوەستاوە. لەشۆڕشەکانی شێخ مەحموودی نەمرەوە، تا دوا شۆڕشـی گەلی کوردستان، شۆڕش بەدوای شۆڕشدا بەرپاکراوەو، لە هەر شۆڕشـێکدا قوربـانی زۆری دراوە...کوردسـتان بـەئارەزووی داگیرکـەران وێران وخاپوورکراوە..هەر گفتوگۆیەك لەگەڵ رژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عێراقدا کراوە..کۆتاییەکەی بەپیلانگێڕی دوایی هاتووە، هەرگیز نەیان ویستووە گـوێ بـۆ خـەڵکی کـوردو داواکارییـەکانی بگـرن دژی بەرنامـەی حزبـە کوردستانیەکان راوەستاون و دەیان تۆمەتی جۆراوجۆریان خستۆتە پاڵیان و هەوڵی ئەوەیان داوە کەشۆڕشی کورد قەت جارێك لەجاران پرسیار لە کوردو خەڵکی کوردستان نەکات نەیانویستووە گوێیان لەداواو داخوازییەکانی بێت، لەدوای٩/نیسانەوە بەزەبری کوشندەی هاوپەیمانانی عێراق ئازاد کراو ئەو دەوڵەتەی ناوی دەوڵەتی عیراق بوو. ئێستا نەدەوڵەتی عیراقە وەکو دەوڵەت ماوەو نەیاسایەك هەیە بەناوی عێراقەوە کاربکات، بۆیە پێویستەو بۆتە ئـەرکێکی نەتـەوەیی مافەنەتـەوەیی ودیموکراتی و ئازادییـەکانی گەلەکـەمان داوابکرێـت، بـۆ ئـەوەی بڕیـاری نـاڕەوا بەسـەر گەلەکەماندا نەسەپێنرێت و، مافەرەواکانمان وەکو مافی نەتەوەیەك کە ساڵەهای ساڵە بەدڕندانەترین شێوە

دەچەوسێنرێتەوە بسەلمێنرێت، سنووری جوگرافی کوردستان دیاریبکرێت شارە زەوتکراو تەعریبکراوەکانی بگەڕێتەوە سەر کوردستان، خێروبێری ولاتەکەمان بۆ خۆمان بێت وبە هەدەر نەدرێت بۆ بووژاندنەوەی ژێرخانی رووخاوی نیشتمانەکەمان بەکاربهێنرێت..ئەمرۆ لەدنیادا راپرسی بۆتە چەکێکی گونجاو بۆ دەسەبەرکردنی مافی زەوتکراو ئێمەش دەبێت لەرێگای ریفراندۆمەوە دریژە بەخەباتمان بدەین و بیکەینە چەکێکی کاریگەری سەردەمانەو جەماوەر سازو ئامادە بکرێت.

# ( ڕۆژی نوێو بزووتنەوەی ڕۆژنامەگەری کوردی... )

گۆڤـاری(ڕۆژی نـوێ) لەسـاڵی ١٩٦٠دا وەك (بڵاوکراوەیـەکی ئـەدەبیو سیاسیو کۆمەڵایەتی ئاسۆی ڕۆشنبیری کوردی ڕووناککردەوە هەروەکو چۆن گۆڤاری(گەلاوێژ) بە نەفەسێکی درێژوتینو تاوێکی کوردانە، مانگانە خوێنەری کـوردی بەسەردەکردەوە...لەوساڵانەدا گۆڤـارێکیتری وەکـو ڕۆژی نـوێ خـۆی لەبواری ئەدەبیو سیاسیو کۆمەڵایەتی لە کوردستاندا نەدەبینرا..ئەم گۆڤارە خاوەنی ئیمتیازی پارێزەر جەمال حاجی فەقێ شاڵی بوو، سکرتێری نووسین کامەران موکری شاعیرودەستەی نووسەران موحەرەم محەمەد ئەمین. ئیحسان عەبدولکەریم. کریم زەند (عەبدوڵڵا– ئەژدەر) بون.

یەکەم ژمارەی لەچاپخانەی کامەران لەسلێمانی چاپکراوە، لە مانگی خاکە لێوە(نەورۆز)ی٢٥٧٢کوردی و نیسانی ١٩٦٠ زاینی دەرچوو..

لەیەکەم ژمارەدا ڕۆژی نوێ لەجیاتی سەروتار دەستەی نووسەران وتارێکیان لە(٥) لاپەڕەدا بە ناونیشانی ئامانجمان نووسیوە.

ڕۆژی نوێ لە ساڵی یەکەمیدا. مانگانە ژمارەیەکی لێدەرچووە، واتە لەساڵی یەکەمیدا(١٢)ژمارەی بە بەرگێکی قەشەنگەوە کەوتۆتەبەر دەسی خوێندەوارانو کتێبخانەی کـوردی دەوڵەمەنـدکردووە، لـە سـاڵی دووەمیـدا تـەنها(٦)ژمـارەی لێدەرچوو وە دوای ئەوە بەفەرمانی ڕژێم ڕاگیراوە، لە(١٨)ژمارەی گۆڤاری ڕۆژی نوێدا..ئەو ڕۆشنبیرو نووسەرو ئەدیبانەی بە نووسینەکانیان بەشدارییان لە گۆڤارەکەدا کردووە. ژمارەیەکی یەکجار زۆر بوون.

ئەگەر سەرنجێ لەژمارەکانی ئەم گۆڤارەبدەین: لەبەرگەوە بۆ بەرگ بابەتی بەپێزو بەکەڵکی هەڵبـژاردوە. لەهـەموو دەرگایـەکی داوە..لەگـەڵ ئاسـتی بیرکردنـەوەی خوێنـەری کـوردا، مامەڵـەی کـردووە..گۆڤـارێکی سیاسـیو ڕوناکبیری، ئەدەبی، مێـژووی زۆر دەوڵەمەند بووە. نووسەرو خوێنەری خۆی هەبووە. لەو ماوە کەمەدا بۆشاییەکی گەورەی ڕۆژنامەگەری کوردی پڕکردەوە.. دیارە ئەگەر وازی لێبهێنرایەو بەردەوام بوایە دڵنیام کە وەکو گەلاوێژ ڕۆڵی زۆر کاریگەری دەبینی لەپێشکەوتنی ڕۆژنامەگەری کوردیدا.

# کاکه گۆران مەرگ ڕێگای نەدا پرۆژەکەم لەگەڵدا تەواو بکات

لە شەستەکاندا..لە ناوەندی جمهوری کاکە عبدلرەحمانی مەلاسدیقی قەرەداخیم ناسی. خوێنگەرمیمان بۆ کوردایەتی زۆرتر لەیەکی نزیککردینەوە.لە قۆناغی ناوەندییەوە.. لەیەك دوورکەوتینەوە...کاتێ مەفرەزە سەرەتاییەکان.. لەناوچەی قەرەداخ بلاوبوونەوە.ناوی چەند کەسم دەبیست..یەکێکیان(گۆران)ناوێکبوو، من نەمدەزانی کە عەبدولرەحمانە... لەساڵی ٢٠٠٣دا بەرنامەی نووسینەوەی ژیانامەی شەهیدان(مامۆستا جەمال تاهیرو مامۆستا عەزیز مەحموود)م دانا..لەساڵی ٢٠٠٤دا کاتێ خەریکی چاپکردنی هەردو کتێبەکە بووم، کاك مولازم عومەر تەلەفونی بۆ کردم وتی دوکەسی هاوڕێی مامۆستا عەزیز هاتوونەتەوە. دەیانەوێت شتی لەسەر بنووسن. دەیانێرم بۆلات یەکێکیان(حاجی مەمۆ)یەو ئەویتریان(گۆران قەرە داخییە)..وتم حاجی دەناسمو گۆران ناناسم...ڕۆژێك یەکێك هاتە لام بە(گۆران قەرەداخی) خۆی پێناساندم..وتی بیستومە خەریکی نووسینەوەی ژیاننامەی مامۆستا عەزیزی کاك ملازم عومەر ناردوومیو دەبێت تەلەفونی بۆ کردبی، وتم بەڵێ بۆی کردوم زۆربەخێربێیت. وتم. کتێبەکە وا دەخرێتە ژێرچاپەوە، وتی من بیرەوەری زۆرم لەگەڵیا هەیە. دەتوانم بینوسمو بۆت بهێنمو لە کتێبەکەدا بلاّوبکرێتەوە.وتم بۆنا..پەلەی لێبکەو بۆم بهێنە زۆرم پێخۆشە. دوای قسەو گفتوگۆیەکی دوورو درێژ بۆم دەرکەت (گۆران) کاك عبدولرەحمانەکەی ساڵانی شەستەکانەو کورەکەی کاك مەلاسدیقی خوالێخۆشبووی قەرەداخەو یەکترمان ناسیەوە..

بابەتەکەی بەناونیشانی(شەهید عەزیزو چەند بیرەوەرییەك)نووسی بۆی هێنامو کردمانە دوابابەتی کتێبەکە..ئیتر بەردەوام سەری لێدەدامو لە هەموو ڕوویەکەوە گەردەشەمان دەکرد، بەرنامەی زۆری هەبوو.. زۆر ئارەزوی لەوە بوو لەیەکەوە نزیکبین..کاتێك بەرنامەی نووسینەوەی مێژووی ژیاننامەی شەهید

ئارامم.. کردە بەرنامەوبۆم باسکرد.زۆری پێخۆش بوو، وتی من هاوکاری تەواوت دەکەم..ئەو رۆژگارەی لەگەڵ شەهیدا بەیەکەوە بوین دەینوسمەوەو، دڵنیام بابەتێکی بەپێز دەبێت بۆ کتێبەکە...باسی ئەوەم کرد کەدەمەوێت سەردانی (گوندەکانی گوربازو تەنگیسەر) بکەم وتی کەی چویت حەزدەکم لەگەڵتا بێم..لەمانگی تەمووزدا لەگەڵ کاك ئاوات قارەمانی بەرنامەی ئەوەمان دانا، سەردانی گوندی گوزباز بکەین، کاك مەولود گوربازیم ئاگادارکرد، بۆ ئەوسەردانە، ئاگاداری کاك گۆرانی جوانەمەرگیشم کرد. پێش نیوەڕۆی رۆژی ٢٠٠٤/٧/٣٠ لەگەڵ کاك گۆران بەرەو گوڕباز کەوتینەڕێ‌و، لە چایخانەکەی سەر تاسلوجە لەگەڵ کاك ئاوات یەکمانگرت، هەرسێکمان لەیەك ئوتۆمبیلدا سوار بووین.. لەماوەی رێگاکەدا لەگەڵ کاك ئاوات کەوتنە گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانیان.. گۆران بیر تیژانە رووداوەکانی دەگێڕایەوە، بەکاك ئاواتی دەسەلماند کە ئەو رووداوە وابووە... بەگەیشتنمان بۆ ناودێی گورباز..خەڵکی گوندەکە لەگەڵ کاك مەولوودا پێشوازی گەرمیان لێکردین..بەبینینی کاك گۆران زۆر شادبوون، کەدانیشتین یەکە یەکەی خەڵکی گوندەکەی دەناسییەوە..گلەییان لێکردن کە فەرامۆشیان کردوون، سەریان لێنەداون‌و بەسەریان ناکەنەوە. هەرلەوێدا بەڵێنیدا کە لەمەودوا لەگەڵ مندا بەبەردەوامی سەردانیان دەکات، زۆر دڵخۆش بوو بەوەی کە ئەوشوێنانەی لەوسەردەم‌و رۆژگارەدا.. تیاحەوانەتەوەو خۆیان تیا حەشارداوە کارو کۆبوونەوەیان تیادا کردووە دەچووە ناویان‌و دەیوت کاك ئارام ئالێرەدا بوو: کاك دلێری سەید مەجید مام رۆستەم. کاك ئاوات، کاك مەولود مامۆستا عەزیز..لێرەدا بوون. لەو سەردانەماندا لەگەڵ کاك ئاواتدا.. کۆمەڵێك بیرەوەری خۆش‌و ناخۆشیان بیرکەوتەوەو دەیان گێڕایەوە، باسی چەند شەڕێکیان کرد. بەرنامەمان دانابوو کەبەیەکەوە سەردانی هەموو گوندەکانی تر بکەین.. بەرنامەی چڕوپڕی زۆری بەدەستەوەبوو، زۆر دڵخۆش بوو..بەبارودۆخی کوردستان بۆچوونی..وابوو..کەکورد دەبێتە خاوەنی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی‌و دوژمنەکانی تازە ناتوانن، بەرنامەی لەناوبردنی پەیڕەوبکەن..بەداخ‌و پەژارەیەکی زۆرەوە لەکاتێکدا من نەخۆش بووم لەماڵەوە. سەعات حەوتی بەیانی رۆژی ٢٠٠٤/١١/٢٥ کاکە (بەهادینی شێخ ساڵح)ی هاوڕێمان بەتەلەفون هەواڵێکی جگەر بڕی دامێ.. ئەویش مەرگی کاکە (گۆران)

بوو، لەبەر باری تەندروستیم بەداخەوە نەمتوانی لەمەراسیمی بەخاك سپاردن و پرسەکەیدا بەشداری بکەم. وائەمڕۆ لەچلەکەیدا رووبەڕووی هاوڕێکانی و خزموکەس وکارە دڵسۆزو کورد پەروەرەکەیدا رادەوەستم، سەری رێزو نەوازش بۆ مەرگی کاکەگۆران و هەرهەمووتان دادەنوێنم، لە حزووری هەرهەمووتانا دەستی رێز بەسنگەوە دەگرم...دەڵێم بەداخەوە کاکە گۆران مەرگ رێگای نەدا. پرۆژەکەی شەهید ئارامم لەگەڵدا تەواوبکات..دڵنیام بیرەوەرییەکانی لەگەڵ شەهید ئارامدا نووسیوەتەوە. ئەگەر تەواویشی نەکردبێ شتێکی نووسیوە، داوا لەهاوسەری و کەس و کارەکەی دەکەم کارێك بکەن بگاتە دەستم بۆئەوەی لەکتێبەکەی شەهید ئارام دا چاپی بکەم و جێگای خۆی بکاتەوە.

دیارە ئەو بابەتە لاپەڕەیەکی مێژووی ژیانی گۆرانیش دەبێت کە لەسەردەمێکدا پێشمەرگەبووە لەگەڵ شەهید ئارامدا. کە کورد لە رۆژگارێکی سەختدا دەژیاو دوژمنەکەی زۆر بەدەسەڵات و پڕچەکبوو.

بەڕاستی جێی داخ و پەژارەیەکی زۆرە، کە ئەو رووناکبیرو نوسەرو زمانزان و شارەزاو هەڵکەوتووە.. لەتەمەنێکی واکورتدا مەرگ یەخەی پێدەگرێت و دەیکاتە خەسارەتێکی گەورە بۆ خۆی وکەس وکاروگەل و نیشتمانەکەی.

داخ بۆمەرگت کاکە گۆران..هەزار سڵاو بۆ گیانی پاکت وژیانی پڕسەروەریت، رەفتاروهەڵوێستی مەردانەت ئەی پیاوی خاوەن هزرورووناکبیرو رۆڵەی رۆژگاری رەش و ئەی پێشمەرگەی شۆڕشی نوێ و هەڵسانەوە رۆڵەی بەجەرگی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان. پێشمەرگەی خۆشەویستی ناو جووتیارو چەوساوەکانی گوندەکانی قەرەداخ هاوڕێی.شەورۆژی شەهید ئارامی سەرکردەو مامۆستا عەزیز.

لە ژمارە (٣٠٢٩) ی کوردستانی نوێدا و لە رۆژی ٢ /٤ / ٢٠٠٣ و لە لاپەڕە (١٠) بڵاوکراوەتەوە

# ڕێزگرتن لە تێکۆشەران نەریتێکی شۆڕشگێڕنەیە

تێکۆشـــەرانی نـــاو بزووتنـــەوەی رزگـــاری یخوازی گەلەکـــەمان ئـەو خەڵکـە شۆڕشـگێڕانەی کـە تەمـەنی خۆیـان و حەوانـەوەی مـاڵ و منـداڵیان خسـتەلاوە، لەپێناوی سـەرفرازی گەلەکەیاندا...ڕێزگرتن لەوتێکۆشـەرانە..دەبێتە نەریتێکی بەرزوشـــکۆدار، کەتێکۆشـــەران و خێزان ومنـــداڵ و کـــەس وکاریان لـــەرووی مەعنەویەوە. دڵخۆش دەکات...دیارە بەونەریتە ڕێزگرتن لەو پۆلەتێکۆشەرەی بوونـە دینـامۆی هەڵگیرسـانەوەی شۆڕشـی نوێخـوازی گەلەکـەمان مـەدالیا لـە ملکردنیان بەناوی پێشمەرگەدێرین و سـەرەتاییەکانی شۆڕشەوە..دڵی سەرجەم تێکۆشەران وهاوڕێیان و خێزان و منداڵ و کەس وکاریانی خۆشکرد.

جـارێکی تـر بۆپـەیرەوکردنی ئەونەریتـە ڕێزگـرتن لەوپۆلەتێکۆشـەرەی بەرشـالاوی گـرتن کـەوتن، لەزیندانـەکانی رژێمـدا تونـدکران. بـەناوی یەکـەم وەجبـــەی زینـــدانی سیاســـیەوە، هـــەنگاوێکیتری شـــکۆدارتربوو جێـــی خۆیەتی....بەدوای ئەو پۆلەتێکۆشەرانەدا تێکۆشـان و خـەباتی پۆلـە تێکۆشـەری هەڵۆی سووریش لەپێش چاو بگرین، کـە لەسـەردەم و بارودۆخێکـدا، جەربەزانـە لـەناو پایتـەختی شاری بەغدادا. لـەناو ئـەو هـەموو دام و دەزگـا جۆراو جۆرەی رژێمـدا، بـۆ سـەلماندنی دەسـتپێکردنەوەی شـۆڕش و هەڵسـانەوەی گەلـەمان و لەناونەچوونی بزووتنەوەی رزگاریخوازی عوسمـان فایـەقی تاوانباریـان بەسـزای گەل و شۆڕشیان. گەیاند.. مافی خۆیانە ئەو پۆلە تێکۆشـەرە هـەنگاوێکی تـری ئـەو نەریتـە بێـت وڕێزیـان لیبگیرێـت و مـەدالیای شـەرەف و چـەلەنگیان لـەمل بکرێت و خەبات وتێکۆشانیان پشتگوێ نەخرێت،، وەکو یەکەم وەجبەی زیندانە سیاسیەکان ڕێز لە خەباتیان بگیرێت.

دوای کارەساتی شومی ئەنفال و سـووتماککردنی کوردسـتان خـاپوورکردنی شاروشارۆچکە و گوندەکانی کوردسـتان.

هێزەکـانی پێشـمەرگە دوای چـەندین رۆژ بـەرگری نـەتوانرا لـەژێر زەبـری کیمیابـاران و هێـزە زەبـەلاح و پڕچـەکەکەی رژێـم خـۆی بگرێـت و، بەناچـاری

بەمەبەستی مانەوەی هێزی پێشمەرگە پاشەکشەیکردو، کوردستان بووە کەلاوەیەك بایەقوژی تیادەخوێند، ورەی کۆمەلانی خەلك رووخاو لە ٧٠٪ خەلك بەبێ ئومێدی سەیری شۆرش و بارودۆخەکەی دەکرد. بەلام لەرۆژگاری شکست و نائومێدیدا. .بەزاخی پێشمەرگە، پارتیزانەکانی. . .گەرمیان و قەرەداغ و چەمی رەزان و دۆلی جافەتی و شاربازێرو بەیارمەتی و تێکۆشەرانی رێکخستنە نهێنیەکانی ناوشارو سەرپەرشتیکردنی راستەوخۆی دەستەکانی پێشمەرگەو دابینکردنی هەمووجۆرە کەلوپەل و پێداویستیەك، توانرا. .گوندە وێرانکراوەکان بێ پێشمەرگەو بێ خاوەن نەبن. چالاکیبە دوای چالاکیدا. .دوژمن بخەنەگێژاوەوە، وای لێبێت متمانەی بەکەسەکانی خۆی نەبێت و لەهەر هەموویان بکەوێتە گومانەوە. .ئا لەو رۆژگارەدا. کۆمەلانی خەلکی شاروشارۆچکەو گوندەکان، لە ئۆردوگای زۆرە ملێیدا کۆکردنەوەو هەموو دەرفەتێکیان لێ برین، خانوومالیان بەسەر یەکدا رووخان و رۆژگارێك بوو. ناوهێنانی وشەی پێشمەرگەو شۆرش بەگشتی بووبوونە وشەی(بڤە) بەدەگمەن کەسانێك تاك و تەرا هەبوون، بوێرن ئەو وشانەیان بەزماندابێت و لەبیرومێشکیاندا گوزەر بکات.

بەلێ ئالەو کاتانەدا ئەو پێشمەرگانە ئەو ریکخستنانەی شارو شارۆچکەکان. .جەسورانە ملیان لەچەقۆ دەسویی و بێسلکردنەوە شانە بەشانە کۆدەبوونەوە، چەك و تەقەمەنی کەلوپەل و ئازووقەی دەگەیاندە پارتیزانەکان، بوونە هەوێنی هەلسانەوەی شۆرش و دنیامۆی راپەرین

بۆیە ئەوانەش مافی خۆیانە هەربەونەریتە رێزیان لێبگیرێت و خەبات و تێکۆشانیان لەپێش چاوبگریت.

لەسەردەمی ئەنفال و نائومێدیدا ئەو پۆلە تێکۆشەرەی رێکخستنی نهێنی ناوشارەکان، کە دەستیان بە پێشمەرگە پارتیزانەکانەوە بوو. لەئەنجامی چالاکی و هەلسوکەووتیاندا دووچاری گرتن و زیندانی کردن بوون. . با ئەو پۆ لە تێکۆشەرە زیندانیانەش وەکو دوا وەجبەی زیندان و تێکۆشەری هەلسانەوەی شۆرش ئەو نەرێتە بیانگرێتەوەو ئەو مافەیان پێرەوا ببینرێت، وەکو یەکەم وەجبەی زیندانیەکان مەدالیای رێزیان لەمل بکرێت، بەو هەنگاوە خێزان و

منداڵو کەسوکاریان شادو گوشاد بکرێن تابزانن کە شۆڕش تێکۆشەرانی خۆی پشـتگوی ناخـاتو هەریەکـەو هـەر کۆمەڵـە لـەکاتو شـوێنی خۆیـدا رێـزی لێـدەگرێتو. بەمـەش..گلـەیی و گازنـدەی هاوسـەرو بـاوكو کـەسو منـداڵیان دەبردرێت کە رۆژانەو بەدەمیانەوەیەو دەڵێن ئەی ئێمە بۆ وەکو وەجبەی زیندانی رێزمـان لێناگیرێـت؟ ئـەی ئێمـەش زینـدانی نـەبووین؟ لەسـەر شـۆڕشو لەسـەر دەمـانێکی سـەختا شـانمان نەدایـە ژێربـاری کـەوتووی شۆڕش؟چەند رۆڵەیـەکی جەربـەزەمان لێنـەکرا بەدارا؟لـە کۆتاییـدا بـا ئـەو نەریتـە شۆڕشگێڕانەیە ئێمـەش بگرێتەوە.

## (رۆڵە بەئەمەکەکانی شار)

# حاجی فەقێ شاڵی

## ١٩٥٨-١٨٨٠

حاجی فەقێ شاڵی کوڕی حاجی محەمەدی شاڵییە، حاجی محەمەد لەگەڵ دوو برایدا، حاجی عەبدوڵڵا شاڵی گەورەو، حاجی مەحمود، کە بابانەکان لە قەڵاچوالانەوە گواستیانەوە بۆ شوێنی ئێستای سلێمانی، بەماڵەوە چوونە سلێمانی، تێیدا نیشتەجێ بوون، بنەماڵەی ئێستای شاڵی لەو سێ بنەماڵەیەوە کەوتۆتەوە.

حاجی فەقێ لەحوجرەوە فێری خوێندن بوو. پیاوێکی ئایینیو سەر بەتەریقەتی نەقشبەندیو بازرگانێکی ناسراو بەناوبانگی شارەکەو پیاوێکی ناوداری کۆمەڵایەتی بوو لە بازرگانیدا هەموو جۆرە بازرگانیەکی ئەو سەردەمەی کردووە. دووکانەکەی لەخانی ئاغا فەتحوڵڵا دابوو. دوکانەکەی شوێنی دانیشتنو کۆڕو کۆبوونەوەی گەورەپیاوانی شارەکەبوو، وەکو مامۆستا عەلادین سوجادیو، شاکر فتاح، فتاح شاڵی، جلال حاجی سەعید ئاغا، شێخ قادری حەفید، مەلا مستەفای سوفوەتو کەسانی تری ناسراوی شارەکە. ماڵەکەشی شوێنی میوانداری شێخانی بیارە بووە، کەبوونەتە میوانی شار.

حاجی فەقێ پیاوی خێرمەندی دەستو دڵ ساف بوو، بەبەردەوامی یارمەتی هەژارانو قوتابیان، قوتابخانەو مزگەوتو مەلاو فەقێکانی داوە.. بەتایبەتی بە بەردەوامی دەسی بەمزگەوتی خانەقای مەولاناو خانەقای بیارەوەبوە. دەسگیرۆیی ساڵانەی خەڵکی گوندەکانی دەکرد. دەفتەرەکەی کەدوای خۆی لەدواکانەکەیدا مابۆوە.. ناوی چەندین قوتابی زانکۆی تێدابوو، کە ساڵانەو مانگانە یارمەتی کردبوون. ناوی چەندین هەژاری تیادابوو، کە مانگانەو ساڵانە یارمەتی داون. ناوی چەندین خەڵکی دێیەکانی تێدابوو کە لەقەرزەکانیان خۆشبووە لەبەر نەدارییان. حاجی فەقێ(٤) کوڕو(٣)کچی بووە.. کوڕەکانی محەمەد فەرەجو محەمەد رەووف وەکو خۆی بەکاری بازرگانیەوە خەریکبوون.

ئەحمەد پیاوێکی حقوقی بووە، وەزیفەی بەڕێوەبەری ناحیەو قائیمقامو دواپلەی وەزیفی جێگری پارێزگای دهۆك بووە. ئەم سێ کوڕەی لەژیاندا نەماون. جەمال شاڵی کوڕی چوارەمی چەندین پۆستی وەزیفی وەرگرتووەو ماوەی چەند ساڵ پارێزەر بووە وئێستا دادوەرو ئەندامی دادگای تەمیزی حکومەتی هەرێمی کوردستانە. لەشەستەکاندا بۆتە خاوەنی ئیمتیازی گۆڤاری رۆژی نوێو بۆ ماوەی یەك ساڵو نیو مانگانە دەریکردووە. (١٨) ژمارەی بەرێکوپێکی لێدەرچووەو ئەرکی تەواوی گۆڤارەکەی گرتۆتە ئەستۆ، کە بەپارەو سامانی حاجی فەقێ شاڵی بووە، خانووەکەیان لەگەڕەکی دەرگەزێن (کاتێ زانکۆی سلێمانی دامەزراوە بەپارەیەکی کەم دایانە زانکۆو کراوە بەمەتحەفی فۆلکلۆری زانکۆ). حاجی فەقێ ساڵێك کەسانی نەفس نزمماڵەکەی دەبڕنو کەلوپەلو پارەی دەدزن... پاش چەند رۆژێ دزەکە خۆی دەخاتە ماڵەکەیەوەو کەلوپەلو پارەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، داوای لێدەکات کەلێی ببورێت ئەویش بەبێ ئەوەی پەنا بۆ هیچ دامو دەزگایەك ببات لێی خۆش دەبێتو ئامۆژگاری دەکات، حاجی فەقێ وەکو نەریتی رۆژانەو هەموو بەیانییەك لەدوای نوێژی بەیانیان قورئانی خوێندووە تا نانوو چا پێگەیشتووە.

محەمەد فەرەج شاڵی کوڕی..سەردەمی پاشایەتی مەلا ئەسعەدی مەحویو شێخ لەتیف حەفید بەتۆمەتی حزبی برایەتی دەگیرێنو خانووەکەی مەلا ئەسعەد مەزات دەکرێت. محەمەد فەرەج لە مەزاتەکەدا خانووەکە دەکڕێتەوە، کە مەلا ئەسعەد بەرئەبێت. ئەچێ بۆلای پێی ئەڵێت خانووەکەتم بۆ خۆت کڕیوە..ئەو پارەیەش کە لەمەزاتەکەدا پێی دابوو لێی وەرناگرێتەوە، حاجی فەقی لەهاوینی ساڵی ١٩٥٨دا کۆچی دوایی کردووە. ئەوە ماوە بڵێین بنەماڵەی شاڵیەکان کە حاجی فەقێ یەکێکیانە. ئەو بنەماڵە بەناوبانگو دیارو خانەدانەن کە لەشاری سلێمانیدا رۆڵی بەرچاویان لەپێشکەوتنی شارەکەدا بینیوە، لەبواری بازرگانی، ئاینی، رۆشنبیری، کۆمەلایەتی، پەروەردەیی، ئەندازیاری، تەندروستیو نیشتمانپەروەریو کوردپەروەریو سیاسیو رۆژنامەگەریدا.

ئەم نووسینە لەگۆڤاری سلێمانیدا لەلاپەڕەی رۆڵە بەئەمەکەکانی شاردا بڵاوکراوەتەوە...

# ئەوانەی شە پۆر بۆ کوڕانی
# سەدام دەکەن وەکو ئەوان تـاوانبارن

دوو.. کـوڕە پیـاوکوژو بەدڕەوشـتو سەرسـەرییەکانی سـەدامی دیکتـاتۆر. ئەوەندەیان تاوان بەرامبەر بەخەڵکی عێراق کردووە. مەگەر باوکە تاوانبارەکەیان شـــان لەشـــانیان بـــدات.. دوای ئـــازادکردنی عـــێراقو ســـەدامو کـــوڕو دەسـتوپێوەندەکانی، کونەمشـکیان لێبـووە قەیسـەریو جێگایـەك لـەو عیراقـەی ئەوان وێرانیان کردبوو، نـەما خۆیانی تیادا بشارنەوە، بۆیە لەشاری موسڵدا.. بەپارچـە پارچـە کـراوی بەسـزای تاوانبارییـان گەیشـتن. سـەیرە کەسانێك هـەر لەخـەڵکی عێـراقو یان وڵاتـانی عـەرەبی... شـینو شـەپۆر بـۆ ئـەو دوو تاوانبـارە دەکەن..ئەو کەسانە دیـارە لـەو کەسـانەن کـوڕانی دکتـاتۆر بـەم دەسو بـەودەس سامانی عیراقـی کـردوون بەقورگـدا.. بـۆ خـەڵکی عێـراق نـاگرین.. کـە بەهـەزاران گۆڕی بەکۆمەڵیان بەدەستی ئەو تاوانبارانە بۆ زیندەبەچاڵکردنیان هەڵکەندراوە، کەناڵـە ئاسمانییـەکانی جزیـرەو ئەلعەرەبیـە تووشـی نەخۆشـی بـون، کـە دەبیـنن دەسەنەیەکەی دکتاتۆریان نەماوە نازانن چی بکەن.

من دەڵێم ئەو کەناڵانەو ئەو کەسانە بیانـەوێتو نەیانـەوێت، مـادام شـەپۆر بـۆ کوڕە تاوانبارەکانی سەدام دەکەن، لەو تاوانبارانە هـیچ کـەمتر نـینو وەکـو ئـەوان تاوانبارن..

مرۆڤ نازانێت بۆچی بۆ کوڕانی سـەدام دەگـرین، بـۆ ئـەو بڕوانامـە درۆییانـەی کـە یـەك دێریـان بـۆ نەخوێنـدەوەو یـەك کتێبیـان بـۆ نەکردۆتـەوەو یـەك سـەعات دەوامیـان بـۆ نـەکردوووە. بـۆ ئـەو خزمەتکردنـەی خـەڵکی عیراقیـان کـردووە بـە کوشتنو بەدڕەوشتیان.

# گۆڤاری سلێمانی

گۆڤاری سلێمانی....یەکێکە لەو گۆڤارانەی مانگانە بەبەردەوامی ژمارەکانی دەردەچێت.

لەناوەرۆکدا دەوڵەمەندە لەڕووی هونەرییەوە..گۆڤارێکی جوانو قەشەنگە. بەپێی ئەو بەرنامەیەی بۆی داڕێژراوە...مانگانە لەبواری ئەرشیفو مێژووی شارورووناکبیرو کەسایەتیە ناودارەکانو خاوەن پیشەو خوێندنگاکانو ئەرشیفی شارو رۆڵە بەئەمەکەکانی شارو نامە گرنگو پڕبایەخەکانو تۆمارکردنی هەموو دیاردە شارستانیەکانی شار کە هەر لاپەڕەیەك لەو تۆمار کراوانە مێژووی پڕ شکۆدارو پڕشنگداری ئەم شارە دەردەخەن...سەرباری ئەوکارە بەنرخو پیرۆزە تۆماری چالاکیو ئەركو کارەکانی شارەوانیو شارەکە دەکات.

دیارە سلێمانییەك لانکەی پەروەردەکردنو پێگەیاندنی...بێ کەسو پیرەمێردو نالیو سالمو مەحویو حەمدیو نوری شێخ سالحو شێخ مەحمودی نەمرو کاك ئەحمەدی شێخو رەفیق حلمیو تۆفیق وەهبیو موحەرەمو گۆرانو کاکەی فەلاحو دیلانو رەشۆلو کێو کێ بێت.

خاوەنی رۆژنامەی ژینو ژیانەوەو ئومێد ئیستقلالو بانگی حەقو گەلاوێژ بانگی کوردستانو رۆژی نویو بڵێسەبێت خاوەنی قەلەندەرخانەی پیرەمێرد بێت... هەردەبێت لەم رۆژی ئازادی کوردستانەداو لەم سەردەمی پەرلەمانو حکومەتی هەرێمی کوردستانەو ئەنجوومەنی هەڵبژێردراوی شاردا...گۆڤارێکی وەکو سلێمانی دەربکاتو بچێتە کتێبخانەی ماڵەکانی شارەوە.بەبۆنەی تەمەنی شەش ساڵیەوە گەرمترین پیرۆزبایی لەشارەوانی سلێمانیو سەرنووسەرو ستافی گۆڤارەکە دەکەمو، دەستخۆشیان لێدەکەم ئومێد دەکەم زیاتروزیاتر بەرەوپێش بچێتو لەسەر رێبازەکەی بەردەوام بێت...دیارە گۆڤاری سلێمانی درێژە پێدەری گۆڤارەکەی شارەوانی سالانی شەستو حەفتاکانە. کە هەربناوی سلێمانییەوە دەرچووو مامۆستای شەهید (محەرەم محەمەد ئەمین) سەرنووسەری بوو. داوای تەمەنی درێژ بۆ مامۆستا (حەمە نوری) دەکەمو سەرکەوتووبێت.

# من و مامۆستا مەحموودی مەلا عیزەت و بیرەوەرییەکی راگوزەری

ساڵی ١٩٦٤خوێندکاری چواری ئامادەیی وەتەن بووم لە سلێمانی، کە ئێستا مەکتەبی رێکخراوەدیموکراتییەکانی تیادایە. یەکێك لە مامۆستاکانمان.... مامۆستا مەحمودی مەلاعیزەت بوو، مامۆستا پیاوێکی کورتە باڵای کەمێ لاوازبوو. وانەی مێژووی پێدەوتین....

چەند لاوازبوو، ئەوەندە لە بەڕێوەبردنی پۆلدا بەتوانا و دەسەڵاتبوو...سامێکی تایبەتی لای خوێندکارەکان هەبوو. سەردەم سەردەمی شۆڕشی ئەیلوول و پارتی دیموکراتی کوردستانبوو...ململانێ لەناو سەرکردایەتی پارتیدا زۆر توندتیژبوو...هەر لەو ساڵەدا کارگەیشتە ئەوەی باڵی مەکتەبی سیاسی لەپارتی جیابۆوەو بارودۆخێکی ناهەموار رووبەڕووی شۆڕش وهێزی پێشمەرگەو ریزەکانی رێکخستن و کۆمەڵی خەڵکی کوردستان بۆوە.

مامۆستا...لەگەڵ وتنەوەی وانەی مێژوودا...زۆرجار تیشکی دەخستە سەر مێژووی کورد و، بزوتنەوەکانی و هۆی ناکۆکییەکانی شۆڕشی باس دەکرد و، لەسەر زۆربەی مەسەلەکان راوبۆچوونی خۆی هەبوو...لەقسەکانیدا بۆمان دەرکەوت، کە مامۆستا یەکێکە لەمامۆستا تێکۆشەرو کادرە بەتواناکانی ناو پارتی و کەسایەتییەکی سیاسی و رووناکبیری ناو کۆمەڵی کوردەوارییەو لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسیدایە.

مامۆستا کاتێك وانەی پێدەوتین....ئەوەندە بەزەوق وشەوقەوە وانەکەی شیدەکردەوە...هەرهەموومانی والێدەکرد، کە بەباشی گوێبگرین و یەك کەس لە شوێنی خۆی جوڵەو ورتە نەکات، حەزمان نەدەکرد زەنگ لێبداو وانەکە تەواوبێت. مامۆستا کارێکی وای کردبوو، خۆشەویستییەکی لەرادەبەدەری لەنێوانی خۆی و خوێندکارەکاندا دروستکردبوو، زۆرجار خوێندکارەکان لەکاتی

زەنگلێدانی دەرەوەدا، ئەملاوئەولایان لێدەگرت‌و پرسیاریان لێدەکرد، زۆربەی پشووەکان لەبەر پرسیاری خوێندکارو وەڵامدانەوەیان نەدەگەیشتەوە ژووری ئیدارەو، زەنگی چوونە ژوورەوە لێدەدرایەوەو یەکسەر دەچووەوە پۆل.

مامۆستا هەرچەندە سەر بەباڵی مەکتەببی سیاسی بوو، بەڵام هەمیشە ئامۆژگاری ئێمەی دەکرد، کە هەوڵبدەین ململانێ‌و ناکۆکییەکەی ناو پارتی نەکرێتە شەڕی ناوخۆو براکوکوژی لێبکەوێتەوە...دەیگووت ئێمەی رووناکبیرانی کورد، دەبێت کار بۆئەوە بکەین کە شۆڕشەکەمان بە رێبازێکی شۆڕشگێڕانەی پێشکەوتووخوازدا بەرین...عەقڵییەتی عەشایەری‌و تیرەگەری وەلابخەین‌و، هەموو خەڵکی کوردستان شۆڕشەکە بەشۆڕشی خۆیان بزانن‌و شۆڕشیش هەموو کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بە موڵکی شۆڕش بزانێت...

مامۆستا دووساڵ لەو ئامادەییە وانەی پێوتینەوە، ئێمە لەپۆلدا خوێندکارو ئەویش مامۆستابوو، بەڵام لەدەرەوەی پۆل دەبوو بەهاوڕێمان بەهۆی دابڕانم لە خوێندن‌و وەرگرتنم لە کولییە، ماوەی چەندساڵێك لەگەڵ مامۆستادا لەیەك دووركەوتینەوە.

کاتێك شەڕ لەگەڵ رژێمی بەغدادا ساڵی ١٩٧٤ دەستپێکردەوە. من وەکو کارگێڕی لیژنەی ناوچەی قەرەداغ، چوومە قەرەداغ... مامۆستا مەحمود ئەوکاتە کارگێڕی لقی چواری پارتی بوو. زۆرجار کە لەقەرەداغ‌و خورماڵ‌و ئەحمەد ئاواوە دەچووم بۆ پێنجوێن، سەرم لە لق دەدا لە بناوەسووتە. مامۆستا لەلق کاری رێکخستنی پێسپێردرابوو. هەر لە بناوەسووتە خانوویەکی بۆ حەوانەوە بۆ دروستکرابوو. بەزۆری شەوانە لەو خانووەدا دەمایەوە، هەر کەدەچوومە لق‌و دەمبینی پێی دەوتم شەو میوانی منبە، منیش رازی دەبووم، بەراستی ئەو شەوانەی کە لەگەڵ مامۆستادا دەمامەوە شەوگارێکی زۆربەسوودبوو...زۆر راپۆرتی ناوچەکان‌و راپۆرتی لقی پیشان دەدام، زۆر لەو وەڵامانەشی دەدایە دەستم بۆئەوەی بیانخوێنمەوە، تا بەراوردی راپۆرتی نووسراوو وەڵامەکەی بکەم، لەگەڵ خەریکبوونی بەخوێندنەوەی راپۆرت‌و وەڵامدانەوەیاندا، خەریکی نووسینەوەی مێژووی کوردبوو...مێژووەکەش لەسەر کۆماری مەهابادبوو، دەیوت ئەم ساڵ کەڵکی زۆرم بۆ نووسینەوەی ئەم مێژووە وەرگرتووە، بنەماڵەی مەجید خان‌و حەمەرەشید خان زۆر هاوکاریم دەکەن زۆر بەڵگەنامەیان

بەمتمانـەوە داوەپـێم...ئـەو شـەوانە زۆر گەردەشـەو گفتوگۆمـان لەسـەر رووداو پێشهاتەکان دەکرد، کەمو کورتییەکانی شۆڕشو هێزی پێشمەرگەو لقەکانی پارتیو فەرماندەکانی هێزی پێچشمەرگەمان باس دەکرد.

ئەوشـەوانە کـەڵکی زۆرم وەردەگـرت، قسـەکانو بۆچـوونەکانیم دەکـردە بەرنامـەی کـارکردن. رۆژێـك لـە پێنجوێنـەوە چـوومە لـق...لـق تـەنها مامۆستاو خوالێخۆشـبووان دکتـۆر کـەمال خۆشـناوو محەمـەدی مـەلا عەبـدوڵلای لێبـوو، کەوتینە قسەکردن، هەرچوارمان راشکاوانە قسەمان لەسەر بارودۆخەکە دەکرد. بۆ نیوەڕۆ میوانیان بووم،لەکاتی نان خواردندا...مامۆستا وتی شەو مەڕۆرەوە بۆ پێنجوێن میـوانی منبـە، دکتـۆر کـەمال وتـی: هەسـتدەکەم مامۆستا نیـوانی تـۆو شێخ محەمەد زۆر گەرمە، وتی بەڵێ ئەو کاتەی چۆن من مامۆستاو ئەو قوتابی بـوو. ئێستاش هـەروا لەگـەڵ یـەك هەڵسوکەوت دەکـەین، شـێخ مـن بەمامۆسـتای خۆی دەزانێتو منیش ئەوم وەکو قوتابییەکی زیرەك قبوڵ کردووە.

دەبێ پیاو ئەوە بڵێت ساڵی ١٩٧٤ لەگەڵ هەموو کەموکورتییەکانیدا ساڵێکی خۆشبوو، بەڵام ساڵی ١٩٧٥ ساڵێکە لـە ساڵە نەگریسو شوومەکان لەمێژووی بزوتنەوەی کورددا، چونکە لە٦/٣ی ئەوساڵەدا رێکەوتننامەی جەزائیر ئیمزاکرا.

لەکاتی ئیمزاکردنی ئەو رێکەوتنەدا، من لەبەری قـەرەداغ بـووم. بروسکەمان بۆکرا بە زوویی بگەڕێنەوە بۆ پێنجوێن.

هەرگەیشـتمەوە پێنجـوێن سـەرم لەلقـدا، سـەیرمکرد وەزعـی لـق زۆر ئاڵۆزوشێواوبوو.

مامۆستا مەحموود بانگی کـردم، وتـی: بەپەلە بگەڕێرەوە بۆ تەوێڵەو بیارە، رایسپاردم. کە بەگەڕانەوەم پەیوەندی بەسەر لقوفەرمانـدە عەسـکەریو کـادرە ساسییەکانەوە بکەین، بۆ شەڕی پارتیزانی، بزانین کێ ئامادەیەو توانـای تێدایـە بۆ شەڕی پارتیزانی. ئەوانەشی کە توانایان نییە پێیان بڵێن دەتوانن بگەڕێنـەوە بۆ ناو حکومەت، مامۆستا وتی، لە مەریوانو کرماشانەوە بڕۆرەوە، چەك لەگەڵ خـۆت مەبـە. دەمانچـەو تفەنگەکـەم لـەماڵێك لەبناوەسـووتە دانـاو، یەکسـەر گەڕامەوە، ئەو رۆژە بەیانییەکەی دەرچووم بۆ ئێوارە گەیشتمەوە بیارە..یەکسەر لەگـەڵ برادەرانـی ناوچـە کۆبوینـەوەو راسـپاردەکانم پـێ وتـن، بڕیارمانـدا کـە

هەریەکە لەلای خۆیەوە دەستبکات بەکار بۆ گەیاندنی راسپاردەکەو، ناونووسکردنی پێشمەرگەو کادرو فەرماندە.

ئێمە سەرقاڵی جێبەجێکردنی راسپاردەکە بووین و، بارەگای ناوچەمان بردبووە دەرگا شێخان... کاتێکمانزانی مامۆستا پەیدابوو... کۆبوونەوەیەکی پێکردین و کۆمەڵی راسپاردەی داینێ و هەر ئەو رۆژە بەپەلە گەڕایەوە بۆ پێنجوێن و ئیتر ئاگامان لەیەکتر نەما.

دوای کارەساتی نسکۆی١٩٧٥ بەپێی سیاسەتی رژێم لە کوردستان دوورخراینەوە. هەریەکە بەلایەکدا رەوانەکراین... ئەو ساڵانەی من لەقەزای حەی بووم. مامۆستاش لەروومادی بوو. لەهاوینی ساڵی ١٩٨٠دا لە سلێمانی بووم، لە مانگی٦/ی ساڵەکەدا... هەواڵی گرتنی مامۆستاو چەند کەسێکیتر بڵاوبۆوە... هاوڕێیان کەوتینە پەژارەوەو خەمی زۆرمان بوو. لەهاوینی ساڵی ١٩٨١دا، رۆژێك حاجی شێخ ئیبراهمی قادرکەرەم هاتە ماڵی کاکەم لە سلێمانی. باسی ئەوەی بۆ کردم کە هەوڵێکی زۆری داوە بۆ بەربوونی مامۆستاو ئەوانەی لەگەڵیا گیراون. وتی بڕیاردراوە بەربدرێن... داوایکەفیلیانکردوە خۆم بوومەتە کەفیلیان هەربۆئەوەی بەربین. لە ١٩٨١/٦/١٨ مامۆستاو هاوڕێکانی بەربوون.

کاتێك مامۆستا بەربوو سەرم لێدا... بەدوورودرێژی باسی گرتن و ئەشکەنجەکانی بۆ کردم، کە چەند لەرووی تەندروستییەوە ئازاری چەشتووە، دواجار باسی حاجی شێخ ئیبراهیمی قادرکەرەمی کردو وتی بەنیازین دوای حەوانەوەو کەمبوونەوەی میوان سەری لێبدەین و سوپاسی بکەین... ئەوەی من ئاگادارم ئەو سەردانەیان کردو چوون بۆ قادر کەرەم بۆ ماڵی حاجی شێخ ئیبراهیم.

پاشماوەیەك مامۆستا... ونبوو. هەواڵیم زانی کە چۆتە دەرەوە. ئیتر یەکمان نەبینییەوە تا ساڵی ١٩٩٧... لەو ساڵەدا مامۆستا لە هەندەران گەڕابۆوە، بۆ وەزارەتی رۆشنبیری بەرنامەی کردنەوەی ئەرشیفی نەتەوەیی پێبوو. لەگەڵ مامۆستا جەمال عەبدولدا لەسەر ئەو بەرنامەیە قسەیان کردبوو، ئا لەو رۆژگارو ساڵەدا جارێکیتر بەیەکگەیشتینەوە. لەساڵی ٢٠٠٠گەڕایەوە کوردستان و کرایە سەرنووسەری رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ئەو ماوەیەی کە لەو دەزگایە کاریدەکرد، زۆر لەیەکتر نزیکبوبوینەوە، بەردەوام سەرم لێدەداو لەسەر

زۆرلایەن قسەمان دەکرد...ئێمە لەو سەردەمەدا توانیمان کتێبی شانۆگەری(دەروێشەکان بەدوای راستیدا دەگەڕێن)ی بۆ چاپبکەین‌و چاپکردنەکەی زۆر بەدڵبوو دەستخۆشی لێکردین.

مامۆستا دوای ئەوەی لە کوردستانی نوێ نەما، چەند کارێکیتری بۆ دیاریکرا، کارەکانی پێدەوتم‌و منیش رای خۆمم لە وەرگرتنی پێدەوت‌و راکەشمی بەهەند وەردەگرت، دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر بەبێ ئیش لە ماڵەوە بوو، پرۆژەی چاپکردنی بەرهەمەکانی داڕشت.

دوای بە ئەنجام گەیاندنی بەرنامەی چاپکردنی بەرهەمەکانی، جارێکیتر گەڕایەوە بۆ سوید، لەساڵی ٢٠٠٤.دا هەواڵی نەخۆشکەوتنیم زانی...بەڕاستی پەرۆشی بووم، تا لە مانگی ٣/٢٠٠٥دا گەڕایەوە بۆ کوردستان، بەگەڕنەوەی سەرم لێدا لەماڵەوە...خۆی‌و هەردوو کوڕەکەی((ژیلوان‌و مەریوان))لەماڵەوە بوون. بەکوڕەکانی ناساندم وتی بڕیارمداوە ئەمجارە نەڕۆمەوەوکوڕەکانیش بڕیاریانداوە بمێننەوە، زیاتر لە سەعات‌و نیوێك لەگەڵیا دانیشتم، باسی نەخۆشییەکەی‌و ئەو ئازارانەی بەهۆی ئەو نەخۆشییەوە لەماوەی ئەو دووسێ مانگەدا چەشتبوویی هەرهەمووی بۆ گێڕامەوە...دوای ئەو سەردان‌و بینینە من بە سەفەرێك چووم بۆ ئێران، کە گەڕامەوە بیستم نەخۆشکەوتۆتەوە‌و بەپەلە گەیاندویانەتەوە سوید، بەداخەوە زۆری نەبرد هەواڵی کۆچی ناوادەیمان پێگەیشت، ئەو سەردان‌و دیدارەمان بوو بەدوا دیدار..مامۆستا هەرکەس ناسیبێتی‌و یان لەگەڵیا ژیابێت، دەزانێت کەچ پیاوێکی بەتوانا‌و تێکۆشەرو لێهاتوو بووە، لەبواری روناکبیری‌و مێژوویی‌و بیروبۆچوونی سیاسیدا..دیارە ئەوەی کاروانی بێکۆتایی ئەو مامۆستایە بخوێنێتەوە تێدەگات مامۆستا چۆن مامۆستایەکبووە...جێی نیگەرانییە کاروانی بزووتنەوەی کوردایەتی، هەر رۆژە لەلایەکەوە کەلێنێ تێدەبێت‌و خۆشەویستانمان‌و زانایانمان‌و خاوەن هەڵوێستەکانمان‌و تێکۆشەرەکانمان لە کاروانە کە مەرگ یەخەی پێدەگرێت‌و لێمان دادەبڕێت ئاخ مەرگ.....

# چاوپێکەوتن بۆ رۆژنامەی کەرکووکی نوێ

**پ١:لە دەستنوسەوە بۆ بە کتێب بوون..دەکرێت ئەو قۆناغانە دیاری بکەیت؟**

وەڵام: هـــەر نوســـەرێك کتێـــب پێشکەشـــی وەزیـــر و وەزارەت یـــان بەڕێوەبەرایەتیەکەمان دەکات، بە مەبەستی چاپکردن یان کۆمەککردن، لەلایەن بەڕێوەبەری گشتییەوە،دەنێردرێت بۆ بەڕێوەبەری چاپ‌وچاپکردن.بۆ ئەوەی لە لیســتی کتێبــە دەســت نووســەکاندا تۆمــاری بکــات.ئەمــە وەکــو هــەنگاوی یەکەم.کتێبەکە سەیر دەکرێت لە هەر بوارێکی رووناکبیری‌و ئەدەبی‌و زانستی‌و هونەریدا بوو. بە پێی بابەتی کتێبەکە دەنێردرێت بۆ شارەزایەکی بوارەکە بۆ هەڵســەنگاندن‌و پێــدا چــوونەوە.ناردنی‌کتێــب بــۆ شــارەزا تــەنها لــەڕێگای بەڕێوەبەری گشــتییەوە دەبێــت.ئەویش بەپێی فۆرمێکی نهێنــی‌و تایبــەت‌و لــە دەفتــەرێکی تایبەتــدا نــاوی کتێبەکــەو نووســەرەکەو ئــەوەی بــۆی دەنێردرێــت‌و رۆژی ناردن‌و ماوەی گەڕانەوەی تیادا دیاری دەکرێت ئەوەش وەکو هەنگاوی دووەم.

دوای گەڕانــەوەی کتێبەکــە، لای شــارەزا.لەلایــەن بەڕێوەبــەرەوە ســەرنجی رای شــارەزاکە دەدرێــت‌و، ســەرنج‌و تێبینییــەکانی شــارەزاکە بەهەنــد وەردەگیرێــت. ئەگــەر کتێبەکــە لەلایــەن شــارەزاوە...پەســەند کــرا بــۆ ئــەوەی چــاپ بکرێــت یــان هاوکــاری بکرێــت.ئــەو کاتــە دەخرێتــە بەرنامــەوە بەپێی مێــژووی تۆمــارکردنی هــاتنی کتێبەکــەو دەخرێتــە بەرنامــەی تاپیکردنــەوە.ئەگــەر شــارەزا ســەرنج‌و تێبینی وای هــەبوو کەلــە کتێبەکــەدا دەستکاری بکرێــت، یــان هەندێ بابەتی لــێ لابیرێت... رای شارەزاکە کۆپی دەکرێت بە بێ ئەوەی ناوی شارەزاکەی لەسەر بێت. نووسەری کتێبەکە بانگ دەکرێــت‌و پێــی رادەگەیەنرێت کە پــەیڕەوی ئــەو ســەرنج‌و تێبینیانــە بکــات‌و کتێبەکــەی چــاك بکــات.ئەگــەر رازی نــەبوو بــە راو ســەرنجەکان کتێبەکــەی دەدرێتــەوە..ئەگــەر شــارەزا ســەرنج‌و رای وا بــوو، کــە بابەتەکــە کــەم‌و کــوڕی زۆری هەیــەو، لاوازەو بــە کــەڵکی چــاپکردن‌و کۆمــەککردن

نایەت. خاوەنی کتێبەکە بانگ دەکرێت کتێبەکەی دەدرێتەوە.ئەمە وەکو هەنگاوی سێیەم.دوای ئەم قۆناغەی باسمکرد.قۆناغی تایپکردنو هەڵەبرو تەصمیم کردنو خستنە سەر ستێنسڵو راکێشانی دەست پێدەکاتو لەگەڵ ئەم قۆناغەداتیراژو تێچوونیو تەسمیمیو بەرگی دیاری دەکرێت..

دوا قۆناغی کتێبەکە دوای راکێشانو کۆکردنەوەو دەرزی لێدانو بەرگی تێدەگیرێتو تەسلیمی گەنجینە دەکرێت بۆوەرگرتنو دابەشکردنی..

**پ٢:بێگومان چالاکییەکانتان دیارن.دەکرێت گرنگترینیان باس بکەیت؟**

وەڵام:ئێمە سالانە چالاکی جۆراو جۆرمان هەیە.ساڵ بە ساڵیش چالاکییەکان زۆرترو باشترو بەرنامەرێژتر دەبێت.ساڵی ٢٠٠٤ جگە لە چاپکردنی(٨٢) کتێب لە ساڵەکەدا، دوو هەفتەی رووناکبیری بە سەرپەرشتی بەرێوەبەرایەتییەکەمان لە پارێزگای سنە(کوردستان)ی کۆماری ئیسلامی ئێرانو شاری سلێمانی ئەنجام دراوە.وە بەڕێوەبەری گشتی وەکو نوێنەری وەزارەت لەگەڵ وەفدێکی حکومەتی هەرێمدا سەردانی میسرو شاری قاهیرەی کردو، چەند جار هەر بۆ کاری رۆشنبیریو هونەری سەردانی ئێرانو دهۆكو هەولێر کراوە... دیارە لە هەموو سەردانەکانماندا بۆ ئەو شوێنانە بەمەبەستی گەشە کردنو بەرەو پێش چوونی کاری رووناکبیریو هونەری بووە بەلای منەوە ئەم کارانەمان گرنگترین کارەکانمانە.

١- سەردانی قاهیرە.
٢- هەردوو هەفتەی رووناکبیری لە سنەو سلێمانی.
٣- چاپکردنی ئەو ژمارە بەرچاوەی کتێب لە ساڵەکەدا.
٤- چاپکردنی چەند ژمارەیەك لە گۆڤاری تێکست.
٥- چاپکردنی دوو ژمارە لە گۆڤاری هەزار مێرد.

**پ٣:پرۆژەی چاپکردنی ئەدەبی منالان پرۆژەیەکی جوانبوو.بۆچی لێرە نەما؟ئایا ئەو لایەنەی کارەکەی پێ سپێردراوە پرۆژەکەی بە چی گەیاند؟**

وەڵام: ئێمە هەر لەدامەزراندنی بەرێوەبەرایەتییەکەمانەوە بەرنامەی چاپکردنی کتێبی منداڵانمان دارشتو بەئەرکو کارێکی زۆر گرنگمان

زانی...بەپێی توانامان لە ساڵانی رابردوودا ژمارەیەکی بەر چاو لە کتێبی منداڵانمان چاپکردووە.کە بەرای من ئەو کتێبانە جێگای خۆیان لە کتێبخانەی کوردیدا کردۆتەوە هەندێ کتێبی منداڵانمان چاپکردووە لە کتێبخانەکاندا نەماون،هەشە دوو جار چاپکراوەتەوە ئێستا لە بازاڕدا نەماوە...لە راستیدا حەز دەکەم ئەوە بۆ هەموو لایەك روون بکەمەوە.لە وەزارەتی رۆشنبیری چەند بەڕێوەبەرایەتییەکی گشتی دامەزراوە.دیارە هەر بەڕێوەبەرێتیە لە دامەزراندنیدا تایبەتمەندیی و ئەرك و کارێکی ئەو تۆی هەیە کە بۆی دامەزراوە.لە ناویاندا بەڕێوەبەرییێتی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە دامەزراوە بە پێی ناونیشانی بەڕێوەبەریتییەکە..دەبێت هەر کتێب و گۆڤارو چاپەمەنییەك لە وەزارەتی رۆشنبیری چاپ دەکرێت، لە ڕێگای ئەم بەڕێوەبەرایەتییەوە چاپ بکرێت..بەڵام بەداخەوە..بە بێ گوێدانە رێنماییەکانی وەزارەتی دارایی و ئابوری و دیوانی چاودێری دارایی گشتی..دەبینرێت هەر بەڕێوەبەرایتییەك دەیەوێت لەسەر ئەرك و کارەکانییەوە کتێب و گۆڤار چاپ بکات.بۆ نموونە.بەڕێوەبەریی خانەی وەرگێران کاتێ دامەزرا بە پێی ئەو بەرنامەیە دامەزرا کەلەلایەن بەڕێوەبەرایتییەکەمانەوە پێشکەشی وەزارەت کرا کە داشمەزرا بەڕێوەبەریتییەکی سەر بە بەڕێوەبەرایەتییەکەمان بوو.بەڵام لەبەر چەند هۆیەك کە دەتوانرا چارەسەر بکرێت جیا کرایەوەو، خرایە سەر بەڕێوەبەرێتی گشتی دیوان...لە ساڵی ٢٠٠٣وە بەڕێوەبەرێتی گشتی هۆشیاری منداڵان..بە ناوی (خانەی سمۆرەوە) کتێبی منداڵان چاپ دەکەن..جارجارە لەنوسینگەی تایبەت و راگەیاندنی وەزارەت کتێب چاپ دەکرێت و کۆمەك دەکرێت، بەرای من ئەمانە هەر هەموو دابەشکردن و پەرتەوازەکردنی توانای رووناکبیری و ئیداری و دارایی و هونەرییەکانەو نەدەبوو وابکرایە.

سەبارەت بەوەی پرۆژەی چاپکردنی کتێبی منداڵان بۆ لە ساڵی ٢٠٠٤ دا راگیراوە؟ هۆیەکەی دەگەرێتەوە بۆ ئەو راسپاردەیەی جەنابی وەزیر پێی راگەیاندین چاپکردنی کتێبی منداڵان رابگرین، ئێمەش لەسەر ئەو راسپاردەیە رامانگرت.لە کاتێکدا ژمارەیەکی زۆر لە کتێبی منداڵانمان لەلابوو، کەلە زمانەکانی فارسی و عەرەبییەوە وەرگێردرابوون، بەرهەمی نوسەرانیشمان لابوو.بەراستی ئێمە لە بەرامبەری ئەو خاوەن بەرهەمانە دەستەو وەستان

بووین و هەشیانە لێمان دڵگیربوون و قەناعەتیان بەوە نەدەکرد کە لە سەر ئەو راسپاردەیە چاپکردنی کتێبی منداڵانمان راوەستاندووە.

سەبارەت بەوەی ئەو لایەنەی ئەو ئەرك و کارەیان پێ سپێردراوە چیان کردووە؟وەکو بزانم.. ژمارەیەك کتێبیان چاپ کردووە، بەلأم کتێبەکانمان نەدیووە..تەنانەت کە بەپێی رێنماییەکانی وەرگرتنی ژمارەی سپاردن کە دەبێت لە هەر کتێبێك کە چاپ دەکرێت و ژمارەی سپاردن وەردەگیرێت (١٠)نووسخە لە کتێبەکە بداتە بەرێوەبەرایتییەکەمان..ئەو بەرێوەبەریتییە رەچاوی ئەو رێنماییانەشی نەکردووە.بەلأم لێتانی ناشارمەوە.ئێمە لەبەر ئەوەی کتێبێکی زۆرمان لایە.بریارمانداوە، کە ئەمساڵ بەپێی بەرنامەیەکی دارێژراو کتێبی منداڵانیش چاپ بکەین و بایەخێکی باش بە بوارەکە بدەین و لەسەر کاری کەس نەوەستین.

**پ٤ :لە هەڵبژاردنی کتێبی باشدا چ رەهەندێك حوکم دەکات؟**

وەلأم: ئێمە لەبەر ئەوەی دەزگایەکی حکومین و سەر بەوەزارەتی رۆشنبیرین و، بەرنامەی چاپکردن و هاوکاریکردنی بەرهەمی نووسەرانمان هەیە.زۆری نووسەران روومان تێدەکەن.بەرهەمییان پێشکەش دەکەن..

ئێمە بەرهەمی هەموو نوسەرێك وەردەگرین، و رێنمایەکانمانی پێدەڵێین و بەرهەمەکەی بەو قۆناغانەدا تێپەر دەبێت.کە لە پێشەوە باسمان کرد.لێتان ناشارمەوە بەرهەمی وا هەیە زۆر گرنگە بۆ کتێبخانەی کوردی ئێمە..لەسەرەدا داینانێین و هەر کتێبەکە ئامادە بوو دەیخەینە ژێر چاپەوە، زۆرجار ئەوەشی تێدەکەوێت نوسەرێك لە رێگای سەرۆکی‌حکوومەت یان وەزیری رۆشنبیری و یان کەسایەتیەکی رۆشنبیرییەوە کتێب دەنێرن و لەگەڵ ناردنەکەیدا راسپاردە دەکەن..ئێمە رەچاوی ئەو راسپاردانە دەکەین لە ساڵی٢٠٠٤ دا لەسەر کەرکوك و تەعریب و ئەنفال هەر کتێبیکمان بۆ هاتبێ هەوڵمانداوە پێشی بخەین و بە زووی چاپی بکەین....

حەز دەکەم ئەوەش باس بکەم..زۆر نوسەر بەرهەمیان لامانە وەکو دەزانم هەندێکیان گلەیی ئەوە دەکەن کە بۆ نووسەرێك لە ساڵێکدا(٢)بەرهەم یان زیاتری بۆ چاپدەکرێت و بەرهەمەکەی ئەوان دوادەکەون لە چاپکردن.

لە راستیدا ئەو دیاردەیە هەیەو زۆر کاری لەو جۆرە کراوە،بەلاّم ئەگەر بەدەستی ئێمە بێت هەرگیز کاری وا ناکەین نامانەوێت بیکەین..زۆر بەرهەم هەیە راستە هی یەك نووسەرە، بەلاّم بەرهەمەکانی بۆ کتێبخانەی کوردی بۆ ئەم بارودۆخەی ئێستا زۆر پێویستن‌و بە کەڵکن.بۆ نموونە لە ساڵی٢٠٠٤دا دوو کتێبمان بۆ (شۆرش حاجی) چاپ کردووە..بۆ (گەلاوێژ خان) دوو کتێب، دەبێت ئەوەش بزانرێت لە خانەی سمۆرە، وەکو دەبینرێت بۆ یەك نوسەر(٢٥)کتێب‌و(٣٠)کتێب چاپکراوە، کە ئەم دیاردەیە لای ئێمە هەرگیز رووی نەداوەو روونادات، من نازانم بە چ حەقێك ئەو حەقە بە یەك نوسەر دەدەن ئەو ئیمتیازەی هەبێت، لە کاتێکدا چەند نوسەری بواری منداڵانمان هەیە.

**پ٥:هەڵە بۆ لە چاپی کتێبەکاندا بەدیدەکرێت و بۆچی دەگەرێتەوە؟**

وەلاّم:١- راستە هەڵەی زۆر لە چاپکراوەکانماندا هەیە.من هەر کتێبێك دەبینم ئەو هەلاّنەی تیادا دەکریٚ باوەر بکەن وا دەزانم کورێکم دووچاری،کارەسات‌و نەخۆشی بووە، حەز دەکەم لەسەر ئەو کتێبە گەورەترین سزای ئەو کەسە بدەم کە هەڵەبڕی‌و تایپی کردووە.من ئەمەش دەگێرمەوە بۆ ناعەدالەتی کارەکانی وەزارەت وکەرت‌و پەرت کردنی تواناکان.بۆ نمونە لە بەرێوەبەریتییەکی رەکو خانەی وەرگێران..چەندین شارەزا بە مووچە یان بە گریٚ بەست‌و بە پارەی باش دامەزراوە.لە کاتێکدا لە بەرێوەبەریتییەکی وەکو بەرێوەبەریتییەکەی ئێمە یەك کەسمان بەناوی (شارەزا) هەیە، ئەوانیتر هەر هەموویان فەرمانبەرن‌و، لەو کەسانەن کە دەرچووی زمانی کوردی‌و عەرەبین‌و، هیچیان لەسەر داوای ئێمە دانەمەزراون، ئەو فەرمانبەرانە لەبەر ئەوەی تازەن‌و لە بوارەکەدا کارییاننەکردووە هیچ شارەزاییکیان لە بوارەکەدا نییە..ئەو هەلاّنەی کەلە کتێبەکاندا دەکریٚ هەر هەمووی دەگەرێنەوە بۆ نە شارەزای ئەو فەرمانبەرانەو ئەو تاییپێستانەی هەمانە.بۆ ئەو ناعەدالەتیەی وەزارەت‌و ئەنجومەنی وەزیران بۆ دامەزراندنی کەسانی شارەزا بۆ خانەی وەرگێران‌و پشتگویٚ خستنی بەرێوەبەریەکەمان لەو بارەیەوە.حەز دەکەم ئەوە بزانرێت کەسانیٚ هەبووە لە سەر نوسراو داوای ئێمە بە شارەزا دامەزراوە.یان لای ئێمە بووە.کاتیٚ فەرمانی دامەزاراندنی دەرچووە نێردراوە بۆ خانەی وەرگێران.تاییپێست لەسەر داوای

ئێمەو بە نوسراوو هەوڵی ئێمە دامەزراوە کە فەرمانی دامەزراندنی دەرچووە نێردراوە بۆ خانەی وەرگێران، یان بۆ شوێنێکی تر، تا ئێستا چەندین داوامان کردووە کە چەند شارەزاو تایپیستمان بۆ بنێرن..بە داخەوە گوێ لە داواکەمان نەگیراوە لەبەر ئەوە ستافی تایپکردنی کتێب و ستافی هەڵەبڕمان وەکو پێویست نییەو لە ئاستی خواست و کارەکانی ئێمەدا نین بۆ ئەو دیاردانە لە رووی(هەڵە)وە لە چاپکراوەکانمدا بە دیدەکرێت،بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە هەوڵی بەردەوامدام بۆ ئەوەی لە هەموو بوارێکەوە کارەکانی دەزگاکەمان چاکتر بکەم و بەسەر ئەو دیاردایانەدا زاڵبین.

**پ٦:کورتەیەکی مێژووی بەڕێوەبەرێتیەکە و ژیانی خۆت؟**

وەڵام: بەڕێوەبەرێتیەکە لە ناوراستی ساڵی١٩٩٩دا دامەزاروە..کە دامەزرا نە فەرمانبەر و نە شوێن و جێگامان لە وەزارەت نەبوو.زیاتر لە(٤)مانگ بەڕێوەبەری گشتی بووم.بەبێ ژوورو شوێن و فەرمانبەر.دوای هەوڵ و کۆششی بەردەوام وهاوکاری (مامۆستا جەمال عەبدول) و (بەڕێوەبەری کارگێری و خۆیەتی دیوانی وەزارەت) توانیم..خانوو بگرم.کۆمەڵێ فەرمانبەر بگوێزرێتەوە بۆ سەر میلاکی بەڕێوەبەرێتیەکە..بە دوایدا بە هاوکاری و گیانی دڵسۆزی فەرمانبەرەکان توانیمان..پەیکەری بەڕێوەبەرێتیەکە دامەزرێنین...هەر چەند لە سەرەتاوەو تا ئێستاش بە بەردەوامی دژایەتی دامەزراندنی و پێشکەوتنی کراوەو دەکرێت.بەڵام ئێمە بەپێی ئەو بەرنامەیەی لە سەرەتای دەست بەکاربوونمەوە دامانڕشتبوو، بە بێگوێدانە ململانێ کارەکانمان جێبەجێکردووە.من ئاواتم بوو.کە دەزگاکەمان لە هەموو روویەکەوە پێشکەوێ.هەست دەکەم ئێستا لە زۆر رووەوە.بەرەو پێشچووە.هەر چەندەهێشتا لە ئاستی خواستەکانمدا نییە، بەڵام ئەو بەرنامەیەی دامڕشتووە، کاری بۆ دەکەم، دڵنیام ئاواتەکەم دێتە دی و دەبێتە دەزگایەکی کاراو پێشکەتووی ئەوتۆ کەبتوانین لە هەموو بوارێکی چاپکردندا خزمەت بە رووناکبیران و نوسەران و هونەرمەندان بکەین و جێگای قەلەندەر خانەو چاپخانەکەی پیرەمێردی نەمر بگرێتە...وە هەروەکو لە بینینێکی کاک نەوشیروان و مندا وتی (دەزگاکەی ئێوە دەزگا رۆشنبیریەکەی بەغدای

جارانــه لــه رووی چــالاکییەوە،بەلام ئیمکانیــەکی کــەمترو بــەئاقاریکیترو بەرنامەیەکی دڵسۆزانەو پێشکەوتوو من زۆردڵم بە دەزگاکەتان خۆشە).

سـەبارەت بـە مێـژووی ژیـانم. نـازانم لـە کویّ و لەکـەیّ و لـە چییەوە دەسـت پێبکـەم.؟لـە گونـدی سـۆڵەی دەربەنـدی ناوچـەی قـەرەداخ لـە سـاڵی ١٩٤٦ دا لـە دایکبـووم.لـە خوێنـدنی مزگەوتـەوە.قۆنـاغی سـەرەتایم تـەواوکردو بـە دوایـدا قۆناغــەکانی ناوەنــدیو دوانوەنــدیم لــە شــاری ســلێمانی تــەواو کــرد.لــە ساڵی١٩٦٨/١٩٦٩لە بەشی کوردی کۆلێژی زمانەکانی زانکۆی بەغدا وەرگیرامو ســاڵی ١٩٧٢بەشــی زمــانو ئــەدەبی کــوردی کۆلێــژی ئــادابم تــەواو کــرد، لــە مێردمنداڵیمــەوە..تێکــەڵاوی بزوتنــەوەی نیشــتمانیو نەتەوایــەتی گەلەکــەم بــووم...لــەو مەیدانــەدا هــەموو بوارەکــانی خــەباتم تاقیکردۆتــەوە بــە نهێنــیو ئاشکراو پێشمەرگایەتیو ڕێکخراوەیو زیندانی،لە ساڵی ١٩٧٦چوومەتە ریـزی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان، لە ژیانی سیاسیمدا چەند جار فەرمانی گرتنم لەلایـەن دەزگاکـانی ئەمنـەوە دەرچـووە، لـە هـیچ جارێکیانـدا بـەر شـاڵاوی گـرتن نەکــەوتووم تــا لــە دوا شــاڵاوی ئــەمنی ســلێمانی لــە ســاڵی١٩٩٠گــیرامو لــە مەحکەمــەی ســەورە لــە١٦/١٠/١٩٩٠حـوکمی موئەبـەد درام.لـە دوای راپــەرین لە٢٢/١٢/١٩٩١بە گۆڕینەوە ئازاد کرام.

لە بواری نوسینو ئەدەبیدا..

لـە ساڵی ١٩٥٩وە خولیـای نووسینو عەشقی شیعر بومو، یەکـەم هۆنراوەم لە(پێشکەوتن)دا بە ناونیشانی(رۆژیّ لە رۆژان)بڵاوکراوەتەوە...لە ساڵی ١٩٧٠وە بە بەردەوامی نووسینم لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوکردۆتەوە.

*لە ساڵی ٢٠٠٣داکۆمەڵیّ شیعرم بە ناونیشانی(دابڕان)چاپکردووە.

*لـە سـاڵی ٢٠٠٤دا دوو کتێـبم لەسـەر دوو هـاوڕێم ئامـادە کـردو بـە چـاپم گەیاند بەم ناونیشانانە.

١- مامۆستا جەمال تاهیر قارەمانی شۆڕشو زیندان.

٢- مامۆستاعەزیز ژیانێکی پاكو شەهیدی دەستێکی ناپاك

چەند پرۆژیـەکی تـرم بـە دەستەوەیە ئەگـەر کێشەو بـاری تەندروستیم مـاوەم بدەن لە داهاتوودا تەواویان دەکەم پرۆژەکانیش ئەمانەن.

١- مێژووی ژیاننامەی شەهید ئارامو نووسینو بەرهەمەکانی.

٢- كە شكۆڵی بیرەوەرییەكانم.

٣- كۆمەڵێ چیرۆك و نووسین و وتاری جۆراو جۆر.

٤- مێژووی ژیاننامەی حەمە رەشید باریكەیی.

لە كۆتاییدا سوپاسی دڵسۆزیتان دەكەم. كە دەزگاكەمانتان بەسەر كردەوەو ماوەتان بۆ رەخساندم. كە لەسەر كارو ئەرك و چالاكی دەزگاكەمان بدوێم.بە پێویستی دەزانم لەم چاو پێكەوتنەدا سوپاسی فەرمانبەرانی دەزگاكەمان بكەم كە پەرۆشی و دڵسۆزییان هەیە بۆ راپەڕاندنی كارەكانیان.

رۆژ:سێ شەممە

بەروار:٢٢/٢/٢٠٠٥

# چل ساڵ دوای مەرگی قانع

لەپێناو زیندووکردنەوەو بەرزراگرتنی یادی شاعیرانی کورد وەزارەتی رۆشنبیری سلێمانی لەمانگی (١٠)ی ئەمساڵدا ڤیستیڤاڵێك بۆیادی شاعیری پایە بەرزی کورد قانع ساز دەکات بەناوی (چل ساڵ دوای مەرگی قانع) ئەم ڤیستیڤاڵە ژمارەیەکی زۆر لەنوسەران و کەسانی شارەزا لەدیدو بۆچونەکانی قانع بەچەند لێکۆڵینەوەیەك بەشداری تێدا دەکەن دواتر خەلات بەسەر بەشداربواندا دابەش دەکرێت. ماوەی ڤیستیڤاڵەکە(٢)رۆژ دەخایەنێت، بۆ زیاتر ئاگاداربوون لەمەراسیمی بەڕێوەچوونی ئەم ڤیستیڤاڵە بە باشمانزانی چاوپێکەوتنێك لەگەڵ بەڕێز(شێخ محەمەد سۆڵەیی) سەرۆکی لیژنەی باڵای ڤیستیڤاڵدا ساز بدەین، بەچەند پرسیارێك بیهێنینە دووان:

***ئێمە خاوەنی چەندین شاعیری چاکین، بۆچیو چۆن قانعتان هەڵبژاردووە کە پێشەکی ڤیستیڤاڵەکە بێت؟**

– راستە شاعیری باشمان هەیە، بەڵام قانع یەکێکە لە شاعیرە هەرە چاکەکانی کورد، بەشاعیری چەوساوەکان مەشهورەو شاعیرێ بووە لەسەردەمانی خۆیدا یەکێ بووە لەناو جوتیاراندا پەروەردە بوووەوە شیعری بۆ جوتیاران وتووەودژی ئاغاو دەرەبەگو شێخو مەلا بووە.

لەبەرئەوە بەلای ئێمەوە هەڵبژاردنی قانع یەکێکە لەو شاعرانەی کە ئێمە زۆربە پەسەندمان زانیو یەکێکە لەو شاعیرانەی کە تائێستا شتێکی ئەوتۆی بۆ نەکراوە، ئێمە بە حەقێکی خۆمان زانیوە کە توانیومانە ئەو بیرۆکەیە بهێنێتە ئاراوە. سەبارەت بەوەی کە ئێمە بتوانین دیدارێك بۆ قانع سازبکەین لە مانگی(١٠)دا.

*ڤیستیڤاڵەکە دەقاو دەق کەی دەبێتو چەند ڕۆژ دەخایەنێت؟

-هێشتا بڕیاری ئەوەمان لەسەر نەداوە کە لەچەندی مانگی(١٠)دا دەبێت. بەڵام ئەوەی کە لەسەری ڕێککەوتووینو قسەو باسمان لەسەری کردووە، لەماوەی(٢)ڕۆژدا دیدارەکە بەردەوام دەبێت.

*بەشداربووانی ڤیستیڤاڵ کێن، واتە بەشداربووان تەنها لە ناوچەکانی هەولێرو سلێمانین یاخود کوردانی ناوچەکانی تریش بەشدار دەبن؟

-سەبارەت بەبەشداری لە ڕاستیدا ئێمە لەڕێگەی نامەیەکەوە لەڕێگەی بانگەوازێکەوە، دوو بانگەوازمان کردووە بۆ ئەوانەی کە هاوڕێیەتیو ئاشنایەتیان هەیە لەگەڵ قانعو دنیاکەیدا، کە دەتوانن پەیوەندیمان پێوەبکەن بۆ ئەوەی ئەگەر لێکۆڵینەوە یاخود هەرشتێکی تریان هەبێت لەسەر قانع بۆمان بنێرن.

بانگەوازەکانیش لە ڕۆژنامەکانو کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە بڵاوکراونەتەوە. بەڵام جگە لەمە ئێمە نامەمان ناردووە بۆ چەند ڕۆشنبیرێکی کورد لە بەغداو لەئێرانو هەولێروسلێمانی، بۆ ئەوەی کە لەسەر قانع دراسە بنوسن، بابەت بنوسنو تا ئێستا دەوری(٤)بابەتمان پێگەیشتووە کە وابزانم دوانیان لە کوردستانی ئێرانەوەیەو ئەوانی تریش ناو کوردستانەو بەدڵنیاییەوە چاوەڕێی بابەتی تریشن کە بە دەستمان بگات.

ئێمە وەك لیژنەی باڵای ڤیستیڤاڵ بابەتەکان کۆدەکەینەوەو لەبەر ئەوەی بابەتەکان لەلایەن کەسانی پسپۆڕو شارەزاوە دیراسە کراون لەبەرئەوەی ئێمە نایکەینە ژێر پرۆجیکتری خوێندنەوەو هەڵسەنگاندنەوە.

*باسی کەسانی بەشداربوونت کردەوە ئاماژەت بەچەند خاڵێکدا دەپرسم کێن ئەو قەڵەمە دیارانەی کە لەم دیدارەدا بەشدار دەبن؟

-بەدڵنیاییەوە ئێستا من نامەوێت بۆت دیاری بکەم کێن، حەزدەکەم لە ڕۆژی دیدارەکەدا ئەو کەسانە ببینرێت، چونکە ئێستا پێم خۆش نییە جاری ڕایبگەیەنین، ئەو کەسانە کێن بەس بەتەئکید کەسانێك بەشداری ئەم دیدارە دەکەن کە شارەزایی قانع بێتو هاودەمو هاوزەمانی قانع بووبێت شارەزایی هەبێت لە شیعری قانعدا.

*واتە ئێوە پێشتر دیاریتان کردووە کەسانی بەشداربووی ڤیستیڤاڵەکە کێن؟

-بەڵێ بەتەئکید کەسەکانمان هەڵبژاردووە، بەنامە بەسەرمان کردۆنەتەوە.

***بەرنامەتان نییە کە کۆی ئەو بابەتو باسانەی ڕۆژانی ڤیستیڤاڵ تەوەری لەسەر دەبەسترێت هەمووی کۆبکرێتەوەو لەکتێبێکدا چاپی بکەن؟**

-بەڵی بەلام پێشتر بپرسە چیتان کردووە بۆ قانع، چیتان بۆ دیداری قانع کردووە.

ئێمە لەراستیدا بۆ دیداری قانع بەرنامەیەکی چڕوپڕمان داناوە، یەکەم شت کە کردومانەو بڕیارمانداوە، دیوانەکەی قانع بە ٣هەزار نوسخە چاپ بکرێتەوە لە ئێران بەبەرگێکی جوان، ئەوە جگە لەوەی کە کۆمەڵێکی لە ڕۆژان دیداردا بەهەدیە دەردێت بە خەڵکەکەو دواتریش دەخرێتە بازاڕەوە، کەڵکێکی زۆری دەبێ شتێکی تر کە کردبێتمانو پەیکەرێکمان بۆ دروست کردووە، پەیکەرەکە لەدار دروست کراوە، هونەرمەندێکی پێنجوێنی بەکارەکە هەڵساوەو ئێمە گرێبەستمان لەگەڵ کردووە، لەرۆژی دیدارەکە دەیهێنینە ئەو هۆڵەی کە لێی دەکرێت بۆ ئەوەی کە خەڵك ئەو ئیشە هونەرییە ببینێت کە لەسەر قانع کراوە.

هەروەها هەدیەکی کریستاڵیمان ئامادە کردووە.لە ڕۆژی ڤیستیڤاڵەکە لەکۆتایدا بەخەلات دەدرێت بە ئەوانەی کەمەبەستمانە.

بەنیازین پۆستەری بۆ بکەین، دەلیل بکەین، دەعوەتنامە بکەین..هتد کۆمەڵێك شتی تر کە بۆئەو ڕۆژە پێویستە هەموومان لەبەرنامەدا داناوەو بودجەشمان بۆ تەرخانکردووە بۆ ئەوەی شتەکانمان بەرێكو پێکی بڕوات بەرێوە.

*** پرۆژەی ئایندەتان چییە، ئایا لەبەرنامەتاندا هەیە کە سالانی داهاتوودا بەهەمان شێوە ڤیستیڤاڵ بۆ شاعیرانی کورد بکرێت؟**

-بەتەئکید بەرنامە زۆرە، ئەگەر ئێمە بتوانینو بارودۆخ لەباربێت لەئاستی بیرکردنەوەی خۆمانو بەرنامەرێژی خۆماندا بێت، ئێمە نەك بۆ قانع، حەزدەکەین هەموو شاعیرێکی کورد لەنالیو حەمدیو لەهەموو ئەمانەوە بتوانین یادیان بکەینەوەو شتیان لەسەر بنوسینو دراسەیان لەسەر بکەین، چونکە لەوانەیە بۆ ئێستا بۆچوونی زۆر گەنجی ئەم سەردەمە جیاوازبێتو لەوانەیە ئێستا ئەوەی کە ئێمە بۆ قانعی دەکەین رەنگبێ کۆمەڵی خەڵك ئەمەی بەلاوە شتێکی زیادەو مەسرەفێکی زیادەبێت.

بەڵام بەڕای من هەرچی بۆ ئەوشاعیرە کۆنانە بکرێت لە ئەحمەدی خانی‌یەوە هەتا دەگاتە قانعو حاجی قادری کۆیی و هەتا ئەو هەموو شاعیرانەی کە هەمانە من لەو باوەڕەدام کە هێشتا هیچمان بۆ نەکردوون.

لەڕاستیدا من ئێستا ئەم دەزگایەی ئێمە کە چاپ و بڵاوکردنەوەیە، من بەدەزگای پیرەمێردی ئەزانم چەند خۆش ئەبوو، ئێمە بۆ پیرەمێردی شاعیرورۆژنامەنووس بمانتوانیایە رۆژێ لەساڵەکانی ئەمساڵ زیندووی بکەینەوەو بیسەلمێنین کە ئەو پیرەمێردە بۆ میللەتەکەی چەند بەخەم بووەو لێرەوە تا ئەستەمبوڵ لە ئەستەمبوڵەوە تا سلێمانی، تا ئەوبنکەیەی کە دروستی کردبوو.

یاخود یەکێکی وەك نەجمەدین مەلا ئەو پیاوەی کە لەکەشتی نوحدا مرد کە دوای چەندین رۆژ لە مردنی پێی زانرا کە مردوە تا ئێستا هیچی بۆ نەکراوە، کە زۆر شتی چاکی هەیە.

ئێمە لەرێگەی سالمو لە رێگەی مەولەوییەوە دەچینە ناو شیعری تەسەوف و دنیا شیعریەکەی ئەوان کە لەراستیا ئەمانە هیچیان بۆ نەکراوە ئەگەر ئێمە بمانتوانیایە دیداریان بۆ سازبدەین و دراسەیان لەسەر بکەین و بەنەوەی نوێیان ئاشنا بکەینەوە، لەو باوەڕەدام کە ئەمە ئەرکێکی وەزارەتی رۆشنبیریەوە حکومەتی هەرێمیش حەقوایە زۆر پشتگیرمان لێبکات.

***لێرەوە مادام ئێوە بەم گەرمیەوەو بەو رەوتەدا بڕۆن و خزمەتی شاعیرانی کورد بکەن کەواتە ئەم ڤیستیڤاڵە لە ساڵەکانی داهاتووشدا هەر بەردەوام دەبێت؟**

—من لەوەتەی هاتوومەتە ئەم وەزارەتە، لەبەرنامەمدایە کە ئەم کارانە بکەین، بەڵام لە راستیدا تا ئێستا پەرتی لەئیشەکاندا هەیە یان نا بەرنامەیی و بەدەنگەوە نەهاتنی ئیشەکان بۆیە ئەم ئیشانە نەکراوە، ئەگینا من وەکو خۆم حەزم کردووە، هەموو ساڵێك شاعیرێ، دوو شاعیر دیداریان بۆ بکرێت، چۆن دەیان کتێب بەچاپ دەگات. حەزدەکەم هەموو بەرهەمی نوسەران و شاعیران چاپ بکەینەوەو لەگەل ئەوەشدا حەزم کردووە کە خزمەتیان بکەین، بۆ ئەوەی کە رۆحیان زیندووبکەینەوە تا خەڵك بزانێ ئەو شاعیرانە کێ بوون و چی بوون. چونکە بەڕاستی تا ئێستا گەنجی ئەم سەردەمە گرفتی ئەوەی هەیە نازانێت ئەم زاتانە کێن، نازانێت سالم کێیە؟ چی کردووە بۆ میللەتەکەی و بۆ شیعرو

ئـەدەبیاتی کـوردی. عەلائـەدین سـەجادی یەکێکـە لـەو زاتانـەی کـە چـەندین بەرهەمی کتێبی گەورەی هەیە. تا ئێستاش بەداخەوە من چەندێکە هەوڵ دەدەم کە کتێبەکانی چاپ کەمەوە، بەڵام کەس وکارەکەی نایەن بەدەنگمەوە، بۆ ئەوەی کە بتوانم جارێکیتر بەرهەمەکانی بخەمەوە ژێر چاپ و کە بۆ زانست و خوێندنی ئەمرۆ زەروورەتی خۆی هەیە، کە لە زانکۆکاندا بخوێنرێت.

رۆژنامەی ئاسۆ ژمارە(١٤٠) ٢٠٠٥/٩/١٥

# دیاردەی چۆڵبوونی گوندەکان
# پێویستی بەچارەسەری گونجاوە

رژێمی دکتاتۆری بەعس و سەدام لەڕێگای ئەنفال و سووتماککردنی کوردستانەوە، بەهەزاران گوندو بەسەدان شارو شارۆچکەی خاپوورکرد. خەڵکی کوردستانی لە ئۆردوگای زۆرەملیدا کۆکردەوە، بازنەیەکی مەترسیداری بەچواردەوری شارە گەورەکانی کوردستاندا کێشا، هەموو خاک و شاخ و دەشتاییەکی کردە زەوی قەدەغەکراو. هەرچی کانی و کاریزی کوردستان بوو تەقاندییەوە.. ئەو رەفتارە شۆفینانەیەی بۆ ئەوەکرد. کە کوردبە یەکجاری لەناو بەرێت، خاکی کوردستانیش بەتەواوی داگیر بکات و هەموو خێرو بێرێکی دەرخواردی بەعسییە خوێنرێژەکانی بدات.

سەدام و رژێمەکەی ئەوەیان لەبیر خۆیان بردبۆوە، کە لەدنیادا میللەتێك، نەتەوەیەك نییە بەزەبری گوشارو تۆقاندن و دابەشکردن و دورخستنەوە لەناوچێت و ئەوەیان دانەنابوو. کە لەم جیهانەدا هیچ دەسەڵاتێك موطلەق و تاسەر نییە..نەیدەزانی هەموو توندوتیژی و کارێکی دڕندانەو نامرۆڤانە.. تەقینەوەی گەورەو راپەڕینی رقی ئەستووری لەدوایە.. راپەڕینی ساڵی ١٩٩١ ئەوەی بەسەدام و دام و دەزگا سەرکوتکەرەکەی و هەموو دکتاتۆرەکانی دنیا سەلماند. کە دەسەڵاتی دکتاتۆری هەتا هەتایەنامێنێت و هەردەبێت کورسی زۆرداری کەرت و پەرت بکرێت.

لەدوای راپەڕینەوە کوردستان ئازادکراو، بەدوایدا پەرلەمان و حکومەتی کوردستان دامەزرا.. دانیشتوانی ئۆردوگا زۆرەملییەکان، یەکسەر گەیشتنەوە سەر زیدی باو باپیران و کەوتنەوە پاککردنەوەی شوێن خانووی گوندەکانیان و کانی و کاریزەکانیان هەڵدایەوەو کەوتنەوە خانووکردن لەماوەی ساڵانی رابووردی ئازادبوونی کوردستاندا زۆربەی زۆری گوندەکان ئاوەدانکرانەوە... زۆربەی ئۆردوگاکان چۆڵکراون بوونەوە بەزەوی کشتوکاڵی... لەبەر پەرۆشی خەڵکی گوندەکان، حکومەت نەپەرژایە سەر ئەوەی بەرنامەیەك بۆ شێوەی

ئاوەدانکردنـەوەی گونـدەکان دا برێـژێت سـالانی رابـردوو کـەڵکی زۆر بـاش لەئاوەدانکردنـەوەی گونـدەکان وەرگیرا.. بەرهـەمی کشـتوکاڵو دانەوێڵـە فریـای خـەڵکی کوردستان کـەوت. بـەلام بەداخـەوە وشکەسالی چـەند سالی رابووردوو کاریگـەری زۆر خراپـی لەسـەر هـەموو گونـدەکانو خـەڵکی کوردسـتان هـەبوو. بـەهۆی کـەم ئاوییـەوە زۆر لەگونـدەکان ناچاربوون چۆڵبکرێنەوە، مەڕومالاتیان بفرۆشنو هیچ جۆرە کشتوکاڵو دانەوێڵەیەك بەرهەم نەدەهێنرا.

لێرەدا دەمـەوێت ئەوە بڵێم ئەگەر پێش ئەوەی هەڵمەتی ئاوەدانکردنەوە لـە کوردسـتاندا دەسـتی پێکـرد. بەرنامـەی گونـدی هاوچـەرخ دابڕێژرایـە لەهـەر ناوچـەیەك بـۆ چـەند گونـدێ گونـدی هاوچـەرخ دروسـتبکرایە، هـەموو جـۆرە خزمەتگوزارییـەکی بـۆ بکرایـە.. ئـەو دیـاردەی وشکەساڵیە کاریگـەری ئـەوتۆی لەسەر خەڵکی گوندەکان نەدەبوو.

دوای رووخـانی یـەکجاری رژێمـی دکتـاتۆری بـەعسو زیـادبوونی مووچـەی فەرمانبـەرو کردنـەوەی دەرگـای دامەزرانـدن لـەدامو دەزگاکـانی حکومـەتی هەرێمدا، کاری راستەوخۆی کردە سەر دانیشتووی گوندەکان.. زۆربەی زۆری کـوڕە گەنجـەکانی گونـدەکان دامـەزران.. ئـەو ماڵـەی ئەگـەر چوارسـەر ئـاژەڵی هەبێت، دەبێت پیاوە پیرەکەی ماڵەکە ببێتە شوانی کە ئەوەش کارێکی وایکردوە کە ئەو پیاوە پیرە تواناو تاقەتی ئەو ژیانی شوانییەی نەماوە، بۆیە بەناچاری بیر لەوە دەکاتەوە کە ئاژەڵەکانی بفرۆشێتو ماڵەکەی بگوێزێتـەوە بـۆ نـاو شـارەکان جگـە لـەوە لەزوربـەی گونـدەکان هـیچ جـۆرە دانەوێڵوکشـتوکاڵێك ناکرێـت لەبەرئەوەیهەر جۆرە کشتوکاڵو دەغڵودانێك بکرێت پارەیەکی زۆری دەوێت بـۆ کێڵانوبژارودروونەوەو کۆکردنەوەو گەیاندنی بەبازاڕی شارەکان. کە کاتێکیش دەبرێتـە بـازاڕ ئەوپارەیـە ناکـات کـە تێـی چـووە تـا ئێسـتا بیرلـەوە نەکراوەتـەوە، میکانیزمـێ بـۆ هانـدانو دەسـتگیرۆیکردنی خـەڵکی دێهاتییـەکانو وەرگرتنـی بەرهەمـە کشـتوکاڵیودانەوێڵەکانی کوردسـتانو بـەتووتنو لۆکـەو مـەرەزەو چـەوەندەرو پەتاتـەو سـیرو پیـازو شـووتیوکاڵەك دەیـەها جـۆری تـری دانەوێڵەوکشتوکاڵ. نەکراوەتەوە کە ئەگەر هاندانو بەرنامەی یارمەتیدان هەبێت پێداویسـتیەکانی نـاو وڵاتـە کـەمان بەئاسـانی دابـین دەکـاتو دەتوانرێـت بـۆ دەرەوەی کوردسـتانیش بنێردرێـت..لاتـان سـەیرنەبێت لـەم هاوینـەدا روولـەزۆر

گونددەکرێت، خەڵکی گوندەکە نە تەماتەونەبامێ ونەباینجانیان نەکردووە. ئەوە مەرەزە هەرهیچ و ماست و دۆشی نییەو ئاژەڵیشیان هەیە لەبەر ئەوەی کەسیان نییە مەڕومانگاوبزنەکانیان بۆ بدۆشێت...دیارە کەهەمووومان دەیزانین لادێ بەدۆوماست و میوەوە لادێیە. ئەم دیاردەیە.. بەشێوەیەکی وا رەنگی داوەتەوە کە ئەو گوندەی ئەگەر دەماڵی تیادا بووبێت ئێستا ماوەتەوە سەر نیوە، بۆ ئەوەی بەرلەم کۆچە نائاساییە بگیرێت، وادەخوازێت هەموو حزب و لایەنە سیاسییەکان و حکومەتی هەرێمی کوردستان، بەرنامەیەکی گونجاو دابڕێژێت، بەر لەودیاردەیە بگیرێت، ئەوەش بەوە چارەسەر دەکرێت.. بەرنامەی گوندی هاوچەرخ لە هەموو ناوچەکانی کوردستان دابڕێژرێت بۆ هەر چەند گوندێك گوندێکی هاوچەرخ لەشێوەی شارۆچکەی بچووك دروستبکرێت گوندەکانیش حکومەت لەهەر گوندێ لەو گوندانە بەپێی زۆری و کەمی دانیشتوانی گوندەکان خانووی تازە دروستبکرێت، لەگەڵ دروستکردنی خانووەکاندا خوێندنگاکانی باخچەی ساوایان، سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی و خەستەخانەو ئاو ئاوەڕۆی بۆ بکرێت. کۆڵانەکانی ناو گوندەکان قیرتاو بکرێن کارەبایان بۆ رابکێشرێت، ئامێرەکانی کێڵان و دورینەوەو گواستنەوەیان بۆ دابینبکرێت، تۆو سەمادو هەموو جۆرە هۆیەکی کشتوکاڵ و دانەوێڵەیان پێ بدرێت، بنکەی کشتوکاڵیان هەبێت بۆ ئەوەی چاودێریی و رێنمایی بکرێن. لەهەر گوندێك بنکەی پۆلیس و ئاسایش و سنوور هەبێت. لەو باوەڕەدام کە دانیشتوانی گوندەکان بیر لەوە ناکەنەوە جارێکیتر بچنەوە بۆناو شارەکان و ئەو کوڕوکاڵانەشی لەفەرمانگەیەکدا دادەمەزرێن دەتوانرێت هەر لەو سنوورەدا دەوام بکەن. بەم رێگایە دەتوانرێت بەرلەکۆچی لادێ بۆ ناو شار بگیرێت و وڵاتەکەشمان سیمای فراوانبوون و شارستانی گەشەکردنی پێوەدیاربێت...هەموو ناوچە گوندنشینەکانیش ببنە ناوچەیەکی بەرهەمهێنەرو بە بەرهەمەکانیان بازاڕەکانی شارەکان پڕبکرێت و وڵاتەکەمان و گەلەکەمان بگەیەنرێتە ئاستی وڵاتە خاوەن بەرهەم وپێشکەوتووەکان.

چونکە ئاوهەواو زەوی وشاخ و کێوی وڵاتەکەمان بەشێوەیەکە لەهەموو رووییەکەوە دەتوانرێت کەڵکی لێوەربگرێت و دانیشتوانەکەشی تەمەڵ وتەوەزەل دانەنیشن، بەڵکە هەڵپە بکەن بۆ کەڵك وەرگرتن لە زەوی و زاری وڵاتەکەمان

باخەڵکی کوردستان. تەنها چاونەبڕێتە مووچەومووچەنەبێتە هۆی کەمکردنەوەو وازهێنـانی لەبەرهـەمی کشـتوکاڵی و رەزی و دانەوێڵـەیی و ئـاژەڵی و پەلـەوەڕی حەزدەکەم ئەوەبخەمە پێش چاو ناوچەیەکی وەکو قەرەداخ. جگە لەمەرکەزی ناحیە دەتوانرێت گوندی تری هاوچەرخ لەرۆژئاوای قەرەداخ لەدەشتی قەلای لای قازانقایە بۆ سەرجەم گوندەکانی ئەوناوچەیە دروستبکرێت و گوندێکی تر لە رۆژهـەڵاتی قـەرەداخ لەناوچـەی سێوسـێنان و تەکیـە بۆدانیشـتوانی گونـدەکانی ئەوناوچـەیە دروسـتبکرێت وەژمارەیـەکی زۆر خـانوو لەمەرکـەزی ناحیەکـە بـۆ گونـدەکانی دەوری ناحیـە دروسـتبکرێت و هەرگونـدێ لەوگوندانـەش لـە(٢٠٠٠)هـەزار خـانوو کـە مترنـەبێت یـان بـەپێی سـەرژمێری گوندەکان ودروستبکرێت لەکاتێکدا کە ئەم گوندانە دروستکران دەتوانرێت دانیشتوانی گوندەکان لەدەوری گوندە هاوچەرخەکان شوێنێك بۆ ئاژەڵداری و پەلەوەڕی تەرخانبکرێت و خەڵکەکەی زەویی گوندەکانیان بکەنە کشتوکاڵ و دانەوێڵـەو بـاخ و سـەرکانی وئاوەکانیان بکەنـە سـەیرانگاو شـوێنی گەشتوگوزار...بەبۆچوونی من ئەگەر بەرنامەیەکی لـەمجۆرە، لەسەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیرانەوە بۆ هەموو ناوچەکان دابڕێژرێت و لەهەندێ ناوچە بەپێی بەرهـەمی ناوچـەکەیان کارگـەی جـۆراوجۆر دروستبکرێت ئـەوە بەدڵنیاییـەوە خـەڵکی گونـدەکان لـەجیاتی ئـەوە وەکـو ئێسـتا ڕوولەشـارەکان دەکـەن بەپێچەوانەوە ڕوودەکەنەوە گوندەکان و بەمەش ئەو زۆری دانیشتوانی شارەکان کەمدەبنەوە چەندکێشەیەکی شارەکانیش کەمدەبنەوە وەکو گیروگرفتی خانووی نیشتەجێبوون و قەرەباڵغی بازاڕو سەرشەقامەکان.

# له كوردستانه‌وه بۆ فرانكفۆرت

پێشانگای كتێبی نێوده‌وڵه‌تی فرانكفۆرت بایه‌خێكی زۆری بۆ رووناكبیری كوردی به‌رجه‌سته‌ ده‌كات.. وزه‌ارتی رۆشنبیری له‌ رێگای ناوه‌ندی كلتوری كوردی ئه‌ڵمانی له‌ مانهایم، بۆ ساڵی دووه‌م به‌شداری له‌ نمایشی كتێبی نێو ده‌وڵه‌تی فرانكفۆرتدا كرد. به‌ جێی خۆی ده‌زانم.. چه‌ند لایه‌نێكی پێشانگاكه‌ بۆ رۆشنبیرانی كورد روون بكه‌مه‌وه‌.

## كورته‌یه‌كی كورتی پێشانگای كتێبی نێو ده‌وڵه‌تی فرانكفۆرت:

ئه‌م پێشانگانێو ده‌ڵه‌تییه‌ی كتێب ( ٥٧ ) ساڵه‌ به‌ به‌رده‌وامی ساڵانه‌ له‌مانگی ئوكتۆبه‌ری هه‌موو ساڵێكدا، له‌ ته‌لارێكی گه‌وره‌ی ته‌رخانكراودا له‌شاری فرانكفۆرتی ئه‌ڵمانیا. به‌ به‌شداری ژماره‌یه‌كی زۆر له‌ ولاتانی دنیا و نه‌ته‌وه‌ی جیا جیاكانی ئه‌م سه‌رزه‌مینه‌وه‌ به‌سه‌دان خانه‌ی نمایشی كتێب به‌رێوه‌ده‌چێت.

له‌و ته‌لاره‌ ته‌رخانكراوه‌دا پاركی وه‌ستانی ئۆتومبیل و هه‌موو پێداویستییه‌كانی كارو حه‌وانه‌وه‌و هۆڵی سمینار به‌ شێوه‌یه‌كی جوان و رێكخراو دابینكرابوو... هۆڵه‌كانی ته‌لاره‌كه‌ له‌لایه‌ن خانه‌ی نمایشی ولاتان‌و نه‌ته‌وه‌ جیا جیاكانه‌وه‌، له‌ مانگی یه‌كی هه‌موو ساڵێكدا شوێنی لێده‌گرێت‌و به‌رێوه‌به‌رانی ته‌لاره‌كه‌، له‌سه‌ر خواستی خاوه‌ن خانه‌كان جیا جیایان ده‌كه‌نه‌وه‌و هه‌موو پێداویستییه‌كی نمایشی كتێبی بۆ دابین ده‌كه‌ن له‌سه‌ر ئه‌و پاره‌یه‌ی ده‌درێته‌ به‌رێوه‌به‌ری ته‌لاره‌كه‌.. له‌م پێشانگا نێو ده‌وڵه‌تییه‌دا ساڵانه‌ ولاتیٚ یان نه‌ته‌وه‌یه‌ك ده‌كرێته‌ میوانی شه‌ره‌ف پێشانگاكه‌و.. ساڵی ٢٠٠٤ میوانی شه‌ره‌ف ولاته‌ عه‌ره‌بییه‌كان‌و ساڵی ٢٠٠٥ ولاتی كۆریا بوون‌و ساڵی ٢٠٠٦ ولاتی هندستان‌و ساڵی ٢٠٠٧ ئه‌ده‌بی كه‌ته‌لۆنیای بیٚ ولات ده‌بێت. ساڵ ٢٠٠٤ له‌و پێشانگانێو ده‌وڵه‌تییه‌دا ( ٣٥٠ ) هه‌زار ناونیشان هێنراونه‌ته‌ خانه‌كانی نمایشی كتێب كه‌ ( ١٠٠ ) هه‌زاریان كتێبی نوێبوون. به‌شدارانی ئاسایی‌و پسپۆری زیاتر له‌ ( ٢٥٠ ) هه‌زار بووه‌.. له‌خانه‌كانی نمایشی كتێب (٢٥٠٠ ) كۆرو

سمینار لەبوارە جیا جیاکانی چاپ و رووناکبیریدا گێڕدراوە. لەناو خانەکانی نمایشی کتێبدا خانەی نمایشی کتێبی کوردی هەبوو. کەبە ( ٧٠٠ ) ناونیشان و بەژمارەی زیاتر لە ( ٣٠٠٠ ) هەزار چاپکراو بەشداری پێشانگاکە یکرد. زۆر لایەنی رووناکبیری و چاپەمەنی سەردانی پێشانگاکەیان کردبوو. لەناویاندا (عەمەر موسا ) لەسەردانەکەیدا وتبووی (زۆر پێخۆشحاڵم، ئەم ژمارە زۆرەی کتێب کە بەزمانی کوردی نووسراوە، لێرە دەبینم. وەشادمانم بەوەی کە ئێستا لە خانەی نمایشی کوردی راوەستاوم). بەرای من ئەم پێشانگایە سەنتەرێکی گەورەو فراوانی کۆکردنەوەی کتێبە لەهەموو جیهاندا، وە بڵندگۆو ویستگەیەکی یەکتر ناسین و یەکتر بینینە بۆ بواری رووناکبیری لە نێوانی وڵاتان و نەتەوەکانی دنیاداو پردێکی زۆر پان و بەرین و درێژی رووناکبیریە. بۆ کورد بایەخێکی زۆرو گرنگییەکی لەرادە بەدەری دەبێت ئەگەر بەهەند وەربگیرێت.

## ساڵی ٢٠٠٥ خانەی نمایشی کورد لە پێشانگاکەدا:

بۆ جاری دووەم، وەزارەتی رۆشنبیری لە رێگای ناوەندی کلتوری کوردی ئەڵمانی لە مانهایم، بە ( ٥٠٠ ) ناونیشان و ( ٢٥٠٠ ) کتێب و بڵاوکراوە لە پێشانگای کتێبی نێودەوڵەتی فرانکفۆرتدا، بەخانەی نمایشی کوردی بەشداریکرد.

ئەو کتێب و چاپکراوانەی کە بۆ ئەو خانەیە نێردران، لەرێگای بەرێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە ئامادە کران و، رەوانە کران ئەو دام و دەزگایانەی بەچاپکراوەکانیان هاوبەشییان لە پێشانگاکەدا کرد ئەمانە بوون:

- چاپکراوەکانی بەرێوەبەرێتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوە و خانەی وەرگێران
- سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان
- دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
- بەشی رووناکبیری مەکتەبی رێکخستن
- مەکتەبی ناوەندی راگەیاندن
- مەکتەبی رێکخراوە دیموکراتییەکان

- مەکتەبی بیرو هۆشیاری
- دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی
- رادیۆی نەوا
- بەشی راگەیاندنی شارەوانی سلێمانی
- بنکەی ژین
- ناوەندی چاپەمەنی و راگەیاندنی خاك
- گۆڤاری سلێمانی
- کۆمەڵەی رووناکبیری و کۆمەڵایەتی کەرکوك
- چەند دەزگایەکی چاپەمەنی و رووناکبیری لە کەرکوك و کەلارۆ

هەڵەبجە.

نوێنەری وەزارەت بۆ پێشانگاکە ( شێخ محەمەد سوڵەیی)و نزار خەیلانی بوون..

خانەی نمایشی کوردی لەلایەن سەرۆك و ئەندامانی ناوەندی کلتوری کوردی ئەڵمانی بەڕێوە دەچوو.

نوێنەری وەزارەت لە ٢٠٠٥/١٠/١٧ لەگەڵ سەرۆك و ئەندامانی ناوەندەکە کۆبۆوەو لە وردەکارییەکانی خانەکەو چۆنێتی بەڕێوەچوونی گفتوگۆکراو لەبەرنامەکەی کۆڵییەوە.

پێشانگاکە لە کاتژمێر ( ٥ )ی ئێوارەی ١٠/١٨ لەلایەن ( رۆڵاند کوخ ) سەرۆکی وەزیرانی ولایەتی (هیسن) کرایەوە کاتژمێر ( ٩)ی بەیانی ١٠/١٩ پێشانگاکە کرایەوە و، رۆژانە لە (٩)ی بەیانییەوە تا ( ٣٠ر٥ )ی ئێوارە بەردەوام دەبوو

رۆژانی ( ١٩-٢٠-٢١ ) تەرخانبوو بۆ رۆژنامە نووسان و پسپۆڕانی بواری چاپ و میدیاو بلاوکردنەوەکان.

رۆژانی (٢٢ -٢٣ ) پێشانگاکە بۆ هەمووان کراوە بوو. بۆ بەستنی سمینارو کتێب کرین و رێکەوتننامە..

لە خانەی نمایشی کوردیدا ناوەندی کلتوری کوردی ئەڵمانی، بانگهێشتی دکتۆر فیردیناندی کردبوو کە بەو کتێبەی لەسەر کورد نووسیویێتی بەناونیشنی

( دی کوردن). ناوبراو پسپۆڕێکی نەمساوییەو بەم کتێبەوە ( ٥ ) کتێبی لەسەر کورد نووسیوە..

نوێنەری وەزارەت بەراوێژ لەگەڵ (ئەحمەد بەرواری ) نوێنەری حکومەتی هەرێم لە ئەڵمانیا و لەسەر بڕیاری (وەزیری رۆشنبیری ) بانگهێشتی دکتۆر فریاد فازلی سەرۆکی ئینستیووتی خوێندنی کوردی لەبەرلین کرد و بڕیاردرا بە کتێبەکانییەوە هاوبەشی لەخانەی کوردیدا بکات.

ئەو شوێنەی بۆ خانەی کوردی بەکرێ گیرابوو، ( ٤٨ ) مەتر دووجابوو.. بەچەند پەیکەرو تابلۆی بەهادینی هونەرمەند و، بەئالای کوردستانو بە چاپکراوەکان رازابۆوە.

لەرۆژانی پێشانگاکەدا. نوێنەری وەزارەت، لەگەڵ ئەندامانی ناوەندەکە سەردانی خانەکانی ( شاریقە- مەنشووراتی جەمەل- هۆنکۆنگ- چین- دارئەهرام- وەزارەتی رۆشنبیری میسر- سکۆتلەند- هندستان- سعودیە- کوێت- ئێران- فەرەنسا- بەلجیکا- روسیا- بەریتانیا- ئەمریکا- ئیسرائیل- کۆریا- چەندیتر) کرد نوێنەرانی ئەو خانانەش سەردانی خانەی نمایشی کوردیان کردەوە، لە رۆژانی پێشانگاکەدا. نوێنەری وەزارەت بەیاوەری ئەندامانی ناوەندەکە، چەندین دانیشتنو کۆبوونەوەی لەگەڵ دەزگاو کۆمپانیا عەرەبیو جیهانییەکاندا کردو، چەند رێکەوتنێ لەنێواندا کرا. کە یەکێك لەو رێکەوتنانە رێکەوتن بوو، لەگەڵ کومپانیای کویزسی نەمساویدا سەبارەت بە چاپکردنی ( ئەتڵەسی کوردستان ) کە ئەم کومپانیایە کاریان تەنها چاپکردنی ئەتڵەسە لە جیهاندا.

لە رۆژانی ٢٢-٢٣ ئەحمەد بەرواری نوێنەری حکومەتی هەرێم لە ئەڵمانیاو، دابان شەدەڵە نوێنەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە نەمساو، کارگێڕانو ئەندامانی مەڵبەندو ئەندامانی کۆمیتەی ئەڵمانیاو کۆمیتەکانی هۆڵەنداو بەلچیکاو نەمساو سویسرا، ئامادەی پێشانگاکە بوون و ژمارەیەکی زۆر لە نووسەرانو رۆژنامە نووسان رووناکبیران لەهەموو شارەکانی ئەڵمانیاو ولاتانی ترەوە سەردانی پێشانگاکەیان کرد. (مستەفا سالح کەریم) جێگری سەرنووسەری ( الاتحاد )و کاوە محەمەد، سەرنووسەری کوردستانی نوێ لە رۆژی ٢٢/١٠ ئامادەی خانەك بوون و لە سمینارەکاندا هاوبەشیانکرد.

رۆژی ۱۰/۲۲ سێ سمینار لەلایەن ئەم رووناکبیرانەوە گێڕدرا:

١. دکتۆر فیردینان لەسەر کتێبەکەی بەدوورودرێژی قسەیکردو دکتۆر راو بۆچوونەکانی سەبارەت بەزمانی کوردیو مێژووی کورد خستە روو. دکتۆر فریاد فازل سمینارەکەی بەرێوەدەبرد.

٢. دکتۆر فریاد فازل لەسەر ئیملاو رێنووسی کوردیو بەرهەمو فەرهەنگەکانی باسێکی پێشکەشکردو نزار خەیلانی کۆڕەکەی بەرێوە دەبرد.

٣. شێخ محەمەد سۆڵەیی لەسەر بزووتنەوەی رۆشنبیری کوردی لەهەرێمی کوردستان و کاروچالاکییەکانی وەزارەتو دەزگا پەیوەندیدارەکان باسێکی پێشکەشکردو کۆڕەکە نزار خەیلانی بەرێوەی دە برد

لە هەرسێ کۆڕەکەدا ئامادەبووان بەپرسیارو روونکردنەوە بەشدارییان لە کۆڕەکاندا کرد. ئەوەی شایەنی باسە مامۆستا مستەفا ساڵح کەریم بۆ دەوڵەمەندکردنی باسەکەی سۆڵەیی بەشدارییەکی خۆی ئاسایکرد.

رۆژانی پێشانگاکە... کەناڵی کوردسات بەپەیام نێرو وێنەگرێکەوە و کەناڵی رۆژو چەند کەناڵێکی بیانیو ناوەندی رووناکبیری بەشدارییان لەرۆژانی پێشانگاکەدا کرد.

لە پێشانگای نێودەوڵەتی فرانکفۆرتدا ( ٦٧٠٠ ) خانەی نمایش هەبوو. زیاتر لە ( ١٠٠ ) وڵاتو نەتەوەی جیا جیا بەشداریان کرد، کە خانەی نمایشی کوردی یەکێکبوو لەو وڵاتو نەتەوانەی بەشداربوان.

لەهەردوو رژی ۲۲-۱۰/۲۳ ئاپوورەیەکی نووسەرانو رووناکبیران لەخانەی نمایشی کوردیدا دەبینراو، تابلۆکانو ژنانو کچان بە جلی کوردییەوە و گۆرانیە کوردییەکانو ئاڵای شەکاوەی کوردستان سەرنجی رۆشنبیرانو نووسەرانی بیانی رادەکێشاو سەردانی خانەکەیان دەکردو پرسیاریان دەکرد ئەوەی شایەنی باسە.. میوانەکانی خانە هەرهەموو بەپەرۆشەوە هەوڵی کڕینی چاپکراوکانیان دەدا و، داوایان دەکرد کە پێیان بفرۆشرێت بەداخەوە لەبەرئەوەی ژمارەی چاپکراوەکان کەمبوون، نەدەتوانرا داواکەیان جێبەجێ بکرێت. زۆر لە میوانەکان بەرهەمەکانی دکتۆر فریاد فازلو چەند کتێبێکی تریان بەدیاری پێشکەش دەکران.

پێشانگاکە بەسەرکەوتووی کۆتایی هات و ئومێد دەکەم بۆ ساڵی ٢٠٠٦ بایەخی باشترو بەرهەمی باشترو زۆرتر ببرێتە پێشانگاو ( ئەتڵەسی کوردستان ) چاپبکرێت و یەکێك بێت لەو بەرهەمە شاکارانەی خانەکە.

هیوادارم دکتۆر فریاد فازل و ئینستیووتی خوێندنی کوردی لە بەرلین: مەلحەمەی مەم و زینی ئەحمەدی خانی و هەڵبژاردە لە شیعری گۆران و شێخ نوری شێخ ساڵح کە کراونەتە ئەڵمانی چاپبکرێن و فەرهەنگی ئەڵمانی کوردی کە ئامادە کراوە چاپبکرێن و ئەو بەرنامانەی دامان رشتووە بۆ ساڵی ٢٠٠٦ بەهەند وەربگیرێن و بەباشی ئەنجام بدرێن.

رۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە( ) لە / /٢٠٠٥

# له دیداری قانعەوە بۆ دیداری شاعیرێکیتر

یــەکێك لەئــەرك و چــالاکییەکانی وەزارەتــی رۆشــنبیری بەســەرکردنەوەو زیندوکردنــەوەو خوێندنــەوەی ئــەدیبان و روونــاکبیرانی گەلەکەمانــە. ئــەو روناکبیرو ئەدیبانەی لەسەردەمەکانی رابردووی گەلەکەماندا، لەگەڵ ناهەمواری بارووذۆخی سیاسی و روونـاکبیری و هونـەری و فشـاری درندانـەی بـەردەوامی رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان لەگەڵ نالەباری ژیانیاندا، خەمخۆرانە ئەسپی ئەدەب و هونەریان، لەبەر تروسکەی قوتیلەو لەمپاو فانۆس، بەپێنووسی ئوچ ئاساو لەسەر کاغەزی بۆری ئەو سەردەمانە، قەڵەمی بەبرشتیان لەبواری ئەدەب و هونەردا، دەخستە کارو شیلەی بیرو مێشکیان دەدا بەدەمی قەڵەمەکانیانەوە و ئەدەب و هونەریان بۆ نەوەی گەلەکەیان دەنووسی. ئەو شاسوارانەی ئـەدەبی کــوردی، زۆربــەیان لــەکونجی مزگەوتەکانــەوە تیشــکی بــیرو بۆچــوونیان تۆماردەکردو بەو کارە بەهرەمەندەیان بنەمای مێژووی ئەدەبی کوردی و هونـەری کوردیــان دارشــت. بــە نووســین و هــۆنراوەی نیشــتمانی و کوردپەروەرانــەیان، رینمـایی نـەوەکانی گەلەکـەیان دەکـرد رووی نیشتمانپەروەری و دڵسۆزیان بـۆ خـاك و نەتەوەکـەیان و، هانیـان دەدان بـۆ خـەبات و تێکۆشـان دژی داگیرکـەران و چەوســاندنەوەی نەتەوایــەت و چــینایەتی... بەشــیعرو نووســینەکانیان، ئامۆژگارییـان لـەرووی پێشـکەوتنی کۆمەڵایـەتی و پـەروەردەیی و رۆشـنبیریەوە دەکـردن، گیـانی بـەرگری و بەگژاچـوونەوەیان بـەهێزدەکردن.. دیـارە یـەکێك لەوشاعیرونووسەرە، منەوەرانەی مەیدانی ئەدەبی کوردیمان قانعی شاعیربووە.

ئەوشــاعیرو نووســەرو روونــاکبیرو هونەرمەندانــە، ئەگــەر لەســەردەمە جیاجیاکنی مێژووی نەتەوەکەماندا، هەلێکیان بۆرەخسابێت و لەو هەلەدا کەمێ خزمەتکرابن.. دیارە ئـەوە ناگەیـەنێ کە ئـەو ئـەدیب و روونـاکبیرو هونـەرمەندانە مـاف خۆیـان دراوەتـێ، ئـەمرۆ بـەهۆی گۆڕانکارییـەکانی ناوچـەکەو کوردسـتان و ئازادبوونی خاك و میللەتەکەمان و پێکهێنانی پەرلەمان و دامەزراندنی حکومەتی هەرێم و رووخاندنی رژێمی دکتاتۆریـەتی سەدام و هەڵبـژاردنی بەڕێز مام جەلال

بەسەرۆکی کۆماری عێراق، دەبێت وەزارەتی رۆشنبیری، بەرنامەی ڕێزلێنان و یادکردنەوەی ئەدیبان و رووناکبیران دابڕێژێت. هەرچەندە لەدامەزراندنی وەزارەتەوە، تا ئێستا وەزارەتی رۆشنبیری و دەزگا حزبی و ڕێکخراوەیی و ئەهلی و حکومییەکان کۆمەڵێ کاری باشیان بۆ خزمەتکردنی ئەدیبان و رووناکبیران و ئەنجام داوەو وەلەلایەن خودی بەڕێز ( مام جەلال ) ەوە بەرنامەی خزمەتکردنی نووسەران و هونەرمەندان دانراو یارمەتی دراون.. بەڵام بۆبواری ئەدەبی و رووناکبیری و هونەری ئەو خزمەتە هێشتا کەمەو لەمڕۆ بەدواوە، ئەوە ئەخوازێ کە بەبەرنامەیەکی چڕوپڕتری هەمە لایەنە خزمەتکردنیان لەپێش چاوبگیرێت لەبواری یادکرنەوەیان بەسازدانی دیدارو کۆڕو میهرەجانی شایستەو بەچاپکردن و چاپکردنەوەی بەرهەمەکانیان وەکو چۆن ئەمساڵ دیداری قانع بەرنامەی بۆدانراو کاری پێویستی بۆکرا. کەبەداخەوە هەندێ هۆو گرفت بووە هۆی دواکەوتنی دیدارەکە لەناوەراستی ساڵەوە بۆ کۆتایی ساڵ دیداری قانع کەبەچاودێری بەرێز عومەر فەتاح سەرۆکی حکومەتی هەرێم و لەژێر دروشمی ( دوای چل ساڵ لەمەرگی شاعیر رۆحی زیندوی بەرز رادەگرین ) لە رۆژانی ٢٧-٢٨/ ١٢/٢٠٠٥، لە هۆڵی هونەرەجوانەکانی کورد لەسلێمانی بەڕێوەچوو...

لیژنەی باڵای دیدار، لەسەر رەزامەندی وەزیری رۆشنبیری، چەند کارێکی شایستەی بۆدیداری قانع ئەنجامدا، وەکو دروستکردنی پەیکەرێك لەدارو چاپکردنەوەی دیوانی قانع بەتیراژی ( ٣٠٠٠ ) دانە و دروستکردنی خەڵاتێکی کریستاڵی بەوێنەی قانع و، دروستکردنی سایك و جانتاو پۆستەرو دەلیل بەوێنەی شاعیرو. لە خۆرهەڵاتی کوردستان و بەغداو هەولێرو کەرکوکەوە بانگهێشتی چەند کەسایەتییەکی ئەدەبی و رووناکبیری کراو، داوا لەچەند نووسەرو قانع دۆستێك کرا، کە لێکۆڵینەوە لەسەر ژیان و شیعری قانع بنووسن و لەرۆژانی دیدارەکە بەچەند کۆڕێك پێشکەشبکرێن. دووبانگەواز لە رۆژنامەو کەناڵەکاندا سەبارەت بەدیدارەکە بڵاوکرایەوە.. ئەوەی‌شایانی باسە زیاتر لە ( ١٢ ) بابەت بۆدیدارەکە هاتبو، لەوبابەتانە تەنها (٨) یان بابەتی‌بەپێزبوون و بابەتەکانی لەلایەن لیژنەوە پەسەنکران بۆ خوێندنەوە. لەکاتێکدا ئەوبابەتانە گەیشتبوونە لیژنەی باڵا، مامۆستا جەمال بابان بەهۆی چاپکردنی کتێبێکیوە

لەبەڕێوەبەرێتیەکەمان سەردانی کردین و باسی دیدارەکەکرا. وتی منیش هەندێ بیرەوەریم لەگەڵ ( قانع ) دا هەیە. ئەگەر بتانەوێت بۆتان دەهێنم و بابەتەکەی دوای چەند رۆژێك هێنا و خریە بەرنامەوە. بەڵام بەداخەوە مامۆستا بابان، لە رۆژانی دیدارەکەدا ئامادە نەبوو، وە نەیویست بابەتەکەی پێشکەش بکات.

ئەحمەدی نەزیری، کە نووسەرێکی خۆرهەڵاتی کوردستانە و ماوەی چەند ساڵێك خۆی بۆ نووسینەوەو کۆکردنەوەی شیعرە بڵاونەکراوەکان و قسەو نوکتە خۆشەکانی قانع تەرخانکردووەو لەئەنجامدا بەرگی یەکەمی ( زایەڵەی زرێباری ) بڵاوکردۆتەوە، ئاگادار کرابوو. بۆ دیدارەکە. بەڵام بەداخەوە پێی نەوترابوو کە بابەتێ لەسەر سەرجەم کارەکانی بۆ قانع کردوویەتی بنووسێت بۆ دیدارەکە، کە هاتە دیدارەکە گلەیی لێکردین و گلەییەکەیمان بە مافێکی رەوا زانی.. بۆ مەراسیمی دیدارەکە. کارتێکی بانگهێشتکردنمان بەوێنەی قانع چاپکردبوو، بەژمارەیەکی بەرچاو لەلایەن لیژنەکانی سەرپەرشتی و بەرێوەبردنەوە. دابەش کرا.

**مەراسیمی دیدارەکە بەم شێوەیە دەستی پێکرد:**

**یەکەم رۆژی دیدارەکە:**

کاتژمێر ۹٫۳۰ ی بەیانی رۆژی ۲۷ /۱۲ بەئامادەبوونی ژمارەیەکی زۆر لە ئەدیبان و نووسەران و هونەرمەندان و عاشقانی شیعری قانع لەلایەن بەرێز عومەر فەتاح سەرۆکی حکومەتی هەرێم، لەهۆڵی کتێبخانەی گشتی سلێمانی پەردە لەسەر پەیکەری شاعیر لادرا.

کاتژمێر ۱۰٫۳۰ ی بەیانی هەمان رۆژ مەراسیمی بەشی یەکەمی دیدارەکە لە هۆڵی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد لەسلێمانی، بە چاودێری سەرۆکی حکومەت و بە ئامادەبوونی میوانێکی زۆر.. مەراسیمەکە دەستیپێکرد.

دڵشاد مستەفا و ناهیدی حسینی مەراسیمەکەیان بەرێوەدەبرد...

دوای دەقیقەیەك وەستان بۆ رۆحی قانع و شەهیدانی قەڵەم و ئازادی کوردستان، ناهیدی حسینی بەدەنگە زوڵاڵ و کاریگەرەکەی چەند بەیت و چوارین و کۆپلەی شیعری قانعی خوێندەوە. بەدوایدا شێخ محەمەد سۆڵەیی وتاری لیژنەی باڵای دیداری خوێندەوەو وتارەکەی بەم بەیتە شیعرەی قانع دەستپێکرد:

هەزار رەحمەت لە ئارامگای بەرزی سەیدی ( چۆڕ )ی
کە منداڵبووم بە لوتفی خۆی مەساری ژینمی گۆڕی

لە وتارەکەیدا وێرای بەخێرهاتنی سەرۆکی حکومەتو میوانە بەرێزەکانی دیدارەکە. ئاماژەی بەوە دا ئەگەر شیعر فاکتەری هاندانو جۆشدانو چرای رووناککردنەوەی رێبازو سرودی چەوساوەو شۆڕشو سەرکەوتن، بێت ئەوە قانعی شاعیر بەشیعرەکانی هەتا هەتایە زیندوەو نەمرەو نەمردەبێتوەهەرەها تیشکی خستە سەر چەند لایەنێکی درەوشاوەی قانعو شیعرەکانی.

بەدوایدا ناهید، چەند کۆپلەیەکی لەشیعری قانع خوێندەوە، دڵشاد مستەفا رایگەیاند کە بەرێز عومەر فەتاح سەرۆکی حکومەت وتارێك بۆ دیدارەکە پێشکەش دەکات. سەرۆکی حکومەت وتارێکی بەپێزی لەسەر رۆڵی جوامێرانەی قانعی شاعیری چەوساوەکان و جووتیارانی کوردستان خوێندەوە، لەوتارەکەیدا باسی کاریگەری شیعری قانعی کرد. لەسەر هوشیارکردنەوەی جووتیارانو کرێکارانی کوردستانو رۆڵی قانعی لە ئەدەبی کوردیو شیعری کوردیدا بەرز نرخاندو، قانعی بەشاعیری چەوساوەکان ناوزەد کردو خۆشحاڵی خۆی بۆ سازکردنی دیدارەکە بەرجەستە کرد، وتی قانع لەمە زۆر زیاتر هەڵدەگرێت بۆی کراوە بۆی بکرێت..

جارێکیتر ناهید بەخوێندنەوەی چەند بەیتە شیعرێکی قانع هۆڵەکەی خامۆشکردەوە. دڵشاد مستەفا بەدوایدا هاوریێ سەنگاوی پێشکەشکرد بۆ خوێندنەوەی وتاری وەزارەت. هاوریێ سەنگاو لە وتارەکەیدا ئاماژەی بۆ شیعری قانعو قانع کرد، لە خزمەتی جووتیارانو چەوساوەکانی کوردستاندا.. رۆڵی قانع و شیعرەکانی بەهاندەرێکی گەورە لەقەڵەمدا، بۆ هۆشیارکردنەوەی جەماوەری چەوساوەی گوندوشارەکان.

ناهیدی حسینی بەشیعری قانع شیعر بارانی هۆڵەکە یکردەوە.. دڵشاد مستەفا شاعیری گەورەی گەلەکەمان شێرکۆ بێکەسی پێشکەشکرد بۆ خوێندنەوە چەند پەیڤێك.. مامۆستا شێرکۆ وێرای خوێندنەوەی چەند پەیڤێكو، ئەو شیعرانەی لە دیوانی کورسیدا بۆ قانعی نووسیووە خوێندەوەو میوانەکانی هۆڵەکەی پەیڤ بارانکرد.. جارێکیتر ناهیدی حسینی بووە ئاوێنەی بالأنمای قانعو عاشقانی قانعی سەرسامکرەوەد.

بەدوایدا دڵشاد مستەفا هونەرمەندی دەنگخۆش حەمە جەزای پێشکەشکرد بۆ چڕینی مەقامی ( ئاخرین ماڵی ژیانم ). کە بەدەنگە زوڵاڵەکەی هەمو دیوارو سەقفی هۆڵەکەی دەلەراندەوە.

دوای خوێندنەوەی چەند بەیتێکیتری قانع لەلایەن ناهید خانەوە دڵشاد مستەفا پشوویەکی چەند دەقیقەی راگەیاند. بەرێز عومەر فەتاح سەرۆکی حکومەت لەگەڵ دەستخۆشی لەسازدانی دیدارەکە داوای مۆڵەتدانی رۆیشتنی کرد.

بەشی دووەمی مەراسیمەکە بۆ پێشکەشکردنی بابەتەکان دەستی پێکرد، دکتۆر حەمە دلێر میسری بەرێوەبردنی کۆڕەکەی وەرگرت، دکتۆر سەباح بەرزنجی پێشکەشکرد بۆ پێشکەشکردنی بابەتێ بە ناونیشانی ( رەنگدانەوەی کلتوری ئاینی لەشیعرەکانی قانع) دا بەتەواوبوونی بابەتەکە گفتوگۆی هەمەلایەنە لەسەر بابەتەکە لەلایەن ئامادەبوانەوە کرا.

بەدوایدا عیرفان رەهمنوون بابەتێکی بە نانونیشانی ( قانعو مۆدێرنیتە ) پێشکەشکردو لەلایەن ئامادەبوانەوە گفتوگۆی لەسەرکرا.

کاتژمێر ( ٣ ) ی دوای نیوەڕۆی هەمان رۆژ دیدارەکە بەردەوام بوو. نووسەرو رووناکبیر رێبین هەردی بەرێوەبردنی کۆڕەکەی وەرگرتو هەورامانی وریا قانعی پێشەکشکرد بۆ خوێندنەوەی بابەتێ بەناونیشانی ( رەخنە وەکو وشیاری سەرەتایەکی نوێ بۆ خوێندنەوەی ئەزموونی قانع ) لە نووسینی ( مەریوان وزیا قانع ) بەدوایدا گفتوگۆ لەسەر بابەتەکە کرا.

بابەتی دووەمی ئێوارە کۆڕەکە تەرخانبوو بۆ رووناکبیرو رۆماننووس بەختیار عەلی کە بابەتێکی بەناونیشانی ( قانع سەرهەڵدانی ناسیونالیستی ) پێشکەشکرد بەدوای پێشکەشکردنی باسەکەیدا دەرگای لێدوان و گفتوگۆ کرایەوە.. ئامادە بووان بەشدارییان لە هەڵسەنگاندنی بابەتەکەیدا کرد.

<u>دووهەم رۆژی دیدارەکە:</u>

کاتژمێر ( ١٠ )ی بەیانی رۆژی ١٢/٢٨ شاعیرو نووسەر دکتۆر رەفیق سابیر بەرێوەبردنی کۆڕەکەی پێ سپێردراو دکتۆر تاهیر محمەد عەلی پێشکەشکرد بۆ

پێشکەشکردنی بابەتێ بەناونیشانی ( گرنگی خوێندن لای قانعو کاریگەری لەسەر نەوەی نوێ ) بەتەواوبوونی بابەتەکە گفتوگۆی زۆر لەسەر بابەتەکە لەلایەن ئامادەبوانەوە کرا...

لەم بەیانیە کۆڕەدا ئەحمەدی نەزیری کە لە خۆرهەلاتی کوردستانەوە بانگهێشتکرابوو خاوەنی زایەڵەی زرێباری قانعە.. بابەتێکی بەناونیشانی ( چۆن توانیم بەرهەمە بلاونەکراوەکانی قانعو نوکتەو قسە خۆشەکانی کۆبکەمەوە ) پێشکەشکرد..

دکتۆر رەفیق شوانی بابەتێکی بەناونیشانی ( قانع شاعیری چەوساوەکان ) پێشکەشکردو بەدوایدا گفتوگۆی لەسەرکرا.

وە هەر لەو بەیانیە کۆڕەدا نووسەری خۆرهەلاتی کوردستان عەلی ئەشراف بابەتێکی بەناونیشانی ( مەکتەبی پەروەردەی قانعو هێڵە سەرەکییەکانی ) پێشکەشکردو بەدوایدا لەلایەن ئامادەبوانەوە گفتوگۆی لەسەرکرا.

دوا ئێوارەی کۆڕو مەراسیمی کۆتایی دیدارەکە: کاتژمێر ( ٣ )ی ئێوارە دکتۆر فەرەیدون بەرزنجی بەرێوەبەری کۆڕ، مامۆستا (( رێبوار حەمە تۆفیق )) ی پێشکەشکرد بۆ پێشکەشکردنی بابەتێ بە ناونیشانی ( قانعو فەرهەنگی ئایندەبینی ) و دوای خوێندنەوەی بابەتەکەی لەلایەن ئامادەبوانەوە گفتوگۆی لەسەرکرا.

دوای پشوویەکی کورت، دڵشاد مستەفا مەراسیمی کۆتایی دیداری راگەیاندو ناهیدی حسینی بە خوێندنەوەی چەند پارچە شیعرێکی قانع سەرنجی ئامادەبوانی هۆڵەکی راکیشاو، بە دوایدا، مەم بورهان وریا قانع وتاری بنەماڵەی خوێندەوەو لە وتارەکەیدا ویرای ئەوەی قانعی بە شاعیری نەتەوەو چەوساوەکانی کوردستان لەقەڵەمدا. بەناوی بنەماڵەوە سوپاسی فەتاح زاخۆیی و لیژنەی بالاو وەزارەتی رۆشنبیریو سەرۆکی حکومەتی کرد. کە توانیان دیدارەکە سازبکەنو ئامادەی رۆژانی دیدارەکەبن.

بەدوای خوێندنەوەی وتاری بنەماڵە سەرۆکی لیژنەی بالای دیدار شێخ محەمەد سوڵەیی وتاری کۆتایی دیداری خوێندەوەو لەوتارەکەیدا سوپاسی سەرۆکی حکومەتو وەزارەتی رۆشنبیریو وەزارەتیدارایی و بەرێوەبەرێتییەکانی کارەباو گەنجینەو ئاسایشو هەموو کەناڵەکانی راگەیاندنو بەتایبەتی کەناڵی گەلی کوردستانو کوردساتو ئەندامانی لیژنەی بالاو ئەو

فەرمانبەرانەی کە لەلیژنەکاندا بوونو بەباشی دیدارەکەیان بەڕێوەبرد کرد. هەروەها سوپاسی ئەو نووسەرانەی کرد کە بابەتیان پێشکەشکرد و ئەوانەی کۆڕەکانیان بەڕێوە بردو ئەو میوانانەی کە هەردوو ڕۆژەکە ئامادەی دیدارەکە بوون، وە سوپاسی کۆمەڵەی هونەرەجوانەکانی کوردو کتێبخانە گشتی سلێمانیو بەڕێوەبەریێتی پەساپۆرتو مانەوەو قائیمقامی پێنجوێنی کرد، کە هاوکاریانکرد، بۆ کار ئاسانیو بەڕێوەچوونی دیدارەکە. بە دوایدا ناهیدی حسینی بەچەند پارچە شیعرێکی قانع هۆڵەکەی شیعر بارانکرد. دوای ئەوە دڵشاد مستەفا دابەشکردنی خەڵاتەکانی دیدارەکەی ڕاگەیاند کە ئەم بەڕێزانە خەڵاتەکان پێشکەش دەکەن: دکتۆر حەمە دلێر، شێخ محمەد سۆڵەیی، هاوڕێ سەنگاو، شۆرش ئیسماعیل، مامۆستا جەمال محەمەد، شێرکۆ بێکەس.

ئەوەی ماوە بیڵێم، هەردوو ڕۆژی دیدارەکە هۆڵی هونەرەجوانەکان لە نووسەرانو ئەدیبانو ئەدەب دۆستانو مامۆستایانی زانکۆو عاشقانی شیعری قانع پڕدەبوو.. وە دیدارەکە بەسەرکەوتوویی کۆتایی هات و. من لێرەوە جارێکیتر سوپاسی هەموو لایەك دەکەمەوە کە یارمەتیان داینو هاوکارییان کردین.

ئومێد دەکەم کە وەزارەتی ڕۆشنبیری لەساڵی ۲۰۰٦و ساڵانی داهاتوودا دیداری لەم جۆرە بۆ ئەدیبانو شاعیرانو ڕووناکبیرانی گەلەکەمان ڕێکبخاتو، لە پێشیانەوە دیدار بۆ شێخ نوری شێخ ساڵحو هێمنی شاعیرو مامۆستا عەلادین سجادیو مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریسو سالمو مەحویو کوردیو ئەحمەد موختاری جافو گۆرانوبێکەسو حەمدی...

دەبا لەدیداری قانعەوە هەنگاو بۆ دیداری شاعیرانی تر هەڵگرین. حەزدەکەم ئەوەش بە خوێندەواران رابگەیەنم ئەوبابەتانەی لەسەر قانع پێشکەشکراون لە داهاتوویەکی نزیکدا لە کتێبێکدا چاپی دەکەین و تکا لەو برایانە دەکەین کە بابەتەکانیان تەواو نەکردووە و یان دەیانەوێت لێی زیادبکەن. بە زوویی تەواوی بکەنو بۆمان بنێرن.

ڕۆژنامەی ئاسۆ ژمارە( ۱۸۱) لە ۲۲ / ۱ /۲۰۰٦

# با ئەمانەش لەناو نەچن

خوێنەری هێژا ئەم بەشەی کە ناونیشانی بابەتە ئەدەبییەکانی لە کەشکۆڵدا وەرگرتووە. کۆمەڵێ نووسینن کە ساڵانی رابردوودا نووسیومن هەیانە لەکاتی خۆیدا بڵاوکراوەتەوە، هەندێکیشیان بڵاونەکراونەتەوە..لەمجۆرە نووسینانەم زۆربوون بەداخەوە..بەهۆی بارودۆخی سیاسی کوردستانەوە زۆربەیان لەناوچوون. ئەمانە تاکوتەران ماونەتەوە بەجێی خۆی دەزانم بۆ ئەوەی ئەمانەش لەناونەچن. لەم کەشکۆڵەدا بڵاویان بکەمەوە، بەلای خۆمەوە ئەگەر بابەتە ئەدەبییەکە بەهێزیش نەبێت لەبەرئەوەی وەکو یادگارییەکی رۆژان و ساڵانێکی مێژووی مەرگەساتی گەلەکەمان بەلامەوە گرنگە.

بۆنموونە لەناویاندا (دوونامە)ی هاورێی شاعیرم کاکە لەتیف هەڵمەتی تیادایە. ئەو نامانە لای خۆم نەمابوون لەئەرشفی کاکە لەتیفدا مابوون.. دیارە کاکە لەتیفیش نامەی بۆمن ناردووە، بەڵام بەداخەوە نامەکەی یەکێکە لەو بابەتانەی لەناوچوون، هیوادارم ئەم بەشە جێی خۆی لە ئەدەبی گەلەکەمدا بکاتەوە.

نووسەر

# شەکیبیش کاروانی ژیانی بەجێهێشت و تابوتی مەرگی ماچ کرد [i]

**ژیان و بەسەرهاتی شەکیب...** [ii]

شەکیب شاعیری زمان پاراوو نوکتە بازو قسەخۆش و دڵبەندی تەریقەی نەقشی و لەخواترس..شاعیری دوودڵی بەئاوات نەگەیشتووی ژەمبووردەی خۆشەویستی لەیلاو مەجنوون..شاعیری زرنگی ناو کۆڕوکۆمەڵی پیاوانی ناوشاری سلێمانی و ناوچەی شاربازێڕ..

شەکیب حاجی مەلا فەرەجی ساڵحی عەزیزی-واژەییە..کەلەساڵی(١٣٣٢)ی کۆچیدا لەباوەشی دێیەکی خنجیلانەی ناوچەی شاربازێڕ(واژە)ی

هەوارگەی دەسەڵاتدارێتی میرنشینی بابان و جێ شەڕگەی-شێخ مەحموودی-نەمرو سەنگەری نەڕوخاوو هەمیشە پتەوی پێشمەرگەکانی کوردستان دا-سەری کێشاوەتە جیهانی کوردستانێکی سەخت و ناو میللەتێکی دابڕ دابڕو ماف پێشێل کراوەوە چاوی لەبەرامبەری شاخی(گمۆ) گمە گمی کوردانەوە هەڵهێناوەو، مەڵاشووی بەوشەی پاراوی-کوردی- هەڵدراوەتەوە..دیارە-لانکەی-ئەمیش شپرزەی بێ دەسرازەیی بووە، بۆیە باوکی بناری چیای(گمۆ)ی بەجێ هێشتووەو روی کردۆتە بناری ئەزمەڕو گۆیژەو چۆتە دێی-کانی بەردینە-وکەوتۆتە ژێر سێبەری- شێر کوژو پیرەمەگروون-ەوە، وەیا شوێنەواری بابانەکان لە قەڵاچوالاندا، پاڵی پێوە ناوە

---

[i] نووسینەوەو لێدوان لەبارەی ژیانی شەکیب لەو دەست خەتەی خۆی وەرگیراوە کە لەکاتی خۆیدا لەهاوینی ساڵی ١٩٧٢دا لەپێش مردنیا بەچەند مانگێك نوسیویەتیەوە. ئێستا لە نامەخانەی کۆڕی زانیاری کورد پارێزراوە.

[ii] کاك(جەمال محەمەد)قوتابی کۆلێجی ئادابی سلێمانی لە ژینی ژمارە(٩٦)دا بەمێژووی ١٩٧٢/١٢/١٤باسێکی کورتی لەسەر شەکیب بڵاوکردەوە من لەبەر نەبوونی ماوە نەمتوانی لەکاتی خۆیدا ئەو ئەرکەی کەوتبووە سەر شانم جێبەجێی بکەم.

کە لە یەکەم مەڵبەندی- حکومەتی کوردی-حکومەتی شێخ مەحموود-لە سلێمانی نزیك ببێتەوە. لە-کانی بەردینە-دا زمانی پڕاوەو، گوێی بۆ هەواڵی ڕاپەڕینەکانی کورد کراوەتەوەو، چاوی بۆ رزگاری کوردستان هەڵهێناوە..باوکی شیرزەیی و بێ دەرامەتی میللەتی کوردی لە نەخوێندەواری‌دا بینیوە بۆیە هەر لەتەمەنی حەوت ساڵییەوە- مەلا فەرەجی خستۆتە حوجرە-ی مەلا ساڵحی قوربانی سەرەتای خوێندنی بە ئەلف و بێ دەستی پێکردووە تا قورئانی-خەتم کردووە.

بەدوای یەك دوو ساڵێکدا، لەبەر پێویستی ژیان ماڵیان باری کردۆتەوەو ناوچەی سەرچنار-یان بەجێهێشووەو گەڕاونەتەوە بۆ بێشکەی چاوکردنەوەی شاربازێڕو چوونەتەوە دێی(واژە)و لەسەر خوێندنەکەی بەردەوام بووەو، نزیکەی پێنج ساڵێك لەلای-مەلا شەمسەی-واژە-ش خوێندویەتی، لەو ماوەیەدا گوڵستان و بۆستان و چەند کتێبێکی تری عەرەبی و فارسی خوێندووە، زیرەکی-شەکیب-خۆی لەلایەك و هاندان و پشت گرتنی باوکی و مامۆستاکانی لەلایەکی ترەوە، پاڵیان پێوەناوە کە لەسەر خوێندن بەردەوام بێت و،خولیای گەڕانی بکەوێتە سەرەوە بەدوای شوێن و مامۆستای باشدا، بۆیە وەکو- فەقێیەکی-ئەو سەردەمە بوخچە کتێبەکەی داوە بەکۆڵیاو، ماڵی خۆیانی بەجێ هێشتووەو، کەوتۆتە ناو ژیانی حوجرەو راتبەو دەقنەکردن و گەڕان بەدوای موستەعیدی باش و مەلای بەناوبانگ و شارەزادا.

بۆیەکەمجار بوخچەکەی لەدێهاتەکانی دەوروبەری سلێمانی کردۆتەوەو، شانی پیا کردووە. تا گەیشتۆتە ناو شاری سلێمانی و لەمزگەوتی-موفتی-لای- مەلا عەزیزی موفتی- گیرساوەتەوە دامەزراوەو دەستی بەخوێندنی-شەرع و سەرف و نەحوی-عەرەبی کردووە، دەرسی فارسیشی لای-عەزیز ئەفەندی وەسمان ئاغا-(خواجە ئەفەندی)خوێندووە.

-شەکیب-جگە لەو مەلایانەی سەرەوە دەرسی لای ئەم مەلا بەناوبانگانەی سلێمانی خوێندووە:

١-حاجی مەلا عەبدوڵڵای چوڕستانی. ٢-مەلا مەحموودی بێخود. ٣-مەلا مستەفای حاجی مەلا رەسوڵ دێلێژەیی(سەفوەت). ٤-حاجی مەلا شێخ نوری

بابە عەلی. ٥-مەلا حەمە سەعیدی دێلێژەیی. ٦-حاجی مەلا عەبدولکەریمی بیارە-مدرس-.

ئیجازەی مەلایەتی لەلای حاجی مەلا شێخ نوری بابە عەلی و ئەو مەلایانەی سەرەوەدا وەرگرتووە، لەلای مەلا کەریمی بیارەش تازەی کردۆتەوە. دوابەدوای ئیجازە وەرگرتنیشی لەسەر خوێندن بەردەوام بووە، وە لەسەر داوای-موفتی- بووە بەئیمامی مزگەوتی موفتی. لەو تەمەنەدا کچی شێخ عەبدوڵڵای واژەی-گواستۆتەوەو لەژیانی حوجرەو فەقێیەتی دەرچووەو، کەوتە ژیانی ماڵدارییەوە.

دوای ماوەیەك بۆتە ئیمامو واعیزو مودەریسی چوارتاو لە ساڵانی(١٩٤٤-١٩٤٥)دا کراوە بە واعیزی گەرۆك(سەیار)، لەناوچەی شارباژێڕدا. بەم حاڵەوە زۆر دەوامی نەکردووە نیشتەجێبووە.

لە(سەراو)ەوە خولیای دیدەنی و زیارەتی-شێخ ئەمینی بێژوێی-کەوتۆتە سەرەوە، کە مەلایەکی شارەزاو شێخێکی بەناوبانگی ئەو ناوەو دەروێشێکی تەریقەتی نەقشبەندی بووەو چوە بۆلای.

چەند رۆژێك لە-(بێژوێ) ماوەتەوەو وەختی لەگەڵ-شێخ ئەمین-دا بردۆتە سەر. شێخ ئەمین شەکیبی بەدڵدا چووەو ئیجازەی مەلایەتی و تەریقەت و شەریعەتی داوەتێ و، ناردویەتی بۆلای-شێخ عەلادینی بیارە-وە ئەویش سەر لەنوێ ئیجازەی تەریقەتی نەقشی داوەتێ پاش ئەو هاتوچۆیە گەڕاوەتەوە دێی-سەراو-و بووە بە پەپولەیەکی باڵ سووتاوی تەریقەتی نەقشی و دەستی کردووە بە بڵاوکردنەوەی لەناو خەڵکدا، وە بەدوای ئەمجارەشدا چەند جارێکی ترو بەڵکە هەموو ساڵ دیدەنی-شێخ ئەمینی بێژوێی کردووە لە بێژوێ- شێخ کاکە حەمەی سۆڵە-و دائیرەکەی دیوەو لەو جارەوە هەمووکات کاغەزی بۆ ناردووەو هەر ساڵێك شێخ کاکە حەمە رێی کەوتبێتە ئەو ناوە چووە بۆلای، دوای وەفاتی پەیوەندی گەرمی لەگەڵ شێخ عەبدولکەریمی کوڕیدا بووە، کە دائیرەی شێخ کاکە حەمە سەر بەتەریقەتی قادرین.

ماوەی چەند ساڵێك لە(سەراو)حەساوەتەوەو، بەڵام لەناکاو هاوسەری ژیانی واتا خێزانی کۆچی دوایی کردووە، بەدوای ئەم لێقەومانەدا کوڕانی-بابە شێخی سیرێ-خوشکی خۆیانیان داوەتێ و لەساڵی(١٩٥٥)یشەوە بەماڵەوە چۆتە دێی-سیرێ- لەناوچەی سیوەیل بەفرمانی پێشوی خۆی، وە لەو ساڵەوە لە سیرێ

ماوەتەوە تا ساڵی (١٩٦٩)کە گەڕاوەتەوە بۆ دێی -واژە-ی ناوچەی -چوارتا- بۆ ناو خزمەکانی.

مەلا فەرەج پیاو چاکێکی ئاینیو کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئەدەبی ناوچەی شاربازێڕ بوو، جێگای لە هەموو کۆڕو کۆمەڵێکا دیار بووە هەر مەسەلەیەکی کۆمەڵایەتیو ناکۆکیەکی عەشایەری پیاگەیشتبێ باڵی رێکەوتنو ئاسیشی بەسەردا کێشاوە، خەڵکی دێیەکانیش لە هەر قەوماونێکدا کە رویدابێ بەرەو ناکۆکیوناخۆشی چووبێ، چوون بەدوایاو بردوویانە، ئەویش بۆ ئەو خزمەتانە هیچ کاتێك سەری پێوە نەبووەو، هەمیشە رقی لە پێلاوی چەك بووە چاوی بەو کەسەدا هەڵنەدەهات پێلاوی چەکی لەپێدەکرد..ئەوەندە تامەزرۆی تەبایی دانیشتوانی ناوچەکەو خەڵکی کوردستان بوو، تا لەپێناویا سەرینایەوە، ئاواتەکانی پڕ بوو لەتاسەو هەموو قسەیەکی هەناسەیەکی ساردی لەگەڵدا بوو، تەزبیحو سەڵاواتو قسەی خۆش لەدەسو دەمی نەئەبوونەوە. لەبارەی نوکتەی کۆمەڵایەتیو روداوی سەیر سەیری ناو ئەو خەڵکە سادەیەدا دەفتەرێکی نوسراوەی بێکۆتایی بوو. خۆ کە باسی -کاکە حەبیبەو فەرەجە دۆمی بۆ ئەکردی، ئەکەوتیتە ناوەڕاستی کارەساتو روداوەوە، وەیا کەهۆنراوەی وەڵامی -کارتی جەژنە پیرۆزەی، دانیشتوانی شاری سلێمانی بۆ ئەخوێندیتەوە سلێمانیت لە شریتێکی سەیردا لەژێر دەستی دۆستەکانی- شەکیب-دا ئەبینی.

مەلا فەرەج -خەڵکیدێی گردەزبێر-ئەچن بە شوێنیاو ئەیبەن بۆناوخۆیان بۆچارەسەرکردنی هەندێناکۆکی گیروگرفتی ناو خۆیان، لەهەمان کاتیشدا عادەتی هەموو ساڵ بۆ دیدەنی سەری لێداون, پاش ئەوەی ئەرکەکانی سەرشانی جێبەجێئەکاتو چەند ڕۆژێك لەناویاندا ئەمێنێتەوە، شەوی ١٩٧٣/١١/١١ لەماڵ خانە خوێکەی ئەبێت ئەو شەوە هەموو دانیشتوانی دێیەکە لەدەوری ئەبن تا نیوەشەو بەقسەو وتوێژی بەکەڵكو خۆش ئەیبەنەسەر, شەو دەوری چۆڵ ئەبێتو نوێنی نوستنی بۆ ڕائەخرێو پشتێنی حەوانەوەی لێئەکاتەوە، نازانێ پشتێنی یەکجاریەو جارێکی تر ناو کۆڕوکۆمەڵ نابینێتەوەو، کۆڕو کۆمەڵیش بێ مەلا فەرەج ئەمێنێتەوە، بەیانی بۆ نوێژ هەڵئەستێتو پاش دەستنوێژ شتن نوێژی بەیانی ئەکات، دواجار خەوی یەکجاری لێئەکەوێت, لەگەڵ تەزبیحو بەرماڵو کرداری چاکدا دڵی لەلێدان

ئەکەویٚ. بەڵیٚ شەکیب دڵی لەلێدان کەوت، لەگەڵ خزمەتی ئاینی ئیسلامو نەتەوەی کوردو ئەدەبی کوردو کۆمەڵی کوردەواریدا.

مردنی شەکیب ناسۆروئازارێکی زۆری کردە دڵی دانیشتوانی شاربازێڕو ئەو کەسەی تەنها ڕۆژێك دیبێتی... واتە شەکیب لە بەیانی ڕۆژی ١٩٧٢/١١/١١گیانی جیهانی کوردەواری بەجێهێشتو، لەهەمان ڕۆژداتەرمەکەی بەسەر شانی دانیشتوانی ئەو ناوچەیەوە لە-گردە زبێر-ەوە بەڕێکرایەوە بۆ دێی-واژەو لەگۆڕستانی -خدری زیندە- نێژراو لەناو قەتارەی فرمێسك داچووە ڕیزی کاروانیسەربەرزانەوە، سەیرانکەرانی هەزارکانیو شاخی گمۆ ئەم ساڵ سەری ڕێزو تاسە بۆ گۆڕەکەی شەکیبو کردەوەکانی دائەنەوێنن.

# شیعرو شەکیب

(شەکیب)ی خاوەن خورپەو سۆزی دڵداری لەیلو مەجنونو شاعیری دەم پاراوی سەیرانی هەزارکانیانو (گمۆ)و لەدوای ناسینی ڕەشو سپییەوە خولیای شیعری کەوتە سەرو زەوقی لەگەڵیا بووە، سەرەتای هۆنراوە دانانی لای(حاجی مەلا ڕەسولی گۆڵێ{فەریق})ەوە دەستی پێکردووەو ماوەیەك لەو دێیانەی کە خوێندویەتی شیعری لەناوخەڵکدا دەنگی داوەتەوە کە ژیانی لادێشی بەجێهێشتووەو چۆتە ناو کۆڕی ژیانی شارستانیەتو جیهانی ئەدیبانی ئەو سەردەمە، لە شاری سلێمانیشدا لەلای مەلا مەحمودی(بێخود)گیرساوەتەوەو بووە بەفەقێی، وەئەوەندەیتر لەگەڵ هۆنراوەدا ئاشنایەتی پەیداکردووە، کە(بێخود)یش زانیویەتی(شەکیب)بەهرەی شیعری تیایەو تواناشی هەیە، چەند دەستووری شیعری پێ وتووە، ڕێپیشاندەریی کردووە لەڕووی وەزنو قافیەوە، هۆنراوەکانی ئەوەندە تەڕوپاراو بووە سەرنجی(بێخود)ی ڕاکێشاوەو(شەکیب)ی بەتەخەلوسی شیعری بۆ داناوە لەناو کۆڕو کۆمەڵدا باسی شاعیرێتی شەکیبی کردووە...

شەکیب لەناو کۆڕەکانی بێخودو مەلاوئەدیبەکانی سلێمانیدا چاوی شیعری کراوەتەوەو، زمانی نوکتەبازیو قسەی بە توێکڵو خۆشی پڕاوە، بەڕادەیەك کە زۆربەی ڕۆژە هەینیوسێشەممەکان کۆڕیان لای شەکیب گەرم کردووە. شەکیب لەماوەی ژیانیدا زۆری لەشاعیرانی کورد بینیوەو هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی لەگەڵدا کردوون.

وەکو پیرەمێرد- ڕەمزی مەلا مارف-قانع-بێکەس-شەفیق-فەریق-ئاری-ئەدیب- هۆشەنگ شێخ نوری شێخ ساڵح-مەلا مستەفای سەفوەت جیهانی-زاری حەقیقی- بۆکانی-هەژارو زۆریتر.

چێژی شیعری لەشیعرەکانی(نالیو سالمو کوردیو مەولانا خالیدو باباتاهیری هەمەدانیو مەولەویو وەفایی) وەرگرتووە..

(شەکیب)کە کەوتۆتە مەیدانی شیعرەوە چالاکانە ئەسپی خۆی لێتاوداوە ڕمبازیەکی زۆری لەشیعردا کردووەو، بۆ خزمەتی سامانی ئەدەبی کلاسیکیمان بەزمانێکی ڕەوان و کوردییەکی پەتیەوە خامەکەی ماندوو کردووە، شیلەی بیری خۆیداوە بەدەمیەوە تا هەوای(لەیلا)بردویەتی بۆ کێوی(دجیل)و(مجنون)ی وێڵی کەژو هەردە کردووە، ئەو داستانەی لەیل و مەجنونەی لە(خەمسەی نیزامی مەولانای ڕۆمی)یەوە لە فارسییەوە بەشیعر وەرگێڕاوەتە سەر زمانی شیرینی کوردی، بۆ لاوە خوێن گەرمەکانی کوردەواری بەکوردیەکی ڕەوان پڕ سۆزو مۆسیقاو گیانێکی کوردی پەتی بەبەردا کردووە.

لەدوای تەواوکردنی داویە بەمامۆستا (بێخود)و ئەویش لەنووکەوە سەیری کردووەو، ئەمسەرو ئەوسەری پشکنیوەو دوای چەند سەرنج و تێبینیەکی پەسەندی کردووە بۆ لەچاپدان: ئەمە یەکەم بەرهەمی شیعری پێشکەشی خوێندەوارانی کوردو کتێبخانەی کوردی[iii] کردووە. ڕەواجێکی چاکی هەبوو لەناو جەماوەری خەڵکی کوردستاندا بەتایبەتی خوێندەوارانی لادێ.

شەکیب...لەهۆنراوەدا بۆ زۆر لای پەلی کوتاوە، لەزۆریاندا سەرکەوت و لەزۆر لاشدا یا وەستاوە یا وازی لێهێناوە. شیعری نیشتمانی و دڵداری و پەروەردەو ئامۆژگاری و هەجوورەسا..شەکیب جگە لەم هەموولایەنی شیعرە کۆمەڵێ هۆنراوەی ناو خەڵکی هەیە کە هەریەکەیان تام و چێژێکی تایبەتی ودەنگی بەسۆزو کاریگەری خۆی هەیە لەناوخەڵکیداو،ترش و شیرینی تایبەتی ئەدەبی شەکیبە دیوانێکی شیعری چاکی ئەبێت ئەگەر چاپبکرێت لە کتێبخانەی کوردیدا. جێگای خۆی دیاری ئەکات، وە ئەو کۆمەڵە سەر گوزشتەو باسانەی کە بەشیعر هۆنیویەتیەوە ئەگەر چاویان بەچاپ بکەوێ ئەوا دەنگی شەکیب تا ماوەیەکی دوور دەنگ ئەداتەوە...

شەکیب جگە لە هەوڵی شیعری چەند هەوڵێکی تری داوە ئەمیشی هەر لەپێناو خزمەتی ئایینی ئیسلام و کۆمەڵی کوردەواریدا(ڕیسالەی تەجویدی

---

[iii] کتێبی(لەیلاو مەجنون) کە شەکیب بەشیعر کردویەتی بەکوردی لەساڵی(١٩٥١)دا لەسەر ئەرکی(مەلا محەمەدی ساڵحی) کتێب فرۆش لەسلێمانی لەچاپدراوە.

قورئانی)بەشیعر وەرگێڕاوەتە سەر فارسی زۆر لە(مەکتوبەکانی) (کاک ئەحمەدی شێخی) بۆکوردی وەرگێڕاوە...

لەگەڵ (خواجەی ئەفەندی)شدا کەرامەتەکانی کاک ئەحمەدی شێخیان بەفارسی وکوردی کۆکردۆتەوەو لەچاپیانداوە.

شەکیب جگە لەهۆنراوەی کوردی دەستی بۆ هۆنراوەی فارسی و عەرەبیش راکێشاوە،چێژی شیعری فارسی لەشیعرەکانی(حافظ وکلیم وسعدي) وەرگرتووە وە(تەخمیسی)لەسەر زۆر هۆنراوەی کوردی و فارسی کردووە، لێرەدا پێنج خشتەکییەکی لەسەر غەزەلێکی(رەمزی مەلا مارف) ئەخەینە پێش چاوی خوێندەوارانی کورد، کە ناونیشانی هۆنراوەکە بەم شێوەیەی خوارەوە نوسراوە.

**پێنج خشتەکییەکی شەکیب لەسەر غەزەلێکی رەمزی مەلا مارف**

ئەی ئەسەف بۆ خاکی پاکی چاکی کوردی بەشبڕاو
بۆنە بۆتەی رۆڵەکانی پڕ گڕو ئاگر گڕاو
یەك بەیەك رۆڵەی ئەسوتێ ئەو بەناحەق هەڵکراو
چۆن ئەبێ نەگریم بەحاڵی میللەتێکی بەش خوراو
یا نەناڵێنم لەداخی جەوری دەوری دوا بڕاو

دەستی زاریم هەڵبڕیوە ئائیلاهە لعالەمین
کوردی جەوساوە رەهاکەی پێی ببەخشی هێزو تین.
دەستە ئەژنۆ دائەنیشم رۆژوشەو مەشغوڵ بەشین
شیوەنم بۆچی نەگاتە عاسمانی حەوتەمین
هەر وەکو تولفێکی دایك لەت لەت و کوت کوتکراو

بۆچ لەتاوی دەوری کوردم شین لەگەڵ شاما نەکەم
شەڕ لەگەڵ تۆپ و تەیارەو بۆمبی ئەتۆما نەکەم
یا لەتاریکی وەتەندا گڕ بەسەر مۆما نەکەم
خاکی عالەم بۆ بەسەر تەوقی سەری خۆما نەکەم
چەشنی مەزلومێکی قەوم و قیلە یەکسەر سەر براو

ڕوو لەپیاوی زۆڵە کورد کە بۆ لە کوردیەت دژی
هەروەکو قرژاڵی دووسەر یا وەکو مێش و سژی
پشت لەهۆزی خۆت ئەکەیت و بۆ غەیر خوێن هەڵمژی
(جوو)ن لەژێر سایەی سەربەخۆییدا بژی
من لەچۆڵی گەرمی دیلیدا لە بەر قرچەی هەتاو

سەیری خاکی کوردەواری چۆن ئەو لەم ئەرزەدا
بەش بەش و داگیرکراوە کەوتووە لەم ڕەزەدا
خوا شفای ڕزگاری دەرخا زوو بەزوو لەم فەرزەدا
کێ ئەبینم غەیری من ئەمڕۆ لەڕووی ئەم ئەرزەدا
وا بەناحەق حەق خوارو موڵک و میللەت بەش کراو

چەند گەدای کردن بەشاهو ناوی دەرخستن بەفەڕ
ئاگرە دایم دەسوتێ پوشی کوردبێ وشک و تەڕ
هەر بەکوردستانە فیزی واش لە ئەو کەوتۆتە شەڕ
هەر ئەوەی دوێنێ بەئاوی نەوتەکەی من کەوتە گەڕ
ئێستا وا لێم بۆتە ئیستیعمارو خاوەن نەوت و ئاو

بۆ ئیتاعەی ئەمری دایکی نیشتمان وا ئەستۆ کەچم
گەر بڵێ بێ خۆت بەکوشت دە زۆڵە کوردم گەر نەچم
قارەمانی کوردی وەك من غەیرە بێ بگرێ مەچم
جا لەشاری پەستی بەو دەستی لەبەر چی دەرنەچم
نەبمە سەربازێکی یاخی بووی لەکێووکەژ خزاو

قــۆڵی کوردانــه بەمەردانــه هــەتا کــەی هەڵنەکــەم
هــەر وەکــو کــاوە زوحــاکی ناحــەزی خۆمدەرنەکــەم
مــاری ســەر شــانو مــل تــادێ لــەرەگ مــن بانــەدەم
تــەوقی یەخســیری لەســەر ئەســتۆی ژیــانم لانــەدەم
نەچمە ســەر رێوشــوێنی شــێرانی بەسەربەســت ژیــاو

کــە س بــەرێزە کــە بــەهێزە پیــاوی خــەواف‌و جــەبوون
بێتەدەســت بــەرداری مــامی هــەر لــە بــەر بــوون‌و نــەبوون
ترســـنۆکی ژێـــر چــەپۆکی دایمــە ماتــەو زەبــوون
تاکو کەی ئەستۆ کەچی بەردەستی ئەمری غــەیرە بوون
جــەژنی خزمــەتکارو خــوبزەی بــەردەرو عەبــدی کــڕاو

هــەر وەکــو موســا بــەتفلی هاتــە دەر لــەو نیلــەدا
بووبەشــت فیرعــەونی کوشــت‌و زەربــەی لــەو خێڵــەدا
میســڕی کوردســتان رەهاکــەن‌و بێتــە دەر لــەم ژیلــەدا
تــاکو کــەی ئــیتر لەگــەڵ هــەم خــوێن‌و قــەوم‌و قیلــەدا
شووڕوشەڕ جەنگ‌و جەدەل وەك دوژمنــی بــاوك کــوژراو

تــەختی بــەختی کــوردی تــورك‌و ســوریاو ئێــران‌و رۆم
ســاڵەهای ســاڵە ئــەو ئەچەوســێ لــەناو نــاکۆکی گــۆم
بۆیـــەش دایـــم زەبـــوونم وا لـــەتاوی رەنجـــەڕۆم
بــۆ غــەمی دەرمــانی زامــی پیســی نــاکۆکی نــەخۆم
نەبمــە فــەراحێکی دڵســۆزی گــەلی لــەش داوەشــاو

باڕەگی غیرەت بجووڵی پشتی یەك بگرن بەجەم
ئەو هەموو ملوێنە کوردە مسلی شێر هەڵکا عەلەم
هەر وەکو سەدێکی ئاسن ریز ببەستن زۆرو کەم
چیم ئەبێ کەمتر لەمو لەوێ ئەگەر بێتو قەومەکەم
چاکی مەردی لێ بەلاداکەن وەك یەك پیرو لاو

بەم هەموو لاوی بەغیرەت بەم هەموو مەردانەوە
بەم هەموو پێشمەرگە زۆرە بەم هەموو لاوانەوە
بەم هەموو ئەسبابی جەنگو ئەسلیحەو سامانەوە
بچنە مەیدانی زەدوخوردی گەلی بێگانەوە
چەشنی شێریڕق هەڵساوی داڵدەدراو

ئەو کەسەی ئەڕوا لەڕێگەی شەرعەوە ڕەفتارو خووی
کوردو مەردو پیای ئیسلام کەی ڕەوایە پێچووی
هۆزی کورد هێزتان وەدەرخەن بەسێ هاتوچووی
سەف ببەستن تیرە تیرە رابوەستن رووبەرووی
هەر وەکو سەدێ لەئاسن یان لە پۆلا داڕژاو

مەیلی ناحەز وایە ژینت بێ بەئاو نانی ڕەق
دەستی شەل بکرێ بەچاوی کوێرو ببێ لاقی لەق
جا کە مافی سەربەخۆیی لای هەموو کەس بوو بەحەق
حەق بەزەبری شەق بسێنە چونکە حەق بێ زەبری شەق
نادرێو نەدراوە هەرگیز ئەی بەناحەق حەق خوراو

ناتــەبایی بــەینی میللــەت پــێم بڵــێ ئــەڕوا بەچــی؟
هــەر تــەبایی باشــە بــێ شــك بــۆ هەرچیئیشێئەچــی
ســامو تیــژی نــەك بەنــەرمی یاقســەی هەرچیوپەرچــی
حەق بەماستیو مووشە یا بەپاڕانەوەو ئەستۆ کەچی؟
نــادرێ جــا بەســیــیە ئــیتر چــاوەڕاوو چاوەچــاو

هەرچــی پێویســتە هەتانــە کــەس نــەڵێ کــورد بــێ فــەڕن
چــەك بپۆشــن جــا بەخۆشــی ڕیــز ببەســتن هەڵپــەڕن
مــافی کــورد دەستخەن وەکــو شێر زوو لەبێشە دەرپــەڕن
کــاتی ئامەتتانــە جــا قوربــانی کــوڕ بم ڕاپــەڕن
هــەر وەکــو شــێری لــەپڕ بــۆ مامــە ڕێــوی ڕاپــەڕاو

گــۆێ لەغــەیرە بگــرە چــۆنە بــۆ قســەو گفتوگــۆی
بــۆ دەروونــی پیســی بــۆ گــەزافو بــۆ درۆی
پیلــی تــونگ بگــرە فــڕێی دە بڵــێ ئــەو کاتــە ڕۆی
تــاکو ئێســتا دەســتو پەنجــەی غــەیرە بووبــوو بــەهۆی
پــەك نەکــەوتن دوودڵــی دایــم لەیــەکتر دابــڕاو.

مــژدەبێ ئــەمرۆ لــەزۆری هێزەکــەی کوردانــەوە
یــەکێتی پــاکی دەروونو پرچــەکی هەردانــەوە
خۆشەویســتی قــەومو قیلــەو دیــدەنیو ســەیرانەوە
تێپــەڕیو ڕۆی لەســایەی هیمــەتی مەردانــەوە
دەوری زوڵــمو زۆری ئیســتعماری خەســیەت نــەماو

هەر کە خوا کردی کەهۆزی کوردی کوردستان بەجەم
بیری رزگاری بەتین بوو ڕۆژ بە ڕۆژو دەم بەدەم
تا بەشادی سەربەخۆیی دانەنیشی دڵ بەخەم
جا هیوادارم کەوا ئیتر لەمەولا قەومەکەم
یەك کەون ئەمما بەچوستی نەك بەسستی خاوەخاو

هەر کەدایکی نیشتمانم مەنجەلیقی داخرا
بۆسووتانی ڕۆڵەکانیو کارەمانی دەرکرا
دڵ کە جۆشا کورد خورۆشا تەپڵی جەنگی لێدرا
پشتی یەکتر بەرنەدەن هەرگیز وەکو باب وبرا
تێکۆشن بۆ نەجاتی دایکی دیلی دڵشکاو

ئەی(شەکیب)شا تەختی کوردم وەکو سلمانیم ئەبێ
پێشەوای..کاکی بەرزانیم ئەبێ
مەعدەنی عیلمو عەدالەت مەرکەزی جانیم ئەبێ
(رەمزیا)تاجی کەیوتەختی سلێمانیم ئەبێ
قەومەکەم گەر بێتو بەگوێرەی خواهێشتی تۆ بێتە ناو

## شەكیبو كوردایەتی[iv]

شەكیب یەكێك بووە لەو مەلایانەی كە ڕێبازی كوردایەتیو جوڵانەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەی كوردی بەڕێبازێكی پیرۆزو ڕێی پیاوەتیو سەربەرزی داناوە. بۆیە لەسەرەتای دەستپێكردنی ئەم جوڵانەوەیەوە(كوردایەتی)چۆتە ڕیزی پارتی دیموكراتی كوردستانەوە لەڕیزەكانیا چالاكی خۆینواندوە، وەیەكێك بووە لەو ئەندامە سەربەرزو چالاكانەی كە كۆڕو خەباتی گەرمكردووە، تا دواهەناسەی بەردەوامی خەبات بووە، لەپاڵ هەموو كردارێكی ئایینیو كۆمەڵایەتیەوە هاندەرێكی ڕاستگۆبێ پشووبووە، لەناو ڕیزی جوتیارو پاڵەو ڕەشو ڕوتی خەڵكی دەرەوەدا، وتارە ئایینیەكانی لەچوارچێوەیەكی ڕێبازە ڕاستیو ڕێبازو وشەی شەرەفوخزمەتی خاكی نیشتمانو، لەگەڵ بیروباوەڕی كوردایەتیدا جووت كردوە. كە شۆڕشی ئەیلولی ساڵی(١٩٦١)بەرپا بوو. لەكوردستاندا شەكیب مەلایەك بوو، لەڕیزی ئەو مەلا ڕۆشنبیرو پاكو سەربەرزانەی، كە دانی بەمافی شۆڕشگێڕیو چەكداریدانا. بۆمافی چارەنوسی گەلەكەی لە بەرامبەر داگیركەر ئەتوانین بڵێین شەكیب بەپێچەوانەی زۆر لە مەلاكانی ترەوە كە لەسەرەتای شۆڕشو بەڵكە تائێستاش دان بەشۆڕشو مافی بەرگریدا نانێن وە خەڵكی لە كاروانی خەبات سارد ئەكەنەوە...

ماڵەكەی شەكیب وەكو بنكەیەكی پێشمەرگەی لێهاتبوو، وە هەمیشە دەرگای لەسەر پشت بوو، بۆ قۆستنەوەی ڕۆڵە جەربەزەكانی كوردستان، كە لەژێر بەزەیی گڕوگوولڵەدا ئەگەڕانەوە...هەمووجار شەكیب ئاخی هەڵئەكێشاو خۆزگەی ئەخواست كە تواناو هێزی ئەبوو، بۆ چەك هەڵگرتن لەكاتێكا كە دوژمن هێرشی ئەهێنا بۆ سەركوردستان..شەكیب هەردەم دژی خۆپەرستیو هەل پەرستیو كردەوەی سەرشۆڕی بووە، ئاواتی تا مردن ڕزگاری كوردستانو

---

[iv] لەكاتی نوسینەوەی ئەم باسەدا سەرم لەمامۆستا(علاء الدین سجادی) داوەو چەند سەرنجو تێبینیەكی بەكەڵكی دامێ بەتایبەتی تا ساڵی(١٩٣٦)كە زۆر ئاگاداری ژیانی شەكیب بووە.

نەمانی زوڵم و زۆر بوو، پارتی بە پێشڕەوێکی شارەزا ئەزانی بۆ ئامانج و ئاواتی میللەتی کورد.

بارزانی بەسەرکردەو ڕۆڵەیەکی سەربەرزو لێهاتوو ئەزانی بۆ ئەمڕۆو دواڕۆژی جوڵانەوەی کوردایەتی. پێشمەرگەی بەچاوی هەموو کوردێکی دڵسۆز ئەزانی لەبینگەی قەڵەولی تفەنگی ئەوانەوە ڕزگاری کوردستانی بەدیئەکرد داخوازی لەهەموو گەنجێکی کورد بەتایبەتی خوێندەواران ئەوەبوو، کە تا مردن لەگەڵ نەتەوەی کوردو شۆڕشی ڕزگاریخوازیماندا پاکوئیشکەرو دڵسۆزبن و، پایەو پارە هەڵیان نەخەڵەتێنێ و فەرامۆشی دابڕینی میللەتی کورد نەکەن.

(شەکیب) سەرەڕای ئەم هەموو شتانە خاوەنی کتێبخانەیەکی پۆشتەو دەوڵەمەند بوو. لەناو کتێبخانە ئاوەدانەکانی کوردیدا لەڕوی دەستنووس و کتێبی بەکەڵکی کوردی و فارسی و عەرەبیەوە... شەکیب وەکو من ئاگاداریم لەساڵی (١٩٧١)دا داوای لەئەندامێکی (یەکێتیی‌نوسەرانی‌کورد) کرد کە ئیستیمارەی بۆ بنێرێ بۆ ئەوەی ببێتە ئەندام لەیەکێتیدا بەلام بەداخەوە ئەو ئەندامە خواستەکەی شەکیبی خستە پشت گوێی و ناوی نەچووە ناو ڕیزی ئەندامانی یەکێتی نوسەرانەوە، لەکۆتاییدا ئەڵێم خۆزگە..

*[*]شەرەفی ئەندامێتی یەکێتی نوسەرانی کورد دوای مردنیش ئەدرا بەشەکیب.

*هەوڵی کۆکردنەوەی دیوان و بەرهەمەکانی ئەدراو لە دانە چیڕەی مشکوتۆزوخۆڵی ناو تاق و ژوورەکان ڕزگاریان ئەبوو.

*کتێبخانەکەی دەستەیەکی شارەزاو پسپۆڕ سەیریان ئەکردو نەئەبوو بەخۆراکی ئاگر.

*لەبیرەوەری ساڵانەیدا یادێکی ئەکرایەوە لە کۆڕێکی ئەدەبیداو دەنگە تۆمار کراوەکەشی کە لەئەرشیفی کۆڕی زانیاری کوردە لێئەدرایەوە..

---

[*] ئەم نوسینە لە ژمارە ١٦ی ساڵی دووەمی گۆڤاری ڕۆژی کوردستاندا لەساڵی ١٩٧٣دا بلاوکراوەتەوە. بەناوی محەمەد عەبدولکەریم بەرزنجی

خوێنـدەواری ئـازیز بـا ئـەم باسـەمان بچـێتە سـەر سـامانی نەتەوایـەتیمانو بەچاکی کەڵك بگەیەنیٚو پەیڕەو بکرێتو بیٚکەڵكو پواوەکەشی لەجێگای خۆیدا دابنریٚ نەك دەریای بۆ رابکێشینو فڕێی دەینە ناوی.

چیرۆك

# "دیمەنێکی ترشاو.."

قەزای حەی سالی١٩٧٨

ئەو رۆژەش وەکو هەموو رۆژەکانی تر کەوتمەوە سەر شەقامەکەی رۆژانە تیایا شەکەت دەبووم دەوارێکیڕەشی خۆلاوی چاوی دووکانەکانی سەر شەقامەکەی داپۆشیبوو. هەندێ لە دووکاندارەکان خەو بردبوونیەوە، هەندێکیشیان خەریکبوون بەنانو ماستاو برسێتیان لەبیری خۆیان ئەبردەوە..بەر دوکانەکان چۆلبوون..ناحەقیان نەبوو..تەنها چایخانەکان جمەیان دەهات..لەگەڵ هەموو هەنگاوێکما بەهێمنی کونو قوژبنی ئەم سەرو ئەوسەری شەقامەکەم بەتیژایی چاوەکانم ئەکێلا...

چایخانەکەی(سەید شاکر)بووبوو بەلانەی حەوانەوەی ئێوارانو شەوانمان. بەرەو چایخانەکە لامدا..سەرمکرد بەژوورا..هەلاوێکی گەرمی خنکاو شالاوی بەخێرهاتنی بۆ هێنام..فەلاحی شاگردی چایخانەکە، بەپەنجە ڕێنوێنی شوێنی دانیشتنمی کرد...بەلێ لەگەڵ پەنجەکەی ئەودا وەکو دارپواز خۆم ترنجاندە نێوانی دەسکی کورسیو زەلامێکەوە.

کابرا بەمۆڕەیەکەوە تفی بەخێرهاتنێکی ساردی بۆ فرێدام..هێشتا بەتەواوی دانەنیشتبوم..فەلاح لەگەڵ بەخێرهاتندا تەق چایەکی بۆدانام..بانگیکرد..عەلاوی..عەلاوی ئاو بۆ ئێرە..تەقەی زاری تاولیو شەقەی پولی دۆمینە جیهانێکی پڕ ئاژاوەی لەناخی مێشکی هەموو دانیشتواندا ئەزرنگاندەوە..

دووشەشێکی دا بەسەر مێزەکەدا..وتی یاریبکە..دەزانیت ئەمڕۆش لەنێوانی تیپی شارولادێدا یارییە؟ بزانین..کێ ئەیباتەوە. خوائەیزانێ کامیان کاسی سەرکەوتن ئەکاتە چەپکە گولی دەستی..سەیرە..یارییە یان یاری نییە، کەیفی خۆیانە..ئێمە نەگۆلچینو نەیاریکەرین..نەسەیرکەریشین..چیمان

بەسەرەوەیە..هەرلایەکیان گۆلیانکرد چەپلەی خۆمان بەقاچ لێئەدەین. دۆمینە..دەستان دانێن..ئا هەندێ ئاو بێنە. بەبێ ئەوەی داوابکەن چوار چایتر..تەق لەسەر مێزەکەیان ریز کرایەوە..داوامان نەکردووە، دووجاریاریتان کردووە، لەسێبەری دارا دانەنیشتون. بەدڵتان نییە فەرموون خەڵکیتر چاوەڕوانە...دەتوانن بێ دڵگرانی دۆمینەکە دانێن و خواتان لەگەڵ...

یەك سەیری یەکیانکردو وتیان ئەمەش مۆدێلێکی تازەیە..حەقیانە..ساڵان دووچابە دەفلس بوو، خوا خوایان بوو سەر بەچایخانەکەیاندا بکەیت..ئاوی سارد، جار لەگەڵ جار ساردتر ئەدرا بەدەم دانیشتوانەوە...دۆمینەش کەسانی خۆی هەبوو..هەموو هەرچی و پەرچییەك پولی دۆمینەی نەئەناسی..لە بەیانیەوە تانیوەڕۆ پولت بدایە بەسەر مێزدا، کێ لێی ئەپرسیت..سەیرە کاروا بڕوات..چایخانەیەك جێگای چەند کتێبخانەو قوتابخانە ئەگرێتەوە.

بەتوڕەیی و بەهەموو هێزیان پولەکانیان بەسەر مێزەکەدا داو مێزوکورسیەکانیان بەجێهێشت...

بۆیاخ..بۆیاخ..قۆندەرەکانت بۆیاخ کەم..؟بۆتۆ..تۆ..تۆ..ئەی تۆ..؟باشی بۆیاخ ئەکەیت؟بۆیاخێکت بۆ ئەکەم لەژیانی قۆندەرە لەپێکردنتا بۆیاخی وات بۆنەکرابێ...ئەوەنەعل..زوو بۆم بهێنەرەوە..بۆیاخ..بۆیاخ..بۆیاخ ناکەن..سەرمان مەیەشێنە..خۆمان بۆیاخچین..

لەوڵاتانی پێشکەوتوو، ئەم دیمەنانە نایەنە پێش چاو..جا ئەم دیمەنە کوا ناشرینە.. بڕۆ ئەگەر ئەتەوێت دیمەنی ئاڵۆزو ناشیرین ببینی..سەرێك لەبازاڕدە..ئەوکاتە دەزانیت..دیمەنەکان چۆنن..بەتایبەتی لەوکاتەی کە(پیاڵە)و(هێلکە)و(قاپی شووشە)و(دۆشاوی تەماتە) دابەش دەکرێت..پاڵە پەستۆی ژن و پیاو..یەك بەسەر یەکدا دەخات..ناشیرینترین دیمەنیش..داری یاساوڵ و چاودێری کەر بێ شەرمانە لەسەر پشتیان هەڵئەبەزێتەوە..

دکتۆر دۆمینەکەمان نەکەین، با باوکی حەیدەر بێت..دۆمینەکە داواکەن. منیش تا ئەوبەر دەچم.. تائێوە ئامادە دەبن دەگەڕێمەوە..ڕێگا کەن..ڕێگا..جەنابی دکتۆر هات..سەیر..سەیر ئەڵێی شارە مێرووڵەیەو، ئاو چۆتە کونیانەوە..هەموو دە دەقیقە نابێت چوومە ئەوبەر، کەسی لێ نەبوو..کوێرا..ئەم هەموو جانەوەرە کۆبوونەوە..مۆڵەتماننادەن..حەوانەوە

لەچـاوی ئەمانـە ئـەبینرێ...؟زۆرتـان هەیـە دەرمـان لـەجیاتی ئـاو ئەخۆنەوە..هەشتانە هیچی نییە هەر ئەیەوێت سەربەناخی خەستەخانەدابکات.

ئەمڕۆ ناتوانم کەس ببینم..پاس بڕەکە مۆڵەتەو لێرە نییە..منیش کاری پەلەم هەیەو دەڕۆم ژورەکەی بەجێهێشتو خۆی گەیاندەوە چایخانەکە..یاڵلا..ئەمڕۆ یارییەکەمان لەسەر چی بێت؟

–کیلۆیەك هەنار..

–نا کیلۆیەك هەنارو چاکان..

–باشە هەرکەس بردیەوە ئەوکەسە هەنارەکە بەش دەکات...

–فەرموو ئەوە قۆندەرەکانت.

–باشت بۆیاخکردووە، سەیربکە ئەڵێی ئاوێنەیە..سەری لەبەر دابێنە..

–چەند ئەکات.

–تازە ئەپرسێ چەند ئەکات..دیارە لێرە نەبویت، یان دەمێکە قۆندەرەت لە پێنەکردووەو بۆیاخت نەکردووە.

–پەنجا فلس زیاتر هەیە.

–چی..؟پەنجا فلس..؟بۆیاخێك بۆ بە پەنجا..؟

–بۆی ناوێت..لەمن مەپرسەو رایمکە..بافریای جووتێکیتر بکەوم..

–ئەمەش جۆرێکە لەڕوتانەوە..

–زۆرم لێنەکردییت..ئەگەر بەزۆری دەزانیتو لەدەستت نابێتەوە..پێویست نییە..خەڵکی رۆژانە بەئاشکرا گیرفانی خەڵکی هەژار دەبڕن. کەس نایبینێو قسەناکات.. ئێمە بەشانو دەستی خۆمان، قۆندەرە بۆیاخدەکەین..پێڵاو پاکدەکەینەوە..کەچی بەچاوی جەردەو ڕێگر سەیرمان دەکەن!؟

–نەعلەکانی هەڵگرتو رۆیشت..ئەمە خۆشە..هەشت سەرخێزانت بەملەوەبێت...لەمەلا بانگدانەوە، تابانگی شێوان شانو قوڵ بکوتە..ئینجا بەحاڵەحاڵو هەزار ناوی خواو ناوی عەلی..بەشی ژیانێکی کولەمەرگیان بۆ پەیدا بکە.. سەعاتێ قۆندەرە لە قوڕو پیسی پاککەرەوە، فلچەی لێدەوبەمدیوئەودیویا بێ..کەچی بۆ داوای حەقی خۆت کە پەنجا فلسە..بەچاوی جەردە سەیر بکرێیت.!!

ئاخر پەنجا فلسەکە دەسکێ تورو دوو دەسك کەوەر ناکات.خوایە..ئەمەش پێی دەوترێت ژیان؟..ئەمە نان پەیداکردنە..؟

—نەعلەکانی خستە ژێر باڵی بۆیاخ..بۆیاخ..بۆیاخ بە پەنجا فلس

—دووشەش لەدەستما تۆپیوە..دۆمینەکە هی ئەوانە.

—بیستان دوێنێ چ روداوێکی ناخۆش رویداوە..؟

—چی..؟رویداوەچی..؟نەمبیستووە..

—چی...؟منیش نەمبیستووە.

—چی..؟رویداوە..ئادەی بۆمانبگێڕەوە..

—دوێنـــێ ژنێـــك زەمیلەیـــەکی پـــڕ لەســـەوزەی لەبـــەردەمی دوکانی(ئەبوجەعفەردا)داناوەو، لێیداوە رۆیشتووە..بەئەبو جەعفەری وتووە تۆزێکی تر دەگەڕێمەوە.

—ئێ..دەی..دەی دوبارەی کەرەوە...!!

—ئەبوجەعفـەر...هـەر چـاوەڕوانی ژنـە دەکـات بێتـەوەو زەمیلەکـەی بباتەوە..دیار نابێت..کاتێ دەیەوێت دوکانەکە دابخات..سەیرێکی زەمیلەکە دەکات..دەبینێت لاشەی منداڵێکی بەلەتو پەتکراوی تیایەو سەرەکەی بەچەند چەپکە کەوروسەوزە داپۆشراوە.

—روداوێکی سەیرو سامناکە..

—ئێ دوایی..!

—خـەڵکی گـوزەری بازاڕەکـەی لەسـەر کۆدەبنـەوە.. بـەپێش چـاوی هەموانەوە..پۆلیسێکی مەدەنی یەکە یەکە پارچەکانی لەشی ئەو منداڵە دەر دێنێ..

—وەکـو بـاس دەکـەن..یـەکێ دەڵێـت. ژنەکـە کـچ بـووە، کەسێك..سکی پڕکردووە..واتە منداڵەکە زۆڵ بووە..

یەکێ تر دەڵێت ژنەکە رقی لەمێردەکەی هەستاوەو منداڵەکەی لەداخی باوکی والێکردووە..یەکێ دەڵێت لەسەر ئەوەی لە کۆڵاندا..شەڕە ژن بووەو ژنێك منداڵی ژنەکەی تری لەداخا والێکردووە..بەکورتی..قسەی زۆر دەکرێت.

—دوێنێ رووداوێکی تر روویداوە..دیارە نەتان بیستووە..؟

-نا دوێنێ نا پێرێ.. ئا پێرێ..زیاتر له چل پەنجا ئۆتۆمۆبیل، جەنازەیەکیان لەسەر یەکێك لە ئۆتۆمبیلەکان دابەستووە، یەك بەدوای یەکدا بەنا و هەموو شاردا سوڕاونەتەوە..بەهۆڕین لێدان گوێی خەڵکی شاریان کەڕ کردووە.

-ئێ..دوایی..!

-کوڕە تابوتەکە جەنازەی تێدا نەبووە..لەداخداو بۆسەیر ئەو شۆفێرانە وایانکردووە..

-کوڕینە ئەمە هێشتا باشترە لەوەی هەفتەی رابردوو..

-چۆن..؟هەفتەی رابردوو چی بووە..؟.

-دوای ئاهەنگی رۆژی چوارشەممە..لەسەر کچە سەماکەرەکەی کە بۆ ئاهەنگەکە هێناویانە، ئەبو محەمەدو ئەبو حەیدەر قسەیان لەیەك هەڵبەزیوەتەوە، پەلاماری یەکتریان داوە...ئەبوحەمەمەد لە کاتژمێری دووی شەودا بەحەربەی چەکەکەی سنجوقێنی لە مێشکی ئەبوحەیدەر کردووە.

-لەو رۆژەوە بۆ حەربەکە دەگەڕێن نایدۆزنەوە...

-ئەبو حەیدەر کوژرا..؟..خۆ کەس بەهیچی نەدەزانی..

-جا ئەوانەش پێیان دەوترێت پیاو..لەسەر ژنێکی سۆزانی وا بەخۆیان بکەن...

-کوڕە ئەوە دەڵێیت چی..هەموان..لە ئەبو محەمەدو ئەبو حەیدەر گەڵێ خراپترن..

-ئێستا ئەبو محەمەدو ئەبو حەیدەر کوژرا..؟

-نا ئەڵێن ماوە..بەڵام توشی شەلەلی مێشك بووە، بەپێی راپۆرتی پزیشکەکان چاك نابێتەوە..

-ئەی ئەبو محەمەد..

-چەند رۆژ خۆی شاردۆتەوە..ئێستا دەڵێن خۆیداوە بەدەست پۆلیسەوەو بەندە...

-وەکودەگێڕنەوە..دەڵێن..ژن و منداڵی هەردوکیان..لەداخی ڕەفتارەکەیان بەتوخنی هیچیاندا ناچن..

-کوڕینە ئەمانە هەمووی بەلایەك..بەڕێوەبەری قوتابخانەی ناوەندی..کچان و ماموستا نەجمی هەتیو بازە...

–چۆن ئێستا ئەو بەڕێوەبەرە...؟

–بەڵێ..وا ساڵێکە..!

–بەخوا جوانە.!.نەوەی نوێ باش پەروەردە دەبێت.!

–کوڕە سەیر لەوەدایە...بەڕێوەبەری کچانیشە...ئەمە لەهەموی خۆشترە..

–ئەی ئەوەتان زانیوە..جەمعیەی هەرەوەزی..لەئەنجامی فرە کوێخایی..زیانی زۆریانکردووەو زۆر قەرزار بوون، بڕیاریانداوە کە گازینۆیەك بۆ خواردنەوە بکەنەوە، تا ئەو قەرزە پڕبکەنەوە..

–کارێکی خۆشە..ئەمەیە دەڵێن بە مازوان تێشکاون بەسێچکان هەڵدەستنەوە..

–هەستن..بابڕۆین ئەمە شارە..ئەمە وڵاتە..وەکو ناو ئەم چایخانەیەیە کەس بەکەس نییە.

چیرۆك

# ( ژانەکانی هەنگە ژاڵ )

**قەزای حەی ساڵی ١٩٧٩**

منداڵ بووم، منداڵان هەموو جارێ باسی هەنگە ژاڵیان دەکرد. منیش نەمئەزانی هەنگە ژاڵ چییە، ئەوەندەم دەزانی که هەنگ به منداڵەوە ئەدات. هەر که لەیاری دەگەڕامەوە، باوەشم بەملی دایکما ئەکرد، دەستمئەکرد بەملاوئەولا ماچکردنی، ئەموت دایە توخوا پێم بڵێ هەنگە ژاڵ چییە؟ چی تێدایە؟ دایکم ماچێکی ئەکردمو ئەیوت کوڕی شیرینم تۆ چیت بەسەر ئەم پرسیارەوە داوە؟کێ پێی وتویت هەنگە ژاڵ هەیە؟ دایە ڕۆژنییە منداڵان باسی نەکەنو گۆرانی پیادا نەڵێن: ئەڵێن هەنگە ژاڵ وا بەکێوی دەربەند چۆلەکەوە، ئەوەندە هەنگوینی تێدایە ئەگەر دەربهێنرێ هەرچی خەڵکی ئەم دەوروبەرەهەیە تێریدەکات.

دایکم سەرێکی راوەشاندو ماچێکی تری کردمو وتی: ڕۆڵەی خۆشەویستم ئەو قسانە قسەی منداڵی لاسارو هاروهاجە. گوێ بۆقسەیان مەگرە کوڕم نەکەی بەقسەی ئەومنداڵانە هەڵخەڵتێیتو لە خشتەت بەرنو لەگەڵیان بڕۆیت. هەنگە ژاڵ شاری هەنگانە، لەدێر زەمانەوە هەیە، بەهەزاران هەزار شارە هەنگی تێدایە شوێنێکی ئەوەندە سەختو هەڵدێری وایە هیچ کەسێك نەیتوانیوەو ناتوانێ لێی نزیك ببێتەوە. لەوشاخی دەربەند چۆلەکەیەدایە، بەزەردەو کاوەیەکەوە کەئەگەر لەبنییەوە بۆی بڕوانیت کڵاوت لەسەر بەردەبێتەوە، گەر لەسەریشەوە سەیری خوارەوە بکەیت چاوت بە گێژەوە ئەچێت. لەوانەیە لەسەر سەر بەرببیتە خوارەوە، وە هەرکەسێکیش لەبەر کونەکەیان نزیك ببێتەوە بەدەردێکی دەبەن با بەدەواری شرینەکردبێ.کوڕم ئێمەش کەمنداڵ بووین باسی ئەم هەنگە ژاڵە هەر هەبوو. منیش وەکو تۆ کچەکانی دەستە خوشکم بۆیان باس دەکردمو ئەیان وت ئەگێڕنەوە تا ئێستا بەهەزاران کەس بەگوریس بۆ ئەم هەنگە ژاڵە شۆڕ کراوەتەوە. بەڵام هیچیان قامکیان لەهەنگوین رانەهاویشتووە، لەوانەشی کە شۆڕکراونەتەوە. من خۆم بەبیرم دێو هیچ دوور نەڕۆین(مام هۆمەرە شەلو

قارەمانە دەسکۆل‌وقالە پشت شکاو نابینی کە ئێستا ماون. ئەمانە هەمووی لەپای هەنگوینی هەنگەژاڵدا بەودەردەیانەوە ئەتلێنەوە. خۆ کزەی جوامێری کوڕی مام پیرۆتم هەر لەدڵ دەر نەچێ، ئەو جوانە مەرگە وەکو تۆ منداڵ بوو. لەگەڵ منداڵانی دێدا سەریاننابۆوەو بەشاخەکەدا هەڵگەڕابوون، چووبوونە سەر شاخی هەنگەژاڵو خۆیشۆڕکردبۆوە بۆئەوەی سەیری شاری هەنگە ژاڵ بکات. لەو شاخە بەرزەوە بەسەردا بەربووەوەو کەوتبووە خوارەوە هەپرون بەهەپرون بووبوو. دایکی کوێربێ ئێستا ئەوکزەیەم لەدڵ دەرناچێ ڕۆژێ هات بۆ زاخو نەمان بوو بیدەمێ. ئێسك‌و پروسکیان لەتورەکەدا کۆکردەوەو هێنایانەوە. کوڕم دەخیل سەد دەخیل جەرگم بەتەنوورەوە نەدەیت‌و نەکەی بەقسەی کوڕوکاڵ فریوبخۆیت‌و خۆت لەقەرەی هەنگە ژاڵ‌و شاخی هەنگە ژاڵ بدەیت. ناوی خۆی بەخۆیەوەیەتی..

ڕۆژو شەو هات‌و ساڵ بەدوای ساڵدا ملی ناو منیش گەورە بووم دەس‌و دەمی خۆمناسی، کۆمەڵێ لەو منداڵانەی کە هاوڕێی منداڵیم بوون، هەر باسی هەنگە ژاڵیان بۆ ئەکردم لەوێدا نەمان‌و ون بوون پاش ماوەیەك پەیدابوونەوە، لەگەڵ خۆیاندا کۆمەڵێ خەڵکیان هێنابوو، کە نەشاخ‌و نەدار بەڕوو نە بەفرو نەهەنگیان نەدیبوو. هاتن بۆلام وتیان ئەزانیت دەمانەوێت هەنگوینی هەنگە ژاڵ دەربێنین. وتم جا بەچی‌وچۆن؟ وتیان ئا ئەم کوڕە ڕەش ئەسمەرانای کە ئەیان بینی هەموو شارەزاو پسپۆڕن لەڕەوشتی هەنگ‌و جۆری هەنگویندا. ئێمە هەر ئەوەندە ڕێبەرێتیان بکەین ئیتر خۆیان ئەزانن چۆنی دەر دێنن..وتم براکانم ئێوە بەهەڵەدا چوون ئەگەر ئەم خۆ ونکردنەتان بۆ ئەمە بووبێ مایەتان پوچە.

باو باپیرانی ئێمە ئەگەر لەدەسەلاتیاندا بوایە خۆیان دەریاندەهێنا، ئەگەر بیانزانیایە بەکەسانێ وەکو ئەمانە هەنگوینی هەنگە ژاڵ دەخۆن، زۆر لەمێژێ بو شاخ‌و داخی هەنگە ژاڵ بەتوورەکە بێژرابۆوە. ئەمانە یەکەم لە خەڵکی ئەم وولاتە ناچن. دووەم تۆ خۆت خەڵکی ولاتەکەی پەی پێنابەیت خۆت یەکێکی نەشارەزا تۆیی پیشان بدەیت ئەتوانێ هەنگوینی هەنگە ژاڵمان دەرخوارد بدات؟

وتیان کاکە تۆ بەهەڵەدا چویت ئەمانە خاوەنی پارەو سامانی زۆرن. بەلایانەوە گرنگ نییە، بە فەردە پارە بسوتێنن لەپێناوی یەك بەرە هەنگویندا. یەکی نادوان دە هەزار دەنێرن...وتم ئەمەی ئێوە دەیڵێن هەنگوین بۆ ئێوە

دەرناهێنن، لەژێر باڵو ڕێو شوێنی ئێوەدا هەنگوینی هەنگە ژاڵ بۆ خۆیان دەردێنن.

بەچنگی شکاوی براکانی ئێمە هەنگوینی چەند ساڵەی هەنگەژاڵ بۆ گەرووی خۆیان دەردێنن.

وتیان تۆ چونکە هێشتا لەم گوندە دوور نەکەوتویتەوە، شارو کەست نەدیوە، وائەزانی جیهان لە چوار دەوری ئەم گوندەدا دەسوڕێتەوە. ئێمە چوینەتە شارو خەڵكوخوامان دیوە، ئەزانین چی هەیەو لەم جیهانەدا. ئێمە دەست بەکاری خۆمان ئەکەین تۆش کەیفی خۆتە.ئەگەر لەگەڵمان بێیت زیاننناکەیت.

منیش وتم لەگەڵتان نابمو کارەکەشتان بەکارێکی ناپەسەند ئەزانم، ملی خۆتانو کۆمەڵێ خەڵکی ساویلکەی تیادا ئەشکێوپریشکیشتان ئێمە پیس دەکات.

کەوتنە فرتو ورت بەیەکاهاتنو بەیەکا چوونو خەڵکی زۆریان لەخۆیان کۆکردەوە. هەمووڕۆژێ لەژێرچاودێری یەکێك لەو پسپۆڕانەکۆمەڵێ خەڵکیان بەگژ هەنگەکانی شاخی هەنگە ژاڵدا ئەکرد. لە هەر پەلامار ێکیاندا کۆمەڵێ کوڕوکاڵی بەپارە چاو بەستە کراو قاچو دەستو پشتیان ئەشکا. هەنگە بزنەکانیش هەرکە ئەئاڵۆسکان. لەسەروملی کابرای کە لە دوور لەسەر بەرزاییەك دائەنیشتو بەدوربین سەیریئەکرد. ئەئاڵانەسەریو ئەیاندا بەسەریەوەو سەریان دەئاوساندو یەکێك تر دەهاتە جێ.. ئەوەندە تاویان لەوشاخەدا زەردەواڵەو زەردە زیڕە کە هەردەم لەپای هەنگ بوون بۆ هەنگوینی بڕیاریانداو، لەگەڵهەنگدا بوون بەیەك. ئەوان وەکو هەنگ نەبوون، کە بەهەر کەسەوە بدەن خۆیان بمرن... ئاو خۆریش نەبوون ژاریان کاریگەر نەبێت.. هەموو لەو دەربەندەدا پورەیاندا هەرکە سووسەی ئەمانەیاندەکرد کە بەنیازن. بێنەسەر هەنگەژاڵ ئەئاڵۆسکانو هەرکەسیان بدیایە تێی ئەئاڵانو ئەوەندەیان چزلەسەر چاوو دەمو گوێو لوتیان هەڵئەچەقاند وەکو هێزرە دەئاوساو لەبەردەمی شاخەدا وەك تەراڵ لێیئەکەوت..

تا ئەوانەی هێنابویانن وەرس بوونو پارەیان بۆ دۆستەکانیان جێهێشتو کارەکەیان بەوان سپارد، ئیتر وا لەو ڕۆژەوە پارە لەباخەڵی ئەوانە دەرئەچێو لاشەی ئەمانی پێ ئەشاردرێتەوە، بە ئومێدی هەنگوینی هەنگە ژاڵ.

دایکیشم ئێستا هەمووجارێ پێم ئەڵێ کوڕم پێم نەوتی خۆت لەقەرەی هەنگە ژاڵ نەدەی. خۆ بەچاوی خۆت بینیت ئەوانەی چاویان لەهەنگە ژاڵ بڕیبوو، چییان بەسەر هاتو هەنگەژاڵیش هەر وەکو نەبای دیبێ نەباران هەر لەشوێنی خۆیەتی گەرووی زیاتر ناخی شاخ ئەهەژێنێ.

چیرۆك

# ((بەڵێن...))

قەزای حەی ١٩٧٦

بەڵێنیان پێدان، ئەگەر بێنەوە، بەرماڵەکەی خۆیان بکەنەوە بەپیاز...بەدڵ خۆشی‌یەوە کەل‌وپەلەکانیان پێ چایەوە.. کاروان کە لەتەمەنی شەش سالاندا بوو رووی کردە باوکی وتی باوکە ئەم جارە کۆچ بەرەو کوی ئەکەینەوە...؟..ئەوشوێنەی بۆی ئەچین هەر بەدەسەنە نانمان بۆ دێنن..؟

کەمێك راماو سەیرێکی کاروانی کرد کەخەریکی کۆلارە دروست کردن بوو چاوێکی لە فرمێسکەکانی ئاسکۆڵی ژنی بڕیو وتی کوڕی شیرینم کۆچ‌وباری ئەمجارە بۆ ئەوەیە کە لەدەسەنەیی سەرفرازببین...دوێنێ ئەو کۆمەڵەت نەدی کە مەلایەکی سەرسپی و ژنێکییان لەگەڵدا بوو...؟

کاروان وتی ئەوەی مێزەرێ سپی‌و فێستێکی سووری لەسەردا بوو..؟!

ئا..کوڕم..ئەوانە بەڵێنییان پێ داوین..کە بچینەوە ناو خانووەکانی خۆمان..لەوێ ئەکەوینەوە سەر رەنجی شانی خۆمان...

کاروان بەدەم بەکرە بەستنی کۆلارەکەیەوە هەناسەیەکی دوو دڵی هەڵکێشاو وتی جا خانووەکەمان ماوە...؟خۆ لەپایزدا هەموو دێکە سووتا..!

کوڕە خۆشەویستەکەم خانووە کانمان راستە سووتاوە. بەڵام هەر دارو بەرد زۆرە..کردنەوەیان خوا یاربێت ئاسانە.. کەچووینەوە بەراوەکانی خۆمانتان بۆ ئەکەم بە تووتن‌و تەماتەو مەرەزەو کە پرتکیتان لەسەری بۆ ئەبەستم‌و ئێوە پێیانەوە خەریك بن. منیش خەریکی کردنەوەی خانووەکان ئەبم.

لەم قسانەدا بوون‌و کاروانیش کەوتبووە هەڵدانی کۆلارەکەی..لەپڕ پیان راگەیاندن ئەوەی بۆ ئەودیو ئەڕواتەوە کەل‌وپەلەکانی لە لێواری خیابانەکە ئامادە بکات. ئێستا ماشێن دێت..ئەوەش چراوبەتانی‌وشتی تری ئێرەی لایە جیا بەجیا دایان بنێن میرزا لێنان وەرگرێتەوە سەرەتایی ماشێن دەرکەوت..خەڵکە کە کەوتنە پەلەوبە یەکاهاتنی چوارپێنج دار بەدەست بەچەند دارێ ئاگاداری کردنەوە کە پەلەی ناوێت بەرێز ماشێن ماشێن پڕ ئەکرێت‌و ئەڕوات. سیارەکان..بەرودوا پڕبوون...پێش ئەوەی سەیارەکان بکەونە

ڕێ..شەبقەلەسەرێك هات وتی گوێ بگرن..كەس بەخراپە باسی ئێمە نەكات..ئێستاش هەر كەس نایەوێت بڕواتەوە ئێمە ئامادەین لەسەر سەرمان بەخێوی بكەین..

لە گەرمەی ئیش و گریانی راوەستاو سواردا شەستە بارانێكی تف و بەڵغەم رووی كردە شەبقە بۆر..برووسكەی ئێوە بوو پوازی كارەساتی ئێمە..ئێوە بوون.. سەیارەكان كەوتنەڕێ و زایەڵەی گریانی بی سەروشوێن دەنگی سەیارەكانی كپ كرد.

كاروان كۆلارەكەی بەدەستەوە بوو ویستی لەناو سەیارەكەدا هەڵی بدات، گیربوو لە سەیارەیەكی ترو پچڕا..دەستی بەگەریان كرد خۆزگا هەر لە شوێنی خۆمان بووینایەوكۆلارەكەم وای لێ نەهاتایە...چەند رۆژە خەریكم تا دروستم كرد..ئاخر چاو لە سواری سەیارە وایە ئەگەر سواری سەیارە نەبووینایەو بەپێ بڕۆیشتینایە تووشی ئەم كۆچە نەبووینایە كۆلارەكەی منیش نەئەپچڕا.. تەماشاكەران لەهەموو دێیەكانی سەر ڕێ هاتبوونەدەرەوە چاوی نیگەرانی و ئاوارەیێ ئەو خەڵكەیان بەفرمێسك بەرێ ئەكرد..پیرە ژنێك هاتە بەرسەیارە كان و مەجبووری وەستانی كردن..قیژانی ووتی پیاوەكان پیاوەكان، خوا رووڕەشی هەردوو دنیاتان بكات، ژیانتان ئەمەی ئەهێنا ئێوە وا ئەم كیژۆڵەو كۆرپە نازدارانەتان خستەوەبەر چەقۆی دوو گەلە گورگی برسی بەخۆین گۆشت و ئێسقانیان..بەسەر بەرزی بمردینایە باشترنەبوو لەوەی كە بەم شێوەو بەسەر شۆڕیتان خۆتان خاكی خوتان هێنا، ژەندرمەیەك پەلی گرت تا هێزی تیادابوو پالێكی پێوەناو لەسەر ڕێوبانەكە دووری خستەوەوتی سەیری عومری مەڕەلاتێكی ماوە داوای فیرعەونی ئەكات (منداڵێكی خرپنەوچاوگەشی قیژانی و هاواری كرد كاكی چریك ئەو سەربازانە خەڵكی وڵاتی ئێمە نین....

وسبە هەتیو ئێستا لوولەی تفەنگەكانمان لێوی یەكتر ماچ مەكەن)..

چیرۆك

# قوتابیو جەندرمە

سلێمانی ١٩٦٧

وا دێتەوە بیرم ئەو بەیانیە بەڵێندەرەکەمان پێ خۆری بۆ نەهێنابووین، هەر چاوەڕوانمان ئەکرد، تەواو درەنگ بوو بۆیە هەرکەس لەئاستی خۆیی دەستی کرد بەنان‌وچایی خواردن کتێبەکانم هەڵگرت‌و، بەرەو قوتابخانە کەوتمەرێ، لەرێگا بومە هاوڕێی چەن قوتابیەکی تری رێی قوتابخانە..

چۆڕاوگەی کۆڵانەکان لافاوی شەقامەکەی هەڵساندبوو بەبەیەکاهاتنی کچ‌وکوڕ شەپۆلی گەورە گەورەی دروست ئەکرد...پەلەکردن بۆ فریاکەوتن وانەی یەکەم خێراییەکی تەواوی دابوو بە دواشەپۆلی قوتابیەکان، دواچۆڕەکەش ئێمە بووین..یەشتا دواشەپۆلی قوتابیەکان لەسەر شەقامەکە بوون تەقە لەدەوروبەری شار دەستی پێکرد..

زەنگ لەلێداندابوو، هەر قوتابیە چووە پۆلی خۆی مامۆستاکان دابەش بوون‌و خۆیان کردبە ژوورەکاندا، تەقە تاهات زیادی کرد، بەرەبەرە ناوشاریشی گرتەوە، دەنگی ریزی کلەشینکۆف وەکو پریشکە ئەیدا بەدەمیەوە گیزو وڕی گوللەو زەلە زەلی ناوشار تەواو سەرنجی بۆ پەنجەرەکان راکێشا. مامۆستا کەشمان لەگەڵ ئێمەدا چاوی برێیە پەنجەرەو چاوەڕوانی دوای هاتنی تەقەی دەکرد..جار جارەش دەیویست کچان. بکاتەوە ئەویش وانەکەی خۆی بڵێتەوە...بەلام زیرە زیری زنجیری دەبابەو دەنگی دۆشکە تەواو پۆلەکەمانی شڵەژاند، بەڕێوەبەرهاتە بەرپۆلەکەمان‌و وتی کەس دەرنەچێت، سەرەتاتکێ لەپەنجەرەکانەوە مەکەن لەسەرخۆبن، با کۆرپەی کەس زیان نەهێنێ مەشترسن ئەمە یەکەم جار نییە وا لەناو شارو دەوروبەری قوتابخانەکەمان تەقە ئەکرێت، یەشتا وانەکەمان تەواونەبوو بوو، لەبەرێوەبەرەوە نووسراوێك هات کە باقوتابیان بەربدەن‌و بڕۆنەوە:-مامۆستا وتی..کورەکانم لەشەقامەکانەوە مەڕۆن، رامەکەن‌و خۆتان مەشڵەژێنن لەرێگا مەوەستن ئێمە کەئیزنتان ئەدەین بۆ ماڵەوەتان ئیزن ئەدەین ئاگاداری خۆتان بن چونکە ئێستا دایك‌وباوکتان دڵیان لەپەژارەدایە.

کۆمەڵ کۆمەڵ قوتابیی دەرچوون بۆ سەر شەقامەکان هەموومان رژاینە سەر شەقامەکان و کۆمەل کۆمەل بلاوەمان کرد بە کۆڵانەکاندا، تەقەگەرمتر ئەبوولەسەری کۆڵانەکەمان (٣)سەربازمان تووش بوو لوولەی میلی کلاشینکۆفەکانیان تێکردین و، وتیان خوێڕی بوەستن بوەستن. یەشتا لەشوێنی خۆمان دانەمرکابووینەوە، سەروزلەمان خوارد، نەخێر قۆنداغی کلاشینکۆف ئاراستەی ناوشان و سەر سنگمانکرا..

ئەوەندە هاتینە زمان وتمان قوتابین ئەوە کتێبەکانمان بۆ ماڵەوە ئەرۆینەوە....کوا هەویەکانتان کێ بوو ئەمشەو قومبەلەی فرێدایە مالی بەرێوەبەری ئاسایشەوە.. منداڵێکیان مردوە ئەبێت سەدتان لێ بکوژین..خۆم گورج کردەوەو رووم تێکردن ئێمە قوتابین لەبەشی ناوخۆبین و هیچ نین ئەتوانن بۆ راستی قسەم پرسیار لەبەرێوەبەری بەشی ناوخۆیی بکەن. سەربازە بێ خەتەکە دەستی بە بەپەلپیتکەی تفەنگەکەیەوە بوو ئاراستەی سنگی هاوەڵەکەمی کردو، وتی تۆبۆ نقەت لەخۆت بڕیوە..نەگەیشتە ئەوەی وەڵام بداتەوە بەریزێ کلاشینکۆف ناوسکی ئاگرداو بە پشتاکەوت.

کەچاوم کەوت بەشێرکۆی هاوڕێم بوورامەوەکاتێ هۆشم هاتەوە وام لەخەستەخانەو دایکم بەسەرمدا ئەگری..وتم دایە شیرکۆ ماوە یان شەهید بووە، وتی بەقوربانتبم جاکێ ماوە ئەمڕۆ(٢٤)قوتابی لەهاوڕێیەکانت کوژراون و(٣٢) قوتابیش بریندارە، کەسیش بەتەمای تۆ نەمابوو. ئەزانیت تۆش لەخوێنی شێرکۆی هاوڕێتا گەوزابووی..ئێستاش ئەوەم لەگوێدا ئەزرنگێتەوە کە دایکی شیرکۆ بەقوربان سامالی کوڕی ئەبوو، کە دووگوللەی پێوە بوو، لەگەڵ بەقوربانی ئەودا بەکوڵ ئەگریاو ئەی وت دایکت کوێربێت شێرکۆ..چەند بەئاواتی دانیشتگاوە بوویت....

چیرۆك

# راوەماسی و گوڵاڵە

سلێمانی ١٩٨٩

خـۆی و هـەر حـەوت منداڵەكـەی و ژنەكـەی و دایكی لەچـواردەوری تەباخـە یەكچاوەكە كۆبونەوە. چۆقەچۆقی دانیان ئەتوت كورسی گۆرانییەكی ناخۆشەو ژوورەكەیانی بە ئاوازێكی ناساز دەلاواندەوە.

لەبەر خۆیەوە وتی.حاڵمان بەم شێوەبێت و زستان والێمان هەڵپێچێ. ئەمساڵ منداڵەكان رەقدەبنەوە.. ژیان بەم حاڵە ناڕوات تاكەی دەم بەحەواوەبگرین..شەوو رۆژ بـەم شـێوە بەسـەر نابرێـت. روی كـردە خونچـەی خێزانـی وتـی كـوا تـۆڕی ماسییەكە...ئابڕۆ بـۆم بخـەرە گونیەكـەوەو یەكـدونانم بـۆ بپێچـەرەوە..سـەرێك ئەڕۆم و دەچم بۆ ئەو چەمە..بزانم چەندماسییەك ناگرم. خونچە وتی پیاوەكە بەم سەرمایە خوا غەزەبی لێگرتوویت بۆ كوێ ئەچیت؟

وتی ئافرەت..نەوتمان نییە..عەلادینمان نییە. دەچم بەشكم هەندێ ماسی بگرم و بیانهێنمە بازاڕو بیان فرۆشم بۆ ئەوەی نەوت وعەلادینی پێبكرم..خونچە وتـی پیاوەكـە رۆژەكـەی رۆژ نییـە. ساردەو رەشـەباكەی ئـەڵێی مووسـە سـەر ئەتاشێ.

وتی..بڕیارە داومەو ئەگەر رەقیش بمبمەوە هەر ئەچم..نانی بەستەپشت و گوێنی تورەكەیدا بەشانداو لەماڵ چووە دەرەوە...سەرماو رەشەباكە وابوو زۆر بەقورسی هەنگاوی بۆ ئەنرا..زۆر لەماڵی خۆیان دوور نەكەوتبۆوە...بەبیریاهات وتی باش وایە بچم تالە بانگكەم بزانم ئەویش نایەت. ئەورۆژە وتی نەوت و شەكرمان نییە یەكسەر لایداو چووە بەرماڵیان و لەدەرگایدا...تالە هات بەدەم دەرگاكەوە وتـی هـا كاكـە بلـە...خێـرە بـۆ كـوێ؟ وتـی نیـازی راوەماسیم هەیـە نایەیت؟ وتی جابەم سەرمایە راوەماسی دەكرێت؟ وتـی چارنییە..ئەمرۆ نەبێت ئێمە ماسیمان دەس ناكەوێت و بۆ ئێمە پارەناكات. تالە رازیبوو. چووە ژوورەوە نان و تفاقی هێناو بەچووتە شاریان بەجێهێشت و خۆیان گەیاندە سەرچەمەكە.

گۆمیـان دۆزیـەوەو کەوتنە تـۆڕ هەڵـدان... ماسـییەکی زۆریـانگرت لەخۆشـی ماسـی سـەرمایان بیرچـۆوە. تـانزیکی نیـوەڕۆ دووکـۆڵ ماسیان گـرتو دەسـتیان لەراو هەڵگرت. لەقەراغی چەمەکە ئاگرێکیانکردەوە بەشی خۆیان برژاندو خویان لێ مرکرد.. هەرلەوێ ماسییە گەورەکانیان لەماسییە بچووکەکان جیاکردەوە..بلـە بەتالـەی دەوت نـانی هـەبێ لـەم سوورەماسـیانەدایە...بـەخوا مەگـەر پـارەی ئـەم ماسییانە فریای منداڵەکانمان بکەوێت لەسەرمای ئەم زستانە دەربازیان کات.

ماسـییەکانیان کـردە دوو گوێنییـەوەو دایـان بەکۆڵیانـداو دوای نیـوەڕۆ گەیشـتنەوە شـار. ماسـییەکانیان بـردە بـازاڕ بـەنیازی ئـەوەی بیفرۆشن.هەردایاننا..چەندرمەکان دایان بەسەریاندا بەئارەزووی خۆیان چەند سوورەماسییەکی گەورەیان هەڵبژاردو بردیان..تالـەو وتـی چۆن بە پەلە ئەوەی خێـری تیـادابوو ماشـییانەوە. بـرا بـەخوا رەنجـی ئێمەیـەو بـردەی جەندرمەیـە. لـەماوەی چـەند سـەعاتێکدا ئـەوەی مـابوو فرۆشـتیانو پارەکـەیان وەکـوبرا بەشـکردو هەریەکـەیان دووعەلاگەشـتی بۆماڵـەوە کـڕیو بـەرەو ماڵـەکانیان گەڕانـەوە..بلـە..بەگەیشـتنی بـۆ بـەرماڵیان گـوێی لـەگریانبوو. بەپەلـە خـۆی بەژووورداکرد. خونچـە بەگریانـەوە پەلاماریـدا.. وتـی چووی بۆکـوێ..؟ نەموت مـەڕۆ..ئـەوە تاهاتیتـەوە..گوڵاڵـەی کچمان لەسەرماوبرسا رەقبـۆوەو دایکیشـت لەگیانەڵادایـە..بەومانـدوویی و چـۆخەی دانـەوە پـەلاماری گوڵاڵەیـداو گرتییـە باوەشیو بەسنگیەوە نووساندو کەوتە ماچکردنی ئەوەندەی ماچکرد تا ئەویش بوورایەوە.

چیرۆك

## (( كارۆوسلێمان بەگ ))

قەزای حەی /واسط

هاوینی ساڵی ١٩٧٧

لەبازاڕی شارە بچوکەکەدا، بەنەشارەزایی ئەخولایەوە، باقەیە سیکاردو چەند شانەیەکی داری بەدەستەوە بوو. بەپێ چاوی یەکەیەکەی خەڵکەکەی ماچ ئەکرد. بەنیازی ئەوەی لێی بپرسن سیکاردوشانەی بەچەند...؟

خەڵکی سەر شەقام و بازاڕەکە هەر هەموو بەسەیرەوە چاویان تێبڕیبوو. ئەوەندە بەسەرنج و سەیرەوە بۆیان دەڕوانی ئەتوت زیندەوەرێکی بیابانەو ڕێی لێتێکچووەو بەرێکەوت پەڕیوەتە ئەم شارەوە، شەقامە دورو درێژەکەی بڕی و، جارێکیتریش پیاگەڕایەوە. بەڵام کەس پێی نەوت شانەت، سیکاردت بەچەند...؟ماندوبوو نەك لە ڕۆیشتن بەڵکەلەبەر ئەوەی کەس لەبەرهەمی کاری دەستی نەپرسی لەسەر شۆستەیەك بەرامبەر بەفولکەی بەردەم سینەماکە ڕاوەستا... نەخێر دانیشت و کەوتە ژماردنی شانەو سیکاردەکانی. چاوی لەخەڵکەکەش نەدەتروکان. بیری لەنرخی شتەکانی دەکردەوە، ئەگەر کڕیاری هەبوو شانە بەشەست فلس و سیکاردیش بداتە حەفتاوپێنج فلس. لەبەرخۆیەوە دەیوت بەم نرخانە هەرزانە. شانەیەکی باغە دەدەنە سەد فلس و بەدوو ڕۆژ دانەکانی هەڵدەوەرێت. چەقۆیەکی خەیار پاککردن دەدەن بەسەد فلس خەیارێکی پێ پاکناکرێت...بەدەم ئەم وتووێژە لەگەڵ خۆیدا دەیوت سەیرە..بۆ کەس لەشتەکانم ناپرسێت. بڵێی ئەم خەڵکە هیچیان پێویستیان بەم سەنعەتانەی من نەبێت؟ ژنەکانیان خۆش نەوێت؟ کەسیان ڕۆژانە گۆشت نەخۆن وچەقۆوسیکارد بەکار نەهێنن؟

لەم سێ ودووەدا هەڵوێستەیەکی کرد..هەرلەبەرخۆیەوە بەخۆی دەوت نا ئەمانە نییە..جلەکانم...جلەکانم.

هەر کەسەیری جلەکانی بەرمدەکەن...دەزانن کوردم ڕقیان لەخۆشم وجلەکانم وسەنعەتەکانیشمە...لەم تاوتوێی ناخی خۆیدا...کاتێکی زانی

دووپۆلیس ئەملاوئەویان لێگرت‌و وتیان هەستەو دایانە پێش...پرسی بۆ کوێم دەبەن هیچم نەکردووە...تکاتان لێدەکەم مەرەخەسم کەن با هەندێ لەسەنعەتەکانم بفرۆشم. رۆژ ئەوەندەی بەدەمەوە نەماوەو دەبێت ئێوارە زووبگەڕێمەوە بۆ شوێنەکەم. دوابکەوم سزام دەدەن.

پاڵێکیان پێوە ناو وتیان قسە مەکەو پێشمانکەوە...دەمی چەند گەرمە...لەسەر ئەم بژێوی‌ودەم درێژییەتان واتان بەسەرهاتووە...ئێوە لەگوندوشوێنی باش نیشتەجێکراون...بەبێ ئەوەی کاروکاسپی بکەن هەمووپێداویستییەکی ژیانتان بۆ دابینکراوە...لەوەزیاتر چیتان دەوێت..؟ بەدەم پاڵنانەوە...کاتێکی زانی لەبەردەمی بنکەیەکی پۆلیسدا رایانگرت. پێیان وت لەوسووچەدا راوەستە...پۆلیسەکە یەکێکیان چووە بەردەم ژوورێك‌و دەرگاکەیکردەوەو سەلامێکی کرد وتی گەورەم هێناومانەو فەرمانتان بەچییە؟ وتی یەکێتان بچن سلێمان بەگ بانگکەن بابێت بۆئێرە. بەئەمرەکەی گەورەم‌و سەلامێکی تر پاشاوپاش گەڕایەوەو چوو بەدوای سلێمان بەگدا.

سلێمان بەگ گەیشت. وتی فەرموو گەورەم..ئەمرت بەجێیە؟ وتی بڕوانە بزانە ئائەوە بۆچی هاتۆتە ناوشار؟ بەگ لەشانەفرۆش نزیکبۆوە...لێی پرسی چی دەکەیت لەناوشار. یەشتا عارتان نەناوە. لەچیتان کەمە..؟چییە ئەم چوار چەقۆوشانەیەت گرتووە بەدەستەوە؟ سەیرن بەهیچ تێر ناخۆن...! هەمووپێداویستییەکی ژیانتان بۆ دابینکراوە بیستوچوارسەعاتە وەکو گای لێسە خۆتان ئەلێسنەوە. هیچ کارێکتان پێناکەن. ئێمە مانانیش بەشەورۆژ کاردەکەین‌و هەرچەند دەکەین بەو مووچەیەی هەمانە بژێوی ژیانمان پێدابین ناکرێت.

وتی بەگم من هیچم نەکردووە. ئەوشوێنەی لێی دانیشتبووم نەمزانی بۆ دانیشتن قەدەغەیە...بەس بەس دەم درێژی مەکە...هەریەکێکتان بەشی شارێك دەکەن...دەبێت پێم بڵێیت کێ پێی وتیت ئەم شتانە دروستبکەیت‌و بیان هێنیت بۆ فرۆشتن؟ بەگم ئێمە کێ ئەمانبینێ‌و کێ ئەبینین لەوبیابانە...خۆم سەنعەتکارم...سەنعەتەکەی خۆم دروستکردووە...ئای!...ئای کەس نابینن‌و کەس ناتان بینێ. دیارە نارزین دەتانەوێت خەڵك بێت‌و خەڵك بتان بینێت. قسەکانت دەریدەخات بەم وەزعە نارازین!...روویکردە ئامر مەخفەرەکە..وتی

گەورەم دەڵێی چی شتەکانی لێوەرگرین و بۆ شوێنەکەی خۆیانی رەوانەبکەینەوە پەلاماری بەگیراو وتی بگەم ئەم جارە بەرمەدەن ئیتر نایەمەوە بۆناوشار...ئامیرەکە وتی بائارەزووی تۆ بێت شتەکانی لێوەربگرن و باملی بشکێنێ و بڕواتەوە. پەلاماری دان و وتی بەقوربانی دەمتان بم..ها ئەوە شتەکانم خوا ئەوەبگرێت وای لێکردین و بەم رۆژەی گەیاندین.

کارۆ ئێوارە گەڕایەوە بۆماڵەوە- حەمەوقاڵەی تووشبوون..لێیان پرسی شتەکانت فرۆشت؟ داتن بەچەند؟ پێی ناچێت هیچت مابێتەوە. بەڵام درەنگ گەڕاویتەوە....وتی ئەی ئێوە چۆنتان فرۆشت و بەچەندتاندا؟ وتیان ئێمە هەر هەموویمان بەسەر یەکەوە دا بەدوکاندارێك شانەدەستەی بەدوانزە پەنجایی وچەقۆ بەهەژدەپەنجایی...وتیان ئەیتۆ؟ وتی باشە ئێوەیان نەگرت؟ گرتن..؟نەوڵڵا کەس لێی نەپرسین. بۆناشێ جەنابتیان گرتبێ؟ وتی برا من پەنی زۆر خراپم بەسەرهات وتیان چۆن؟ ئادەی بۆمان بگێڕەوە؟

باسی گەرانی ناوشاروشاری دواجار دانیشتنی سەر شۆستەکەی بۆکردن و ئینجا باسی هاتنی پۆلیسەکان و بردنی بۆمەرکەزو پەیدا بوونی سلێمان بەگی بۆکردن. وتی ئێمە نەمانزانیوە خەڵکی خۆمان لەم وڵاتە چاوساغیانە.

سلێمان بەگ بەکوردیەکی پەتی خۆمانە..لێم تورەدەبوو قسەی لەگەڵدا دەکردم. وتیان سلێمان بەگ؟ سلێمان بەگ کێیە؟ ناوەکەی غەریب نییە بەخوا هەوێ نەبێ خەڵکی وڵاتی خۆمانە..باشە ئەوچیی پێدەوتیت؟

قسەی زۆری پێوتم...قسەکانی هەرەشە ئاسا بوو...منەتباری دەکردین دەیپرسی کێ پێی وتوویت ئەم کارانە بکەی..؟ دواجار بەخۆی و مەئمور مەرکەز شتەکانیان لێوەرگرتم و بەڵێنیان لێوەر گرتم کە ئیتر نەچمەوە بۆناوشارو بوشت فرۆشتن. وتیان ئەوەقسەیە...باسلێمان بەگ و ئاغاکەی باهەربۆخۆیان بڵێن بەخوا ئەمشەو سبەینێ زیاتر دروست دەکەین و دەچینەوە بۆشار دەیانفرۆشین.

ناسر چووە ماڵەوە..خێزان ومنداڵەکانی بەپیریەوە چوون. کەسەیریانکرد بەدەستی بەتاڵ و بەدڵگرانی گەڕاوەتەوە..لێیان پرسی چی بووە تووشی چی بوویت؟ لەنووکەوە بۆی گێڕانەوە. یەکێك لەمنداڵەکانی وتی ساوەڵڵا من کاکەحمەومامە قاڵەم بینی. زۆردڵیان خۆشبوو. وتیان هەموو شتەکانمان فرۆشتووە و شتیشمان بۆ ماڵەوە هێناوە و کەسیش لێی نەپرسیون..ژنەکی وتی

دیاره ئەمە لەنەگبەتی ئێمە یە تۆ تووشی ئەوسەر یەشەیە بوویت..کارۆ وتی گوێی مەدەنێ ئێوە ئەمشەو بەیانی چیتان بۆ دروستدەکردێت دروستی کەن. بەخوا ئەگەر بەندیشیان کردووم دەیبەمەوە بۆناوشار. وتیان خەمت نەبێت ئێمە شتمان دروستکردووەو شتی تریش دروست دەکەین...بەلام تکات لێدەکەین کەچوویتەوە بۆناوشار ئەوەندە سەیری ئەملاوئەولامەکە..وتی ئێوە بۆم ئامادە بکەن بەخوا ئەگەر بەداریاندا کردوم هەردەچمەوە

دوای دووڕۆژ یەك توورەکەی گەورە چەقۆو شانەیان بۆ پێچایەوە بەیانی زوودای بەکۆلیاو بەرەو شار کەوتە رێ..وتی ئەگەر ئێوارە نەگەڕامەوە ئەوەبزانن بەندکراوم..هەرگەیشتە ناو شارو چووە ناو بازاڕی شارەکە هەر ئەوەندە هاواری شانەو چەقۆیکرد...هەردوکاندار بوو بانگیان دەکرد.

کاکە...کاکە ئادەی دووشانەو دووسیکاردم بۆبێنەوبەبێ پرسی نرخ پارەیان دەدایەو...بازاڕەکەی وروژاند واشڵەژانەی دەزانی کێ ئەیبات وکێ پارەی ئەداتێ..کاتێکی زانی توورەکەکەی بەتاڵبوو. گیرفانەکانی پڕبوو بوون لەپارە..کاتێ سەیرکرد...کاکە حەمەولالە قالەیان داوەتە پێش بەناوبازەڕەکەدا...خەڵکی بازارەکەش یەك یەكو دوو دوو لێیان نزیکدەبنەوە..شانەو سیکاردیان لێوەردەگرن و پارە دەکەنە گیرفانیانەوە، پۆلیسەکانیش لەدوایانەوە پەلەیان لێدەکەن. گەیشتنە کارۆ ئەمیشیان دایە پێش...وتی من هیچم پێ نییە..هەروا هاتووم بۆشار. ئەفەندییەکی قژلوول لەتەنیشتیانەوە دەرۆیشت هەڵیدایەو وتی درۆئەکات ئەمیش ئێستا تەواویکرد. گیرفانەکانی بگەڕێن پریەتی لەپارە. من خۆم ئەم دوانەم بۆ بەڵگە لێکڕیووە..بەقسەی ئەفەنییەکە پۆلیسەکان تێگەیشتن ئەمیش شتی فرۆشتووە.

ئەمیشیان دایە پێش..کاکە حەمەوقالە لەبازاڕەکە دەرنەچووبوون هیچیان نەما...لەناوبازاڕەکەدا ئەفەندییەکی تر لەپۆلیسەکان پەیدابوو لێی پرسین ئەمانە بۆ کوێ دەبەن؟ تاوانێکیان کردووە؟ وتیان شتیان فرۆشتووە؟ وتی بۆشت فرۆشتن لەبازاڕدا قەدەغەیە؟ بۆ ئەمانە بەهاوڵاتیان دانانێن.؟ بۆ مرۆڤ نین؟ سەیرە سەیر تەنها لەم وڵاتەی ئێمە ناحەقی وادەکرێت. پۆلیسەکان تووڕە بوون بەرقەوە سەیری ئەفەنییەکەیانکرد. بەبێ ئەوەی وەڵام بدەنەوە بەلوولەی کلاشینکۆفەکانیان کەوتنە وێزەیان و پەلەکردن لێیان هەر زووگەیاندیاننەوە

مەرکــەز وتیــان خوێرپینـــە...بەرِێزبوەســتن...یەکەیەکــە بــەدوای یەکـــدا بانگیـانکردن...کارۆ چووە ژوورەوە. ئـەوە هاتوویتـەوە؟ عـارت نـەناوە؟ بـەڵێنت نــەدا ئــیتر نەیەیتــەوە؟..پارەکانتــان دەرکــەن...بیــان ژمێــرن..پارەکانیــان ژمـارد...ئـامیر مەخفەرەکـە وتـی پارەکانیـان بنووسـن‌و بیـان دەنـەوە..ئاگـاداری شـوێنەکەیان بکــەن بـەپێی پارەکـەیان لـەخواردن‌و مانگانەکـەیان دابشـکێنن‌و باملیـان بشـکێنن‌و بڕۆنـەوە هەرسـێکیان وتیـان..باکمـان نییـە. باسـەری مـانگ لەمووچـەو ئازوقـەمان بشـکێنن..هەرکاردەکـەین‌و تەمەڵ‌وتـەوەزەل دانانیشـین‌و ئەمـەمان باشـترە لـەوەی بەدەسـەنە بـژین..چـیمان لێبکـەن بـەس نییـە بەرهـەمی رەنجی شانمان دەخۆین...کەمیش بێت هەر پێی ئەچین بەڕێوە.

ئای ئەمە چەندی بەچەند...تاگەیاندیانینە ئێرە پێیان دەوتین لەهەموو تـاوان‌و گوناهێکیــــان خۆشـــــبووین‌و بـــــەخوا هــــاوولاتی چــــاکیین....کــــارکردن قەدەغـەبێت...هاتنەناوشـار تـاوان بێـت شتفرۆشـتن سـزای لەسـەروەربگرین... خۆش لێبوردنە!!

...مامە قالە لەحەمەو ناسر بەتەمەنتر بوو وتی کوڕەکانم گوێ مەدەنێ..ئێمـە کارەسـاتی زۆرمـان دیـوە. هـەموو ژیانمـان دەردی سـەریبووە..ئەمـەش پێـنج‌و دووڕۆژێکە تەواو دەبێت بەری تەنگانە کورتـە، چـی ئەکـەن بابیکـەن..ئێمـە کـاری خۆمـان هەردەکـەین..بـەس نییـە بـەهۆی کارەکەمانـەوە دەچـینە ناوخـەڵك خـەڵك دەبینین‌و خەڵك ئەمانبینێت....

# کاوەو ماسی...

قەزای حەی ساڵی ١٩٧٨

کاوە قوتابییەکی زیرەك و چالاکبوو..مامۆستای قوتابخانەکەیان خۆشیان دەویست..رۆژانە ئەرکەکانی سەرشانی جێبەجێدەکرد، ڕێگای قوتابخانەکەی بەناو باخچەیەکی جوان و خنجیلانەدا تێدەپەڕی.. بەناوەڕاستیدا جۆگایەکی ئاوی بچووکی پێدا دەرۆیشت.. کەپڕبوو لە ماسی بچووك و جوان..کاتێ کاوە، دەچوو بۆ قوتابخانە خۆی بەوانەوە خەریك نەدەکرد تا دوانەکەوێت..بەڵام لەکاتی گەڕانەوەیدا لەسەر جۆگاکە دادەنیشت و..کاتێکی باشی لەگەڵ تەماشاکردنی ماسیەکاندا بەسەر دەبرد..لەهاتو چۆو هەڵبەزو دابەزیان ورد دەبۆوە، چێژی لێوەردەگرتن..هەرچی خواردنێکی دەست بکەوتایە..بۆی فڕێدەدانە ئاوەکەوە.

ئەم کارەی وایلێکرد کە زۆرجار بۆ گەڕانەوەی ماڵەوەی دوابکەوێت..سەرزەنشت و ئامۆژگاری دایك و باوکی هیچ کاریان تێنەدەکرد، وازی لەڕاوەستان و سەیرکردنیان نەدەهێنا..کاوە وابیری دەکردەوە..کە سەربەست و ئازادو جوان بێت وەکو ئەو باخچەو جۆگەو ماسیانە...

بۆیە باوکی بڕیاریدا..کەلەم خووەی دووری بخاتەوە..ئەویش بەدۆزینەوەی جۆرەکارێك..کە لەجێگای ئەو باخ وجۆگەو ماسیانەی بۆ بگرێتەوە...

رۆژێ باوکی پێیوت: کوڕم کاوە...ئەگەر ئەمساڵ بەنمرەیەکی باش دەرچوویت..من و دایکت دیاریەکی جوان و بەدڵی خۆت بۆ ئەکڕین..ئەودیاریەشت لە هەموو شتێك خۆشتر بوێت.

کاوە وتی: بابە سوپاست دەکەم..بۆ ئەو بایەخەی بەمنتانداوە منیش بەڵێنتان ئەدەمێ کە نمرەکانم بەدڵی ئێوەبێت.

کاتێ نمرەی سەری ساڵ وەرگیرا..کاوە بەرزترین نمرەی لە هەموو وانەکانیدا هێنابوو..مامۆستاکانی هەر هەموو پیرۆزباییان لێکردبوو..کە گەڕایەوەو کارتی

نمرەکانی دایە دایکی‌وباوکی..ئەوانیش ئەملاوئەولایان ماچ کردو بەگەرمی پیرۆزباییان لێکرد..باوکی هەر ئەو رۆژە..چوو بۆ بازاڕ..بۆ ئەوەی بەڵێنەکەی بەکاوە دابوو..جێبەجێی بکات‌و دیارییەکەی بۆ بکڕێت..چووە بازاڕو لەبازاڕ حەوزێکی شووشەی جوانی پڕ لەماسی رەنگاو رەنگی بۆ کاوە کڕی..

کە گەڕایەوە کاوەو دایکی کاوەی بانگکرد.. حەوزە ماسیەکەی وەکو دیارییەك پێشکەش بەکاوە کرد..کاوە بەو دیاریە جوانە زۆر دڵخۆش بوو..رەنگ‌ورووی زیاتر گەشایەوە، پەلاماری باوکیداو دەست‌و ئەملاوئەولای ماچکرد، زۆر سوپاسی ئەو هەستە باوکانەییەیکرد..لەناو ماسییەکاندا ماسیەکی رەنگ ئاڵتونی زۆر جوانی تیادا بوو. کاوە..بەو پەڕی دڵخۆشییەوە..سەرنجی یەکەیەکەی ماسیەکانی ناو حەوزەکەی دەدا... رۆژانە خواردنی دەدانێ‌و بەدیاریانەوە دادەنیشت، وایلێهات حەزی نەدەکرد بەساتیش بەجێیان بهێڵێت..کاتی پشووی هاوین تەواو بوو، ساڵی نوێی خوێندن دەستی پێکردەوە..کاوە کە بەیانیان دەچوو بۆ قوتابخانە. وەکو ساڵان بەهەمان ڕێگاو شوێندا دەڕۆیشت..کاتێ وانەکانی تەواو دەبوو، وەکو ساڵان بەدیار جۆگاو ماسیەکانی ناو باخچەکەوە دانەدەنیشت..هەر زوو بەپەلە خۆی دەگایەندە ماڵەوەو سەری لەماسیەکان دەداو خەمی خواردنی بۆ دەخواردن، ئاوی حەوزەکەی بۆ دەگۆڕین‌و هەردەم لەئاوی تازەو خاوێن پشت گوێی نەدەخستن.

رۆژێکی هەینی کاوە ویستی لەگەڵ هاوڕێکانی بچێتە دەرەوە بۆ یاری‌و مەزاق..حەوزی ماسیەکەی هەڵگرت خستیە پەنجەرەکەو سەرەکەی لادا..تا خۆریان لێبدات‌و هەوای پاك هەڵمژن..کاتێ کاوە چووە دەرەوە بۆ ئەوەی بچێت بۆلای هاوڕێکانی کاتێکی زانی هەورێکی ڕەش بەری ئاسمانی گرتوو دەستی بەباران‌وبروسکەو هەورە چەخماخە کرد.

کاوە بەڕێگاوە بیری دەکردەوە..واباشە بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەو حەوزی ماسیەکانی بگەڕێنێتەوە شوێنی خۆی‌وگەڕایەوە..کە چووە ماڵەوەو گەیشتە سەرحەوزەکە..سەیریکرد واپشیلەیەکی رەشی گەورە..لەسەر حەوزەکەیەو سەری بەسەر حەوزەکەدا شۆڕکردۆتەوە..هەوڵدەدات بەکەڵبەکانی ڕاوی ماسیەکان بکات..ماسییەکانیش لەترسی کەڵبەو رەنگی رەشی پشیلەکە

کەوتونەتە هەلەکە سەماو، هەڵبەزو دابەزیانەو لەم سەری حەوزەکە بۆ ئەوسەری حەوزەکە ڕاکە ڕاك دەکەن.

پشیلەکە هەر کاوەی بینی..سەری لە حەوزەکە دەرهێناو ڕایکرد..

کاتێ کاوە چووە سەر حەوزەکەو سەرنجی یەکە یەکەی ماسیەکانی دەدا، کە چەند شپرزەو لەترسا چیدەکەن...ڕوویکردە ماسیەکان داوای لێبوردنی لێکردن..چووخواردنی بۆ هێنانو کاتێ خواردنی دەدانێ سەیریدەکرد، ماسیەکان وەکو شێتیان لێهاتووە جێگا بەخۆیان ناگرنو هەر ئەمسەرو ئەوسەر بەناو حەوزەکەدا دەکەن، بەتایبەتی ماسیە ئاڵتونییەکە...

ئەم دیاردەیە..زۆر ئازاری کاوەی داو کەوتە بیرکردنەوەو لەدڵی خۆیدا وتی: ئەگەر ئەم ماسیانە..سەربەستو ئازادبوونایەو لەناو حەوزو چەمو ڕووباردابوونایە، بەئارەزووی خۆیان بژیانایە..لەم حەوزەدا بەندنەکرانایە، هەرگیز پشیلەیەکی دڕندەی وا نەیدەتوانی پەلاماریان بداتو، کەڵبەیان لێگیربکات، بەم دەردەیان بەرێت..باشتر وایە..بیانبەمو بیانخەمە ناو جۆگاکەوەو لەگەڵ ئەو ماسیانەی ناو جۆگەکەدا بژین ئازادیان بکەم.

حەوزەکەی هەڵگرتو خۆی گەیاندە ناو باخەکە، حەوزە ماسیەکەی بەماسیەکانەوە هەڵڕشتە ناو جۆگەکەوە، تێکەڵاوی ماسیەکانی ناو جۆگاکەی کردن، ماسیەکانیش یەکسەر لەگەڵ ماسیەکانیتردا کەوتنە هەڵبەزودابەز..لەم سەری جۆگاکە دەچوون بۆ ئەوسەری جۆگاکە، بەئارەزووی خۆیان لەگەڵ ماسیەکانی ناو جۆگاکەدا، بەبێ ترس دەهاتنو دەچوونو هەوای پاکیان هەڵدەمژی.

کاتێ گەڕایەوە بۆماڵەوە..باوکی حەوزە بەتاڵەکەی بەدەستیەوە بینی پێیوت: ها کوڕم..ئەوە کوا ماسیەکانت؟

کاوە بەدەنگێکی خەماویەوە وەڵامی دایەوەو وتی:باوکە..سەیرمکرد حەوزەکە بچوکەو ماسیەکان تیایا ناڕەحەتنو ئەمڕۆ پشیلەیەکی ڕەش خەریك بوو بیانخوات.

بۆیە بڕیارمدا کە ئازادیان بکەم، بیاندەمەوە دەست ژیانی سروشتی خۆیان..بردمنو هەڵمڕشتنە ناو جۆگاکەو با لەگەڵ ئەو ماسیانەدا بژین...

باوکی..کاوەی لەباوەشگرتو ئەملاوئەولای ماچ کرد، پیرۆزبایی گەرمی بۆ ئەو بیرکردنەوە راستە لێکرد، پێیوت: کوڕم کاوە کارێکی زۆر چاکو پەسەندتکردووە، راستی لای تۆیە..ماسی بەئارامو خۆشی ناژی ئەگەر لەگەڵ هاوڕێکانیو لەناو ئاووهەوای خۆیدا نەژی...بزانە سەربەستی چەند گەورەیە چەند خۆشە بارتەقای نییە...مرۆڤیش ئەگەر لەخاکو زێدی خۆیدا ئازاد نەبێت...هەروەکو ئەو ماسییانەیە مرۆڤی پشیلە ئاسا دانەچیڕەی لێدەکەن ئازاری دەدەن...کوڕی شیرینم جارێکی تر پیرۆزبایت لێدەکەمەوە...

## رایەك

# بەری خۆر
# بەبێژنگ ناگیرێ

لەم کاتەدا گزنگی خۆر سەرەتاتکێ لەگەڵ ئاسۆکانی کوردستاندا ئەکاتو، مژدەی رزگاری بە کۆرپەی نیشتمان ئەدات، هەزاران جووتیارو کرێکارو رەشو رووتی جەنگاوەر خۆیان ئەخۆنەوەو چەکەکانیان ئەمشانەوشان ئەکەن..

لەم کاتەدا..دایك کۆرپەی ناو بێشکەی بە گۆرانی پێشمەرگە ئەلاوێنیو جاجمی خەوی بەسەردا ئەداتەوەو، شوانو گاوان ئەپرسیو میلی رادیۆکەی ناوەستێنێو بۆ دەنگو باسی کوردستان ئەگەرێتو، بەدوای وشەی سەرکەوتنیدا وێڵەو هۆرە بە گوێی چیاکانی کوردستاندا ئەدات. لەم کاتەدا پۆلەکچ بە کۆڵە چیلکەکانیانەوە بەسەرەو ژوورکەی شاخەکاندا هەڵگەرێنو گۆرانی بە باڵای پێشمەرگەدا ئەڵێنو پێشمەرگەش سوێندی خواردووەو بڕیاری داوە تا کوردستان رزگاری نەبێت کەژاوەی خۆشەویستەکەی نەگوێزێتوە.

لەم کاتەدا..قوتابیان ورەیان داوەو گمەگمی خوێندنەو لەهەموو دێرێکی دەفتەرەکەیاندا کوردستانێك وێنە ئەکێشن دنیا دیدەکانمان بە گوێماندا ئەدەن ئەو کاتەی ئەوان شەڕیان کردووە لە تفەنگی حسکەو یایلی زیاتریان نەبووە، سەنگەرەکان چاوەچاویانەو پێشمەرگەش خۆی بۆ خڕداوەو بە لوولەی تفەنگەکەی یاری بەنەخشەورێبازی دووژمنو هەموو ئەو رێگایانەی ئەیانەوێت کۆسپ لەبەردەمی ئاواتەکانماندا دابنێن ئەکات..

لەم کاتەدا هەندێ لەبەرەی شۆڤێنیستەکانی لیژنەی مەرکەزی حزبی شیوعی، ئەیانەوێت شۆڕشی کوردو پارتە پێشڕەوەکەی بۆ بەیەك بکەن بەهەموو ئاوی دەریاکانو بەنزینو نەوتی عەمارەکانی دنیا پاك ئەبێتەوە، با لەوانیشو لە هەموولایەکی تر روون بێت گەلی کورد شەڕبکاتەوە. پێشمەرگەی خۆی بۆ ئەوە نادا بەکوشت کە بکوژرێ. ئێمە شەڕ ئەکەین بۆ ئەوەی بتوانین بژینو خۆمان ئەدەین بەکوشت بۆ ئەوەی کۆرپەی دوای خۆمان بە گوللە گۆش نەکەینو

بەئاسوودەیی بژی. شۆڕشی رزگاری خوازیمان رێبازی زۆر دیارو ئاشکرایەوله ناوجەرگـــەی جـــەماوەری خـــەڵکی رەش‌وڕووتـــی کوردســـتانەوه رەگی‌داکوتاوەوســوتەمەنییەکەی هــەموو ئــەو جووتیـارو کرێکـارو رۆشـنبیره شــۆڕش گێرانەیـه کـه باوەڕیـان بـه شۆڕشـی چـەکداری هەیـه، لـه پێنـاوی سـەندنەوەی مـافی زەوت کـراودا رۆژگارێکیشــه خـەڵك ئەوەنـده وریـا بۆتـەوه بەئاسانی‌ناخەڵەتێ بەری خـۆریش بەبێـژنگ ناگیرێت‌و خـەڵکی کورسـتان خـۆی حەکەمەو دوا رۆژیش کاڵەك بەئەژنۆ ئەشکێنن..

*له رۆژنامەی برایەتی ژماره(٢٠)له ١٩٧٤/١/٣٠ بەناوی(کەرکووك)دا بڵاوکراوەتەوه

# ئاهەنگەکەی یەکێتی قوتابیانی کوردستان لقی سلێمانی

لەگەڵ کەلوی بەفروکزەبای گوێ تەزێن دا، لەگەڵ ڕێبەندانی ناو چیاکانی کوردستاندا، لەگەڵ پۆشینی بەرگی سپی چیاو دۆڵو دەشتی خاکی پیرۆزدا، لەگەڵ هەڕەشەی سەرماو سۆڵەی شوباتی سامناک دا، لەگەڵ گێژە لوکەی بەفرو چلورەی. ئەستور سەهۆڵ بەندانی بێ وچاندا. یەکێتی قوتابیانی کوردستان. لەعێراقدا هەڕەشەی دامەزراندنو پتەوی ڕێکخستنو قوتابیانی کوردستانی لە دوژمن کرد، بۆ سەلماندنی قوتابیانی کوردو، بەدەست هێنانی مافی ڕەوایی قوتابیانەو، چارەسەرکردنی گیروگرفتی نەتەوایەتیمان. بۆیە لە هەژدەی مانگی شوباتا لەشاری زێڕی ڕەشی وولاتا، لەناو دڵی کوردستانی بەریندا، مەشخەڵی تێکۆشانی بەرزکردەوەو ئاسمانی کوردستانی لەگەڵ بڵێسەی سووری نەکوژاوەدا پێ ڕووناك کردەوە بەم بۆنەوە لە هەموو دڵی قوتابییەکی دڵسۆزی کوردا، لەهەموو سووچو قوژبنو شارێکی کوردستاندا، بەبۆنەی سەروەری هەژدەساڵ بەسەر تێکۆشانیا لەگەڵ یادی ئەم ڕۆژە پیرۆزەدا ئەژیانو خۆیان ئامادەکرد بۆ گێڕانی ئاهەنگ..لە شاری هەڵمەتو قوربانیشدا (سلێمانی)لە شاری ئەمارەتی بابانو شێخ مەحموودی نەمردا، لەشاری محەمەد صدیق پێنجوێنیو کەمال سەلیمومحەمەدی حاجی ساڵح دا، ئامادەیی خۆیان نیشاندا بۆ ئەمەش لەڕۆژی پێنج شەمە ڕێکەوتی ١٨-٢یەکێتی قوتابیانی لقی سلێمانی هۆڵی قوتابخانەی ئامادەیی کوڕانیان ڕازاندەوە..

کارتی بانگ کردن لەچاپ درابوو، بەخۆڕای دابەش کرا بەسەر هەموو ڕێکخراوە کوردستانییەکانو لقی چواری پارتیو کاربەدەستانو مووچە خۆران، وەزوربەی زۆری دانیشتوانی شاری سلێمانی کارتی بەشدار بوونیان بۆ چووبوو.. هەر لە کاتژمێری دووی پاش نیوەڕۆی ڕۆژی پێنج شەمەوە هەروا پۆل پۆل کچوکوڕوژنوپیاو بەرەو هۆڵی ناوبراو کەوتبونە ڕێ. تاکردنەوەی ئاهەنگەکە سەروخواری هۆڵەکە پڕبوو. لەکاتژمێری چواردا دوای ئەوەی جێگری پارێزگاری سلێمانیو نوێنەری فەرماندەی سوپاو هەڤالانی لقی چوار گەیشتن

ئاهەنگەکە لەلایەن هەڤاڵ کاك (حەمە فەرەج) ەوە کرایەوە، بەوەستانی دەقیقەیەك بۆ گیانی پاکی شەهیدەکانی کوردستان..سروودی(ئێمە قوتابی گەلین) لەلایەن تیپی یەکێتی‌یەوە بە یارمەتی تیپی مۆسیقای سلێمانی پێشکەش کرا..دوابەدوای سروود ووتاری یەکێتی لقی سلێمانی لەلایەن هەڤاڵ(دلێر ڕەشیدە)وە خوێندرایەوە کە تیایا بەخێرهاتنی دانیشتوانی کرد..وهاتە سەر باسکردنی چۆنێتی یەکێتی وتی: یەکێتی قوتابیانی کوردستان کە لە(١٨)شوباتی ساڵی (١٩٥٣)دا مەشخەڵی تێکۆشانی ئاسمانی کوردستانی عێراقی روناك کردەوە، شان بەشانی مەشخەڵی ڕۆشنکەرەوەی کەرکوکی ئازیز.. بێگومان دروست بوونی یەکێتیمان مژدەیەکی سەرکەوتن بوو درا بەنەتەوەکەمان و خوێنێکی نوێ بوو کرایە لەشی بزووتنەوەی نەتەوایەتیمان...واتە(کوردایەتی)..بەمە بایەخێکی گرنگی‌دا بە یەك خستن و تێکۆشانی قوتابیانی کوردستان، لە چوار چێوەی عێراقێکی دیموکراتی‌دا..لەسەر قسەکردن بەردەوام بوو وتی: لەم کۆڕەدا دەستە قوتابیان گیانی خۆیان ناوەتە سەر لەپی دەست و خۆیان کردۆتە قۆچی قوربانی لەپێناوی بەدەست هێنانی مافە ڕەواکانی گەلەکەماندا. بۆ ئەمەش خوێنی شەهیدان عبداللە مناف..مأمون الدباغ –محمد صدیق پێنجوێنی و کەمال سەلیم و محمد حاجی صالح ئاشکرایە– هەروەها کاك دلێر وتی: یەکێتیمان بەقۆناغی سەختا تێپەڕیوە بە ئاڕاستە کردن و یارمەتی دانی پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکایەتی بارزانی تێکۆشەر..وە ئێستاش یەکێتیمان دەرگای خراوەتە سەر پشت بۆ هەموو قوتابییەکی کورد  کە هەست بەڵێ پرسراوی پاشە ڕۆژ بکا بەرامبەر بە چارەنووسی نەتەوەکەمان.. بەتایبەتی دوای بەیانی ١١ی ئادارو دەرچوونی بەیانی یەکگرتن کە هەموو قوتابییەکی دڵسۆز ئەتوانێ بەسەربەستی ئیش بکات لەیەکێتیدا..وە کاك دلێر وتی: یەکێتیمان دووجار تووشی بەر بەرەکانی تێك دانی ڕیزەکانی بووە.بەڵام  بەهۆی چاو کراوەیی قوتابیانی دڵسۆزەوە هەموو کەلێنێك پڕکراوەتەوەو ڕێگا لە هەموو تێك دەرێك گیراوە بۆمانەوەی قەوارەی یەکێتی.. وە بەم بۆنەیەوە پەیمانتان بۆ تازە ئەکەینەوە کە وچان نەگرین بۆ ئیشکردن  لەپێناو چەسپاندنی ناوەرۆکی بەیاننامەی ١١ی ئادار، کە ئۆتۆنۆمی تیا دیاری کراوە بۆ گەلی کوردمان..هەڤاڵ

دلێر لە دوا وتەیدا بانگیدا بە مافی برایەتیو دۆستایەتی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستانو پارتی بەعسی عەرەبی ئیشتراکیو سەرکەوتنی یەکێتیو نەمری بۆ شەهیدانی کوردو کوردستان.

دوابەدوای وتاری یەکێتی هەڤاڵ قادر جەباری وتاری لقی چواری پارتی دیموکراتی کوردستانی خوێندەوە..

لەدوای وتاری لقی چوار وتاری ئافرەتان لەلایەن خوشکە (نوخشە عەزین)ەوە خوێندرایەوە کە دەوری یەکێتی قوتابیانی تێدا باس کرد شان بەشانی هەموو رێکخراوە کوردستانییەکان، وەبەناوی ئافرەتانی کوردستانەوە لەسلێمانی پیرۆزبایی لەهەموو قوتابیانی کوردو ئەندامانی یەکێتی قوتابیان کرد..لە کۆتاییدا خوشکە نوخشە بانگیدا دۆستایەتی نێوان پارتیو بەعسیو یەکێتی رێکخراوە کوردستانییەکان لەژێر باڵی پارتیماندا بەسەرۆکایەتی بارزانی. وەنەمری دانا بۆ شەهیدانی کوردستان.

دوای وتاری ئافرەتان (هەڤاڵ شیخ رەوف قەرەداغی) هۆنراوەیەکی بەسۆزی خوێندەوە کە هۆڵەکەی هەژاند دوای خوێندنەوەی ئەم پارچە هۆنراوەیە..هاوڕێ محمد عبدالکریم بەرزنجی وتارێکی بەناوی دەستەی بەڕێوەبەرانی گۆڤاری(نۆبەرەوە) خوێندەوە دوای ئەم وتارە کۆتایی بەوتار خوێندنەوە هاتو کەوتنە پێشکەش کردنی بەرنامەکەیان هەڵپەڕکێییەکی کوردی لەلایەن تیپی یەکێتی قوتابیانەوە پێشکەش کرا..دوای هەڵ پەڕکێ دووپارچە مۆسیقا لەلایەن تیپی مۆسیقای سلێمانییەوە پێشکەش کرا.

دوای ئەمە نۆرە هاتە سەر هونەرمەندی تازە هەڵکەوتوو(تۆفیق عەلی) کە بەدەنگە سازگارەکەی چەند ئاوازێکی بەسۆزی دا بەگوێی دانیشتواندا هیوادارین کە نموونەی زۆربێت.. دوابەدوای هونەرمەند (تۆفیق عەلی) برادەر کاك (نوری قەرەداغی) چیرۆکی(پارتی بەسەرۆکایەتی بارزانی) پێشکەش کرد کە دەوری هەموو چینەکانی گەلی کوردیان دەرخست لەبەشدار کردنیان لە شۆڕش دا تێکست(نص)ە کە کاك (حەمە فەرەج) ئەیخوێندەوە لە پشت پەردەوە چیرۆکەکە لە نووسینو دەرهێنانی کاك نوری خۆی بوو، دوای ئەم چیرۆکە چەند هەڵپەڕکێییەکی تر پێشکەش کراو برادەر وریا هاواری شیعرێکی خوێندەوە..ئاهەنگەکە لە کاتژمێری(٦)ی پاش نیوەڕۆ کۆتایی پێهات. ئیتر

هیوادارین که هەموو ڕێکخراوە کوردستانیەکان تاسەر لەگەڵ بیرەوەریەکانیاندا بژین.

*ئەم وتارە لەساڵی ١٩٧١دا ئامادە کراوەو لە ڕۆژنامەی هاوکاریدا بڵاوکراوەتەوە.

# بەشی کوردی لەبەر ڕۆشنایی بەیاننامەی یانزەی ئازاردا

یەکێك لەدەستکەوتەکانی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ بۆ گەلی کوردی قارەمانمان، دامەزراندنی بەشی کوردی بوو لە کولیەی ئاداب لە دانیشتگای بەغدا.

ئێمە لێرەدا نامانەوێ بێینە سەر ئەوە، ئایا ئەم بەشە چۆن دامەزراو کێ بیری دامەزراندنی کرد..بەهەر حاڵ..بەشی کوردی دەستکەوتێکی نەتەوایەتی گەلی کوردمانەو چرایەکی هەڵکراوی پڕ لەنەوتەو هیچ کاتێك کوژاندنەوەی بۆنییە.

بەدەرچوونی بەیانی ١١ی ئازاری پیرۆزو دان نان بە حوکمی زاتی بۆ کوردستان و گەڕانەوەی هێمنی و ئاسیش بۆ وڵات، قۆناغێکی نوێ لە مێژووی خەباتی گەلەکەمان دەستی پێکرد..قۆناغی ئاوەدانکردن و پێشخستن و گەشە دان بە باری ئابوری و کۆمەڵایەتی و..هتد.......

یەکێك لەناوەڕۆکی بەندەکانی ١١ی ئازار پەرەپێدان و پێشخستنی ڕادەی زانیاری کوردی و بایەخدانە بە کەلەپوری نەتەوایەتیمان.

بەشی کوردیش کە دەسکەوتێکی نەتەوایەتیمانە، بە بەرهەمی تێکۆشانی گەلەکەمانی ئەزانین، بۆیە لەگەڵ مژدەی ئاشتی‌دا چاوی گەشایەوەو هەموو ڕۆژگارێکی پڕ کۆسپ و ناخۆشی لەیاد چووەوە، ئاواتێکی تازەو دیاری بۆ هاتە کایەوە، بەتایبەتی لەکاتێکا بڕیاری خوێندنی دەرسی کوردی درا، لەهەموو قوتابخانەکانی عێراق بەگشتی، وەبوونی دەرسی کوردی لە هەموو قوتابخانەکانی ناوچەی کوردستاندا، بەتایبەتی وە دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری کوردی، زیاتر ڕۆشنایی لەبەردەم بەشی کوردی‌دا دانا، هەر قوتابیەکی بەشی کوردی بەئاوات و هیوایەکی پیرۆزەوە دەستی ئەدایە کتێب و بەرەو کولیەو بەشی کوردی ئەکشا.

بەڵام ئەوەی جێگای داخ و سەر سوڕمانە، تا ئێستا ئەوەیە کە ئەبوایە ئەم بەشە لەلایەن کاربەدەستان و سەرۆکی دانشتگای بەغداوە زیاتر بایەخی پێ بدرایەو، هەموو توانایەك بخرایتە کار بۆ پێشخستن و فراوان کردنی، وە هەوڵ

بدرایە کە ژمارەیەکی زۆر لە قوتابیانی کوردی بەتوانایان بۆ ڕابکێشایە..وە داوا لە هەموو ئەو ئەدیبو نووسەرو زانایانە بکرایە کە توانای خزمەت کردنیان هەیە لەم لایەنەوە، تا بێنە پێشەوەو قوڵی لێ هەڵبکەنو چاکی لێ بکەن بەلادا بۆ هاوکاری کردنو، ووتنەوەی دەرسو بەرەوپێش بردنی ئەم بەشە. لەسەر ڕێو شوێنێکی دانشتگایی، لێرەدا کە دەس ڕائەکێشین بۆ ئەم لایەنە لەبەر ئەوەیە ئەو ڕۆشنبیرانەی کە خاوەنی باوەڕنامەی بەرزن بە پەنجەی دەست ئەژمێررێن، کە ئەمانە ناتوانن ئەو بۆشاییە لەیەکەم هەنگاودا هەوڵی ئەوە هەیە پڕی بکەنەوە، هەر بدرایە کە بەشەکە ببوایەتە بەشێکی سەربەخۆو بینایەکی باشی بۆ تەرخان بکرێ، کە هەموو کەرەسەو پێویستی تەواوی تیا بوایە، وەکو هۆڵی کۆبونەوە بۆ گرتنی کۆڕو ووتنەوەی موحازەراتی فراوان، لەلایەن مامۆستاو زاناو شارەزایانی زمانو ڕێزمانو ئەدەبی کوردییەوە، بەڵام بەداخەوە ئەیڵێم ئەو چوزەرەیەی لە دڵی قوتابیانی بەشی کوردیدا سەری بەرز کردبووەوەو، خوێندەوارانی کورد چاویان تێبڕیبو سیسیان کردەوە هەر لە ناوەوە سەریان قرتان، ئەمانە هەمووی خرایە فایلی بیرچوونەوە. باوەڕ ناکەم کەسێ هەبێ لە کوردستانو شاری بەغدا لێشاوی قوتابیانی کوردی نەدیبێ بۆ بەشی کوردی، کەچی لەگەڵ ئەو هەموو هیواو ئاواتەدا بەبێ ئەوەی بزانرێ هۆی چییە؟ لە بەرچییە؟ وەیا لەبەر خاتری چاوی کاڵی کێیە؟ کە ئەم بەشە پشتگوێ خراوەو تەنانەت لەڕیزی بەشەکانی تریش نەژمێررا!

ساڵانی پێشو..بەتایبەتی ساڵی ڕابوردوو کە لە کۆدستان ئاگرو ئاسن ئەباری..بەشی کوردی نزیکەی(٣٠٠)قوتابیکوردی لە باوەشی خۆیدا قایم کردو، باڵی دڵسۆزی کێشان بەسەرا..هەر چونبێو بەهەر جۆر، ئەم ژمارەیە وەرگیرابن کارێکی بەسوودو پیرۆزو بەنرخە بۆ گەلی کوردمانو بۆ چاندنەوەی سامانی ئەدەبیو کەلە پووری نەتەوایەتیمانو پێگەیاندنی کادری باشو لێهاتووی زمانو ئەدەبی کوردی بەخامەیەکی سوور لە مێژووی بەشی کوردیا ئەنووسرێ.

ئەم ساڵیش کە زروفی دوای بەیاننامە مێژووییەکەی١١ ئازارە، ژمارەیەکی زۆر لە قوتابیانی کورد ئەوراقو سکالایان پێشکەشی بەشی کوردی کرد، بەڵام

ئەوەی تا ئێستا ئەم قوتابیانە لە گۆماوی گوماندا گێژئەدا چەند هەواڵ و قسەی سەرپێیە کە ئەدرێت بە گوێیاندا..

ڕۆژ نییە یەخەی مامۆستایان لەلایەن قوتابیانەوە نەگیرێت، بەڵام جێگای داخە کەوا نیوەی ساڵ هات و هێشتا نەخشەو ڕێ و شوێنێك دانەنراوە بۆ وەرگرتنی قوتابیان لەم بەشەدا..ئیتر لەژمارەی(٤٠٠) قوتابی کە ئەوراقیان پێشکەش کردووە بۆ بەشەکە تەنها (٧٠)قوتابیان وەرگرتووە.

ئەو بەتالیۆنە قوتابییەی کە تا ئێستا سکالاکانیان چەکمەجەی مێزی ژووری پیرۆزی بەشی کوردیدا کەوتووە، دەستیان پان کردۆتەوە بەرەو ڕووی بەشی کوردی.. کەس نییە لێیان بپرسێتەوە ڕێگایەکی چارەکردنیان بۆ بدۆزێتەوە.

بەڵێ وا لەجیاتی بەشی کوردی، سوپاگاکان باوەشی بۆ گرتونەتەوە بەم زووانە ڕاست و چەپی خۆیان ئەناسن..!

بەڵێ جیاوازی ئەمساڵە زۆرە لەگەڵ پار..(٧٠)قوتابی لەکوێ و (٣٠٠)قوتابی لەکوێ!؟

ساڵی ڕابردوو لەکوێ و دوای بەیانی ١١ی ئازارو چەسپاندنی ناوەڕۆکی لەکوێ..!؟

*ئەم وتارە لەساڵی ١٩٧١ لە ڕۆژنامەی هاوکاریدا بڵاوکراوەتەوە.

# خەباتی قوتابیان

خەباتی قوتابیان...بەڵێ خەباتی قوتابیان..لەو رۆژەوەی جوولە کەوتۆتە ناوگەلەکەمان‌و، ئالای خەباتی لێ هەڵکردووە، قوتابیانیش دەستەچیلەیەکی نەکوژراوەی ئەو ئاگرە سوورەن‌و خۆیان لەبۆنەی خەباتدا قاڵ کردووە، بەتایبەتی لەچلەکان‌وپەنجاکاندا قوتابیەکان دەورێکی چالاکانەیان بینیووە لە رۆژانی تێکۆشانی گەلی عێراق بەگشتی‌وگەلی کورد بەتایبەتی. خەباتی قوتابیان بووبە نەوت‌و چووە ناو لەشی کاروانی‌و تێکۆشانەوەو رۆژ لەگەڵ رۆژ لەبەرزبوونەوەو بڵێسەسەندندا بووە. ئەم جموجۆڵ‌و چالاکییەی قوتابیان ئەیانکرد قوتابیانی کوردی بەرەو ئەوەبرد کە لەدوای ١٩٥٠وە بیر لەدامەزراندنی یەکێتی‌یەك بکەنەوە کە بتوانن زۆربەی زۆری قوتابیانی کوردتیادا کۆبکەنەوە، بۆیە لەدوای کۆنگرەی پارتی لە ١٩٥٣ یەکێتی قوتابیانیش لەشاری زیری رەش‌و لەنێوان ئەو هەموو بڵێسە سوورە نەکوژاوەدا، ئەویش بڵێسەی ئاڵی خۆی هەڵکردو خوێنی قوتابیانی کرد بەنەوتی هەمیشەیی بۆی....

یەکێتی قوتابیان لەوساڵەوە پێناوەتە ناو قەوارەیەکی گورج‌وگۆڵانە خەبات ئەکات‌و تێ ئەکۆشێ لەپێناوی مافەکانی قوتابیان‌و لەرۆژی دامەزراندنیەوە، هەنگاوێك لەکاروانی رزگاریخوازی گەلەکەمان دوور نەکەوتۆتەوە. ساڵ لەگەڵ ساڵ زیاتر برەوی بەخەباتی داوەو سووربووە لەسەر چەسپاندنی مافەرەواکانی قوتابیان(ی.ق.ك) نموونەی خەباتی بێ کۆڵدانمان شەهیدان(مۆموند دەماغ‌و پێنجوینی، کەمال سەلیم‌و دەیانیترن).(ی.ق.ك) لەدەساڵی هەڵگیرساندنی شۆڕشدا دەوری رێبازی کوردایەتی‌و دیاریکردنی دوا رۆژێکی باش بۆ قوتابیانی کورد لەسایەی رزگاری نەتەوەکەماندا. هەردەم پێشمەرگەی نەترس‌و خۆبەخشبووو لەریزی سوپای شۆڕشگێری کوردستانداو راوچییەکی هەمیشە ئامادەبوون بۆ بەرەنگاری دوژمن لەدوابەیانی ئازاریشەوە، ئەوەی لەتوانادا بووە، بۆ بەرژەوەندی قوتابیان‌و گەلەکەمان کەمتەرخەمیان نەکردووە هۆشیاریانە هەڵسوکەوتیان بۆ کردووە. جێگای شانازیە(ی.ق.ك) گەیشتۆتە ئەورادەیە

ڕۆشنبیری نەترس و چالاکی واهەبێت بێ سڵکردنەوە دوژمنەکانی خۆی دیارییبکات و هەوڵی ڕێگادۆزینەوەبدات بۆ چارەسەرکردنی کەم وکوڕیەکانی و دورخستنەوەی کەسانی هەڵپەرست و نامۆبە ڕەوتی قوتابیان... ئەگەر ڕاستەوڕاست ئەوەبدرکێنم کە(ی.ق.ك) زۆرکاری باشی بۆ قوتابیان کردووە..لە کۆنگرەدا بەپێی پەیڕەوپرۆگرامی یەکێتی دەبێت ڕادەی ڕۆشنبیری قوتابیان بەرزکرێتەوە لەڕێگای دەرکردنی نامیلکەوگۆڤاروکۆڕوسیمینارەوە. وا هەربەدوای کۆنگرەدا سوپاگای لەناوچەکانی کەرکووك و خانەقین پێکبهێنێت و نامیلکەی لەبارەوە دەرچوە. وە بەدوایدا گۆڤاری خەباتی قوتابیان دەرکراوو گۆڤارەکە دەیەوێت و بەڕێڕەوێکی سەردەمانە بچێتە ناو کۆڕی ڕۆژنامەگەری کوردییەوەو لەڕێگایەوە قوتابیان هۆشیار بکاتەوەو لەکۆڕی خەباتدا ببێتە گۆڤارێکی زانستی و پەروەردەیی و ڕۆشنبیری گشتی و هەموو چالاکی و گیروگرفت و کێشەکانی قوتابیان ڕۆشنایان بخاتە سەرو چارەسەری گونجاوی بۆ بدۆزێتەوە ئەو کەندو کۆسپانەی دێتە بەردەم ڕێبازی خەباتی قوتابیان تەخت بکات..دەیەوێت قۆناغ بەقۆناغ قوتابیان پەروەردە بکات و نەوەیەکی نوێ پێبگەیەنێت کە لەدواڕۆژدا گەلەکەمان کەڵکیان لێوەربگرێت و بەرەو بەگڕی خەبات بدات لەژێر ئالای یەکێتی قوتابیانی کوردستاندا.

## هەر لەم ڕوانگەیەوە دەڵێین خەباتی قوتابیان

*ئەو دارە شۆخ و شەنگەیە کە بەخوێنی مەئمون دەباغ و محەمەد سدیق و کەمال سەلیم ئاو دراوە...

*ئەو شاپلێتە بەتینەیە کە قوتابیان سووتە مەنیەکەی بوون..

*درێژەدانە بەتێکۆشانی قوتابیانی کوردستان لەپێناو مافەکانی قوتابیانی کوردستان و، چەسپاندنی ئۆتۆنۆمی ڕستەقینەو بۆ کوردستانی پیرۆزمان..

*هەڵگری مەشخەڵی بیرو باوەڕی پێشکەوتوو خوازانەیەو هەردەم لەپێشەوەی هەموو یەکێتی یە نیشتمانیەکانەوە هاواری یەکگرتنی بەرەی قوتابیانی کردووە لە عیراقدا. و هەموو ڕۆژیش داوای خۆی تازە ئەکاتەوە،

بانگەوازی خۆی بەگوێ هەموو لایەکدا ئەدا. سوورە لەسەر ئەوە بێ یەکگرتنی بەرەی قوتابیان لەعێراقدا ناتوانرێ ئەو مافانەی قوتابیان دەستی ئەخەنە سەر بەباشیو تەواوی بێتەدی.

*بەرەنگاری هەموو رەگەز پەرستو شۆفینیەك ئەکات کەبیەوێ لەم دەروازەوە ڕێزەکانی قوتابیان بەرەو نووچدان بەرێت.

ئەم بابەتە لەسالآنی حەفتاکاندا نووسراوە بۆ گۆڤاری خەباتی قوتابیان لەسکرتارییەتی یەکێتی قوتابیانی کوردستان دەریدەکرد.

## لەڕوانگەی بیرکردنەوەوە

*(کورد ئەگەر خۆی واز لەخۆی بێنێت بەهەموو ئاواتێکی خۆی ئەگات)

*(کورد ئەگەر پارەی خۆش نەویستایە(گەلە)ی بێ شوان نەئەمایەوە)

*(گەلە) ئەگەر شوانی دڵسۆزی هەبێ مەڕەکانیشی شاخدارن)

*(هەموو(کەسێك)(نەتەوەیەك) چارەنووسی خۆی بەدەس خۆیەتی، تەنها کورد نەبێ چارەنوسی خۆی ئەخاتە دەست کەسانی تر)

*(کورد ئەگەر خۆی ئاگر لە (قەدەغە)ی خۆی بەرنەدات هیچ ئاگرێك قەدەغەی ئەو ناسوتێنێ)

لەسالّی١٩٦٨/بەغدا

## نامە:

# برای گەلیٚ لەدڵاشیرین وخۆشەویستم کاکە لەتیفی بەڕیٚز

### قەزای حەی/واسط

١٩٧٧/٢/٢٣

سڵاووسۆز پیٚشکەش

کاتیٚ خەم دەبیٚتە تەمو، دەیەویٚت چاوی شارەکان پڕکاتەوەو وزەی روانینیان نەهیٚڵیٚ...لەپڕ شەماڵیٚکی سەرخۆش کلچیٚوکیٚکی زەیتوون بەچاوەنووساوەکاندا دەهیٚنیٚ و خەمو تەم بەچەند گەردەلوولیٚك تۆڵە دەکاتەوە...لەباپیٚچی شارە غەمبارەکاندا نیشتە جیٚیان دەکات...

منیش لەشاریٚکی ژانگرتوودا، هەوارم هەڵ داوەو، رۆژانە هەموو ساتیٚ بەتەمەنی خەمەکانمدا دەچمەوە...شەو بەچەند کاتژمیٚریٚکی خەوبینینەوە بارگەی تاریکی دەپیٚچیٚتەوە...بەدوایدا خۆر چقڵی دارخورماکان دەمژیٚ...

وڵاتی پرتەقاڵو خورما بەگژ خۆردا دەچن و، دەڵیٚن تۆیی پرتەقاڵو خرماکانمان دەسوتیٚنیٚ و نایەڵیٚت باخەوانەکانمان لیٚی تیٚربن..تا لەدوکانی خورما فرۆشیٚك دەدەم...بەقەدەر تاقەتی گیرفانم خورما بۆ دەمی تاڵی خۆمو منداڵەکان دەبەمەوە...بۆ ئەوەی بەشیرینی چەند دەنکە خورمایەك تاڵی دەممان برەویٚنیٚتەوە.. بەڵام چەندیٚ دەخوین دەممان هەرتاڵە، خورماکەش بەتاڵی لەژیٚر ددانەکانماندا دەتویٚتەوە. دەڵیٚم دەبیٚت خورماش ئاوی تاڵی خواردبیٚتەوە، بۆیە وا دەڵیٚی سڵپاتەیە لەدەممان‌دا..یان دەمی ئیٚمە ئەوەندە تاڵە هیچ جۆرە شیرینییەك شیرنی ناکاتەوە...بەڵام جارجاریٚك چەند وشەیەکی

پیٚچراوەو مزر دەخویٚنمەوە، ئاویٚکی شیرن بەتاڵی دەرونما دەهات..خەو جارجارەش لەباوەشی گرمو نەرمی کتیٚبیٚکدا سەفرای دڵم دەفریٚنیٚ..

جەژنی قوربانمان لەگەڵ کارتەکەی تۆدا کرد...دەستی جەژنە پیرۆزەمان لەمل کرد..کارتەکەت شەورۆژ هۆنراوەکانتم بۆ دەخویٚنیٚتەوە...لەگەڵ هەر سەرهەڵبڕینیٚکما هەڵمەتەکەی ناوپردان و، هەڵمەتە ریش پانەکەی پیٚنجویٚن و، هەڵمەتە سەرتاشراوەکەی میهرەجانی شیعری کوردی شاری ئاگرم دیٚنیٚتەوە

یادو، لەگەڵ ئەوەدا زامەکانم یەك بەدوای یەکدا دەکولێتەوە سەری کۆڵنەدان بەیەکەوە دەنێتەوە.

لەگەڵ یادەکاندا ئەملاوئەولات بەکامەی دڵم ئەمژەو، هیوادارم هەموو ساتێکت هەڵمەت بێ و، لەگەڵ هەموو هەناسەیەکتا چاوی کۆرپەی شیعرێکی نوێ بدرەوشێتەوە...سڵاوم بەکاك ئەنوەرو کاك محەمەدی مەلا کەریم کاك محەمەد بەدری کاك ساڵحی سەید گوڵ بگەیەنە...

لەپشتی کارت نووسیبووت کۆمەڵێ شتم بۆ داناویت، کەس نییە پیایا بنێرم بۆت و ئەگەر هەرکەس نەبوو دوای جەژن خۆم دێم!! زۆر حەز بەهاتنت دەکەم و، لەدوای جەژنەوە هەر بەتەماتم....زۆر حەزبەهاتنت دەکەم..بەڵام هەڵمەت هەر هەڵمەتی نەهێنا..کاکە هەڵگری نامە دێتە خزمەتت ئەوەی لەژێر دەستایە بۆمی بنێرە...خۆ ئەگەر خۆشت بۆت کرابێت گەلێ خۆشترە..وە رەنگە لەنیوەی ساڵدا سەر بدەم لەبەغدا جا حەزئەکەم بزانم مسۆگەر کام رۆژانە تۆ لەبەغدا دەبیت.

وەنامەی کورت کورتیش بۆ کوێ بنێرم بەبەریددا.

بۆیە بە(عبدالرضا زکی)دا جوابی نامەکەم نەدایەوە، حەزناکەم زۆر لەگەڵی تێکەڵاوبیت. هەر چەند دەماری یاخی بوون و پێشکەوتنی تیادا هەیە...منداڵەکان داوای وێنەی کوردستان و سلێمانی دەکەن لەرۆژنامەکەتانا...کۆتایی بەماچ کردنێکی تری ئەملاو ئەولات دێنم و هەربژیت.

برات

محەمەد عەبدولکەریم بەرزنجی

لەقەزای حەی/ واسط

١٩٧٧/١٢/٢٣

## نامە :

# برای خۆشەویستم کاکە لەتیف گیان ڕۆژباش

دوای سڵاو..

هیوادارم هەمیشە لەوپەڕی باشییدا بیت لەمن ئەپرسیت ئەی گوزەرێنین، کاکە شەوەو هەمیشە ئەمەوێت لەناوباوەشی گەرمی کتێبێکدا بنووم. ئەنووم و هەل دەسمەوەو جارێکی تر سەری دێرێکی تر ئەگرم و جێگا خەوێکی تر خۆش ئەکەمەوە..لەم راچەنین و وەنەوزەدا، وێنەیەك لەدووتوێی کتێبەکەوە سەرتاتکێم لەگەڵ دا ئەکات، وێنەیەکی ریشنی سۆفیانەی قەڵەم نەکراوی لەشەقامێکی یەکجار قەرەباڵغی بەیەکاچووی پڕ ئاواتدا... لەشارێکی رازاوەی خنجیلانەی هەڵواسراوی سەربەرزدا..لەناوچەیەکی رزگارکراوی سەرسنووری وڵاتێکی بریندارادا...باوەشم پیاکردو کەوتمە ماچ کردنی ئەملاوئەولای ریشی پڕی...لەخۆمم پرسی جارێ دووجار سێ جار ئەم سۆفیە نورانییە کێ بێت.؟

هاتم و چووم بەدڵ و دەروونی شپرزەی خۆمدا چوومەوە...دۆزیمەوە..دۆزیمەوە..هەڵمەت بوو خاوەنی خواو شارە بچکۆلەکەمان...یەکسەر خەو لەچاوەکانمدا تەری وجیهانی چڕ بەچڕی کتێبم بەجێ هێشت خۆم کوتایە باخەڵی پەڕەییەکی سپییەوە کەوتە گێڕانەوەی یادی ڕۆژانەو ساڵانەی بە ئاکام نەگەیشتووم...خۆم دا بەسەر سەرو سنگی قەڵەمداو بەزۆر خستمە گریان و، وتم ئەبێ بگریت بەفرمێسکی گریانت یادگاری چەند ساڵەم بۆ بنووسێتەوە بۆ شاعیرێکی یاخی و سەربەدەرەوەو سەرچڵی ناو ئەم جیهانە پڕ ئاژاوەو سەرگەردانە..بۆ لەتیف ئەو لەتیفەی لەدەسرازە قارس بووەو حەزی بەشنەشنەی سەر باوەشی گەرمی دایکی کردووە بۆ ئەو لەتیفەی کە ئەیەوێت هەڵمەت بەرێت بۆ...زۆرو زۆرداری، تاوان و تاوانکاری، برسێتی و ئەوانەی ئەیانەوێت مرۆڤ بێ قاچ بکەن و بەژانی برسێتییەوە بتلێتەوەو بپرزێنن...،ئەوانەی لەسەر بەرەی خۆیان قنگیان توێتکە ناخوات و ئەیانەوێت بەرەی رەنگاورەنگ لەجەرگی خاکی کەسانی تردا دابخەن و بەزۆر بیکەنە ماڵ ومولکی خۆیان و کەس و دانیشتوانی ئاوارەو دەربەدەر بکەن و پەرت و بڵاوی بکەنەوە بیکەنە ئاردی ناودرکی ووشتر خۆرەکانی چبایش و جلعە..لەمەدا

کۆتایی گریانم هات و راست بوومەوەو چاوێکم بەدەوروبەری خۆمدا گێرا کەسەیری ماڵەکان و دەوروبەرم کرد چەندەها ساڵە لەم شوێنەدا ئەژین بەجل بەزمان بەکردارو خوورەوشت رەنگ و خوی ئەمانیان گرتووە کەچی کەدێتە سەر حیساب و ئەپرسێت لێیان ئەڵێن ئێمە کوردین...

برای ئازیز هەڵگری نووسراو کاک رەشید خضیر مامۆستایەو ئەمساڵ کۆلیجی تەواو کردووە کوردەو خەڵکی قەزای حەیە...دێتە لات..کاتی خۆی لەسلێمانیەوە بەکاک صالحی حاجی سید گوڵدا نامەیەکم بۆناردی ئیتر نازانم (صالح)ت دیوەتەوە یان کاغەزەکەت بەدەست گەیشتووە؟ کاکە هیچ جۆرە لاپەڕەیەکی کوردیمان پێناگات...جا زۆر مەمنون ئەبم، ئەوەی توانات بەسەردا بوو کەوتە بەردەستت بەشکم بۆمی بنێری..دیوانەکەی خۆشت بۆ ناردووم..جا ئێستا بەشکم ئەم کتێبانەم بۆ بنێری بەکاک رەشیددا...

١. کردستان بین الحربین د.کەمال مەزهەر

٢. کوردستان کورد د.قاسملۆ، کوردیەکەی

٣. نالی دراسەکەی مامۆستا مەلا عبدالکریم

ئەمە لای کاک ئەنوەرە کاتی خۆی بەڵێنی داومێ کەنوسخەیەکم بۆ بنێرێ بەشکم ئەگەردیت دوای راگەیاندن و سلاو ئەوەشی پێ بڵێیت.

٤. ئەگەر کۆڕشتی تازەیان دەرکردبوو ئەمەش بەکاک ئەنوەر بڵێ..

٥. عیراق کوردی یەکەی چەند ژمارەت لەبەر دەستدابوو...وەداوای ئەمجارەش بەشکم عیراق کوردیەکەیم هەمووی بۆ بنێرێ...

٦. بەیان و رۆشنبیر نوێ..

ئیتر سلاوم بۆ...مامۆستا محەمەد بەدری و کاک ئەنوەرو کاک محەمەدی مەلاکەریم کاک صالح بەرزنجی هەیەو هیوادارم هەردەم لەوپەڕی باشیدابیت.

کاکە رووی بێدەرامەتی رەشبێت، کە ناتوانم لەساڵێکدا جارێکیش سەرێکتان لێبدەین..منداڵ وئەرکی ژیانی رۆژانە مۆڵەتمان نادات.

من ئەڵێم ئەگەر بۆتانکرا، تۆو کاک سالح و کاک ئەنوەر، لەمۆڵەتێکا سەرێکمان لێبدەن.

کاکە چەند شتێکم بەدەستەوەیە، ئەگەر بەسەریاندا زاڵبم لەمەودوا جاروبار شتتان بۆ بنێرم...بۆ بەشی کوردییەکە. ئیتر لەدوا فرمێسکی خەمدا، باوەشت پیا ئەکەمو ئەملاو ئەولات ئەمژمو هەربژیت.

برات

محەمەد عەبدولکەریم بەرزنجی

مامۆستای زمانی کوردی، لەقەزای حەی واسط

١٩٧٧/١١/٢٢

شیعر

# کوردستان ونەورۆز

کوردستان ئێستا چەندێ ڕەنگینی
لەدڵی مندا یەکجار شیرینی
دۆڵت ڕازاوەی دەستی هیوایە
چیات سەرخۆشی بەزمی لەیلایە
فەرشی زەمینیت سەوزو دڵگیرە
بەپەخشانی گوڵ ژوانگەی ژیرە.
لاپاڵ و دۆڵ وهەردەوشیوەکان
چاوەڕێی گرن لەبان چیاکان
هەریەک بەجۆرێ خۆی ڕەنگین ئەکا
چوالەیەکەم ڕۆژ ئارایش ئەکا
بۆ بەزمی ڕۆژی گوڵی خۆی پشکوان
بۆن وبەرامەی بۆ دیمەن پژان
فەڕی دایە پەڕەی شۆخ و شەنگ
لاوان سازبکەن بۆجەژن و ئاهەنگ
بۆ چ ئاهەنگی، کام شەبەنگێ
بۆ ئاهەنگی نەورۆزو سەنگێ
تەکانی دایە گیان ولەشی
دوژمنی بەزان بە گەردەشی

گوێزوچوالەو بەڵاڵووک
خۆیان گۆڕی وەکو بووک
لەگەڵ تیشکی خۆری بەیانا
سپیو سوورو مۆرلە ناویانا
بەڵێ..بەڵێ درەخت خۆی گۆڕی
بۆ ئاواتی کورد ساڵی گۆڕی
بەڵێ درەخت دارو دەوەن
چیاو دەشتو چۆڵوزەوەن
لەبەریان کرد بەرگی رەنگین
بۆ نەورۆزیان دەم بەکەنین
چرۆ پشکوت بووژایەوە دار
شینایی دەشتی پۆشی تاکەنار
بەڵێ...رۆژ لەدوای رۆژ گیا زیادیکرد.
بن داریگرت لوتکەی سەوزکرد
رێی زەوەنکرد
دنیایی جوانکرد
گوڵی بەناوبانگی گیا گرۆ
لەیاڵوشاخ روا بەدرۆ
زۆر گوڵیش گوڵی نیسان

کە پرۆکەی کرد لەملەوشان

دەشتودەریان رازانەوە

بەگوڵە مەشقانەی پانەوە

گیا تەواو هەستا لەدەشت

ڕێگاوبانی جوانکرد بۆ گەشت

مارومێروی سرِو نووستوو

لەناوکونا پەپکە خواردوو

ئەو مارانەی لەترسی سەرما

خۆیان حەشاردابوو لەکونا

بەگەرمی خۆر بووژانەوە

لەکونی زستانیان جووڵانەوە

گوڵاڵە خونچەی کردەوە

دیمەنی شاریان روونکردەوە

بەدوایاندا گوڵی باخان

یەک بەدوای یەکدا گوڵیان پشژان

یەکەم گوڵی باخ گوڵە باخ بوو

بەگوڵی شەسپەڕی پەرداخ بوو

کرایەوە خونچەی یەکسەر

لەجوانیدا وەکو ئەختەر

بەو ئاورنگەی شەو ئەباری

سازو ئامادە بوو بۆ دیاری

ئەرخەوانی گوڵ ئاڵ ومۆر

سەرقەبرانی کردە شەپۆر

هەرچی گوڵی تری باخ بوو

بەبۆنی گوڵەباخ شادبوو

بەڵام دیمەن خۆی وادیاربوو

هەریەک گوڵێکیان لەسەر داربوو.

ئامادەبوون بەگوڵیانەوە

بۆ جەژن ویادی نەورۆزیانەوە

بەڵێ بەڵی گشت کوردستان

زۆر نەخشینەوجوانە بۆژیان

ئاگری نەورۆزی بەخوێن ولەش

لەسەر چیاکان ئەکا گەردەش

بەئاگری نەورۆز ئەنووسین کوردستان

بۆمافی رەوامان و رزگاری کوردان

ئاگری نەورۆز بەرزئەبێتەوە.

بەهیچ دوژمنێ دانامرکێتەوە

# راوکەروبەران

لەتاقێکا لە دەربەندێ
لەبناری شاخ‌و، ناوبەردێ
راکشا بوو یەکبەران
سووری خورمایی جوان
بەدوو چاوی بزی تیژی
ئەیڕوانییە دەوری بەتیژی
سڵی ئەکرد لەگیزەی مێش
رائەپەڕی لەدەنگی رێش
مێشی سەرشاخی جارجار
کە دائەبەزی بۆ دەوری زار
دایئەچڵەکاند ئیستێنکێ کرد
لەکاوێزی خۆی مت ئەکرد.
هەرچاوێکی چەند چاوبوو
بۆ بەرانبەری کەدیاربوو
ئەیڕوانییە دەوروپشتی
جارجار هەڵنە سابۆ هەستی
ئەیڕوانییە بن تاشەکان
ناو ئەشکەوت کەورگەکان

ئەشکەوتە کانی ئەو ناوە

گشتی شارەزا بوو بەوچاوە

پاش هەست هەڵگرتنی تەواو

کەنەی ئەدی هیچ بەچاو

دەستی ئەکردەوە بەکاوێژ

گوێی ئامادەی وتو وێژ

لەگەڵ کاوێزا سەری شاخی

لەنجەی ئەکرد وەک دەماخی

لەجیهانی خۆیدا ئەژیا

لەوناو ماڵی کاوەووزەردەدا

بێ ئاگا بوو لەوجیهانەی

کەراوکەرێ لەخوارلانەی

لوولەی تفەنگی کوشندەی

لەکارایە بۆ ئەلەنگەی

بەڵێ..کابرای راوکەری ئەو

دەستی لەسەر پیتکەبوو بۆ ئەو

کاتێ زانی ئەو ئەیڕوانی

سەیر ناکا بۆ ئەوبەچاوانی

دەستی لەسەر پیتکەی تفەنگ

پەنجەی داگرت بەبێ دەنگ

لەسەر نیو دەستی ترازا

ئەو حەیوانەی خستە سزا

دای لەتەنگیو پێکای ئەو

گلۆر بۆوە بۆبەردەستی ئەو

گلۆر بووە گلۆر بووە

لەخوێنو خۆڵدا خلبۆوە

راوکەریش هەڵسا راوکەرانە

تفەنگی کردە شان نامەردانە

خۆی لەکاوەفرێدا داخوار

بۆ سەر لاشەی لەخوێنا بار

بەراکردن زۆر بەپەلە

ئەو بەرانەی سەربری.

لەبەردەستی راوکەرا

بەرانی سەربڕاو

هەڵئەساو ئەکەوتەوە

تا لەخوێنا بەگیانی ساردبۆوە.

دەک دەستت شکێ راوچی

بۆ کارێ کردت لەوێ.

بەغدا

١٩٧٠/٣/٨

**لەچاپكراوەكانی نووسەر:**

١. دیوانێكی شیعری بەناونیشانی(دابڕان) ساڵی ٢٠٠٣ چاپكراوە.
٢. كتێبی مامۆستا جەمال تاهر قارەمانی شۆڕش‌و زیندان. ساڵی ٢٠٠٤ چاپكراوە.
٣. كتێبی مامۆستا عەزیز ژیانێكی پاك‌و شەهیدی دەستێكی ناپاك ساڵی ٢٠٠٤ چاپكراوە.

**بەرهەمە چاپ نەكراوەكانی نووسەر**

١. ژیاننامەو بەرهەمەكانی شەهید ئارام.
٢. زیندان‌و بیرەوەری.
٣. مێژووی گوندەكانی قەرەداخ.
٤. كەشكۆڵی بیرەوەرییەكانم.

## زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی ٢٠٠٦ی

## بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە لە وەزارەتی رۆشنبیری

| ز | ناوی کتێب | ناوی نووسەر / وەرگێر | بابەت | جۆری چاپ |
|---|---|---|---|---|
| ٤٠٨ | هەندێ سیمای ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی و. | و. ئەنوەر قادر محەمەد | کۆمەڵایەتی | چاپکردن |
| ٤٠٩ | چەردەیەك لەمێژووی کورد | کەیوان ئازاد ئەنوەر | مێژوویی | چاپکردن |
| ٤١٠ | هەمەچەشنەی زانیارییەکان | عەلاء نوری بابا عەلی | زانیاری | چاپکردن . |
| ٤١١ | هارمۆنی | و. توانا رەشید | مۆزیك | چاپکردن |
| ٤١٢ | نهێنییەکانی ئەلگرا | و. شەرمین محێدین | چیرۆك | چاپکردن |
| ٤١٣ | Opticl Properties Of Minerals | ئارام عوسمان | زانستی | چاپکردن |
| ٤١٤ | سایکۆلۆژیی منداڵ | سۆزان جەمال | زانستی | چاپکردن |
| ٤١٥ | گەشتە تیوارەکانی میر بەتەنیاییدا | عەتا محەمەد | رۆمان | چاپکردن |
| ٤١٦ | سێبەرەکانی میرا | زەینەب یوسفی | رۆمان | چاپکردن |
| ٤١٧ | ئازادی رۆژنامەنووسی و رۆژنامەنووس.. | بەناز کوێستانی | رۆژنامەنووسی | چاپکردن |
| ٤١٨ | اعلام کرد العراق | جمال بابان | بیبلوگرافیا | چاپکردن |
| ٤١٩ | توخمەکان | ئەسعەد قەرەداغی | زانستی | چاپکردن |
| ٤٢٠ | بەجیهانیبوونەر کورد | عومەر رەسوڵ | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٤٢١ | بەهەشتی دڵداری | میرزا محەمەد ئەمین مەنگوری | دیوانە شیعر | چاپکردن |
| ٤٢٢ | دیوانی کەژاڵ ئەحمەد | کەژاڵ ئەحمەد | دیوانە شیعر | چاپکردن |
| ٤٢٣ | جنوب کردستان فی موازین السیاسە الدولیە | شیخ سالار حفید | رامیاری | چاپکردن |
| ٤٢٤ | الارهاب- ارکانە- اسبابە- اشکالە | همداد مجید علی | رامیاری | چاپکردن |